# زانستی ئابووری

**نووسین و ئامادەکردنی**

**د. نەهرۆ عەلی**

**هەولێر - ٢٠٠٩**

**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **زانستی ئابووری**
- نووسینی و ئامادەکردنی: د. نەهرۆ عەلی
- نەخشەسازی ناوەوە: تەها حسێن
- بەرگ: ئاسۆ مامزادە
- ژمارەی سپاردن: (٥٢٤)
- نرخ: (٤٥٠٠) دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠٠٩
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

**زنجیرەی کتێب (٣٧٢)**



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

**پێشکەشە بە....**

هەموو ئەوانەی، کە داهات و سەروەت و سامانی کوردستان زیاد دەکەن!

# پێڕست

# لەبری پێشەکی

بەگشتی پەرتوکخانەی کوردی زۆر لاوازە لە زۆربەی بوارەکانی زانستدا و بەتایبەتی لە بواری ئابووریدا. ئەمڕۆ لە دونیای نوێ و لەسەر لێواری پەڕینەوە بۆ سەردەمێك تەواو جیاواز لە سەردەمەکانی پێشوو پشکی ئابووری و ئەقڵی ئابووری و جوگرافیای ئابووری بوونەتە پایە سەرەکییەکانی بەڕێوەبردنی وڵاتان و سیاسەتی دەوڵەت و سەرجەم پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان و پەیوەندی لەگەڵ ڕێکخراوەکانی دونیادا لەبەرژەوەندییە ئابوورییەکانەوە ڕێگە دەگرێت.

ئەگەر بەئاشکراو بێ پەردەش هەندێك جار قسە لەسەر هاوتەریبی بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی نێوان دوو لایەن نەکرێت ئەوا بێگومان لەناوەڕۆکدا بزوێنەری ڕاستی پەیوەندییەکە هەر بەرژەوەندییە ئابوورییەکانە. بەرژەوەندی ئابووری دەتوانێت دوو دوژمنی سەرسەختی یەکتر بکاتە دۆست و شەریك وە هاوکات دەشتوانێ دوو دۆست یان دوو وڵاتی برا بکاتە دوژمنی سەرسەختی یەکتر، ئەگەر ئێمە بمانەوێت باس لەگرنگی کەرتی ئابووری بکەین لە بەڕێوەبردن و سیاسەتدا ئەوا زۆر لەوە زیاتری دەوێت کە ئێمە بمانەوێت لەم نووسینەدا ئاماژەی پێ بکەین. بەڵام ئەوەی من مەبەستمە گرنگی ئەم کەرتەیە لای بەرپرسان و خەڵکانی ئێمە و تێگەیشتنیان لە ئابووری و سیاسەتەکانی.

ئێمە لە کوردستاندا بە درێژایی مێژوو و لە مێژووی دروست بوونی حکومەتەکەمان (حکومەتی هەرێم) هیچ سیاسەتێکی ئابووری ڕوون و ئاشکراو زانستیمان نەبووە کە حکومەت بەرنامەکانی خۆی لەسەر دابڕێژێت و بیکاتە پرنسیپی کارکردنی خۆی و لە نەخشە و پلانەکانییەوە بڕوانێتە ئەو پڕۆژانەی کە جێبەجێی دەکات، بەداخەوە بەرپرسانی ئێمە نەك هەر کەسانی ئابووری نین بگرە بیری ئەوەشیان نییە کە چاودێری گۆڕانکارییە ئابوورییەکانی جیهان بکەن و دۆخی وڵاتەکەی خۆمانی پێوە بەراورد بکەن.

ئەوەتا بەناو دۆست و هاوپەیمانەکانمان لە بەغدا بەهەموو کەموکوڕی و بێ سەروبەری دەسەڵاتەوە بەرنامە سیاسییەکانیان لەسەر پایەی بەرنامە ئابوورییەکان دادەنێن و هیچ بەندێکی سیاسییان نییە کە ناکۆك بێت لەگەڵ بەرنامەی ئابووریاندا، بەڵام ئەوە تا ئێمە دوای



(١٧) ساڵ ڕزگاری نەك هەروەك ئەوان بیر ناکەینەوە بەڵکو لامان هەر هیچ وەزنێکیشی نییە، لای ئێمە هەموو شت بە مەزاجە.

باشە چۆن بەرەو کرانەوەی ئابووری و بنیاتنانەوەی ژێرخانی ئابووری کوردستان هەنگاوبنێین لەکاتێکدا وەك گوتاری ئابووری وڵات تا ئێستا یەك دێڕ نووسراومان نییە، بگرە لەهەموو قەیران و گرفتە ئابوورییەکانماندا بەغدا تاوانبار دەکەین، چونکە تاکو ئێستا یەك شیتەڵ کردنەوەی ڕەوا و زانستانەمان نییە بۆ ڕوون کردنەوە و چارەسەرییان، تاکو ئێستا بەرپرسێکم نەدیوە کە شرۆڤەیەکی زانستانە و ئابوورییانە بۆ گرفتەکانی بەرزبوونەوەی نرخ یان نەبوونی سوتەمەنی یان بڵاوەکردنی گەندەڵی ئابووری بکات.

بۆیە منیش بە پێویست و ئەرکی سەرشانی خۆمم زانی کە نووسراوێکی ئابووری بەشێوەیەکی سادە و ساکار پێشکەش بە پەرتوکخانەی کوردی و خوێنەری بەڕێز بکەم، بەتایبەتی بۆ ئەوانەی کە شارەزاییەکی باشیان نییە لەبارەی بابەتە ئابوورییەکانەوە، هیوادارم تا ڕادەیەك توانیبێتم ئەم ئەرکە پیرۆزە جێبەجێ بکەم.

ئابووری زانستێکی کۆمەڵایەتییە هەروەك زانستە کۆمەڵایەتییەکانی تری وەك (مێژوو، سایکۆلۆژی، فەلسەفە.. هتد.) ئابووری دەکۆڵێتەوە لە تەوەرەکانی بازاڕ، بۆچی خەڵکی یان کڕیار کاڵا و شمەکێکی دیاریکراو دەکڕن؟ خاوەن دوکانەکان چۆن نرخ دەستنیشان دەکەن؟ بۆچی هەموو کەسێك ناتوانێت هەموو ئارەزوو داوا و خواستەکانی جێبەجێ بکات؟ چۆن خاوەن کارگەکان بڕیار دەدەن چی بەرهەم بهێنن؟ چ بڕە پارەیەك بدەن بە کارکەران؟ حکوومەت دەتوانێت چی بکات بۆ باشکردنی گوزەرانی هاوڵاتییان، وە چۆن حکوومەت دەتوانێت یارمەتی هەژاران و کەم دەرامەتان بدات؟ ئابووری وەڵامی ئەم پرسیارانە و چەندان پرسیاری تر دەداتەوە و لێی دەکۆڵێتەوە.

ئەگەر تۆ پیاوی کاریت و سەوداکاری، سەرمایەداریت، یان تەنها مرۆڤێکی ئاسایی و مووچە خۆریت یان لێپسراو و خاوەن بڕیاریت، تێگەیشتن لە زانستی ئابووری ئەگەر بەشێوەیەکی سادەش بێت یارمەتیت دەدات چۆن بڕیاری ڕاست و گونجاو بدەیت لەکارەکاندا یان لە ژیانی ڕۆژانە و کۆمەڵایەتیدا. تۆ ئەگەر خوێندکاری یان قوتابیت ئەم پەرتووکە یارمەتیت دەدات کە بەئاسانی لە تیۆرییە ئابوورییەکان تێ بگەیت وەك لەوەی لە هۆڵی زانکۆکاندا تیۆری وشك و ئاڵۆزت بۆ باس بکەن.

ئەم پەرتووکە باس لە تیۆری وشك و ئاڵۆزەکانی ئابووری ناکات، بەڵکو ئەو تیۆری و یاسا ئابوورییانە بەشێوەیەکی سادە و ساکار بەهۆی نموونەی ئاسان و پراکتیکەوە ڕوون دەکاتەوە.

هەروەها ئەم پەڕتووکە باس لە کاریگەری ئـابووری دەکـات لەسـەر کارگـەکان، سـەوداکاران، دارایی، حکوومەت، سیاسەت. تەنانەت لە هەڵبژاردنی خواردنی ژەمی ڕۆژانەمان.

ئەمڕۆ ئێمەی کورد لە هەمـوو خەڵکانی تر زیاتر پێویستمان بە زانین و تێگەیشتنی زانستی ئابووری هەیە، چونکە ڕێگەیەکی دوورودرێژ و دژوارمان لەبەردەمدایە بـۆ بوژانـەوەی ئـابووری وڵاتە وێرانکراوەکەمان. بەبێ زانین و تێگەیشتن لە بنچینە سەرەکییەکانی ئابووری ناتوانین ئـەم کارە پیرۆزە جێبەجێ بکەین.

جارێکی تر هیوادارم تا رادەیەك توانیبێتم بەهۆی ئەم پەراوگەیەوە ئەقڵی ئابووری لە هزر و مێشکی ڕۆڵەکانی گەلەکەمدا بەرجەستە بکەم.

وە هەر لێرەوە داوای لێبوردن دەکەم لە هەموو کەم و کوڕییەکی زاراوەیـی زمانـەوانی لـەم پەراوگەیەدا، چونکە زۆر زۆر بەداخەوە زۆربەی زاراوە ئابوورییەکان لەزمانی کوردیدا هـەر نـین یان من پێم نەزانیوە، هیوادارم لەکارەکانی ترمدا ئەم کەم و کوڕییانـەش کـەم بکەمـەوە ئـیتر فەرموون بۆ خوێندنەوەی ناوەڕۆکی ئەم پەراوگە ئابوورییە.

لە کۆتاییدا پڕ بەدڵ سوپاسی بێ ئەندازەم، پێشکەش بە بەڕێز (بیلال کـەمال حەمەعـەلی) دەکەم، کە بەوپەڕی سەرنجەوە بە زمانی نووسـینەکەدا چـووەوە لـە داڕشـتنەوەی بابەتەکـەدا، دەستی یارمەتی بۆ درێژکردم، وێنەی زۆربێ و هەر سەرکەوتوو بێت.

**ئۆکرانیا/ ٢٠٠٨**

# بەشی یەکەم

## نەخشەیەکی گەورە!

لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین باس لە تێگەشتنە ئابوورییەکان و میکانیزمی ئـابووری بکـەین، هەروەها باس لە بەشداران و لایەنـەکانی پرۆسـەی ئـابووری بکـەین کـە بـریتین لـە کڕیـار و فرۆشیار، کۆمپانیاکان، سەرکار و کارکاران، بازرگانـەکان، کاسـبکاران، حکوومـەت...هتـد، دەربارەی پلەوپایەی ئابووری نەتەوەیی دەدوێین، باسی یاسا ئابوورییەکان بەتایبەتی یاسای داوا و خستنەڕوو دەکەین، لەم بەشەدا باس لە پرنسیپەکانی پێکهاتەی بـازاڕ و* بـاس لـە بـەها و نرخی کالا و خزمەتگوزارییەکان و کاریگەری فاکتـەرە دەرەکییـەکان لەسـەر پێکهاتـەی ئـەو نرخانە دەکەین.

---

* لەم نووسـینەدا وشـەی بـازاڕ بەرامبـەر وشـەی (Market)ی ئینگلیـزی بـەکاردەهێنین، مەبەسـتمان لـە بەکارهێنانی وشەی بازاڕ واتە ئەو رووبەرە فراوانەی کە مامەڵە و چالاکی ئابووری تێدا بە ئەنجام دەگەیەنرێت.

# فەسڵی یەکەم

## کێ چی بەدەست دەهێنێت و چۆن؟

لەم فەسڵەدا هەوڵ دەدەین وەڵامی سێ پرسیار بدەینەوە.

- بۆچی زانستی ئابووری گرنگە؟
- کۆمەڵگا و خەڵکی چۆن بڕیار دەدەن؟
- تێگەیشتن لە تیۆرییە ئابوورییەکان؟

ئەگەر بە وردی سەرنج بدەین دەبینین تەنها پرینسیپێك بۆتە هۆی بەردەوامی و پێشکەوتنی ژیانی مرۆڤایەتی لە گۆی زەویدا ئەویش بریتییە لە نەبوونی، کەمی، کەموکورتی، دەگمەنی، بێ سنووری ئارەزوو خواستەکانمان، بۆ نموونە کەمی خانووبەرە، کەمی ماشین و ئامێرەکان، کەمی وزە و تەنانەت کەمی خۆراك و پۆشاك، کەمی داودەرمان، کەمی مامۆستا و پزیشکەکان،...هتد. ئابووری وەك زانستێکی کۆمەڵایەتی دەکۆڵێتەوە لە هۆکانی نەبوونی و کەمی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان، وە هەمان کات چارەسەر دەدۆزێتەوە بۆ لەناوبردنی نەبوونی و کەم دەرامەتی و قەیرانە ئابوورییەکان.

ئەگەر سەیری مێژووی مرۆڤایەتی بکەین بۆمان دەردەکەوێت کە بەدرێژایی مێژوو مرۆڤ پەنای بردۆتە بەر هێز بۆ بەدەستهێنانی پێداویستییەکانی، شەڕوشۆڕی بێ بڕانەوە و هەمیشەیی نێوان میللەتان و دەوڵەتان ئەم ڕاستییەمان بۆ دەسەلمێنن.

بەکارهێنانی هێز و داگیرکردنی سەربازی هەتاکو ئەمڕۆکەش بەردەوامە. زانستی ئابووری ڕێگەیەکی دوور لەشەڕ وشۆڕ و داگیرکردن نیشان دەدات بۆ جێبەجێ کردن و بەدەستهێنانی هەموو داوا و خواست و پێویستییەکانی مرۆڤایەتی، ئابووری باس لە چی دەکات؟ باس لە بەڕێوەبردن و ڕێکخستنی سیستەمە ئابوورییەکان دەکات، باس لە بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕ دەکات باس لەخەرجی بەرهەمهێنان و قازانج دەکات، باس لە نرخ و بەها و کاڵا دەکات، باس لە کار و کرێی کار دەکات...هتد. باس لەوە دەکات چۆن بەرهەم بهێنین و کار بکەین و بەرهەمی نەتەوەیی و سامان زیاد بکەین تاکو هەموو تاکەکانی کۆمەڵ بەخۆشی و ئاسودەیی



ژیان بەرنەسەر؟ تاکو هەژاری و دواکەوتوویی لەجیهاندا بنەبڕ بکرێت لەبەر ئەم هۆیانە و چەندان هۆی تر زانستی ئابووری بۆ هەمووان پێویستە.

## ئابووری چییە؟ لەپێناوی کێدایە؟

زەمینەی ئابووری باس و توێژینەوەیە لە بەرهەمی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان و دابەشکردنی لە کۆمەڵگادا دەکات.

هەر لە دێرینەوە لە مرۆڤەکانی چەرخی بەردینەوە تاکو ئەمڕۆکە، مرۆڤ چالاکی ئابووری نواندووە و هەمیشە هەوڵی داوە لە نهێنیەکانی دیاردە ئابوورییەکان تێ بگات.

**کەواتە زانستی ئابووری چییە؟**

ئابووری زانستێکی کۆمەڵایەتییە کە توێژینەوە و لێکۆڵینەوە لەپەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و پەیوەندی تاکەکانی ناو کۆمەڵگا دەکات. جیاوازی زانستی ئابووری لەزانستییە سروشتییەکانی تر لەوەدایە کە ئەنجام و تاقیکردنەوەی زانستە سروشتییەکان ڕەهایە و بەتەواوەتی بەرجەستە دەبێت، بەڵام زانستی ئابووری ئەنجام و تاقیکردنەوەکانی ڕەها نییە، بۆ نموونە بەپێی یاسای فیزیا هەموو دەزانین کە ئاو لە (١٠٠°) پلەی گەرمیدا دەکوڵێت، بەڵام بەهۆی زیادبوونی باجەوە ناتوانین بزانین چی ڕوودەدات، چونکە زیادبوونی باج کاردەکاتە سەر کەم بوونەوەی داهاتی تاکەکەس، کەم بوونەوەی قازانجی کۆمپانیاکان، دابەزینی توانای کڕین لەلایەکەوە، بەڵام لەلایەکی ترەوە دەبێتە هۆی زیادبوونی بودجەی گشتی کەواتە حکومەت دەتوانێت زیاتر پارە خەرج بکات بۆ پرۆگرامە کۆمەڵایەتییەکان. کەواتە بەهۆی تێگەیشتن لە یاسا ئابوورییەکان دەتوانین شیتەڵی دیاردە ئابوورییەکان بکەین، بەهۆی ڕێسا ئابوورییەکانەوە دەتوانین پێشبینی گەشەکردن و داشکانەوەی باری ئابووری بکەین. وە دەتوانین بزانین هەڵاوسان بۆچی ڕوودەدات، وە چارەسەری دیاردەی هەڵاوسان چۆن بکەین. دەتوانین دیاردەی زیادبوونی نرخی سووتەمەنی ڕوون بکەینەوە وە هەروەها دەتوانین ڕێگەچارەی بۆ بدۆزینەوە، لەبەرئەوەی دیاردە و گۆڕانکارییە ئابوورییەکان پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەیە بە ژیانی ڕۆژانەی هەر یەکێك لە تاکەکانی کۆمەڵ، وە پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بە چالاکی کارکردن* لەبازاڕدا هەروەها پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەیە بۆ هەڵسوکەوت و

* کارکردن: لەبری وشەی (Business)ی ئینگلیزی بەکارهاتووە، وە هەروەها هەندێ جار لەبری وشەی (Busniness) وشەی پیشە، سەوداکار، کاسبکار، بەکار دەهێنرێت.

بڕیارەکانی حکوومەتەوە. لەبەر ئەم هۆیانە و چەندان هۆی تر زانستی ئابووری گرنگە بەهۆی تێگەیشتن لەزانستی ئابووری دەتوانین لە سیاسەتی ئابووری حکوومەتەکەمان تێ بگەین.

**فەرهەنگی ئابووری**

ئابووری هەمەکی (Macro Economics): ئەو بەشەیە لە بیروڕای ئابووری کە بایەخ بە لێکۆڵینەوەی پەیوەندی نێوان گۆڕاوە ئابوورییە هەمەکییەکان دەدات، کە گرنگترینیان داهاتی نەتەوەییە، خەرجی بەکاربردنی هەمەکی، وەبەرهێنانی هەمەکی، کارپێدانی تەواو، بڕی پارە، ئاستی گشتی تێکڕای نرخ، تەرازووی پێوانە..

**فەرهەنگی ئابووری**

ئابووری هەندەکی (Micro Economy): ئابووری هەندەکیی بایەخ دەدات بە لێکۆڵینەوەی بڕیارنامەکانی تاکەکیی (بەکاربەر، خێزان، دەزگا) و چۆنێتی ئاوێتەبوونی ئەم بڕیارنامانە بۆ دەستنیشان کردنی نرخی ڕێژەی کاڵا و خزمەتگوزاری و ئەو بڕەی کە دەفرۆشرێت و لێی دەکڕدرێت.

**فەرهەنگی ئابووری**

ئابووری پێوانەکیی (Econometrics) بەکارهێنانی ئامرازی بریکاری و ئامارییە لە شیکردنەوەی ئابوورییدا.

## گەورە یان بچووك؟

هەموو زانستی ئابووری دابەش دەکرێت بەسەر دوو بەشی سەرەکیدا. ئەو بەشەی کە لەدیاردە گشتی و گەورەکان دەکۆڵێتەوە پێی دەوترێت ئابووری هەمەکیی، بەشەکەی تر پێی دەوترێت ئابووری هەندەکیی، چونکە لەدیاردە تایبەت و بچوکەکان دەکۆڵێتەوە، کەواتە ئابووری هەمەکیی ئەو بەشە ئابوورییەیە کە لەدیاردە گشتییەکان دەکۆڵێتەوە، وەك داهاتی نەتەوەیی، هەڵاوسان، بودجە، باج، گومرگ، بازرگانی دەرەکی...هتد) ئابووری هەندەکیی ئەو بەشە ئابوورییەیە کە لەدیاردە تایبەتەکان دەکۆڵێتەوە، وەك (کرێی کار، بازاڕی کار، نرخ، دارایی، خستنەڕوو، سەوداکاری..هتد) جگە لەو دوو بەشە سەرەکییەی ئابووری و بەهۆی گۆڕانکاری بنەڕەتییەکانی ئەرکی ئابووری وەك زانستێك بەشێکی تری ئابووری هاتۆتە مەیدانەوە ئابووریناسان پێی دەڵێن ئابووری ئەندازەیی پێوانەیی، مەبەست لە ئابووری پێوانەیی بەکارهێنانی ڕێسای بیرکارییە لە لێکۆڵینەوە و شیتەڵکردنی دیاردە ئابوورییە ئاڵۆزەکاندا. بەتایبەتی لە داڕشتن و نەخشەکێشانی



بەرنامەی ئابووری درێژخایەن و پێشبینە ئابوورییەکان. بۆ نموونە بەهۆی میتۆدی پێوانەییەوە دەتوانرێت پێشبینی فرۆشتنی ژمارەی ئۆتۆمۆبیل بکرێت لەئایندەدا، هەروەها ئەم میتۆدە بەشێوەیەکی فراوان بەکاردەهێنرێت لەسیاسەتی دارایی و قەرزیدا، بەتایبەتی لە دەستنیشانکردنی بڕ و ڕێژەی سوودی قەرز، ئەمڕۆکە پێشبینی ئابووری گرنگترین لقی ئابوورییە لەبەشەکانی دواییدا بەدرێژی باس لە گرنگێتی پێشبینی ئابووری دەکەین.

هەروەك لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا. ئابووری زانستێکی کۆمەڵایەتییە، بۆیە لەتوێژینەوە و لێکۆڵینەوە دیاردە ئابوورییەکاندا پەنا دەباتە بەر کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی ئەو بابەتانەی کە لێی دەکۆڵێتەوە (بابەتی لێکۆڵینەوە جموجۆڵ و چالاکی پرۆسەی ئابوورییە کە لەلایەن خەڵکییەوە بەئەنجام دەگەیەنرێت) دوابەدوای ئەوە ئەو زانیارییانە لە روانگەی تیۆرییە ئابوورییەکانەوە شیتەڵ دەکرێت و بڕیارە ئابوورییەکان گەڵاڵە دەکرێت، لەلایەن دەسەڵاتەوە بۆ دیاریکردنی ئاڕاستەی ئابووری دەوڵەت بۆ نموونە تیۆری دارایی قەرز، کاتێك بڕی سوودی قەرز کەم دەبێتەوە، ئەوا سەوداکار و کۆمپانیاکان وە تەنانەت خەڵکیش روو دەکەنە بانکەکان وە ئامادەن قەرز وەربگرن چونکە ڕێژەی سوود نزمە. ئەمەش قەوارەی قەرز وەرگرتن زیاد دەکات، واتە چالاکی لەبازاڕەکاندا بەرزدەبێتەوە و بڕی خەرج کردنی زیاد دەبێت واتە گەشەکردنی ئابووری بەرەو قۆناغی بوژانەوە دەچێت. کەواتە دەتوانین بڵێین کە بەهۆی زانینی تیۆرییە ئابوورییەکانەوە حکوومەت دەتوانێت کاریگەری بکات لە بارودۆخی ئابووری.

خاڵێکی گرنگ هەیە کە دەمەوێت سەرنجی خوێنەری بۆ راکێشم، ئەویش ئەوەیە چالاکی ئابووری لە چوارچێوەی وڵاتێکدا یان ناوچەیەکدا ناتوانرێت بەتەواوەتی کۆنترۆڵ بکرێت، چونکە چالاکی ئابووری چالاکی تاك و کۆمەڵانی خەڵکییە، هەڵسوکەوت و جموجۆڵی ئابووری ئەو خەڵکانە تایبەت و تاکایەتییە بۆیە کۆنترۆڵ کردنیان مەحاڵە، بەڵام بەهۆی تێگەیشتن لە تیۆرییە ئابوورییەکان حکوومەت دەتوانێت ئەو چالاکییانە ئاڕاستە بکات.

خاڵێکی تری گرنگ کە دەمەوێت سەرنجی خوێنەری بۆ راکێشم ئەوەش ئەوەیە بنچینەی تیۆرییە ئابوورییەکان لەسەر بناغەی بیرۆکەی هەڵسوکەوتی خەڵکی لە کڕین و فرۆشتنی بەرهەمەکان لەبازاڕەکاندا بەرجەستە کراوە. بەواتایەکی تر ئابووری لە جموجۆڵ و چالاکییەکانی بازاڕ دەکۆڵێتەوە کەواتە بازاڕ بابەتی لێکۆڵینەوەی زانستی ئابوورییە.

بازاڕ ئەو شوێنەیە یان ئەو رووبەرەیە کە دەتوانین کاڵا و خزمەتگوزارییەکانی تێدا بکڕین یان بفرۆشین، جگە لەوە ئەمڕۆکە بۆرسەکان کە چالاکی کڕین و فرۆشتنی کاغەزی بەنرخ و

شـەیر و دراوی قورسـی تێـدا دەفرۆشـرێت و دەکڕدرێـت بـە بـازاڕ دەژمێرێـت. هەنـدێ لـە ئابووریناسان شاشەکانی کۆمپیوتەر بە رووبـەری بـازاڕی نـەبینراو دادەنـێن، چـونکە بـەهۆی ئینتەرنێتەوە دەتوانین چالاکییە ئابوورییەکانمان جێبەجێ بکەین.

## فەرهەنگی ئابووری

### بازاڕ، باژێڕ (Market):

ئەو شوێنەیە کە هێزی خـستنەڕوو و خواسـتی شمـەکێك، یـان خزمەتگوزارییـەك بەیـەکتر دەگەن و کار لەیەکتری دەکەن.

شێوە و جۆرەکانی بازاڕ بریتییە لە:

| | |
|---|---|
| بازاڕی فرۆشیار | Foreign Exchange Market |
| بازاڕی ئازاد | Free Market |
| بازاڕی داشکاندن | Discount Market |
| بازاڕی نائاسایی | Over the lounger Market |
| بازاڕی زێڕ | Gold Market |
| بازاڕی سەرمایە | Capital Market |
| بازاڕی رەش | Black Market |
| بازاڕی ئالوێر | Exchange Market |
| بازاڕی کەساسی | Soft Market |
| بازاڕی کارکەران | Labor Market |
| بازاڕی ناکار | Bear Market |
| بازاڕی ناتەواو | Imperfect |
| بازاڕی قەرز | Debt Market |
| بازاڕی دارایی | Financial Market |
| بازاڕی کڕیارەکان | Buyers' Market |
| بازاڕی جامبازی | Bull Market |
| بازاڕی پارە | Money Market |
| فرە بازاڕی | Brond Market |
| بازاڕی چەرچییان | Brokers' Market |



- بازاڕی فرۆشیار:

باری ئەو بازاڕەیە کە تیایدا شمەك بە بڕێکی زۆرکەم هەیە و فرۆشیاریش دەتوانێ کاربکاتـە سەر بڕ و کارەکانی بازاڕ و نرخیش بەرزبکاتەوە.

- بازاڕی ئالوگۆڕی دەرەکی:

گۆڕینی یان ئالوێرکردنی دراوی بیانی بەبێ کۆت.

- بازاڕی ئازاد:

ئەو بازاڕەیە کە تیایدا هێزی خواست و خستنەڕوو بەشێوەیەکی ئازاد رۆڵی خۆیـان دەبیـنن (واتە بێ دەست تێخستنی دەوڵەت).

- بازاڕی داشکاندن:

ئەم بازاڕە لە بانکەکان خانەی داشکاندن و خانەی پەسەندکردنی پێکدێت کە تیایدا ئـالوێر لە بوارنامەی گەنجینە و کومپیالە و قەواڵەی ماوە کورت دەکرێ.

- بازاڕی ئاسایی:

زاراوەیەکە کە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا بەکاردێت بۆ ئـەو بـازاڕەی کـە لـە دەرەوەی سنوری بازاڕی یاسایی کاغەزی داراییدا دەبێت.

- بازاڕی زێڕ:

ئەو بازاڕەیە کە تیایدا سەوداکاری بە داڕشتەی زێڕ دەکرێت.

- بازاڕی سەرمایە:

بریتییە لەو بازاڕەی کە تیایدا قەرزی ماوە درێژ بە دەست دەکەوێت، بە پێچەوانەی بـازاڕی نەختینە کە ئالودێر تیایدا بەندە بە قەرزی ماوەکورت.

- بازاڕی رەش:

ئەو بازاڕەیە کە تیایدا بە شێوەیەکی نایاسایی دەفرۆشرێت، واتـە بـە نرخێکـی زیـاتر لـەو نرخەی کە لە لایەن دەوڵەتەوە بۆی دانراوە.

چارەسـەرکردنی کێـشەی دواکـەوتویی وڵاتـە تـازە پێگەیـشتووەکان مێـشك و هـزری ئابووریناسانی سەرقاڵ کردووە، هەروەها وڵاتە گەرە و دەوڵەمەندەکانی جیهان لە هەموو کۆڕ و کۆبوونەوەکانیاندا هەوڵی چارەسەری کێشەی وڵاتە هەژارەکان دەدەن، بەڵام ئایا چۆن چارەسـەر دەکرێت (ئەمەش باس و لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی دەوێت).

- بازاڕی ئاڵوویر:
بازاڕی کڕین و فرۆشتنی پارە.
- بازاڕی کەساسی:
باری ئەو بازاڕەیە کە دیاردەی کەمبوونەوەی نرخی پێوە دیارە و ژمارەی کڕیارەکانیش کەمن.
- بازاڕی کارکەران:
بریتییە لەو بازاڕەی (واتە هێزی خستنەڕوو خواستی کارکەران) بەپێی کرێ و مەرجەکانی کارکردن دەستنیشان دەکرێن.
- بازاڕی ئاگارا:
ئەو بازاڕەیە کە تیایدا نرخ کەمدەبێتەوە، یاخودا وا چاوەڕوان دەکرێ کە کەمبێتەوە.
- بازاڕی ناتەواو:
واتە بازاڕی هامڕێکی قورخدار (مۆنۆپۆڵی).
- بازاڕی قەرز، بازاڕی دام:
ئەو بازاڕەیە کە تیایدا خواست لەسەر قەرز (پرۆژەکان و خێزانەکان و گەنجینەی گشتی) و خستنەڕووی قەرز (بانکەکان و دەزگا داراییەکان و...هتد) بە یەکتر دەگەن.
- بازاڕی دارایی:
ئەم بازاڕەیە یان بە سەرجەمی خواست و خستنەڕووی سەرمایە لە ماوەیەکی درێژدا، وە یان بەو دەزگایانە دەگوترێ کە بەکار دیاری بەرامبەر کردنی خستنەڕوو خواست هەڵدەستن.
لەم دەزگایانەدا پرۆسەی کاغەزە داراییەکان و هەروەها بانکەکان و سەوداکاران بە کڕین و فرۆشتنی کاغەزی دارایی هەڵدەستن.
- بازاڕی کڕیارەکان:
ئەو بازاڕەیە کە تیایدا شمەکێکی زۆر بۆ فرۆشتن ئامادەکراوە، لێرەدا کڕیارەکان توانای هەڵبژاردنی ئەو شمەکانەیان هەیە کە ئارەزوویان لێیەتی، یان دەتوانن کاربکەنە سەر نرخەکان بەرەو کەمی.
- بازاڕی جامبازیی:
ئەم زاراوەیە بۆ نیشانە هەڵدانی بەرزبوونەوەی نرخی پشك و قەواڵە و کەلوپەلی بازرگانی لە بازاڕدا بەکاردێت.



- بازاڕی هاڤرکێی ناتەواو:
ئەو بازاڕەیە کە تیایدا مەرجەکان هاڤرکێی تەواو بەدی ناکرێت، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کەمی ژمارەی کڕیارەکان یان کەمی ژمارەی فرۆشیارەکان، یان نایەکسانی ئەو شمەکانەی کە دەکرێنە بابەتی ئاڵوگۆڕکردن، یان بەهۆی کۆڵدانان لەسەر ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری تایبەت بە خستنەڕوو خواست، یانیش بەهۆی کۆڵدان لەسەر داهاتی بەرهەمهێنی تازە لەو پیشەسازییەی کە ئەم شمەکە بە بەرهەم دەهێنێت.
ئەم بازاڕە چوار جۆری هەیە:
١- بازاڕی قۆرخ — Monopoly
٢- بازاڕی قۆرخی کڕین — Monopsony
٣- ئەو بازاڕەی کە قۆرخی کەمینەی بەسەردا زاڵە — Oligopoly
٤- ئەو بازاڕەی کە هاڤرکێی قۆرخواری تیا باوە — Monopolistic
- بازاڕی پارە:
ئەو بازاڕەیە کە تیایدا بانکەکان و دەزگاکانی مایە و پارەدان بە یەکتر دەگەن، بە مەبەستی هێنانەدی هەمبەرییەکی رۆژانەی نێوان دەرامەت و پێوەدادەکانیدا.
- فرە بازاڕ:
١- ئەو بازاڕەیە کە تیایدا چەند شمەکێکی جیاواز دەفرۆشرێت.
٢- ئەو بازاڕەیە کە سنوورە جیۆگرافییەکەی فراوان بێت.
٣- ئەو بازاڕەیە کە تیایدا سنووری نرخەکان فراوانن.
- بازاڕی چەرچییان:
ئەو بازاڕەیە کە تیایدا سەوداکاری لە نێو چەرچییەکاندا دەکرێ.

## سیستەمە ئابوورییەکان

هەر کۆمەڵگا و وڵاتێك سیستەمێکی ئابووری بۆ خۆی هەڵبژاردووە، واتە سیستەمە ئابوورییەکان جیاوازن بەڵام هەموو ئەو سیستەمانە دەتوانین لە سێ گروپدا کۆبکەینەوە.
– سیستەمی ئابووری ئازاد (سەرمایەداری).
– سیستەمی ئابووری بەڕێوەبردنی فەرماندەیی (سۆسیالیستی).
– سیستەمی ئابووری تێکەڵاو.

ئێستاکە بەدرێژی ناوەڕۆکی هەریەك لە سیستەمەکان روون دەکەینەوە.

- سیستەمی ئابووری ئازاد (سەرمایەداری):- هەندێ جار ئەم سیستەمە ناو دەنێنین سیستەمی بازاڕی، بیرۆکەی ئەم سیستەمە لەوەدایە کاتێك بەرهەمهێنەر سەربەست و ئازادە لە بەرهەم هێنانی کالاّ و خزمەتگوزارییەکاندا، کاربەر، کڕیار،لە بڕیاردانی کڕینی کالاّ و خزمەتگوزارییەکاندا تەنها یاساکانی بازاڕ دەتوانن سنوور بۆ ئەم ئازادییە دابنێن. یاساکانی بازاڕیش بریتین لە (داوا و خستنەروو، نرخ) کەواتە بەرهەمهێنەر بەپێی داواکانی بەکاربەران کالاّ و خزمەتگوزارییەکان بەرهەم دەهێنێت وە کڕیارەکان بڕیار دەدەن بە چ نرخێك کالاّ و خزمەتگوزارییەکان بکڕێت، لەم سیستەمەدا حکوومەت ناتوانێت دەست بخاتە کاروباری بەرهەمهێنەرەوە وە ناتوانێت بڕیار لەسەر بدات چی و چەند بەرهەم بهێنێت چونکە بنچینەی ئابووری ئازاد لەسەر بناغەی کەرتی تایبەت دامەزراوە بۆیە حکوومەت ناتوانێت کاریگەری راستەوخۆ لە بازاڕ بکات، سیستەمی ئابووری ئازاد تەنها سەرشۆڕی یاسا ئابوورییەکانی بازاڕە.

- سیستەمی ئابووری بەڕێوەبردنی فەرماندەیی (سوشیالیستی):- لەم سیستەمەدا دەسەلاّت بەپێی نەخشە و پلانێکی ناوەندی دیاری دەکات چی و چەند بەرهەم بهێنرێت وە هەروەها ئەرکی دابەشکردنیش دەخاتە ئەستۆی خۆی وە هەروەها نرخی کالاّ و خزمەتگوزارییەکانیش لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا دەستنیشان دەکات. واتە حکوومەت هەڵدەستێت بە رێکخستنی بازاڕ و پرۆسەی بەرهەمهێنان و بەکارهێنان، واتە حکوومەت بەشێوەیەکی راستەوخۆ دەست دەخاتە کاروبار و جموجوڵ و چالاکییە ئابوورییەکان، چونکە بیرۆکەی سیستەمی بەڕێوەبردنی فەرماندەیی لەسەر بناغەی کەرتی گشتی دامەزراوە ئامرازەکانی بەرهەمهێنان هەمووی موڵکی دەوڵەتە و گشتییە، ئەمڕۆکە تەنها سێ وڵات بەردەوامن لە بەکارهێنانی ئەم سیستەمە (کۆریای باکور، کوبا، چین) بەلاّم چین هەنگا و بەهەنگا و سیستەمەکەی دەگۆڕیت بۆ سیستەمی تێکەلاّو.

- سیستەمی ئابووری تێکەلاّو:- ئەم سیستەمە هەردوو سیستەمەکەی پێشووی لەخۆیدا کۆکردۆتەوە واتە بیرۆکەی سیستەمی ئابووری تێکەلاّو لەسەر بناغەی بیرۆکەی هەردوو سیستەمی ئابووری ئازاد و بەڕێوەبردنی فەرماندەیی دامەزراوە. لە پراکتیك کردنی ئەم سیستەمەدا زیاتر بیرۆکەی ئابووری ئازاد بەکارە، چونکە حکوومەت ناتوانێت بەشێوەیەکی راستەوخۆ بڕیاری چەندایەتی و چۆنایەتی بەرهەمهێنان لەکەرتی تایبەتدا بدات.



هەروەها بەهۆی لاوازییەوە ئامرازێکی بەهێزی بەدەستەوە نییە تاکو کاریگەری بکاتە سەر بازاڕ. حکوومەت لە چوارچێوەی ئەم سیستەمدا تەنها دەتوانێت کاریگەری بکاتە سەر چالاکی ئابووری کەرتە گشتییەکان کە خۆی خاوەنێتی جا چەند بڕی کەرتی گشتی زۆرتربێت ئەوا کاریگەری حکوومەت زیاتر دەبێت لە پرۆسەی ئابووریدا.

ئەمڕۆکە لەسەردەمی جیهانگیریدا و بەهۆی گۆرانکارییە گەورەکانی جیهان لە هەموو بوارەکاندا بەتایبەتی لە بواری ئابووریدا زۆربەی وڵاتە پیشەسازییە پێشکەوتووەکان رەچاوی سیستەمی ئابووری تێکەلاّو دەکەن، تەنانەت ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کە بەتەواوەتی رەچاوی سیستەمی ئابووری ئازاد دەکات لە (٢٨٪) ئابووری پاراستووە بۆ دەوڵەت واتە لە ٢٨٪ی ئابووری ئەمەریکا کەرتی گشتییە، وە ئەو کەرتانەش کەرتە ستراتیژییەکانی ئابوریین وەك (وزە و کارەبا و هاتووچۆ)، ئەمەش یارمەتی حکوومەت دەدات بەشێوەیەکی چالاك دەست بخاتە پرۆسەی ئابوورییەوە.

لە ئابووری ئازاددا بەرهەمهێنەر خۆی بڕیار دەدات چەند و چی بەرهەمبهێنێت، وە کڕیار سەربەستە لە کڕیندا، دەسەلاّت ناتوانێت راستەوخۆ دەست بخاتە کاروبار و چالاکی بازاڕەوە.

لەئابووری بەڕێوەبردنی فەرماندەیدا، دەسەلاّت بەهۆی پلان و نەخشە کێشانەوە کۆنترۆڵی بەرهەم و دابەشکردن دەکات.

ئابووری تێکەلاّو، ئابووری ئازاد و ئابووری بەڕێوەبردنی فەرماندەیی بە بیری جیاجیا کاردەکەنە سەر پرۆسەی بەرهەمهێنان و دابەشکردن.

هەرچی وڵاتانی تازە پێشکەوتووە هەر وڵاتەی جۆرە رامیارییەکی ئابووری گرتۆتەبەر کە هەریەکەیان جیاوازە لەوی تر ئەم وڵاتانە چەندەها جۆر سیستەمی ئابووری و شێوازی بەرهەمهێنانی تێدا بەدی دەکرێت، پێکهاتەی کۆمەلایەتی چۆنیەك و جیاوازە، بێگومان ئەم تێکەڵە و نایەك چوونە لە رووی شێوازەکانی بەرهەمهێنانەوە بۆتە هۆی ناهاوسەنگی و نایەکسانی رادەی پێشکەوتن و گەشەکردنی ئابوورییان بەپێی ئامارە نێودەوڵەتییەکان وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان رێژەی لە (٨٠٪)ی وڵاتانی جیهان پێکدەهێنن لە (بەشەکانی داهاتوودا بە دوور و درێژی باس لە ئابووری وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان دەکەین). خاڵێکی گرنگ هەیە دەمەوێت ئاماژەی پێبدەم، کۆسپی سەرەکی و گەورە لەبەردەم پەرەسەندنی وڵاتە تازە پێگەشتووەکاندا لە سەردەمی جیهانگیریدا جیاوازی نێوان ناوەندی سەرمایەداری و وڵاتانی تازە پێگەیشتووەکانە ئەمەش بۆتە هۆی کێشە بازرگانییەکان قەرز و قۆڵەی دەرەکی، پیشەسازی، راگوێزانی تەکنەلۆژیا،...هتد.

**ئاگاداری**

هیچ سیستەمێك لە سیستەمە ئابوورییەكان (ئابووری ئازاد، ئابووری بەڕێوەبردنی فەرماندەیی ئابووری تێكەڵاو) ناتوانن هەندێ كاڵا و خزمەتگوزاری بەرهەم بێنن كە زۆر پێویستە بۆ دانیشتوان، بۆ نموونە (هەوا) بەبێ هەوا ژیان كۆتایی پێ دێت، بەڵام ئەم ماددەیە خۆڕاییە و هیچ كەسێك پارەی پێ نادات. هەندێ لە ئابووریناسان دەڵێن ئەگەر هەوای ناوچەكە پاكو خاوێن بێت حكوومەت پێویستە لە شێوەی باجدا بڕێك پارە لە دانیشتوان وەربگرێت، بەڵام ئەگەر هەوا پیس بێت و زیانی هەبێت بۆ تەندروستی ئەوا حكوومەت پێویستە لەسەری بڕێك پارە وەك قەرەبووی هەواپیسی بدات بە دانیشتوان.

**فەرهەنگی ئابووری**

سەرمایەداری (capitalism): سیستەمێكی ئابوورییە كە زۆربەی بەشە ئابوورییەكان و سەرمایەی وڵات بەدەست چەند كەسانێك و ئەو دەزگا و دامەزراوانەوەیە كە دەوڵەتی نین، ئەم دەزگا و دامەزراوە ئابوورییانە هاڤركێی چالاكی ئابووری یەكتر و قازانجی زیاتر دەكەن.

نیشانەكانی سیستەمی سەرمایەداریش ئەوەیە كە هی یەك كەسە و هۆی بەرهەمهێنانیش موڵكایەتییەكی تایبەتییە و ئارەزوو قازانج لەبەرهەمهێناندا دەستێكی باڵایان هەیە و باوەڕیش وایە كە بەرژەوەندی كەسێك و بەرژەوەندی كۆمەڵ لە خۆیانەوە ناگرن و دەوڵەتیش دەستی تێ ناخات.

سیستەمی سەرمایەداری لەسەر ئەم بنچینە و باوەڕانەی خوارەوە وەستاوە:

١- هەموو كەسێك سەربەستە لە هێنانەدی بەرژەوەندی خۆیدا بەبێ دەستێخستنی دەوڵەت.

٢- بڕواهێنان كە سەربەستی لە هاڤڕێكدا و سەربەستی لە نرخبازیدا دوو هێزی شاراوەن كە سیستەمی ئابووری بەڕێوە دەبەن.

٣- بڕواهێنان بەوەی كە بەرژەوەندی هەر كەسێك لەگەڵ بەرژەوەندی كۆمەڵدا ڕێگە لە یەكتر ناگرن واتە بەیەكەوە دەگونجێن.

٤- بڕواهێنان بەوەی كە هەموو كەسێك بۆی هەیە تا بەرزترین پلەی بەختیاری بۆ خۆی بسازێنێت.

٥- قازانج چاكترین بزوێنەرە بۆ بەرهەمهێنان و پێشكەوتنی ئابووری.

٦- خەوشەكانی سیستەمی سەرمایەداری لەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا دەردەكەوێت.

أ) ناكۆكی نێوان بیروڕای تەنیاكەس و بەختیاری كۆمەڵ.



ب) نارێكی دابەشكردنی داهات و سامان.

ج) نائارامیی.

هـ) سیستەمی سەرمایەداری چینێك پێ دەگەیەنێت دەبێتە خاوەن موڵك بێ ئەوەی بەرهەمێك بدات و بەبێ ڕەنجكێشان شتیش بەكار دەهێنێت.

و) ئەم سیستەمە نەك هەر ناتوانێت جیهانێكی چاكتر دروست بكات، بەڵكو بووەتە هۆی دروستبوونی سیستەمێكی چینایەتی ڕەها كە لە هەموو ڕێیەكەوە پڕبێت لە جەوری كۆمەڵایەتی.

**فەرهەنگی ئابووری**

هاوبەشایەتی (سۆشیالیزم) Socialism:

یەكەمین قۆناغی سەردەمێكی كۆمەڵایەتی _ئابوورییە كۆمەڵگەیە كە بەپێی یاسا مایەكییەكان گەشەكردنی كۆمەڵ لە جێگەی سیستەمی سەرمایەداری جێگیر دەكات، واتە ئابووری وڵات لەسەر بنچینەی خاوەندارێتی دەستە كۆمەڵی هۆیەكانی بەرهەمهێنان دادەنرێت، لە كۆمەڵگەی هاوبەشایەتیدا دەتوانین دوو جۆرە خاوەندارێتی كۆمەڵ دەستنیشان بكەین.

١- خاوەندارێتی سەرتاسەری خەڵك یان دەوڵەت.

٢- خاوەندارێتی دەستە كۆمەڵ یان هەرەوەزییانە.

هەروەها لەم كۆمەڵگایەدا پێوەندییەكانی بەرهەمهێنان، كە پێوەندییەكی دەستە كۆمەڵییانەیە لەگەڵ خاسیەتی هێزە بەرهەمهێنەرەكان كە ئەویش دەستە كۆمەڵییە وەكو یەكن واتە هاوشانن. ئەم هاوشانییە دەبێتە هۆی بەخێرایی گەشەكردن و بەردەوامی ئابووری، هاوبەشایەتی لە وشەی (Social)ی فەرەنسییەوە وەرگیراوە كە بە مانا (دەستە كۆمەڵ) دەگرێتەوە.

هاوبەشایەتی، تیۆری یان سیاسەتێكە، كە دەیەوێ خاوەندارێتی دەستە كۆمەڵ پەیدا بێت و كۆمەڵ ببێتە خاوەنی هۆیەكانی بەرهەمهێنان.

سەرمایە و زەوی و زار و كەلوپەل و هەموو شتێكی دیكە ببێتە خاوەنی تایبەتی كۆمەڵ و بە قازانجی كۆمەڵ كاریان پێ بكرێ.

زاراوەی (Socialism) یەكەم جار لە ساڵی ١٨٢٧دا بە لایەنگرانی( ڕۆبەرت ئۆوێن )یان دەگوت.

ئابووری تێکەڵاو (Mixed Economy):

ئەو ئابورییەیە کە توخمەکانی هاوبەشی نێوان پرۆژەی تایبەتی و پرۆژەی میری دەگرێتەوە، ئابووری بەریتانیا باشترین نموونەیە بۆ ئەم سیستەمە وە هەروەها ئابووری سویدیش نموونەیەکی ترن بۆ ئەم سیستەمە.

## سێ ئابووریناس و تێورییەکانیان

هەر کۆمەڵگایەك بەهەموو رژێم و سیستەم و پەیوەندییەکانییەوە کەوتوونەتە ژێر کاریگەری رژێمی ئابووری و رێکخراوە جۆر بەجۆرەکانی بەشێوەیەك کە پەیوەندییە ئابوورییەکان دەست بکێشن بەسەر گشت پەیوەندییەکانی نێو کۆمەڵ و گشت هەڵسوکەوتێکی رۆژانەیانەوە. وە بەهۆی ئەو جیاوازیانەی نێو کۆمەڵگاکانی مرۆڤ و جیاوازی مەبەست و ئامانجەکانیان و شێوازی کارکردنیان، بۆیە بۆچوون و تێڕوانینەکانیان هەمیشە لەیەك جیاوازبوون سەبارەت بە رۆڵی (بواری ئابووری) لەژیانی مرۆڤداو گرنگی ئەو بوارە لە ئاڕاستەکردنی ئاکاریدا.

لە ئەنجامی ئەم جیاوازییانەدا چەندەها باوەڕی جیاجیا هاتنە کایەوە و هەریەکەیان دەیویست بەو جۆرە بۆچوون و شیکردنەوەیەکی تایبەتی بەخۆیانو پێشوازی لەو رووداوانە بکەن، هەریەکەیان هەوڵی خولقاندنی تیۆرییەکی تایبەتییان لەم بارەیەوە ئەدا، وەك بنکەیەکی بۆچوون و شیتەڵکردنەوە و دەستنیشانکردنی هۆکار و شێوازەکانی گەشەکردن و پێشکەوتنی کۆمەڵگاکانیان و ئاسۆییەکی ئابووری و رامیاری و کۆمەڵایەتی ئەو پاشەڕۆژەیان پێ رەچاو بکەن.

لە نێوەندی ئەمانەشدا لەهەرە دیارترین و زانایانی ئابووری دەتوانین تەنها سێ کەڵە زانا دەستنیشان بکەین و لە تێورییەکانیان بکۆڵینەوە، ئەوانەش بریتین لە:

**(ئادەم سمیت، کارل مارکس، جۆن ماینارد کینز).**

بێگومان تێورییە ئابورییەکان و بۆچوونە ئابورییەکانو کۆمەڵایەتییەکانی ئەم سێ کەڵە زانایە تاکو ئەمڕۆکەش وەکو بنچینەیەکی بنەڕەتی و سەرەکی بەکاردەهێنرێت.

ئێستاکە با بزانین ئەو کەڵە زانایانە کێن و چیان بەرهەمهێناوە.



**- ئادەم سمیت (١٧٢٣ - ١٧٩٠):**

ئابووریناس و فەیلەسوفێکی سکۆتلەندییە، یەکێکە لەو ئابووریناسانەی کە بانگەشەی بۆ ئابووری ئازاد کردووە کە ئەمڕۆکە جیهان پەیڕەوی دەکات. لە کتێبەکەیدا کە ناوی (سامانی نەتەوەکانی) لێنا، لە ساڵی (١٧٧٦)دا بڵاوی کردەوە، بە ئاشکرا و روونی باسی ئابووری ئازاد دەکات.

لەهەرە گرنگترین بیروراکانی سمیت تێوری بەهایە، ئاستی بەرهەمهێنان، دابەشکردنی کار، ئاڵوگۆڕکردن، بەهای بەکارهێنان، بەهای ئاڵوگۆڕ، داوا و خستنەڕوو.

ئادەم سمیت چەندان نموونە لە کتێبەکەیدا دەهێنێتەوە بۆ سەلماندنی یاسای داوا و خستنەڕوو وە هەروەها سەلماندنی ئابووری ئازاد بە بۆچوونی ئادەم سمیت هەریەکەیەکی بەرهەمهێنەر و بەکاربەر بەبێ ئاگا لە یەکتر چالاکی دەنوێنن. بۆ نموونە قەساب، نانەوا، بەرهەمهێنەری مۆم. هەریەکە کاری خۆی دەکات و بەرهەم دەهێنن بەو بڕ و قەبارە وچەندایەتی وچۆنیەتییەی کە بە پێویستی دەزانێت، لە هەمان کاتدا هەریەکەیان بەرهەمی یەکتری بەکاردەهێنن بەو بڕەی کە پێویستیانە. کەسیان ئامۆژگاری یەکتر ناکەن، وە کەسیش پێیان ناڵێت چەند بەرهەمبهێنن وە چەند بەکاربهێنن ئەمەش واتە ئابووری ئازاد.

ئادەم سمیت بەهۆی ئەم ئەنجام گەیشتنەوە بناغەی قوتابخانەی ئابوریی کلاسیکی دامەزراند لێرەشەوە باوەڕی سمیت وابوو کە نابێ دەوڵەت دەست لەکاروباری ئابووری وەربدا، چونکە دەوڵەت دام و دەزگایەکی بەرهەمهێن نییە و سامان بەفیڕۆ دەدا. چونکە تەنها (دەستی شاراوە) واتە یاسای داوا و خستەڕوو دەتوانێت دەستنیشانی بڕ و قەبارەی بەرهەم و بەکارهێنان دیاری بکات.

زۆربەی بۆچوون و لێکۆڵینەوەکانی ئادەم سمیت هەتاکو ئەمڕۆکەیش جێگەی مشتومڕ و گفتوگۆیەکی زۆرن لە نێوان ئابووریناساندا.

**- کارل مارکس (١٨١٨ – ١٨٨٣):**

ئابووریناس و سیاسەتمەدارێکی ئەڵمانییە. یەکێکە لەو ئابووریناسانە و سیاسەتمەدارانەی کە بانگەشەی شۆڕشی پرۆلیتاریا و کرێکارانی کرد دژ بە سەرمایەداران. خاوەنی تێوری چەوساندنەوەیە. مارکس ئاماژەی بەوە کرد کە بەهای زیادە لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا بەدەست ناکەوێت، بەڵکو لە چەوساندنەوەی کرێکاردا بەدەست دەکەوێت. ئەم تێورییە مارکس لە کتێبە ناوبانگەکەیدا (سەرمایە) کەساڵی (١٨٦٧) بڵاوی کردەوە بە شێوەیەکی ورد و درشت دایڕشتووە. کارل مارکس چەندان نموونەی لە کتێبەکەیدا دەهێنێتەوە بۆ سەڵماندی تێوری بەهای

زیادە و مارکس لەسەر بنچینە ئابوورییەکان سەلماندویێتی کە مێژووی مرۆڤایەتی بریتییە لە تێکۆشانی چینایەتی لە نێوان چینی چەوساوە و چەوسێنەرەکانەوە.

مارکس بۆ یەکەمجار پرۆسەی چڕبوونەوەی سەرمایەی شیکردەوە و رایگەیاند (کێبەرکێی سەرمایە بەدوای خۆیدا سەرمایەی مۆنۆپۆلی دەهێنێ)، وە پاشان بەهۆی شیکردنەوەی ناوەڕۆکی کەڵەکە بوونی سەرمایە، زیاتر چڕبوونەوەی شیکردەوە سەلماندی کە چۆن چۆنی لە ئەنجامی ئەم پرۆسەیەدا سەرمایە دەبێتە سەرمایەی مۆتۆپۆڵی کەواتە مارکس یەکەم ئابوورنیاس بوو کە بەهۆی دۆزینەوەی تێوریایی چڕبوونەوەی سەرمایە و شیکردنەوەی ئەم تێورییە پێشبینی جیهانگیری ئابووری کردووە. کارل مارکس توانی زانستییانە دەروازەکانی پەرەسەندنی سەرمایە هەڵبسەنگێنێ وە پەیوەندی ئۆرگانی ئیمپریالیزی بە جیهانگیرییەوە گرێدا.

دوابەدوا مارکس دەر ئەنجامی ئەو بۆچونانەی کرد کە زوویان درەنگ قۆناغی سەرمایەداری بە هەموو شێوازەکانییەوە کۆتایی پێدێت و قۆناغی سۆشیالیزم دەست پێدەکات، کە چینی پرۆلیتاری و خەڵکی دەبن بە خاوەنی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و بەمەش بانگەشەی بۆ بەگشتکردنی ئابووری کرد وە بانگەشەی بۆ کۆمەڵێك کرد کە چەوسانەوەی تیا نەبێت. ئەوەبوو بەهۆی تێوری و بۆچوونەکانی مارکس لە پراکتیکدا لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا کەمپی سۆشیالیستی بە سەرۆکایەتی یەکێتی سۆڤیەت دامەزرا (رووخان و رماندنی ئەم سیستەمە باسێکی تایبەتی دەوێت). ئەوە بوو بۆ بەدرێژەدانی تێورییەکانی کارل مارکس، لێنین یەکەم وڵاتی سۆشیالیستی دامەزراند و سیستەمی بەڕێوەبردنی فەرماندەیی چەسپاند. بێگومان سیستەمی بەڕێوەبردنی فەرماندەیی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤی خۆی هەیە. کە لێرەدا شوێنی باسی نییە. هەرچەندە تێورییەکانی مارکس لە پراکتیکدا تاڕادەیەك سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا و بەڵام مارکس توانی لایەنە لاوازەکانی سیستەمی سەرمایەداری بخاتەروو کە سەرمایەداران سودێکی زۆری لێ وەردەگرن ئەوەتا هەتاکو ئەمڕۆکەش جیاوازی چینایەتی بۆتە هۆی کۆسپێکی گەورە لە هەموو کۆمەڵگایەکدا هەرچەندە ئەم جیاوازییە شێوازی تازەی وەرگتووە بەڵام ناوەڕۆکی مەسەلەکە نەگۆڕاوە کە مارکس باسی لێکردووە.

### - جۆن ماناردکینز (١٨٨٣ - ١٩٤٦):

ئابووریناس و پسپۆڕی دارایی ئینگلیزییە بۆ مەبەستی دۆزینەوەی رێگا چارەیەك بۆ تەنگژەی ئابووری سەرمایەداری لە سەرەتای ساڵەکانی سەدەی بیستەمدا هاتە مەیدانی تێوریزەکردنەوە.

(کینز) بۆچوونی وابوو کە دەبێت دەوڵەت خۆی بێتە لایەنێك لە ئابووری نەتەوایەتیدا، واتە دەبێ دەوڵەت بۆ چارەسەرکردنی حاڵەتی بێ بازاڕیی دەخالەت لەسەر پاکی جموجۆڵی ئابووریدا بکا بە پێچەوانەی بۆچوونەکانی ئادام سمیت و کارل مارکسەوە. پوختەی تێورەکەی کینز لەو کتێبەدا



بڵاوکردۆتەوە کە ناوی (تێورە گشتییەکانی بێکاری، سوود ، دراو) لێنا، لەم کتێبەدا کنیز دەیسەلمێنێت.. کاتێك پرۆسەی ئابووری نەیتوانی خۆبەخۆ گەشە بکاتەوە و لە دۆخی بێ بازاڕیی رزگاری ببێ، پرۆسەی پەرەسەندنی گەشە بە خۆیان بدەن و سەرمایە بەگەر بخەن، لە حاڵەتێکی وادا دەبێ دەوڵەت رۆڵی خۆی ببینێ و دەخالەت بکا و سەرمایە بخاتە کارەوە، کاتێکیش پرۆسەی پەرەسەندنی گشتیی بەرادەیەك باش گەشە دەکا و ئاستی بەرهەمهێنان تێدەپەڕێنێ. دەبێ دەوڵەت رێگای پترکردنی داهاتی باج بگرێتەبەر وە بەم هەڵوێستەش دوو ئەنجام دەپێکێت.

رێگا لە هەڵئاوسانی دراو دەگرێ، وە پارە و پولێکی زۆریش لە رێگەی باجەوە کۆدەکرێتەوە، ئەو قەرزانە پڕدەکاتەوە کە لەکاتی بێ بازاڕیدا خەرجکراون لەبەر رۆشنایی تێورییەکانی (کنیز)دا دەوڵەتانی سەرمایەداری کەوتنە پشتگیری ئەو پیشەسازییانەی کە خێراتر پەرە بە ئابووری دەدەن و زۆرترین ژمارەی هێزی کاریان تێدا بەگەڕ دەخرێ، بۆ نموونە لە ساڵەکانی سییەکانی سەدەی بیستەمدا رێژەی بێکاری لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا گەیشتبووە (٢٥٪) ئەگەر بە روونی بڕوانین لە تیۆرییەکانی کینز بۆمان دەردەکەوێت کە نەپشتگیری لە فراوان بوونی موڵکایەتی دەوڵەت دەکات وە نەدژی کەرتی تایبەتە. تەنها مەبەستی (کنیز) رزگارکردنی ئابووری سەرمایەداری بوو لە رێگای دەست تێوەردانی دەوڵەتەوە.

بەهۆی بەرپابوونی جەنگی جیهانی دووەمەوە تێورییەکانی (کینز) نەتوانرا بەشێوەیەکی فراوان لە پراکتیکدا بەکار بهێنرێت. دوابەدوای ئەوە زۆری تری ئابووریناسان بڕە و گەشەیان دایە بۆچوونەکانی (کنیز) وە بنچینەی تێورییەکانی کنیز بوون بەسەرتایەك بۆ هێنانە کایەی سیستەمێکی نوێی دراو. وە لە پراکتیکدا بوو بەهۆی دامەزراندنی سندوقی دراوی نێودەوڵەتی وە هەروەها دوابەدوا (بانکی نێودەوڵەتان) دامەزرا.

بە کورتی ئەگەر دەرئەنجامی بۆچوونەکان ئەو سێ ئابووریناسە بکەین دەتوانێن بڵێین.

(ئادەم سمیت) توانی بنەما سەرەکییەکانی زانستی ئابووری دادەمەزرێنێت.

(کارل مارکس) توانی مەودا و زەرەر و زیان و لاوازی و لایەنە نەگەتیڤەکانی سیستەمی ئابووری ئازاد (سەرمایەداری) ئاشکرا بکات.

(جون ماینارو کنیز) توانی سەرەتایەك بۆ ئابووری سیاسی دابڕێژێت.

### فەرهەنگی ئابووری

ئادەم سمیت بنەما سەرەکییەکانی سیستەمی ئابووری ئازاد (سەرمایەداری) دامەزراند. کارڵ مارکس بنەما سەرەکییەکانی سیستەمی بەڕێوەبردنی فەرماندەیی (سۆشیالیزم)ی دامەزراند.

جۆن کنیز بنەما سەرەکییەکانی سیستەمی ئابووری تێکەڵاوی دامەزراند.

# فەسڵی دووەم

## تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی

وابزانم هەریەکە لە ئێوە دەتوانێت وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە, ئایا چـۆن گۆشـتی (گایـەکی گەورە ) دەخورێت..؟ بێگومان پێویستە گاکە (پارچە پارچە بکرێت) دوای ئەوە دەتوانین سوود لە پارچە گۆشتەکان وەربگرین بۆ شلە، بۆ برژاندن بۆ سوورکردنە و..هتد.

تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی یان ئابووری نەتەوەیی وەك ئەو گایە وایە بەیەك پارچەیی ناتوانین بزانین چییە پێویستە بـەش بەشـی بکـەین، ئەوکاتـە بەتوێژینـەوە و لێکۆڵینـەوەی هەربـەش و کەرتێکی ئابووری دەتوانین لە ناوەڕۆکی ئابووری نەتەوەیی تێبگەین.

دەمەوێت خاڵێکی گرنگی بخەینەوە بیری خوێنەر، ئەو خاڵەش بریتییە لەوەی کە مـرۆڤ واتە خەڵکی کە ئێمەین تـەوەری سـەرەکی هـەموو جموجـوڵ و چـالاکییە ئابوورییـەکانن، هەموو شتێك لەناوی مرۆڤ و لەپێناو خۆشی مرۆڤدا دەکرێت. مـرۆڤیش هەڵدەسـتێت بـە هەموو کارەکـان، کەواتـە مـرۆڤ چـەقی ناوەنـدی چـالاکییە ئابوورییەکانـە تـەنها مـرۆڤ بڕیاردەدات چی و وە چەند وە چۆن بەرهەم بهێنرێت وە تەنها مـرۆڤ دەستنیـشانی بـەها و نرخەکانی بەرهەمەکان دەکات.

هەرچی ئامێر و تەکنەلۆژیا و دام و دەزگا ئابووری و حکومییەکانە رۆڵی دووەم سێیەم دەبینێت لە چالاکی ئابووریدا رۆڵی سەرەکی تەنها مرۆڤ دەیبینێـت کەواتـە هـەر مـرۆڤ دەتوانێـت کاریگـەری و کۆنترۆڵی پرۆسە ئابورییەکان بکات بەڵام بەداخەوە هەندێ جار رۆڵی خۆمان بیردەچێتەوە.

چـەند بەرهـەم بهێنرێـت، چـەند سـەرمایە پێویـستە چـۆن بەرهـەم و داهاتـەکان دابەشبکرێت..هتد بە واتایەکی تر بەرهەمی نەتەوەیی چۆن پێـك دەهێنرێـت لـەم فەسـڵەدا هەوڵ دەدەین بەشێوەیەکی ساکار و ئاسان چۆنیەتی پێکهێنانی پرۆسەی تێکرایـی بەرهـەمی نەتەوەیی روون بکەینەوە.



## تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی واتە ئابووری دەوڵەت (G.N.P)

(Gross National Product)

کاتێك سیاسـەت مـەداران و ئـابووری ناسـان دەڵـێن (هێـزی ئـابووری چـەکی سیاسـییە) مەبەستیان لە سەروەت و سامانی نەتەوەییە، چونکە دەسەڵاتی سیاسی هەر نەتەوەیەك بەندە بەو سەروەت و سامانەوە کە هەیەتی. لەبەر ئەوە مەسەلەی بەرهەم و دەستهاتی نەتەوەیی لە یـەکالا کردنەوەی ئابووریدا زۆر گرنگە چونکە تێکڕایی بەرهەمی نەتەوەیی کام وڵات بگرێت پلە و پایەی ئابووری نەتەوەیی ئەو وڵاتـە و مـەودای بـەرەوپێش چـوون و پەرەسـەندنی ئـابووری ئـەو وڵاتـە دەنوێنێ. ئێستا هـەوڵ دەدەیـن بـە شـێوەیەکی دووروودرشـت لـە تێکـڕای بەرهـەمی نەتـەوەی بکۆڵێتەوە و پێکهێنەرە بنەڕەتییەکانی لێك شیبکەینەوە و لـە رێگـا و چـۆنیەتی ژمێرکـردن و پێوانەکردنی شارەزابین.

کەواتە تێکڕایی بەرهەمی نەتەوەیی چییە؟ بریتییە لە بەهای نەختینەیی پوختەی کالا و خزمەتگوزارییەکان کە بەرهەم هێنراون لە ماوەیەکی دیاریکراودا واتە لە ساڵێکدا. یـان دەتـوانین بڵـێن بریتییـە لـە کـۆی گـشتی بـڕی خەرجییـەکانی نـاوەوەی وڵات بـۆ کـالا و خزمەتگوزارییەکان لە ماوەی ساڵێکدا. زۆربـەی ئابووریناسـان بازرگـانی دەرەکـی واتـە ناردنە دەرەوەی کالا و خزمەتگوزارییەکان بە پێکهاتەیەکی گرنگـی بەرهـەمی نەتـەوەیی دادەنێن. کەواتـە ئێـستاکە دەتـوانین تێکڕایـی بەرهـەمی نەتـەوەیی لـەم هاوکێـشەیەی خوارەوەدا نیشان بدەین.

هاوکێشەی تێکڕایی بەرهەمی نەتەوەیی:

$$\{G.N.P = C + I + G + (Ex. - Im)\}$$

G.N.P- تێکڕایی بەرهەمی نەتەوەیی.

C- کۆی گشتی هەموو خەرجی دانیشتوان.

I- کۆی گشتی هەموو سەرمایە گوزارییەکان.

G- کۆی گشتی هەموو خەرجییەکانی حکوومەت.

Ex. – Im. - کۆی پوختەی ناردنە دەرەوەی کالا و خزمەتگوزارییەکان.

بۆ نموونە تێكڕای بەرهەمی نەتەوەیی {(C+I+G) + (EX - IM)} ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا نزیكەی (١٠) ترلیۆن دۆلارە واتە ئەمریكا لە ماوەی ساڵێكدا بە بڕی (١٠) ترلیۆن دۆلار كاڵا و خزمەتگوزاری بەرهەمهێناوە※.

ئێستاكە یەكە یەكە بڕگەكانی هاوكێشەكەی سەرەوە ڕوون دەكەینەوە.

پێكهاتەی تێكڕایی بەرهەمی نەتەوەیی ئەمریكا بەم شێوەیە دابەش بووە.

| | | |
|---|---|---|
| بڕگەی | (C) | ٦٥٪ |
| بڕگەی | I | ١٥٪ |
| بڕگەی | G | ٢٠٪ |
| بڕگەی | Ex. – Im. | ٠ |
| هەمووی | | ١٠٠ ٪ |

كەواتە خەرجییە گشتییەكانی خەڵكی ئەمەریكا ڕێژەی (٦٥٪) هەموو بەرهەمی نەتەوەیی پێكدەهێنێت بەڵام سەرمایەگوزاری تەنها لە (١٥٪) وە خەرجییەكانی حكومەت (٢٠٪) ئەگەر ئەو ئامارەی سەرەوە كەمێك تاوتوێ بكەین. دەبینین خەرجی گشتی دانیشتوان بڕگەی (C) ڕێژەكەی لەوانی تر زیاترە بۆچی، چونكە دانیشتوان واتە كڕیار داهاتێكی بەرزی هەیە بۆیە دەتوانێت خەرجییەكی زۆربكات لە كڕینی كاڵا و خزمەتگوزارییەكاندا ئەمەش واتە ئەو وڵاتە ئابوورییەكی پەرەسەندن و گەشەكردوویی هەیە. وە كاتێك سەرمایەگوزاری بڕگەی (I) زیاد دەكات واتە كۆمپانیاكان خەرجییەكانیان زیاتر دەكات لە دروستكردندا، كڕینی ئامێر و تەكنۆلۆژیای نوێ بۆ بەرهەمهێنان، كڕینی زیاتر مەوادی خاو و، ئەمەش دەبێتە هۆی زیادەی بەرهەم واتە ئابووری وڵات بەگشتی بەرەو گەشەكردن دەچێت، كاتێك خەرجییەكانی حكوومەت زیاد دەكات واتە بڕگەی (G)، ئەوكاتە حكومەت دەتوانێت ڕێگاوبان و باخچەكان زیاتر دروست بكات دەتوانێت زیاتر خەرجی بكات لە بەرنامە كۆمەڵایەتییەكاندا لە كردنەوەی خوێندنگا و خەستەخانە. دەتوانێت مووچەی فەرمانبەران و خانەنشینی زیاد بكات ئەمەش واتە ئابووری وڵات لە ئاستی گەشەكردندایە.

※ لەم نوسینەدا زۆربەی نموونەكانمان لەسەر ئابووری ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بەكارهێناوە، لەبەر ئەوەی ئەمڕۆكە ئەمریكا مەزنترین هێزی ئابووری جیهانە، وە هەروەها ئامارێكی چڕوپڕ و تەواو دەربارەی ئابووری ئەمریكا لەبەردەستدایە.



**فەرهەنگی ئابووری**

تێكڕای بەرهەمی نەتەوەیی: بریتییە لە كۆی گشتی هەموو خەرجییەكان (بەهای كاڵا و خزمەتگوزراییەكان) لە ناوەوەی وڵات لە ماوەی ساڵێكدا. هاوكێشەی تێكڕای بەرهەمی نەتەوەیی بریتییە لە:

$$\{G.N.P = C + I + G + (Ex. - Im)\}$$

كاتێك:-

C- كۆی گشتی هەموو خەرجی دانیشتوان.

I- كۆی گشتی هەموو سەرمایە گوزارییەكان.

G- كۆی گشتی هەموو خەرجییەكانی حكوومەت.

Ex. – Im.- كۆی پوختەی ناردنە دەرەوەی كاڵا و خزمەتگوزارییەكان.

## بەكاربەرەكان (كڕیار) (C)

مەبەست لە بەكاربەران واتە كڕیار هەموو دانیشتوانی وڵاتەكەیە لە خەرجكردنی داهاتەكانیان بۆ جێبەجێ كردنی پێداویستییەكانی لە هەموو بوارەكاندا، بەپێی سەرنجی ئابورینناسان كۆمەڵگای ئەمەریكی بە كۆمەڵگایەكی بەكاربەر لە قەڵەم دەدەن چونكە دانیشتوانی ئەمەریكا خەرجییەكی زۆر دەكەن بە ڕادەیەك كە دەتوانن تا ئاستێكی دیاریكراو هەموو داوا و خواستەكانی جێبەجێ بكەین هەروەك لە پێكهاتەی تێكڕای بەرهەمی نەتەوەیی نیشتمانیدا ڕێژەی خەرجی دانیشتوان ڕێژەكەی لە (٦٥٪)ی تێكڕای بەرهەمی نەتەوەیی پێك دهێنێت. بەڵام دانیشتوانی ژاپۆن زیاتر هەوڵی پاشەكەوت كردن دەكەن وەك لە بەكارهێنان..هتد چەند فاكتەرێكی گرنگ كاریگەری ڕاستەوخۆیان هەیە لەسەر چالاكی بەكاربەران بە گشتی ئەو فاكتەرانەش بریتین لە:

- بڕی ژمارەی دانیشتوان.
- ڕادەی بێكاری.
- بڕی داهات.
- ڕێژەی سودی قەرز و باج.

ئێستا لە خوارەوە هەریەك لەو فاكتەرانە ڕوون دەكەینەوە.

– بڕی ژمارەی دانیشتوان: چەند ژمارەی دانیشتوان زۆرتربێت پێویستی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان زیاتر دەبێت، زیاد بوونی ژمارەی دانیشتوان بەرە بەرە یان بە کوتوپڕی دەبێتە هۆی زیادبوونی داوا بۆ نموونە بە کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم بەهۆی گەڕانەوەی سەربازەکان بۆ وڵاتەکانی خۆیان بەشێوەکی کتوپڕی بووە هۆی زۆربوونی ژمارەی دانیشتوان، بێگومان هەر بە گەڕانەوەی سەربازەکان ڕێژەی دروستبوونی خێزان زیادی کرد بەپێی ئامارەکان لە ساڵی (١٩٤٦) تاکو ساڵی (١٩٦٥) ژمارەی دانیشتوان و خێزانەکان زۆر زیادیان کرد واتە ژمارەی بەکاربەرەکان زیاد بوون ئەمەش بووە هۆی زیادبوونی خەرجی دانیشتوان چونکە خێزانێکی نوێ پێویستی بە خانووی جیا هەیە کەواتە داوا لەسەر خانوبەرە زیاد دەکات کەواتە کەرتی بیناسازی بەرەو بوژانەوە دەچێت، بێگومان هەموو خێزانێك جگە لە خانوو پێویستی بە ناوماڵە هەر لە فەرش، رایەخەرە تاکو تەلەفزیۆن و قەنەفە و ئامرازی ساردکردنەوە و قاپ و قاچاخ... هتد.

کەواتە داوا لەسەرتاپای کاڵا و خزمەتگوزارییەکان زیاد دەکات لەبەر ئەوە ئابوریناسان زۆر بەوردی دەکۆڵنەوە لە زیادبوونو کەم بوونەوەی ژمارەی دانیشتوانو تەمەنی دانیشتوان چونکە لە پێشبینیکردنو نەخشەکێشانی ئابووریدا فاکتەری ژمارەی دانیشتوان کاریگەریەکی راستەوخۆیان هەیە لە گەشەکردنو داشکانەوەی ئابووری نیشتمانیدا زربەی ئابووریناسان فاکتەری ژمارەی دانیشتوان تەمەنی دانیشتوان بە دایلەمۆی پێشکەوتنە ئابورییەکان لە قەڵەم دەدەن.

**فەرهەنگی ئابووری**

داینەمۆی (وزەی) ئابووری: پێرستی پێوەرکردنی ئەندازەی گەشەکردنی ئابوریە وە هەروەها بەهۆیەوە رادەی داهات، بڕی خەرجکردن، ژماری بێکاری، ژمێر دەکرێت، واتە یەکێکە لە پێرستە ئابورییەکان کە بەهۆیەوە دەتوانن بزانین چی روودەدات لە بارودۆخی ئابوورییدا، وەهەروەها بەهۆیەوە دەتوانین پێشبینیکردنی گۆڕانکارییە ئابوورییەکان بکەین.

**– رادەی بێکاری:**

بێگومان چەند داهات زۆرتربێت، خەرجییەکان زیاتر دەبێت بەڵام بۆ ئەوەی داهاتی هەبێت پێویستە سەرقاڵی ئیشکردن بین واتە سەرچاوەی داهات کارکردنە جا ئەو داهاتە لە شێوەی کرێی کار دابێت یان مووچەی مانگانە یان کاری سەربەست بە دەست بکەوێت هەمووی بە سەرچاوەی داهات دەژمێرێت کەواتە چەند دانیشتوان سەرقاڵی کارکردن بن واتە رێژەی بێکاری



لەنێو دانیشتواندا کەم دەبێتەوە کەمی بێ کاریش دەبێتە هۆی سەقامگیری کۆمەڵایەتی و سیاسی وڵاتەکە زۆر بوونی داهاتی خەڵکی دەبێتە هۆی زیادبوونی کڕیار و بەکارهێنان ئەمەش دەبێتە هۆی گەشەکردنی ئابووری خۆی لەخۆیدا دیاردەیەی کەم بوونەوەی بێکاری واتە هەموو کەرتە ئابورییەکان لە چالاکیدان چونکە شوێنی کار دابین کراوە بۆ هەموو ئەوانەی خواستی کارکردنیان هەیە چەند شوێنی کار لە دامو دەزگاو کارگەکاندا زیاتربێت ژمارەی بێ کاری کەم دەبێتەوە و داهاتی گشتی دانیشتوان زیاد دەکات.

**ئاگاداری**

سەرقاڵی تەواو: ئەوکاتە روودەدات کە بێکاری نەمێنێت واتە ئەوانەی پێویستیان بەکارە دەتوانن بە ئاسانی شوێنی کار بدۆزنەوە ئابووریناسان رێژەی (٤٪) بێکاری بەسەرقاڵی تەواو ئەندازە دەکەن، چونکە رێژەی لە (٤٪) ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە شوێنی کارکردن دەگۆڕن یان لە گەڕاندان بەدوای کاردا بەپێی پسپۆڕییان.

**– بڕی داهات:**

داهات ئەو بڕە پارەیەیە کە خەڵکی لە ئەنجامی کاکردندا یان لە ئەنجامی بەگەڕخستنی سەرمایەدا دەستیان دەکەوێت. سەرچاوە سەرەکییەکانی داهات بریتییە لە کرێی کار، مووچەی مانگانە، بەخشیش، خانەنشینی، یارمەتی کۆمەڵایەتی، رێژەی سوود لە پاشەکەوتکردنی پارە، سوودی شەیرەکان مولکانەی زەوی،...هتد. زیادبوونی داهات دەبێتە هۆی زیادکردنی خەرجییەکانو زیادبوونی داهات دەبێتە هۆی زیادکردنی خەرجییەکانو زیادبوونی بڕی پاشەکەوتکردن. واتە پتر بوونی داواکان کە دەبێتە هۆی گەشەکردنی ئابووری لە وڵاتدا. خەڵکی داهاتەکانیان یان خەرج دەکەن یان پاشەکەوت دەکەن لە هەردوو حاڵەتەکەدا کاریگەری پۆزەتیفانەی هەیە لەسەر باری ئابووری (لە بەشی دووەمدا بە درێژایی باس لەم پەیوەندییە دەکەین) زۆربوونی داهات بڕی پارە زیاددەکات لە گیرفانی خەڵکیدا، کەواتە ئەو پارەیە یان خەرج دەکرێت یان پاشەکەوت دەکرێت واتە بڕگەی (C) لە هاوکێشەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوایەتیدا زیاد دەکات واتە ئابووری نەتەوەیی بەرەو گەشەکردن دەڕوات. خاڵێکی گرنگ هەیە کە دەمەوێت سەرنجی خوێنەری بۆ رابکێشم ئەویش ئەوەیە کاتێك بڕی رێژەی پاشەکەوتکردن زیاتربێت لە خەرجکردن ئەوا بڕگەی (I) سەرمایەگوزاری پتر دەبێت، کەواتە هاوسەنگی هاوکێشەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی ناگۆڕێت.

داهاتی پاك: ئەو برە پارەیەیە کە خەڵکی لە ئەنجامی چالاکی ئابووریدا دەستیان دەکەوێت دوای پاککردنەوەی لە باج، داهات یان خەرج دەکرێت، یان پاشەکەوت دەکرێت لە هەردوو حاڵەتەکەدا برگەی (C) هاوکێشەی تێکرای بەرهەمی نەتەوەیی زیاد دەکات. واتە دەبێتە هۆی گەشەکردنی باری ئابووری وڵات.

**- رێژەی سوودی قەرز و باج:**

رێژەی سوودی قەرز و باج دوو فاکتەری گرنگن لە بوژانەوە و گەشەکردنی بەکاربردندا. دانیشتوانی وڵاتە پێشکەوتووەکان بەشێوەیەکی زۆر چالاکانە پەنا دەبەنە بەر قەرزکردن بۆ جێبەجێکردنی پێویستییەکانیان بە تایبەتی لە کڕینی خانووبەرە و ئۆتۆمبێل و پێویستییە درێژخایەنەکانی تر. (چونکە سیستەمی دارایی‌و بانك لەو وڵاتانەدا پێشکەوتووە کە لەبەشەکانی تردا باسیان لێ دەکەین(. چەند رێژەی سوودی قەرز نزم بێت ئەوا خەڵکی دەتوانن زیاتر قەرزبکەن، واتە بڕی پارە زیاتر دەبێت لای دانیشتوان کە سەرچاوەکەی قەرزە مانگانە لە مووچە و داهاتەکانیان دەگێرێتەوە بۆ بانکەکان کەواتە کەمی رێژەی سوود کاریگەرییەکی راستەوخۆی هەیە لە پرۆسەی ئابووریدا بەتایبەتی لە چالاکی بەکاربردندا. هەموو داهاتێك باجی لەسەرە کە پێی دەوترێت (باجی داهاتی تایبەتی) بێگومان کەم بوونەوەی رێژەی باج لەسەر داهاتەکان جارێکی تر دەبێتە هۆی زیادبوونی داهات‌و پارە لەلای دانیشتوان. خاڵێکی گرنگ هەیە کە دەمەوێت ئاماژەی پێ بدەم لە زۆربەی وڵاتەکاندا رادەی باجی داهات زۆر بەرزە، چونکە حکومەت بەهۆی سیاسەتی دارایی و قەرزەوە بەرزکردنەوەی باجی داهات بودجەی گشتی پێ دەوڵەمەند دەکات ئەمەش کاریگەری نێگەتیڤانە ناکاتە سەر هاوکێشەی تێکرای بەرهەمی نەتەوەیی بە مەرجێك ئەگەر بڕی ئەو باجانە خەرج بکرێتەوە لە بەرنامە کۆمەڵایەتیەکاندا ئەمەش پێی دەوترێت خەرجی گشتی حکومەت لە هاوکێشەکاندا بە برگەی (G) دیاریان کردووە.

**ئاگاداری**

باجی داهات: لە زۆربەی وڵاتە پێگەیشتووەکاندا رادەی باجی داهات زۆر بەرزە، بە تایبەتی ئەو وڵاتانەی کە ئاراستەیەکی کۆمەڵایەتییان لە سیاسەتی ئابووریدا رەچاو کردووە بۆ نموونە باجی داهات لە سوید بەپێی داهات بەرز دەبێتەوە، چەند داهات زۆرتربێت باجەکەی زیاتر دەبێت هەندێ جار دەگاتە رێژەی (٨٠٪)، لە ئەمەریکا رێژەی باجی داهات لە نێوان



(١٣٪) تاکو لە (٣٦٪) دەبێت، لە نەرویج رێژەی باجی داهات لە نێوان (٣٠٪) تاکو (٦٥٪) دەبێت. لە عەرەبستانی سعودی رێژەکە لە ١٪ دەبێت.. هتد.

## سەرمایەگوزاری (I)

وشەی سەرمایەگوزاری چەند مانایەکی هەیە بۆ نموونە کڕینی شەیر لە بۆرسەکاندا بەمەبەستی دەستکەوتنی قازانج دوای فرۆشتنەوەی پێی دەوترێت سەرمایەگوزاری، دانی پارەدان لەلایەن خوێندکارەوە بە زانکۆکان واتە پارەی خوێندن ئەمەش پێیدەوترێت سەرمایەگوزاری لەپیناوی پاشەرۆژدا واتە (سەرمایەگوزاری خودی)، خەرجکردن‌و کڕینی ئامێر و تەکنۆلۆژیاو کارگەکان لەلایەن سەرمایەدارانەوە واتە بەگەڕخستنی سەرمایە لە بواری بەرهەمهێناندا ئەمەش پێیدەوترێت سەرمایەگوزاری، ئێمە لێرەدا باس لەم جۆرە سەرمایەگوزارییە دەکەین واتە (بەگەڕخستنی سەرمایە لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا)، هەرچی جۆرەکانی تری سەرمایەگوزاری لە هاوکێشەی تێکرای بەرهەمی نەتەوەیدا دەچنەوە سەر برگەی (٢) وەك خەرجی گشتی دانیشتووان. واتە سەرمایەگوزاری ئەو پرۆسەیەیە کە لەئەنجامی بەگەڕخستنی سەرمایەدایە دەتوانێت کاڵا و خزمەتگوزاری بەرهەم بهێنێت لەپێناوی دەستکەوتنی قازانجدا. چەند فاکتەرێکی گرنگ دەبنە هۆی هاندانی سەرمایەگوزاری لەو فاکتەرانەش:

- بڕی سوودی قەرز و باج.
- پێویستی سەرمایە.
- بوونی تواناکان.

ئێستا لەخوارەوە هەریەك لەو فاکتەرانە باس دەکەین.

**بڕی سوودی قەرز و باج**

ئەگەر بەوردی سەرنج بدەین دەبینین بڕی سوودی قەرز و باج یەکەم فاکتەرە، بەڵام لەحاڵەتی بەکاربردندا کە لەپێشەوە باسمان لێکرد دواهەمین فاکتەرە بۆچی؟ چونکە سەرمایەگوزاری زیاتر هەستدارترە بەرامبەر رێژە و بڕی سوودو قەرزو باج وەك لەبەکاربەران (کڕیاران). لەبەرئەوەی کڕیار لەهەموو حاڵەتێکدا زۆر بیرناکاتەوە لەکاتی خەرجکردنی داهاتەکانیدا، بەڵام سەرمایەدار پێش ئەوەی سەرمایەکەی بەگەڕبخات پێویستە بیرێکی قووڵ و پلانێکی گونجاو دابڕێژێت چونکە هەموو سەرمایەگوزارێك ئامانجەکەی لەبەگەڕخستنی سەرمایەدا دەستکەوتنی زۆرترین قازانجە.

سەرمایەگوزار پێش بەگەڕخستنی سەرمایە قازانجی گشتی و راستەوخۆ ژمێرناکات بەڵکو پێویستە رێژەی قازانج ژمێربکات ئەو رێژەیەش بریتییە لە بڕی قازانج لەسەروو لەژێر ناوەندی قازانجی گشتییەوە.

هەمیشە رێژەی ناوەندی قازانج بەراورد دەکرێت بەبڕی سوودی قازانجەوە.

ئەگەر بڕی سوودی قەرز زۆرتربێت لە رێژەی ناوەندی قازانج ئەوا سەرمایەگوزار هیچ ئامادەییەکی نییە بۆ وەرگرتنی قەرز، بەڵام ئەگەر بڕی سوودی قەرز نزمتربێت لە رێژەی قازانجی ناوەندی ئەوا سەرمایەگوزار ئامادەیە قەرز وەربگرێت.

بۆ نموونە گریمان بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەیەکی دیاریکراو پێویستمان بە ١٠٠٠٠ دۆلار قەرز هەیە، وە دەزانین بەگەڕخستنی ئەو برە پارەیە لەماوەی ساڵێکدا ١٠٠٠ دۆلار قازانج دەکەین، واتە بڕی قازانجی ناوەندی بریتی دەبێت لە (١٠٪)، (١٠٠٠ دۆلار / ١٠٠٠٠ دۆلار= ١٠٪)، ئەگەر بڕی سوودی قەرز لە ساڵێکدا بریتی بێت لە (٧٪) کەواتە لە بەگەڕخستنی سەرمایەدا بڕی قازانجی ناوەندی بریتی دەبێت (٣٪) ئەمەش مانای ئەوەیە پرۆژەکە سەرکەوتوو دەبێت. کەواتە چەند بڕی سوودی قەرز کەمتربێت ئەوا رادەی قازانجی ناوەندی زیاتردەبێت.

جگە لەبڕی سوودی قازانج باج بەشێوەیەکی راستەوخۆ کاردەکاتە سەر پرۆسەی سەرمایەگوزاری، بێگومان چەند بڕی باج کەمتربێت ئەوا بڕی قازانج بەرزتر دەبێت، وە ئەمەش هانی سەرمایەگوزاران دەدات کە سەرمایەکانیان بخەنەگەڕ لەبواری وەبەرهێناندا. ئەگەر بەووردی سەرنجی بەرنامەی پارتە سیاسییەکان بدەین لەکاتی هەڵبژاردندا بەتایبەتی (لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا). هەموو بەیەك دەنگ پەیمانی کەم کردنەوەی باج دەدەن، چونکە سروشتی مرۆڤ وا هەڵکەوتووە کە حەز بە باجدان ناکات، ئەو پارتە سیاسیانەش پێویستییان بەدەنگی دانیشتوان هەیە. بەڵام لە پراکتیکدا مەرج نییە هەموو نزمکردنەوەیەکی بڕی باج ببێتە هۆی زیادبوونی سەرمایەگوزاری لە وڵاتدا (لە بەشەکانی دوایدا باس لەم پەیوەندییە دەکەین).

**فەرهەنگی ئابووری**

سەرمایەگوزاری، وەبەرهێنان (Investment) :- خەرجی لەسەر چۆنیەتی بوون بە خاوەن هۆیەکانی بەرهەمهێنان، بە واتایەکی دیکە ئەو شمەکە سەرمایە تازانەیە، کە لەبەرهەمهێنانی شمەکی دیکەدا بەشداری دەکەن، واتە شمەکی بەرهەمهێنراو ناگاتە پارەی بەکاربردن، بەڵکو هەر لەپارەی بەرهەمدارییدا دەمێنێتەوە.

وەبەرهێنان چەندان جۆری هەیە لەهەرە گرنگەکانی:



| | |
|---|---|
| - وەبەرهێنانی بیانی | Foreign Investment |
| - وەبەرهێنانی بازرگانی | Trade Investment |
| - وەبەرهێنانی نێودەوڵەتی | International Investment |
| - وەبەرهێنانی داڕن | Investment passive |
| - وەبەرهێنانی بەشدارگەکان | Corporate Investment |
| - وەبەرهێنانی رووت | Investment Net |
| - وەبەرهێنانی راستەکیی (ماڵینە) | Investment Real |
| - وەبەرهێنانی ناڕاستەوخۆ | Indirect Investment |
| - وەبەرهێنانی راستەوخۆ | Investment Direct |
| - وەبەرهێنانی ناوەکی (خۆجێیەکی) | Domestic Investment |
| - وەبەرهێنانی دنەدەر | Induced Investment |
| - وەبەرهێنانی سەربەخۆ (خۆکار) | Autonomous Investment |
| - وەبەرهێنانی جێگرەوە | Replacement Investment |
| - وەبەرهێنانی نەختینە (پارە) | Money Investment |
| - وەبەرهێنانی حکوومی | Government Investment |

- سەرجەمی وەبەرهێنان:

هەر سەرباره کردنێك بۆ مافەکانی دەزگا (کە ئامێر و خانووبەرە و هۆیەکانی گواستنەوە و رێگەوبان و جڕ و جیازە جیاوازەکان —ستۆکات- دەگرێتەوە).

سەرەڕای ئەو سازاندنەی کەلە تەمەنی بەرهەمداری ئامێرەکاندا زیاد دەکات.

- وەبەرهێنانی بیانی:

ئاراستەکردنی پاشەکەوتی وڵاتێك بۆ پێکهێنانی سەرمایەی راستەقینەی تازە لە وڵاتێکی دیکەدا، هەروەها وەبەرهێنانی نێودەوڵەتیش پێی دەگوترێت.

- وەبەرهێنانی بازرگانیی:

هەڵگرتنی یان کڕینی پشکی بەشدارگەیەکی دیارکراو لە لایەن بەشدارگەیەکی دیکەوە.

- وە بەرهێنانی داڕن:

ئەگەر پاشکەوتی رالێبینراو یان گەرەك زیاتر بێت لە وەبەرهێنانی رالێبینراو یان گەرەك جیاوازییەکە وەبەرهێنانێکی داڕن پێك دەهێنێت.

- وەبەرهێنانی بەشدارگەکان:

هەڵسانی بەشدارگەکان بە پێکهێنانی سەرمایەی راستەقینەی تازە (خانوو بەرە، ئامێر رێگەوبانو..هتد)و پارەداکردنی لە رێگەی ئەو پاڵپشتییەی کە لەلایانە.

- وەبەرهێنانی رووت:

پوختەی زیادەی قەوارەی سەرمایە نێوان دوو مادەیان چەند مادەیەکی بەراوردکراودا، ئەم وەبەرهێنانە خواستی هەمەکی لەسەر شمەك و خزمەتگوزاری زیاتر دەکات.

- وەبەرهێنانی راستەکیی (ماڵینە):

ئەمەش هەموو (مافە) چەسپاوە جیاوازەکان و گۆڕان لە ئاخنراو دەگرێتەوە.

- وەبەرهێنانی ناراستەوخۆ:

وەبەرهێنانی لەسەر ئاستی دەوڵەتاندا دەکرێتە دوو بەش:

وەبەرهێنانی راستەوخۆ Direct Investment

وەبەرهێنانی ناراستەوخۆ Indirect Investment

کاتێك لە راپۆرتە ئابوورییەکان و هەواکانی تەلەفزیۆندا گوێمان لی دەبێت دەڵێن بەرهەمی نەتەوەیی بەرێژەی ٣٪ زیادی کردووە واتە بارودۆخی ئابوری بەرەو بوژاندنەوە دەچێت کەواتە باروگوزەرانی خەڵکی بەرەو باشتر دەچێت. واتە داهاتی خەڵکی زیاد دەکات, بەڵام کاتێك گوێمان لێ دەبێت کە بەرهەمی نەتەوەیی بەرێژەی ٣٪ دابەزیوە واتە ئابوری توشی قەیران بووە ئەمەش کاردەکاتە سەر خراپ بوونی بارو گۆڕانی خەڵکی دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی داهاتی دانیشتوان.

پێکهاتەکانی تێکڕایی بەرهەمی نەتەوەیی وەك ئۆرگانێکی پێکەوە بەستراو لە یەك نەپێچراو وان هەریەکەیان کاردەکاتە سەر ئەوی تریان بەکەم بوونەوەی بڕی هەر یەکێك لە پێکهاتەکانی بەرهەمی نەتەوەیی تێکڕایی بەرهەمی نەتەوەیی کەم دەبێتەوە ئێستا بە جیاجیا لە هەریەکە لەو پێکهاتانە دەدوێین.

ئەگەر مەبەستی وەبەرهێنانی بیانی زاڵ بوون بێت بە سەر پرۆژەی نیشتمانیدا بەهۆی ئەو سەرمایەی کە لەم پرۆژەیەدا بەکاری دەێنێت، ئەمە پێی دەگوترێ وەبەرهێنانی راستەوخۆ.

ئەگەریش وەبەرهێنانە کە مەرجی زاڵبوونی نەبێت ئەم پێی دەگوترێ وەبەرهێنانی ناڕاستەوخۆ.

- وە بەرهێنانی دنەدەر:

ئەم جۆرە وەبەرهێنانە  زیادبوونی داهاتی نەتەوە زیاد دەکاتو یەکەم بوونیشی کەم دەبێت واتە قەبارەکەی پشت بە ئاستی داهاتی نەتەوەیی دەبەستێت.



- وەبەرهێنای ناوەکی (خۆجییەتی):

ئاراستەکردنی پاشەکەوتی وڵاتێك بۆ پێکهێنای سەرمایەی راستەقینەی تازە لە هەمان وڵاتدا.

- وەبەرهێنانی سەربەخۆ (خۆکار):

بەشێکە لە وەبەرهێنانی هەمەکی، کەتیایدا.

١) هۆکارە ئابورییەکان (وەك نرخی سوود، گۆڕانی خواستی شمەكو خزمەتگوزاری، قازانجی وەبەرهێنان) کاری تێ ناکەن .

٢) چەند هۆکارێکی دەرەکی (ئەوانەی، کە پەیوەندییان بە ئاوێتەبوونی چالاکییە ئابورییەکانەوە هەیە) کاری تێدەکات.

- وەبەرهێنانی جێگرەوە:

بەشێکە لەو سەرمایەی کە تەرخان دەکرێت بۆ ئەوەی جێی ئەو سەرمایە بگرێتەوە، کە لە کردەی بەرهەمهێناندا تووش پووان دەبێت.

- وەبەرهێنانی نەختینە (پارە):

وەبەرهێنانی راستەقینە، کە بە پارەی خۆیەکیو دراوی بیانی هەڵسەنگاندرابێت.

**پێویستی سەرمایە**

بێگومان چالاکی سەرمایەگوزاری جێبەجێ نابێت بەبێ بوونی سەرمایە، ئایا چۆن سەرمایە پەیدا دەبێت، سەرچاوەی سەرمایە گەلێك زۆر و جیاوازن. بەڵام ئێمە باس لەبوونی سەرمایە دەکەین کە لەپرۆسەی چالاکی ئابووریدا دەهێنرێتە بەرهەم. پێشتر باسمان کرد کاتێك بڕی سوودی قەرز نزم بێت ئەوا سەرمایەگوزار دەتوانێت قەرز وەربگرێت لە بانکەکان یان لە رێکخراوە داراییەکان بۆ جێبەجێ کردنی پرۆژەکانی، باشە بانکەکان پارەیان لەکوێ بوو، وەڵامی ئەم پرسیارە ئاسان نییە بەڵام هەوڵدەدەم بەشێوەیەکی ساکار روونی بکەمەوە.

هەروەك لە پێشەوە باسمان لێکرد خەرجییە گشتییەکانی دانیشتووان واتە داهاتی دانیشتووان بەرزترین رێژەی هاوکێشەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی پێکدەهێنن، کەواتە گرنگترین سەرچاوەی سەرمایە داهاتی دانیشتووانە. بەشێوەیەکی گشتی بەشێك لە داهاتەکان خەرج دەکرێت بەڵام بەشێکی زۆرتری پاشەکەوت دەکرێت، لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا خەڵك پارەکانیان لە بانکەکان دەپارێزن یان لە بازاڕی داراییدا بەهۆی بۆرسەکانەوە شەیر دەکڕن لە هەردوو حاڵەتەکەدا بڕێ پارەی زیاد پەیدا دەبێت بەگەڕخستنی شێوەیەکی نوستوو. کاتێك ئەو

بڕە پارەیە بەکاردەهێنرێت لەشێوەی پێدانی قەرزدا ئەوا ئەو پارە پاشەکەوتکراوانە دەگۆڕێن بۆ سەرمایە. کەواتە بڕگەی (I) لەهاوکێشەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیدا زیاددەکات ئەمەش دەبێتە هۆی چالاکی پرۆسەی سەرمایەگوزاری واتە بوژانەوەی ئابووریو گەشەکردنی بارو دۆخی ئابووری بەگشتی.

خاڵێکی گرنگ کەدەمەوێت سەرنجی خوێنەری بۆ راکێشم، زۆربەی حکوومەتەکان بۆ داپۆشینی کورتهێنانی بووجە پەنا دەبەنە بەر قەرزی ناوەکی. واتە حکوومەتیش بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی پەنا دەباتە بەر قەرز لەناوەوە وەك باسمان لێکرد کە سەرچاوەکەی دانیشتوانە, واتە حکوومەت بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ قەرز لە هاولاتیان دەکات.

**فەرهەنگی ئابووری**

پاشەکەوتی Saving: گلدانەوی بەشێك لەداهات بۆ رابەرکردنی پێداویستییەکانی دوارۆژ، ئەمەیش بوونی سەر رێژێك پاش بەکاربردن دەگرێتەوە.

پاشەکەوتی بەو مانایە سەرمایە پێك ناهێنێت، بەڵام مەرجێکە بۆ پێکهێنانی، چونکە پێویستە زیادەیەك هەبێت لەسامانی بەرهەمهێنراودا لەچاو سامانی بەکاربراودا.

پاشەکەوتی چەند جۆری هەیە گرنگترینیان:

١- پاشەکەوتی پاڵپشتە.

٢- پاشەکەوتی دنەدەر.

یەکەمیان: بریتییە لەو مانایەی کە ئادەمیزاد بۆ تێرکردنی پێداویستییەکانی دوارۆژ بەکاری دێنێت.

دووەمیشیان: بریتییە لە بەکارهێنانی بەشێك لەداهاتی کەسێك لە کردەی بەرهەمهێنانی ماوە درێژدا، ئامێر و پشك و قەواڵە بەمەبەستی زیادکردنی داهاتی نەتەوەییو سامانی نەتەوەیی.

**بوونی تواناکان**

بوونی توانا واتە ئاکادەبوونێکی شیاو بۆ بەگەڕخستنی سەرمایە گرنگترین فاکتەرە لەچاو فاکتەرەکانی تردا، بەڵام ئەم فاکتەرە ناچێتە ژێر دەسەلاتی لێکۆڵینەوە ئابوورییەکانەوە. چونکە ئەم فاکتەرە بریتییە لەهەموو ئەو پرۆژە سوودبەخشو سەرنج راکێشەرانەی کە سەرمایەگوزار دەتوانێت هەڵبژێرێت بۆ بەگەڕخستنی سەرمایەکەی.

هەروەك لەپێشەوە باسمان لێکرد کەمی بڕی سودی قەرز و نزمی باج هاندەرێکی گرنگن بۆ بەگەڕخستنی سەرمایەو بوژانەوەی سەرمایەگوزاری، بەڵام ئەگەر پرۆژەی سوود بەخش و



سەرنج راکێشەر لەئارادا نەبێت ئەوە سەرمایەگوزاری جێبەجێ نابێت، مەبەست لە پرۆژەی سەرنج راکێشەر ئەو پرۆژانەن کە پاشەڕۆژی هەیە چونکە سەرمایەدار کاتێك سەرمایەگوزاری دەکات بیر لە پاشەڕۆژ و داهاتووی پرۆژەکە دەکات، بەمەرجێك سەرمایەگوزاری دەکات ئەگەر بڕی قازانجی ناوەندی هەمیشەییو درێژخایەن بێت. بۆ نموونە لەساڵەکانی (٢٠٠١-٢٠٠٢) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا زەمینەی سەرمایەگوزاری گەلێك لەبار و گونجاوبوو، چونکە رێژەی سوودی قەرز لە نزمترین ئاستدا بوو، وە رێژەی باجی قازانجیش کەمکرایەوە، بەڵام پرۆسەی سەرمایەگوزاری رواڵەتی بوژاندنەوەی پێوە دیار نەبوو، بەڵام لەساڵی ١٩٩٠دا هەرچەندە بڕی سوودی قەرز بەرز بوو بەڵام پرۆژەی سەرمایەگوزاری بەشێوەیەکی بەرچاو گەشەی کرد چونکە لەوساڵانەدا تەکنۆلۆژیای زانیاری بەشێوەی خێرا گەشەی کرد وە ئەم شۆڕشە واتە شۆڕشی زانیاری تاکو ئەمڕۆکەش بەردەوامە ئەم کەرتەش سەرنج راکێشەر و بەکەڵك و سودمەند بوو بەلای سەرمایەگوزارانەوە، بۆیە بەشێوەیەکی چالاك کەوتنە سەرمایەگوزاری هەرچەندە بڕی سوودی قەرز بەرزبوو وە ڕێژەی باجی گشتیش لە ئاستێکی بەرزدابوو.

**فەرهەنگی ئابووری**

سەرمایە، دەستمایە Capital:- لەمەیانی ئابووریدا سەرمایە یان دەستمایە دەتوانرێت بەوە پێناسە بکرێت کە ((گشت ئەو مایانەی کە کەسێك خاوەنییەتی لە ماوەی کاتێکی دیاریکراودا)).

ئەم مایەیەش یان لەشێوەی شمەکدا دەبێت یان لەشێوەی بەهادا، لەمەیانی کردەی بەرهەمداریشدا دەتوانرێت بەوە پێناسە بکرێت کە ((ئەو شمەکانەیە کەلەوە پێش بەرهەمهێنراون و راستەوخۆ بۆ تێرکردنی پێداویستی بەکارناهێنرێن، بەڵکو بۆ بەرهەمهێنانی مایەی دیکە بەکاردەهێنرێت)).

ئەم جۆرە پێکهاتووە لە مەکینە و ئامێر و خانوو هەروەها هۆی گواستنەوە و هاتووچۆ کە (سەرمایەی بەرهەمهێن - Productive Capital) یان پێ دەگوترێو بەیەکێك لەبەرهەم ماکەکان دادەنرێت.

لە مەیانی کارداریشدا دەتوانرێت بەوە پێناسە بکرێت کە ((ئەو مایانەی کە هاوبەشەکان هاوبەشی تێدا دەکەن یان ئەو مایانەی کە هەڵگرانی قەواڵە پێشکەشی بەشدارگەکان دەکەن)).

سەرمایە چەندان جۆری هەیە:

١- سەرمایەی ڕاستەکی.
٢- سەرمایەی نەگۆڕ.
٣- سەرمایەی وەستاو دەستپێکراو.
٤- سەرمایەی تایبەتمەند.
٥- سەرمایەی گۆڕاو.
٦- سەرمایەی کۆمەڵایەتی (تایبەتی).

هەروەها لە مەیانی کارداریشدا بەم شێوەیە دابەش دەکرێت:

١- سەرمایەی ماوە درێژ.
٢- سەرمایەی ماوە کورت.
٣- سەرمایەی کارکەر.
٤-

## حکوومەت (G)

حکوومەت بەهەموو دام و دەزگاکانییەوە بریتییە لە بەکاربەرێکی گەورە و گران، بۆ هەڵسوڕانی کاروباری ئیش کارەکانی حکوومەت خەرجییەکی زۆردەکات لە کڕینی کالاّ و خزمەتگوزاییەکاندا ئەمەش دەبێتە هۆی زیادبوونی هێمای (G) کە لەهاوکێشەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی دیاریمان کردووە. کەواتە زیادبوونی بڕی خەرجە گشتییەکانی حکوومەت دەبێت بەهۆی زۆربوونیو زیادبوونی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی ئەمەش دەبێتە هۆی بوژانەوەو گەشەکردنی باری ئابووری. سەرچاوە گرنگەکانی داهاتی حکوومەت دوو سەرچاوەیە باجو گومرگ بەهەموو شێوەکانییەوە وەهەروەها قەرز مەبەستمان تەنها قەرزی ناوەکییە حکوومەت بەهۆی سیاسەتی باجەوە باج لە هەموو چالاکییە ئابوورییەکانی وڵات وەردەگرێت وە هەروەها بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ قەرز دەکات لە دانیشتوان.

بێگومان حکوومەت دەتوانێت ڕۆڵێکی گرنگ لە چالاکی ئابووری وولاتدا ببینێت بە مەرجێك ئەگەر ئەرکەکانی سەرشانی جێبەجێ بکات، لەهەرە ئەرکە گرنگەکانی حکوومەت لە پرۆسەی ئابووریدا، سەقامگیرکردنی بازاڕی داراییە لە ڕێگەی سیاسەتی داراییو قەرزەوە، ڕاگرتن و کەم کردنەوەی دیاردەی هەڵاوسان، ڕەخساندنی شوێنی کار و کەمکردنەوەی بێکاری، خۆشکردنی زەمینەی ڕەخساو بۆ سەرمایە گوزاری....هتد، کەواتە حکوومەت پێویستە زەمینە خۆش بکات بۆ گەشەکردن و بوژانەوەی ئابووری. جگە لەم ئەرکە ئابووریانە



حکوومەت دەبێت ئەرکە سیاسیو کۆمەڵایەتییەکانی سەرشانی جێبەجێ بکات، چونکە پرۆسەی سیاسی پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ دەکاتە سەر بارودۆخی ئابووری، لەهەرە ئەرکە سیاسییەکانی حکوومەت دابین کردنی ئارامی و ئاسایشە لە وڵاتدا وە هەروەها دابین کردنی ئازادی و دیموکراتییە بۆ هاوڵاتیان. حکوومەت نەك تەنها دەبێت خەرجی گشتی بکات بەڵکو و دەبێت داهاتی نەتەوەیی زیاد بکات، بۆ ئەمەش پێویستە بە شێوەیەکی چالاکانە بەشداری لە پرۆسەی ئابووریدا بکات.

## ناردە و هاوردە (Exp. – Imp.)

پرۆسەی هاوردە و ناردە پێی دەوترێت بازرگانی دەرەکی. کاتێك کالاّ و خزمەتگوزارییەکان ڕەوانەی بازاڕەکانی دەرەوە دەکرێت پێی دەوترێت ناردە، بەڵام کاتێك کالاّ و خزمەتگوزارییەکان لە بازاڕەکانی دەرەوە دەهێنرێت بۆ ناوەوەی وڵات پێی دەوترێت هاوردە. هەرچ وڵاتێك بڕی ناردنە دەرەوەی زیاتربێت وەك لە بڕی هاوردە واتە باڵانسی بازرگانی ئەو وڵاتە پۆزەتیڤە. ئەمەش دەبێتە هۆی زیادکردنی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی. بۆ نموونە گریمان وڵاتێك بەبڕی بەهای (١٠٠) ملیۆن دۆلار بەرهەم (کالاّ و خزمەتگوزارییەکان) ڕەوانەی دەرەوە دەکات، وە بڕی بەهای (٨٠) ملیۆن دۆلار بەرهەم (کالاّ و خزمەتگوزارییەکان) لە وڵاتانی دەرەوە دەهێنێت. ئەوکاتە ناردەی پوختە بریتی دەبێت لە (٢٠) ملیۆن دۆلار کەواتە تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی بەبڕی ٢٠ ملیون دۆلار زیاد دەکات. بەڵام ئەگەر ئەم پرۆسەیە پێچەوانە بێتەوە ئەوا ئەنجامی نێگەتیڤ دەدات بە باڵانسی بازرگانی واتە تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی بە بڕی (٢٠) ملیۆن دۆلار کەم دەبێتەوە.

کەواتە بازرگانی دەرەکی ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لەگەشە کردنی ئابووریدا، ئەگەر وولاتێك بڕی هاوردەی کالاّ و خزمەتگوزارییەکانی زیاتربێت لە بڕی ناردن، ئەوا تووشی لاسەنگی بازگانی دەبێت و ئەمەش دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی کەلە کۆتایدا دەبێتە هۆی تەنگەژی و قەیرانی ئابووری. بێگومان هەموو وڵاتێك هەوڵی ناردنە دەرەوەی کالاّ و خزمەتگوزارییەکان دەدات وەك لە هاوردەی. بەڵام ئەم خواستە کاتێك جێبەجێ دەبێت ئەگەر ئابووری وڵاتەکە ئابوورییەکی بەرهەمهێنەر بێت. (لە بەشی پێنجەمدا بەدرێژی باسی لێدەکەین).

# فەسڵی سێیەم

## ئامرازەکانی ئابووریناسان (ئامرازی ئابووریناس)

لە فەسڵی دووەمدا باسمان لە پێکهێنانی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی کرد بە یارمەتی هەندێ هێما و، ئامار و، ژمارەوە توانیمان ناوەڕۆکی دیاردە ئابوورییەکان روون بکەینەوە. چونکە ئابووریناسان تەنها بەهۆی پێوەرە ئابوورییەکانەوە دەتوانن دیاردە و چالاکییە ئابوورییەکان لێکۆڵنەوە و شیتەڵ بکەن ئەمەش پێی دەوترێت ئامرازی ئابووریناس.

لە فەسڵەکەی پێشوودا باسمان لە خەرجییە گشتییەکانی دانیشتوان کرد، باسمان لە سەرمایەگوزاریو خەرجییەکانی حکومەت و هاوردە و ناردەکانو خزمەتگوزارییەکان کرد. بەڵام باسمان لەوە نەکرد ئایا دانیشتوان چەند خەرج دەکەن ئایا بڕی سەرمایە گوزاری چەندە لە تێکڕای بەرهەمی نەتەوایەتیدا،...هتد. زمانی ئابووری بریتییە لە ئامار و ژمارە و هێما و خشتە و وێنە.. هتد چونکە بەبێ تێگەیشتن لە ئامرازە ئابوورییەکان تێگەیشتن لە زانستی ئابووری مەحاڵە. بۆ نموونە ئابووریناس دەبێت بزانێت چەند ئۆتۆمبێل ئەمساڵ فرۆشراوە، بۆ ئەوەی کارگەکانی ئۆتۆمبێل لە نەخشە و پلانی ساڵی داهاتوودا ئاگاداربن چەند ئۆتۆمبێل بەرهەم بهێنێت، کاتێك گوێمان لێی دەبێت نرخی خواردەمەنی بەرزبۆتەوە، بەڵام ئایا بە چ رادەیەك یان بە چ رێژەیەك بەرزبۆتەوە، ئەم پرسیارانە لای ئابووریناسانە، ئابووریناسانیش بە یارمەتی میتۆدی پێوەرە ئابوورییەکانو بەیارمەتی ئامرازەکانی ئابووری دەتوانێت پێمان بڵێت کە نرخی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان بە چ رێژەیەك لەچاو داهاتماندا بەرزبۆتەوە، بۆیە لەم فەسڵەدا بە پێویستمان زانی بەشێوەیەکی سادە و ساکار باس لە ئامرازە ئابوورییەکان بکەین بۆئەوەی تۆش (خوێنەری خۆشەویست) بتوانیت بە ئاسانی لە دیاردە ئابوورییەکان بکۆڵیتەوە بەیارمەتی بەکارهێنانی ئامرازە ئابوورییەکان بە تێگەیشتن لە بەکارهێنانو خوێندنەوەی ئامرازە ئابوورییەکان مادەکانی تری ئەم پەڕاوگەیە ئاسان دەبێت لات.





ئامار statistics: زاراوەی (statistics) لەوشەی (status)ی لاتینییەوە وەرگیراوە، کە بەواتای بار یان باری ئێستا دێ.

زانستی ئامار ئەو زانستەیە کەوا بایەخ بە لێکۆڵینەوەی ژماردن دەدات بۆ دۆزینەوەی راستییە کۆمەڵایەتییەکان، هەروەها بایەخ بەژماردنی رووداوەکانو کەسانو ئەو شتانەی کە دەتوانرێت بژمێردرێت دەدات.

بەواتایەکی دیکە ئەم زانستە یارمەتی لێکۆڵەرەوە دەدات بۆ زانینی پەیوەندی لە نێوان ئەم رووداوانەدا.

بۆ نموونە: کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی باری دەوڵەت، وەك بلاو نامەی بازرگانی دەرەکی، یان رێژەی نەخوێندەواری لە نێو دانیشتوندا، یان ژمارەی لە دایك بووەکانو مردووەکانو......هتد.

ئامار گەلێك جۆری هەیە لەهەرە گرنگەکانیان ئاماری (جێهێنانـدن)ە ( Applied statistics). کەلە لێکۆڵینەوەی نیشتەنییەکان و چالاکییە ئابووریو کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگا دەکۆڵێتەوە. ئەو ئامارانەش بریتین لە:

١- ئاماری تەندروستی.

٢- ئاماری پەروەردەیی.

٣- ئاماری داهاتی نەتەوەیی.

٤- ئاماری بازرگانی دەرەکی.

٥- ئاماری بازرگانی ناوەکی.

٦- ئاماری پیشەسازی.

٧- ئاماری کشتوکاڵیو هی دیکە.

## ژمارە و هێما و خشتە و وێنەی پێرستە ئابوورییەکان

ئەگەر سەیری هەرچی بلاوکراوە و پەرتووکی ئابووری بکەین دەبینین پڕە لە زانیاری ئابووری لە شێوەی خشتە و نەخشە و وێنە و هێڵکاری و ژمارە...هتد.

هەموو ئەمانە پێی دەوترێت زمانی ئابووری چونکە ئابووریناسان بەهۆی زمانی ئابوورییەوە دەتوانن پێمان بڵێن چالاکیو جموجوڵی ئابووری لە چ ئاستێکدایە، ئاڕاستە

ئابورییەکان بەرەو کوێ دەڕۆن، گۆڕانکارییە ئابورییەکان چ کاریگەریەك دەکەنە سەر ژیانی ڕۆژانەمان، چۆن سەرمایەکانمان بخەینە گەڕ، بەرزبوونەوە و دابەینی نرخەکان..هتد.

**چۆن خشتەی ئابوورییەکان بخوێنینەوە؟**

زۆربەی زانیاری ئابوورییەکان لە شێوەی خشتەدا نیشان دەدرێن، با ئێستا بزانین خشتە ئابوورییەکان چییە و چۆن ئەم خشتانە ئامادە دەکرێن وە چۆن چۆنی ئامارەکانی ناو خشتەکە شیەڵ بکەینەوە لەم خشتەیەی خوارەوەدا بۆ نموونە تێکڕای بەرهەمی نەتەویی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا شی دەکەینەوە. ژمارەکانی ناو خشتەکە هەمووی ئاماری ڕاستەقینە و تەواوی تێکڕاییو بەرهەمی نەتەوەیی ئەمریکایە ساڵی (١٩٩٠ تا ساڵی ٢٠٠١).

خشتەی ژمارە (٣-١) تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ساڵانی (١٩٩٠ — ٢٠٠١).

| ساڵەکان | تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی (ملیار دۆلار) بە پێی نرخی ئێستەکی | ڕێژەی پلەی گەشەکردن (ملیار دۆلار) بەپێی نرخی ئێستەکی | تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی (ملیار دۆلار) بەپێی نرخی ئاستەکی | ڕێژەی پلەی گەشەکردن (ملیار دۆلار) بەپێی نرخی ئاستەکی |
|---|---|---|---|---|
| ١٩٩٠ | ٥,٨٠٣ | ٥,٧ | ٦,٧٠٨ | ١,٨ |
| ١٩٩١ | ٥,٩٨٣ | ٣,٢ | ٦,٦٧٦ | ٠,٥ |
| ١٩٩٢ | ٦,٣٠٠ | ٥,٦ | ٦,٨٨٠ | ٣,٠ |
| ١٩٩٣ | ٦,٦٤٢ | ٥,١ | ٧,٠٦٣ | ٢,٧ |
| ١٩٩٤ | ٧,٠٥٤ | ٦,٢ | ٧,٣٤٨ | ٧,٠ |
| ١٩٩٥ | ٧,٤٠١ | ٤,٩ | ٧,٥٤٤ | ٢,٧ |
| ١٩٩٦ | ٧,٨١٣ | ٥,٦ | ٧,٨١٣ | ٣,٦ |
| ١٩٩٧ | ٧,٣١٨ | ٦,٥ | ٨,١٦٠ | ٤,٤ |
| ١٩٩٨ | ٨,٧٨١ | ٥,٦ | ٨,٥٠٩ | ٤,٣ |
| ١٩٩٩ | ٩,٢٧٤ | ٥,٦ | ٨,٨٥٩ | ٤,١ |
| ٢٠٠٠ | ٩,٨٢٥ | ٥,٩ | ٩,١٩١ | ٣,٨ |
| ٢٠٠١ | ١٠,٠٨٢ | ٢,٦ | ٩,٢١٥ | ٠,٣ |



وەك ەبینین خشتەکەی سەرەوە پڕە لە ژمارەی جیاواز وە لەسەر هەموو زنجیرە ژمارەیەکەوە پێڕستە ئابورییەکان نوسراونەتەوە. لە ناونیشانی خشتەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم خشتەیە تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکامان لە ماوەی (١١) ساڵدا واتە لە ساڵی (١٩٩٠ بۆ ساڵی ٢٠٠١) نیشان دەدات. خشتەکە پێك هاتووە لە (٥) زنجیرە. زنجیرەی یەکەم ساڵەکانمان نیشان دەدات ئاشکرایە بۆیە پێویستی بە ڕوونکردنەوە نییە. ئێستا هەریەك لە زنجیەکانی تر ڕوون دەکەینەوە.

لە زنجیرەی (٢)دا تێکڕایی بەرهەمی نەتەوەیی بە نرخی ئێستەکی ملیار دۆلار نیشان دراوە ئەمە مانای چییە، کاتێك دەڵێین ملیار دۆلار واتە لە دوای هەرژمارەیەکەوە (نۆ سفر)واتە تێکڕایی بەرهەمی نەتەوەیی لە ساڵی (٢٠٠١)دا بریتی بوو لە (٠٠٠ ٠٠٠ ٠٠٠ ٠٨٢ ١٠) دۆلار واتە دە ترلیۆن و هەشتاو دوو ملیار دۆلار. ئێمە لە خشتەکەدا بەم شێوەی ئەم ژمارەیەمان نیشان داوە (١٠,٠٨٢). کەواتە ئێستا زانیمان چۆن ژمارەی ناو خشتەکان دەخوێنینەوە. با ئێستا کە بزانین مەبەست لە نرخی ئێستەکی چییە؟ بریتییە لە بەهاو نرخی هەموو کاڵا و خزمەتگوزارییەکان کە لەو ساڵەدا بەرهەم هێنراوە بەبێ ڕەچاوکردنی فاکتەری (نرخ هەڵاوسان) (کە لەبەشی سێیەمدا بە درێژی باسی لێ دەکەین)، نرخ هەڵاوسان واتە کەم کردنەوەی بەهای پارە، بۆ نموونە ئەگەر ڕێژەی نرخ هەڵاوسان لە ساڵێکدا لە ٣٪ بێت واتە ئەو کاڵایەی کە نرخی (١٠٠) دۆلار بووە لە مانگی کانوونی ووەمدا ئەوا لە مانگی کانوونی یەکەمدا نرخەکەی دەبێت بە (١٠٣) دۆلار. واتە نرخ بەرزبۆتەوە چونکە بەهای دۆلار نزم بۆتەوە ئەمەش دەبێتە هۆی کەم کردنەوەی توانای کڕین.

ئێستاکە بە یارمەتی خشتەی سەرەوە هەوڵ ەدەین بزانین چ گۆڕانکارییەك لە ئابووری ئەمەریکادا لە ماوەی ١١ ساڵدا ڕووی داوە، وە هەروەها بەهۆی خشتەکەی سەرەوە دەتوانین هەڵکشانو داکشانی چالاکییە ئابوورییەکانی ئەمەریکا دەستنیشان بکەین. لە زنجیرەی ژمارە (٢)دا تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی بەپێی نرخی ئێستەکی ژمێرکراوە بەپێی ئەوەی فاکتەری نرخ هەڵاوسان ڕەچاوبکەین، بەڵام لە زنجیرەی ژمارە (٤) تیکڕای بەرهەمی نەتەوەیی بەڕەچاوکردنی نرخ هەڵاوسان ژمێرکراوە چونکە قەبارەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی ڕاستو دروست دەبێت کاتێك بە پێی نرخی (ئاستەکی) ژمێردەکرێت. (بێگومان مێتۆدی تایبەتی هەیە بۆ ژمێرکردن کە لێرەدا باسی لێ ناکەین). لەکاتی ژمێرکردندا ساڵی (١٩٩٦) بە بنچینە وەرگیراوە.

له زنجیرەی (٤)دا تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی بەپێی نرخی ئاستەکی نیشان دراوە.

بڕی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی بەپێی ئەو نرخە لە ساڵی (٢٠٠١) بریتی بوو لە (٩,٢١٥) ملیار دۆلار. ئەگەر ئەم ژمارەیە بەراورد بکەین لەگەڵ هەمان ژمارە کە بەپێی نرخی ئێستەکی ژمێرکراوە دەبینین بڕەکەی کەمترە، چونکە لەکاتی ژمێرکردن بەپێی نرخی ئاستەکی فاکتەری نرخ هەڵاوسان رەچاو کراوە.

هەروەك لە سەرەوە ئاماژەمان پێدا ساڵی (١٩٩٦)مان بە بنچینە داناوە. چونکە لەو ساڵەدا واتە ساڵی (١٩٩٦) تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی لە هەردوو حاڵەتەکەدا واتە بە نرخی (ئێستەکیو ئاستەکی) وەك یەکنو یەکسانن بە (٧,٨١٣) ملیار دۆلار ئەگەر بە وردی سەیری ئامارەکانی پێش ساڵی (١٩٩٦) بکەین سەیر دەکەین نرخەکانی کە بەپێی نرخی ئاستەکی ژمێرکراوە بەرزترە وەك لەو نرخانەی کە بەپێی نرخی ئێستەکی ژمێر کراوە. بەڵام دوای ساڵی (١٩٩٦) نزمترە، ئایا بۆچی ئەم گۆڕانکارییانە پێشو پاش ساڵی (١٩٩٦) روویداوە. چونکە لە دوای ساڵی (١٩٩٦) بەهۆی نرخی هەڵاوسانەوە بەهای دۆلار دابەزیوە لەبەر ئەوە ژمێرکردنی بەپێی نرخی ئاستەکی بەرەو دابەزین دەچێت، ئەگەر قەوارەی تێکڕایی بەرهەمی نەتەوەیی تەنها بە یەك نرخ ژمێربکرێت، ناتوانین بزانین چۆن باری ئابووری گۆڕاوە بۆیە لە ژمێرکردنی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەییدا پێویستە بەهەردوو شێوە نرخەکان نرخی (ئاستەکیو ئێستەکی) ژمێربکرێت تاکو بە شێوەیەکی راستەقینە و تەواو بزانین ئاستی رادەی ئابووری لە چ قۆناغێکدایە.

ئەگەر جارێکی تر سەرنج بدەینە خشتەکەی سەرەوە دەبینین لە ساڵی (١٩٩١)دا قەوارەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی بەپێی نرخی ئێستەکی بە رێژەی لە (٣,١٪) گەشەی کردووە، بەڵام ئەگەر تێبینی بکەین لە هەمان ساڵدا کاتێك قەوارەی تێکڕایی بەرهەمی نەتەوەیی بەپێی نرخی ئاستەکی ئەوا بە رێژەی (٠,٥٪) کەمی کردووە. ئێستاکە دەتوانین دەرئەنجامی ئەوە بکەین کە ئابووری ئەمەریکا بە شێوەیەکی راستەقینە لە داکشاندا بووە، بەڵام ئەگەر تەنها سەیری ئامارە موتڵەقەکانمان بکردایە نەمان ئەتوانی بگەینە ئەم دەرئەنجامە. چونکە قەوارەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی لە ساڵی ١٩٩١ بەپێی نرخی ئێستەکی بریتییە لە (٥,٩٨٦) ملیار دۆلار بەڵام بە پێی نرخی ئاستەکی بریتییە لە (٦,٦٧٦) ملیار دۆلار. ئەگەر سەیری زنجیرەی سێو زنجیرەی پێنجەمی خشتەکە بکەین رێژەی گۆڕینی گەشەکردنی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەییمان نیشان دەدات. ساڵی (٢٠٠١) رێژەی گەشەکردن بەپێی نرخی ئێستەکی بریتییە لە



(٢,٦٪) بەڵام لەهەمان ساڵدا رێژەی گەشەکردن بەپێی نرخی ئاستەکی بریتییە لە (٠,٣٪)، ئەمەش جارێکی تر بۆمان دەسەلمێنێت کە ژمێرکردن بە پێی نرخی ئاستەکی وێنەیەکی تەواو کوتومتی باری ئابووری نیشان دەدات، ئێستاکە دەتوانین دەرئەنجامی تەواوەتی خشتەکەی پێشوومان بکەین.

سەیردەکەین کە قەوارەی تێکڕایی بەرهەمی نەتەوەیی لە (٥,٨٠٣) ملیار دۆلار بەرز بۆتەوە بۆ (١٠,٠٨٢) ملیار دۆلار بەپێی نرخی ئێستەکی واتە لە ماوەی (١١) ساڵدا ئابووری ئەمەریکا بە رێژەی لە (٧٤٪) زیادی کرد.

(١٠٠٨٢ — ٥٨٠٣ = ٤٢٧٩ کاتێك

٤٢٧٩ ÷ ٥٨٠٣ = ٠,٧٣٧ واتە ٧٤٪)

بەڵام لە راستیدا ئابووری ئەمەریکا لە ماوەی (١١) ساڵدا بە رێژەی ٣٧٪ زیادی کردووە. بەپێی نرخی ئاستەکی.

(٩٢١٥ — ٦٧٠٨ = ٢٥٠٧، ٢٥٠٧ ÷ ٦٧٠٨ = ٠,٣٧٣) واتە ٣٧٪. ئەم رێژەیەش دووجار کەمترە وەك لە رێژەی پێشتر.

دەمەوێت سەرنجی خوێنەر بۆ خاڵێکی گرنگ راکێشم، پرنیسپی هەموو خشتە ئابوورییەکان کە دەربارەی رووداوە ئابوورییەکان دەدوێت وەك یەکە، هیوادارم بەهۆی ئەو نموونەیەی سەرەوە توانیبێتم پرنسیپی خشتە ئابوورییەکانو تێگەیشتن لێیانم بۆ خوێنەر روونکردبێتەوە.

بێگومان جگە لە خشتەی ئابووریناسان وێنە و هێڵکاری لە روونکردنەوەی پرۆسە ئابوورییەکاندا بەکاردەهێنن.

ئێستا هەوڵ دەدەین بە شێوەیەکی ساکار شێوەی وێنە و هێڵکارییە ئابوورییەکان روون بکەینەوە.

**چۆن وێنە ئابوورییەکان نەخشە دەکێشرێن و دەخوێنرێنەوە؟**

مەسەلەیەك هەیە دەڵێت یەك جار بینین لەسەد جار گوێ لێبوون باشترە، سەیرکردنێکی وێنە ئابوورییەکان باشترە لەوەی کە سەیری ژمارەو ئامارەێکی زۆر بکەینو تووشی سەرگێژی بین. بەهۆی وێنە و هێڵکارییە ئابوورییەکانەوە دەتوانین لە هەزاران ژمارە ئامار بکۆڵینەوە، بەهۆی وێنە و هیڵکارییەوە دەتوانین بە شێوەیەکی راستو دروست گۆڕانکارییە ئابوورییەکان شیتەڵ بکەینەوە. وە هەروەها دەتوانین پەیوەندی و کاریگەری فاکتەرە ئابوورییەکان لەسەر گەشەکردن و قەیرانی باری ئابووری بکۆڵینەوە.

بەشێوەیەکی گشتی هەرچی وێنەی ئابووری هەیە لە دوو هێڵ پێکدێت هێڵێکی تەریبی و هێڵێکی شاوڵی. بەهۆی خاڵ و نوختەی جیاجیاوە پەیوەندی نێوان هەردوو هێڵە تەریبی و شاوڵی دیاری دەکرێت، بۆ نموونە بەهۆی وێنەی (٣-١)ەوە هەوڵ دەدەین کاریگەری پەیوەندی نێوان قەوارەی گۆشت فرۆشتنو نرخی گۆشت دیاری بکەین.

وێنەی ژمارە (٣-١) داوا لەسەر گۆشت.




**نرخ ( بە دۆلار بۆ یەك کیلۆ گۆشت)**

ئیستاکە بەهۆی وێنەکەی سەرەوە بابزانین چەند کیلۆ گۆشت بە چ نرخێك فرۆشراوە. خاوەن دوکان دەتوانێت ئەگەر کیلۆ گۆشت نرخەکەی (٣) دۆلار بێت ئەوا دەتوانێت (٢٠٠٠) کیلۆ بفرۆشێت لە ماوەی مانگێکدا، بەڵام نرخی کیلۆیەك دابەزێت بۆ (١,٥) دۆلار ئەوا دەتوانێت (٧٠٠٠) کیلۆ بفرۆشێت لە ماوەی مانگێکدا. بەهۆی چەند نوختەیەکەوە لە خاڵی (A) پەیوەندی نرخی گۆشت و قەوارەی گۆشتی فرۆشراو نیشان دراوە لە حاڵەتی نرخ بەرامبەر (٣) دۆلار وە قەوارەی فرۆشتن بەرامبەر (٢٠٠٠) کیلۆ. بەڵام لە خاڵی (B) نرخی گۆشت (١,٥) دۆلار بەرامبەر قەوارەی گۆشتی فرۆشراو (٧٠٠٠) کیلۆ نیشان دراوە. ئێستا کە دەتوانین بەهۆی هێڵێکەوە هەردوو خاڵی (A) وە خاڵی (B) یەك بگەیەنین، سەیری وێنەی ژمارە (٣-٢) بکە.



وێنەی ژمارە (٣-٢) چەماوەی (هێڵی) داوا لەسەر گۆشت.




**نرخ (بە دۆلار بۆ یەك کیلۆ گۆشت)**

لە وێنەکەی سەرەوەدا دەبینن بەهۆی بەیەکەوە بەستنی هەردوو خاڵی (A) وە خاڵی (B) پەیوەندی نێوان نرخی گۆشت و قەوارەی گۆشتی فرۆشراومان بۆ دەردەکەوێت چەند نرخ کەمتربێت گۆشت زیاتر دەفرۆشرێت. وە چەند نرخی گۆشت بەرزبێت قەوارەی گۆشت فرۆشتن کەمتر دەبێتەوە بێگومان ئێمە لەم وێنەیەدا تەنها پەیوەندی نێوان نرخی گۆشت و قەوارەی گۆشت فرۆشتنمان دیاری کردووە واتە کاریگەری نرخی لەسەر قەوارەی فرۆشتن، بەڵام لە راستیدا قەوارەی گۆشت فرۆشتن تەنها پەیوەندی نییە بە نرخەوە بەڵکو و چەندان فاکتەری تر کاردەکاتە سەر نرخی گۆشت.

وەك بوونی گۆشتی هاوردە لە بازاڕەکاندا، کاریگەری ئاو و هەوا بۆ لەوەڕگا و ئاژەڵەکان، کات و وەرزی فرۆشتن، بۆ نموونە لەکاتی جەژنی رەمەزان و قورباندا گۆشت زیاتر داوای لەسەرە لەبەر ئەوە لەو ماوەیەدا نرخەکەی گرانتر دەبێت وە بەبڕێکی زۆریش گۆشت دەفرۆشرێت، بەڵام ئێمە تەنها بۆ ئاسانکردنی تێگەیشتن لە ئامرازە ئابوورییەکان باس لەو فاکتەرانە ناکەین.

ئێستاکە بەهۆی نموونەیەکی ترەوە جۆرێکی تر لە کێشانی وێنەی ئابووری نیشان دەدەین لەم وێنەیەی خوارەوەدا پەیوەندی کاریگەری نێوان داهاتی ساڵانەی خەڵکیو بڕی توانای کڕینی جلوبەرگ لە ماوەی ساڵێکدا نیشان دەدەین.

وێنەی ژمارە (٣-٣) داهاتی سالآنە و توانای خەرجی بۆ کڕینی جلوبەرگ.




وێنەکەی سەرەوە پەیوەندی نێوان داهاتی سالآنە و خەرجی سالآنە بۆ کڕینی جلوبەرگ سەیردەکەین لە وێنەکەدا هیچ ژمارەیەکی تێدا نییە، چونکە دیاریکردنی پەیوەندی داهاتو خەرجکردن ئاشکرایە، ، چەند داهاتی دانیشتوان زیاد بکات، ئەوکاتە توانای خەرجکردن زیاد دەکات وەك لە هێڵی ناو وێنەکەدا دیارە بەرەو سەرەوە دەچێت، ئێمە لێرەدا لەبەر ئاسانکردنی تێگەیشتن لە جۆری وێنە ئابوورییەکان ناچینە ناوەرۆکی باسی پەیوەندی داهاتو خەرجکردنی (لەبەشەکانی دوایدا بە درێژی باس لە وپەیوەندییە دەکەین).

هەروەك ئاماژەمان پێکرد، کاریگەری داهاتو خەرجی گشتی بەستراون بە چەند فاکتەرایکەوە ئابووریناسان بۆ لێکۆڵینەوە و چاودێریکردنی ئەو فاکتەرانە چەند مێتۆدێکی جیاجیا بەکار دەهێنن لە هەرە گرنگەکانیان مێتۆدی ماتماتیکی و بێکاری و بەرنامەی تایبەت کە تەنها بە یارمەتی کۆمپیوتەرەوە دەتوانێت ژمێربکرێت کاریگەری ئەو لێشاوە فاکتەرانە دەتوانین لەم وێنەی خوارەوە نیشان بدەین.



وێنەی ژمارە (٣-٤) داهاتی سالآنەو توانای خەرجی بۆ کڕینی جلوبەرگ کاریگەری فاکتەرەکان.




ئەگەر سەیری وێنەکەی سەرەوە بکەین وە سەرنجی نوختەکانی دەوری هێڵەکەی ناو وێنەکە بدەین ئەو نوختانە ئەو فاکتەرانە نیشان دەدەن کە کاریگەریان هەیە لەسەر داهاتی دانیشتوان بۆ توانای خەرجکردنیان، بەڵام ئەگەر تێبینی بکەین بە هیچ جۆرێك ناتوانین ئەو نوختانە بە یارمەتی هێڵەکانەوە یان چەماوەکانەوە پێکەوە ببەستینەوە یان بە یەکتریان بگەیەنین. بۆیە لەم حاڵەتانەدا ئابووریناسان پەنا دەبەنە بەر مێتۆدی ماتماتیکیو بەرنامەی تایبەتی بە یارمەتی کۆمپیوتەرەوە بۆ ژمێر کردنی هەموو ئەو فاکتەرانە.

هەندێ دیاردەی ئابووری هەن کە پێویستییان بە چاودێری هەمیشەیی درێژ خایەن هەیە، ئابووریناسان بۆ ئەم حاڵەتانە وێنەی هێڵکاری بەکار دەهێنین بەڵام بەبێ بەکارهێنانی هێڵو چەماوەی ئاراستەکراو چونکە ئەو فاکتەرانە ئەوەندە زۆرن و چاودێری کردنی پێویستی بەماوەیەکی دوور و درێژ هەیە بۆیە تەنها بە دیارکردنی نوختەکان دەتوانن لەو دیاردانە بکۆڵنەوە لەم وێنەیەی خوارەوەدا ئەم جۆرە تایبەتە لە وێنەی ئابووری نیشان دەدەین.

وێنەی ژمارە (٣-٥): گەشەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی ناوەندی پلەی گەرما.




**ناوەندی پلەی گەرما (ساڵ)**

لە وێنەکەی سەرەوەدا پەیوەندی نێوان ناوەندی پلەی گەرما لە ساڵێکدا، گەشەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی بۆ ماوەی (٥٠) ساڵ نیشان دراوە.

ئێستاکە با بزانین مەبەست لەم پەیوەندییە چییە؟ هەروەك لە پێشەوە باسمان لێکرد، چەندان فاکتەری جیاجیا کاردەکەنە سەر گەشەکردنی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی، یەکێك لەو فاکتەرانەش گۆڕانی پلەی گەرمایە لە ناوچەکەدا، بۆ نموونە لە هەندێ وڵاتدا گەشتوگوزاری خلیسکانی سەر بەفر یەکێکە لە سەرچاوە گرنگەکانی داهاتی نەتەوەیی بەڵام ئەگەر پلەی گەرما بەرزبێتەوە و بەفری پێویست نەبارێت، ئەوا ژمارەی گەشتیار کەم دەبێتەوە ئەمەش کارێکی نێگەتیڤانە ەکاتە سەر کەرتی گەشتوگوزار واتە کاردەکاتە سەر کەمکردنەوەی دەستهاتی نەتەوەیی.

هەروەك دەزانین گۆڕانکاری ئاو و هەوا پلەی گەرما لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێکی تر جیاوازە بۆیە پێویست دەکات کە کاریگەری گۆڕانی پلەی گەرما بۆ ماوەیەکی درێژ چاودێری بکرێت وە رەچاوبکرێت لە داڕشتنی پلان و نەخشەکێشانی ئابووریدا، بە تایبەتی بۆ ئەو وولاّتانەی کە پشتیان بەستووە بە کەرتی گەشتوگوزار، وە هەروەها ئەم فاکتەرە لە بواری کەرتی کشتوکاڵدا



بەکار دەهێنرێت کەواتە فاکتەری سروشتی( پلەی گەرما) کاریگەریەکی گەورەی هەیە لەسەر بەرهەمی نەتەوەیی.

هەروەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێدا هەموو پرۆسە و دیاردە ئابوورییەکان پەیوەندیەکی ئۆرگانێکیو دیالەکتیکی لە نێواندا هەیە وە هەریەکەیان کاریگەری راستەوخۆ یان ناراستەوخۆیان هەیە لەسەر یەکتری. ئابووریناسان بۆ زیاتر لێکۆڵینەوە لە دیاردە ئابوورییەکان جگە لەو ئامرازانەی کە لەسەرەوە باسمان لێکرد چەند جۆرێکی تری وێنە و هێما ئابوورییەکان بەکار دەهێنین بۆ ئەوەی بەشێوەکی دروست و تەواوکاریگەری دیاردەکان لەنێوان یەکتردا روون بکەنەوە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ نموونەکەی پێشوومان ژمێرکردنی قەوارەی بەرهەمی نەتەوەیی بەپێی نرخی ئاستەکیو ئێستەکیو دەتوانین لە شێوەی وێنەیەکی تردا نیشان بدەین بەمەرجێك مەیلی گۆڕانکاری تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی لە ماوەی (١٢) ساڵدا بەپێی هەروو نرخی ئاستەکیو ئێستەکی.

**فەرهەنگی ئابووری**

نرخی ئێستەکی (بەردەوام): بریتییە لەو نرخەی کە فاکتەری نرخی هەڵاوسان تێیدا پشتگوێ دەخرێت. لەکاتی ژمێریکردن بەم نرخە تەنها نرخی ئەو ساڵە یان ئەو ماوەیە رەچاو دەکرێت.

بەڵام نرخی ئاستەکی (بەرامبەر): بریتییە لەو نرخەی کە فاکتەری نرخ هەڵاوسان رەچاو دەکات، زۆربەی ئابووریناسان مامەڵە لەگەڵ ئەو ئامارانەدا دەکەن کە بە نرخی ئاستەکی ژمێرکراون، چونکە ئەم نرخە بە شێوەیەکی دروستو راست دیاردە ئابوورییەکان نیشان دەدات، بۆ نموونە ئەگەر بەپێی نرخی ئێستەکی داهاتی دانیشتوان زیادبێت، ئەوا لەکاتی ژمێرکردن بە نرخی ئاستەکی کەم دەبێتەوە چونکە فاکتەری هەڵاوسان رەچاوە کراوە، ئەوکاتە بە رواڵەت داهاتی خەڵکی زیادی کردووە، بەڵام لە راستیدا کەمی کردووە.

وێنەی ژمارە (٣-٦) قەبارەی تێکڕایی بەرهەمی نەتەوەیی بەپێی هەردوو نرخی ئاستەکی و ئێستەکی.




ئەگەر سەرنجی وێنەی ژمارە (٣-٦) بدەین هەردوو چەماوەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی، لەساڵی (١٩٩٦) یەکدەگرنەوە بەڵام چەماوەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی بەپێی نرخی ئێستەکی بەرەو سەرەوە دەڕوات، بەڵام چەماوەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی بەپێی نرخی ئاستەکی دوای ساڵی (١٩٩٦) بەرەو خوارەوە دەڕوات ﴿ئێمە ئامارەکانی نەخشەی ژمارە (٣-١)مان بەکارهێناوە لە نەخشەکێشانی وێنەی (٣-٦)دا﴾ چونکە ژمێرکردن بەپێی نرخی ئاستەکی وێنەیەکی دروستو راستەقینەی گۆڕانی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکامان نیشان دەدات لە ماوەی(١٢) ساڵدا.

ئابووریناسان پەنادەبەنە بەر ئەم جۆرە وێنانە لە کاتێکدا بڕیاری بەگەڕخستنی سەرمایە دەدرێت لە بوارێکی تایبەتی ئابووریدا. بەتایبەتی لەکاتی بەگەڕخستنی سەرمایەگوزاری لە بازاڕە داراییەکاندا واتە لە بۆرسەی داراییو دراودا، کە کڕین و فرۆشتنی شەیر و پشکەکانی کۆمپانیا گەورەکاندا.

چونکە لە شیتەڵ کردنەوەی ئامارەکانی ئەم وێنەیەدا دەتوانین بە شێوەیەکی دروستو راست بزانین چی بەسەر باری ئابووریدا دێت ئایا بەرەو گەشەکردن دەچێت یان بەرەو داکشانەوە،



چونکە هەر لەسەر ئەم بنچینەیە ئابووریناسان دەتوانن پێشبینی باری ئابووری بکەن بۆماوەیەکی درێژ.

خاڵێکی گرنگ هەیە دەمەوێت سەرنجی خوێنەری بۆ راکێشم. هەرچی وێنەو خشتەکانی کە لەپێشەوە باسمان لێکرد)، شیتەڵکردنەوە و لێکۆڵینەوەی هێما و پێرستەکانی خشتە و وێنەکان تەنها لە توانای پسپۆڕی تایبەتی ئابوورییەوە جێبەجێ دەکرێت، لەبەر ئەوەی تەنانەت تازەترین و باشترین بەرنامەی کۆمپیوتەر ناتوانێت ئەو دیاردانە شیتەڵ بکاتەوە.

شێوەیەکی تر لە وێنەکێشان کە ئابووریناسان هەندێ جار بەکاری دەهێنن پێیدەڵێن (گیستۆگرام) ئێستا هەر لەبەر رۆشنایی نموونەکەی پێشومان ئەم جۆرە وێنەیە روون دەکەینەوە.

هێڵکاری ژمارە (٣-٧) گەشەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی بەپێی نرخی ئاستەکیو ئێستەکی.




بەسەیر کردنی هێڵکارییەکەی سەرەوە دەبینین ڕێژەی گەشەکردنی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی ئەمەریکا بەپێی نرخی ئاستەکی کەمترە وەك لەڕێژەی گەشەکردنی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی بەنرخی ئێستەکی بەتایبەتی ساڵەکانی (١٩٩٠)، (١٩٩١)، (٢٠٠١). ئەمەش جارێکی تر راست و دروستی ژمێرکردنی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی بەپێی نرخی ئاستەکی دەسەلمێنێت.

## ئاگاداركردنەوە

کاتێك کەسەیری زانیارییە ئابوورییەکان دەکەین یان گوێمان لێی دەبێت بۆ ئەوەی توشی سەر لێشێوان و هەڵەنەبین پێویستە ئاگاداری ئەم خاڵانەی خوارەوە بین.

ئەگەر چاوێکی خێرا بگێڕینەوە بە نموونەکەی پێشوودا و، وە سەیری هەموو خشتەو وێنەکان بکەین، دەبینین بەشێوەیەکی گشتی پەیوەندی دیاردە ئابوورییەکان تەنها بە کاریگەری دوو فاکتەر یان دوو پێرستی ئابووری نیشاندراوە، بەڵام هەروەك دەزانین دیاردە ئابوورییەکان ئۆرگانێکی پێکەوە بەستراون فاکتەرەکان راستەوخۆ کاریگەرییان هەیە بۆسەر یەکتری. کاتێك نموونەمان لەسەر کاریگەری پلەی گەرما لەسەر قەوارەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی هێنایەوە، چەند فاکتەرێکی گرنگمان پشتگوێ خست وەك قەوارەی بەرهەم هێنان، رادەی هێزیکار، ئاستی بەرهەمهێنان، بەتەکنۆلۆژیا کردنی کەرتی کشتوکاڵی، رێژەی کەرتی گەشتوگوزار لە ئابووری نەتەوایەتیدا....هتد. کەواتە بەبێ لەبەر چاوگرتنی هەموو ئەم فاکتەرانە پێکەوە ناتوانین دەرئەنجامێکی راست و دروست بکەین لە دیاریکردنی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیدا و ئاڕاستەکەی.

زۆربەی جار لە راپۆرتە ئابوورییەکاندا گوێمان لێی دەبێت بەتایبەتی لە زمانی دەسەڵاتەوە کە داهاتی خەڵکی یان کرێی کارو مووچە بەرێژەی لە (٥٪) زیادی کردووە. ئایا مەبەست لەم زیادبوونە چییە؟ ئایا ئەم زیادبوونە بە پێی نرخی ئێستەکییە یان بەپێی نرخی ئاستەکی، ئایا ئەو زیادبوونە لە چ کاتێکی زەمەنیدا رووی داوە لەماوەی ساڵێکدا، مانگێکدا....هتد. گریمان ئەو زیادبوونە و لە ماوەی سێ مانگدا روویداوە کەواتە ئەوکاتە دەبێت رێژەی زیادبوونەکە زەربی چوار بکەین تاکو رێژەی ساڵێکمان دەست دەکەوێت.

هەروەها زۆربەی جار گوێمان لێ دەبێت لە زمانی سیاسەتمەدارانەوە، دەڵێن ژمارەی بێکاری بە رێژەی لە (٢٪) کەمی کردۆتەوە، ئەمە مانای چییە؟ ئایا ئەم رێژەیە کەمی کردوە بەراورد بەو ژمارەی بێکارانەی کە ئێستا کار ناکەن، یان ئایا ئەم رێژەیە بەراوردە بە ژمارەی هەموو دانیشتووانەوە.

هەروەها زۆربەی جار گوێمان لە راپۆرتە ئابوورییەکان دەبێت کە دەڵێن داهاتی ناوەندی تاکەکەس بریتییە لە ...؟، ئەگەر داهاتی ناوەندی بەشێوەیەکی ساکاری ماتماتیکانە ژمێربکەین ئەوا ئەنجامێکمان دەست دەکەوێت بەڵام ئەگەر لە روانگەی ئابوورییەوە لێی بکۆڵینەوە و ژمێری بکەین ئەوا ئەنجامێکی ترمان دەست دەکەوێت. هەوڵ دەدەین لەم نموونەیەی خوارەوەدا داهاتی ناوەندی تاکە کەسی دانیشتوانی ئەمەریکا روون بکەینەوە.



| داهاتی ساڵانە (دۆلار) | ژمارەی تاکە کەسەکان |
|---|---|
| ٩٤٠٠٠ | A |
| ٤١٠٠٠ | B |
| ٤٠٠٠٠ | C |
| ٣٩٠٠٠ | D |
| ٣٨٠٠٠ | E |
| ٣٧٠٠٠ | F |
| ٣٧٠٠٠ | G |

لە نموونەکەی سەرەوەدا ئەگەر بەهۆی ژمێرکردنی ساکاری ماتماتیکەوە ناوەندی داهاتی ساڵانەی خەڵی دیاریبکەین ئەوە بریتی دەبێت لە (٤٦٠٠٠) دۆلار ئەمەش بە دابەشکردنی کۆی هەموو داهاتەکان (٣٢٦٠٠٠) دۆلار بەسەر ژمارەی تاکە کەسەکاندا کە بریتییە لە (٧). بەڵام لە راستیدا ئەم ژمێریکردنە ناوەندی داهاتی خەڵکیمان نیشان نادات. ئەگەر لە روانگەیەکی ترەوە سەیری بکەین دەبینین بەرزترین داهات بریتییە لە (٩٤٠٠٠) دۆلار لە ساڵێکدا وە نزمترین داهات بریتییە (٣٧٠٠٠) دۆلار لە ساڵێکدا. ئابوریناسان میتۆدێکی تر بەکار دەهێنن لە ژمێرکردنی ناوەندی داهاتدا تا پێی دەوترێت (ناوەندارێتی). چونکە ئابووریناس پێویستە هەموو فاکتەرەکان کە کاریگەرییان هەیە لەسەر داهات شیتەڵ بکەنەوە دوای ئەوە ژمێری ناوەندی داهات دەکەن، لەم نمونەیەدا ناوەندێتی داهات بریتی دەبێت لە (٣٩٠٠٠) دۆلار. بەڵام بە ژمێرکردنی ساکاری ماتماتیکان بریتیبوو لە (٤٦٠٠٠) ئێستا سەیری ئەم جیاوازیانە بکە. کە بریتی دەبێت لە (٧٠٠٠) دۆلار لە ساڵێکدا بێگومان ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە.

کەواتە زانیاری ئابووریەکانو ئامارە ئابووریەکان تەنها برتیی نین لە ژمارەیەی رووت و هیچی تر بەڵکو تەعبیر لە دیاردە ئابووریو گۆڕانکارییە ئابوورییەکان دەکەن بۆیە پێویستە بە سەرنجەوە سەیری ئەو زانیارییانە بکەین.

# فەسڵی چوارەم

## دەستی شاراوە!

لەپێناوی جێبەجێكردنی داوا و خواستو پێویستییەكانی خەڵكی، كەسانو كۆمپانیاكانو دام و دەزگا حكوومییەكان دەكەونە چالاكی ئابووری، واتە ڕێدەكەون لەسەر كڕینو فرۆشتنی كالاّ و خزمەتگوزارییە بەرهەم هێنراوەكان بەرامبەر بە نرخێكی دیاریكراو. هەروەك لە فەسڵی دووەمدا باسمان لێكرد چالاكی ئابووریو مامەڵەكردن دەبێتە هۆی پێكهێنانی تێكڕای بەرهەمی نەتەوەیی هەندێ لە ئابووریناسان كویێ داوا و خواستەكان یەكسان دەكەن بە تێكڕای بەرهەمی نەتەوەیی بەپێی یاسا ئابورییەكان لە كۆی داوا و خواست هەبێت واتە خستنەروو پیشنیار هەیە. كەواتە خستنەروو رووەكەی ئەودیوی داواكانە.

بێگومان یاسای داوا و خستنەڕوو پابەندە بە چەندان فاكتەرەی كاریگەرەوە كە لە دوایدا بەدرێژی باسیان لێ دەكەین و هەروەها باس لە كاریگەری داوا و خستنەروو دەكەین لە دیاریكردنی بەها و نرخی كالاّ و خزمەتگوزارییەكان. كەواتە ئەو دەستە شاراوەیەی چییە كە سەواو مامەڵەی بەشدارانی بازاڕەكان ڕێكوپێك دەكەن وە چالاكیو جموجوڵە ئابوورییەكان ئاڕاستە دەكات. بە واتایەكی تر ئەوە دەستە شاراوەیە چییە كە سەرجەم پەیوەندییە ئابوورییەكان دیاری دەكات ئەو دەستە شاراوەیە بریتییە لە (داوا و خستنە روو) لەم فەسڵەدا هەوڵ دەدەین بە شێوەیەكی فراوان باس لەو دەستە شاراوەیە بكەین چونكە داوا و خستنەڕوو گرنگترین و كاریگەرترین تەوەری ئابوورییە بە تێگەیشتن لە ناوەڕۆكی یاساكانی داوا و خستنەڕوو دەتوانین هەموو دیاردە ئابوورییەكان شیتەڵ بكەین داوا و خستنەڕوو كلیلی گەورەی هەموو نهێنی زانستە ئابوورییەكانە هەر بۆیە پێی دەوترێت (هێزی شاراوە یان دەستی شاراوە).

**فەرهەنگی ئابووری**

یاسای خستنەڕوو خواست :(Law of demand and supply) یاسایەكی بنەڕەتییە لە ئابووریدا، نرخی هەر شمەكێك یان خزمەتگوزارییەك لەسەر هێزی خواستو هێزی خستەڕووی راوەستاوە، نرخیشی لە ئاستی هاوكێشەبوونی هەردوو هێزەكەدا جێگردەبێت.



## داوا و خواستەكان

لە بازاڕەكاندا هەر كالاّ و خزمەتگوزارییەك نرخی خۆی هەیە، وە تەنها كڕیار بڕیاری چارەنووسی كالاّ و خزمەتگوزارییەكان لە بازاڕەكاندا دەدات. سروشتی كڕیار لەوەدایە هەمیشە دەگەڕێت بەدوای هەرزانترین نرخدا بۆ كڕینی پێویستییەكانیو جێبەجێكردنی داوا و خواستەكانی، لەلایەكی ترەوە فرۆشیار هەمیشە هەوڵ دەدات بە نرخێكی گرانتر كالاّ و خزمەگوزارییەكان بفرۆشێت. كەواتە ململانێیەكی هەمیشەیی هەیە لە نێوان كڕیار و فرۆشیاردا، واتە لە نێوان داوا و خستنەڕوودا. ئابووریناسان ململانێ و ناكۆكی نێوان داوا و خستنەروو بە هێزی بزوێنەری هەموو پەیوەندییە ئابوورییەكان لە قەڵەم دەدەن. كەواتە لەبەر رۆشنایی ئەم بیرۆكەیە چەند نرخ كەمتر بێت كڕیار دەتوانێت كالاّ و خزمەتگوراییەكان بكڕێت، وە چەند نرخ بەرز بێت كڕیار بە بڕێكی كەمتر كالاّ و خزمەتگوزارییەكان بەدەست دەهێنێت. ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین خەڵكی زیاتر شەربەت و گوڵەبەڕۆژە دەكڕن وەك لە كەڤیارو ماسی، خەڵكی بەشێوەیەكی گشتی ئامێری هەرزان دەكڕن وەك لە ئامێرە گرانەكان.

ئێستا هەوڵ دەدەین بەهۆی نموونەیەكی ئاسانەوە پرۆسەی كڕینو فرۆشتن روون بكەینەوە گریمان سوپەرماركێتێك پسپۆڕە لە فرۆشتنی گۆشتی ئاژەڵدا. خاوەنی سوپەرماركێتەكە دەیەوێت بزانێت چەند كیلۆ گۆشت دەفرۆشێت لە ماوەیەكی دیاریكراودا بۆ ئەمەش گۆڕانكاری دەكات لە نرخدا واتە چەند نرخێكی جیا جیا بۆ كیلۆیەك كۆشت دیاری دەكات ئابووریناسان بەم پرۆسەیە دەڵێن خشتەی داواكان.

خشتەی ژمارە (٤-١) خشتەی داواكان:

| نرخ بۆ یەك كیلۆ گۆشت (دۆلار) | بڕی گۆشتی فرۆشراو بە (كیلۆ) |
| --- | --- |
| ٥,٠٠ | ٢٠ ٠٠٠ |
| ٤,٠٠ | ٤٠ ٠٠٠ |
| ٣,٠٠ | ٦٠ ٠٠٠ |
| ٢,٠٠ | ٨٠ ٠٠٠ |
| ١,٠٠ | ١٠٠ ٠٠٠ |

خشتەی داواکان بڕی گۆشتی فرۆشراومان نیشان دەدات بە نرخی جیاجیا، دەبینین چەند نرخ نزم بێت بڕی گۆشت زیاتر دەفرۆشرێت وە بە پێچەوانەشەوە چەند نرخ بەرز بێت بڕی گۆشت کەمتر دەفرۆشرێت.

لەم نموونەیەدا بە شێوەیەکی زۆر سادە پەیوەندی داوا و خواستەکانمان تەنهابە فاکتەری گۆڕانی نرخەوە بەستەوە، لە کاتێکدا کە چەندان فاکتەری تری کار دەکەنە سەر نرخی گۆشتی ئاژەڵ. وەك نرخی گۆشتی سپی (گۆشتی باڵندە) یان گۆشتی ماسی. ئێمە تەنها لەبەر ئاسانکردنی تێگەیشتنە لە یاسای دواکان زۆربەی فاکتەرەکانمان پشتگوێ خست ئێستا ئەگەر ئاماری خشتەکەی سەرەوە لە شێوەی وێنەدا نیشان بدەین ئەوا ئەم شێوەیەی خوارەوەمان دەست دەکەوێت.

وێنەی ژمارە (٤-١) چەماوەی داواکان:




ئەگەر سەیری وێنەکەی سەرەوە بکەین جارێکی تر بۆمان دەردەکەوێت چەند نرخ بەرزبێت گۆشت کەمتر دەفرۆشرێت وەئەمەش لە چەماوەی (D) لە وێنەکەی سەرەوەدا بە ئاشکرا دیارە، چاماوەی داواکان پەیوەندی راستەوخۆی قەوارەی گۆشت بە نرخی گۆشتەوە نیشان دەدات، لێرەدا پرسیارێکی لۆژیکی دێتە پێشەوە ئایا بۆچی کڕیار هەمیشە هەوڵی کڕینی کاڵا و خزمەتگوزارییە هەرزانەکان دەدات؟

هۆی یەکەم: لەبەر ئەوەی سروشتو سایکۆلۆژی مرۆڤ بەو شێوەیە هەڵکەتووە.



هۆی دووەم: سنووردارێتی توانای کڕین واتە سنووردارێتی داهات. ئێستا هەوڵ دەدەین بە شێوەیەکی فراوانتر باسی لە یاسای داوا بکەین بە رەچاوکردنی هەموو ئەو فاکتەرە گرنگانەی کە کاریگەری راستەوخۆیان هەیە. داوا گشتییەکان رەنگە بەرەو زیادبوون یان کەمبوون بچێت، ئەویش بەهۆی کاریگەری ئەم فاکتەرانەی خوارەوە

– زەوقو مەیلی کڕیار.
– ژمارەی دانیشتوان.
– جیاوازی نرخەکان.
– داهات.
– پێشبینیکردنی گۆڕانی نرخەکان.

ئێستاکە هەوڵ دەدەین یەك یەك ئەو فاکتەرانەی سەرەوە روون بکەینەوە.

**– زەوق و مەیلی کڕیار**

لە فەسڵی یەکەمدا باسمان لە جیاوازی زەوقو حەزەکانی خەڵکی کرد. کڕیار ئازادە لە هەڵبژاردنی چەندایەتیو چۆنایەتی کاڵا و خزمەتگوزارییەکاندا. هەڵسوکەوتی کڕیارەکان لە بازاڕەکاندا هەمەلایەنی و جیاوازن جیاوازییەتی زەوقەکان بۆتە هۆی بەرهەمهێنانی کاڵا و خزمەتگوزاری هەمەجۆر. بۆ نموونە هەموو کەس گۆشتی ئاژەڵ بەکارناهێنن لە ژەم خواردنەکانیاندا بەڵکو حەز بە گۆشتی باڵندە دەکەن. هەندێ جار باری کۆمەڵایەتی دەبێتە هۆی رێگر لەبەکارهێنانی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان، وەزیرێك ناتوانێت لەسەر شەقامەکان لەفەیەك گەس بخوات هەرچەندە حەز بە خواردنی ئەو لەفە گەسە بکات. کەواتە زەوقو مەیلی کڕیار کاریگەرییەکی راستەوخۆیان هەیە لەسەر قەوارەی فرۆشتنی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان، کەواتە کاریگەرییەکی راستەوخۆشیان هەیە لەسەر داوا و خواستەکان.

**– ژمارەی دانیشتوان**

هەروەك لە فەسڵی دووەمدا باسمانی لێکرد، ژمارەی دانیشتوان کارێکی گەورەیان هەیە لەسەر قەوارەی داواکانو، بۆ نموونە لە ساڵی (٢٠٠٢)دا ئابووری ئەرجەنتین تووشی تەنگەژییەکی قووڵ و فراوان بوو، ئەمەش بووە هۆی کۆچکردنو رەوکردنی سەدان هەزار ئەرجەنتینی بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، وەك ئاشکرایە دانیشتوانی ئەرجەنتین زۆر هۆگری گۆشتی سوورن بە تایبەتی مانگا، لەبەر ئەوە لە ئەمەریکا داوا لەسەر گۆشتی سوور زیادی کرد چونکە کۆچی ژمارەیەکی زۆری ئەرجەنتینی بە شێوەیەکی کتوپڕ بۆ

ئەمەریکا کە حەزیان بە گۆشی سوورە بووە هۆی زیادبوونی داوا لەسەر گۆشتی سوور، کەواتە زۆرتربوونی ژمارەی دانیشتوان بە شێوەیەکی راستەوخۆ کاردەکەنە سەر زیادبوونی داواکان بە شێوەیەکی گشتی هەندێ جار دەبێتە هۆی زیادبوونی داواکان بۆ کالآیەکی تایبەتی وەك نموونەکەی سەرەوەمان.

**– جیاوازی نرخەکان**

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ نموونەکەی پێشوومان، گریمان نرخی گۆشتی سوور نەگۆڕ و جێگیردەبێت لە ئاستێکی دیاریکراودا. بەلاّم لە هەمان کاتدا نرخی گۆشتی سپی (باڵندە) بەشێوەیەکی بەرچاو دادەبەزێت. کەواتە داوا لەسەر گۆشتی سوور کەمتر دەبێتەوەو، داوا و خواست بۆ گۆشی سپی زیاد دەکات، بۆچی؟ چونکە لە هەردوو حاڵەتەکەدا هەردوو بەرهەمەکە گۆشتن، مرۆڤ دەتوانێت لە جیاتی گۆشتی سوور گۆشتی سپی بخوات. ئەمەش پێی دەوترێت لەبری دانان، یان گۆڕین، واتە گۆڕینی بەرهەمێك لە بڕی بەرهەمێکی تر کە هەمان سیفەتیان هەیە.

دەتوانین چەند نموونەی تر بهێنینەوە لە گۆڕینی کالاّ و خزمەتگوزارییە لەیەك چووەکان لە سیفەتەدا.

ئەم فاکتەرە کاریگەرییەکی راستەوخۆی هەیە لەسەر پێکهێنانی داوای کالاّ و خزمەتگوزارییەکان بۆ نموونە تەلەفونی دەستی هەموو یەك سیفەتیان هەیە، کە بەهۆیەوە دەتوانین تەلەفۆنی پێ بکەین، بەلاّم لەهەمان کاتدا بازاڕ پڕە لە تەلەفۆنی دەستی جۆراوجۆر دەتوانین مارکەی نۆکیا بکڕین یان مارکەی سەمسۆنگ. دەتوانین تەلەفونی دەستی نەکڕین، تەنها تەلەفۆنی ئاسایی بەکار بهێنین‌و.. هتد...

کەواتە بوونی بەرهەمە جیاجیاکان بە هەمان سیفەتی بەکارهێنانەوە چەندایەتی داواکان زیاد دەکات، ئەوکاتە لەم کێبەرکێیەدا لە نێوان کۆمپانیا بەرهەم هێنەرەکاندا هەوڵی بەرهەم هێنانی جۆریەتی باش دەدەن واتە پاشکردنی جۆریەتی کالاّ و خزمەتگوزارییەکان بە نرخی گونجاو ئەمەش هەموو لەبەژەوەندی کڕیاردا دەبێت.

**فەرهەنگی ئابووری**

لە بری دانان – واتە بەکارهێنانی کالاّ و خزمەتگوزاری لە بری کالاّ و خزمەتگوزارییەکی تر کە هەمان سیفەتیان هەیە. ئابووریناسان چەند زاراوەیەکیان بۆ ئەم



دیاردەیە داناوە کە هەمان مانایان هەیە، ئەو زاراوانەش (جێگرتن، گۆڕینی بەرهەم بە بەرهەم، شوێن گۆڕکێی بەرهەمەکان.

**- داهـــــــــات**

هەروەك فاکتەرەکانی تر بەرزی و نزمی (کەمی‌و زۆری) داهاتی دانیشتوان کاریگەرییەکی راستەوخۆیان هەیە لەسەر داواکان. بەپێی بەرزبوونەوەی داهات داواکان زیاد دەکەن، وە بەکەمبوونەوەی داهات داوای کالاّ و خزمەتگوزارییەکان کەم دەبێتەوە. ئەو ولاّتانەی کە داهاتی دانیشتوانی بەرزە وەك ولاّتە پێشکەوتووە پیشەسازییەکان‌و ولاّتەکانی کەنداوی عەرەب داهاتیان رێگەی ئەوەیان پێ دەدات ئەو کالاّ و خزمەتگوزارییانە بکڕن کە جۆرێتییەکەی بەرزە وە هەندێ کالاّ و خزمەتگوزاری بەلای کڕیاری ئەو ولاّتانەوە بەستاندارت دەژمێردرێت بۆ نموونە گۆشت، بەلاّم لە ولاّتە دواکەوتوو, هەژارەکاندا گۆشت بە بەرهەمێکی ستاندارت دانانرێت, چونکە داهاتی خەڵکی ئەو ولاّتانە نزمە رێگەیان پێ نادات کە هەموو رۆژێك گۆشت لە ژەم خوادنەکانیاندا بەکار بهێنن. کەواتە بڕی داهات کارێکی راستەوخۆیان هەیە لەسەر داواکان. ئەرك‌و هەوڵی حکومەتەکان هەمیشە بەرزکردنەوە و زیادکردنی داهاتی خەڵکییە چونکە رێژەی داهات کاریگەری راستەوخۆی هەیە لەسەر ئابووری بە گشتی کە لەبەشەکانی داهاتوودا بە درێژی باسی لێ دەکەین.

**فەرهەنگی ئابووری**

داهات، دەسکەوت Income: بریتییە لەو راژەیەی یان ئەو کەڵکەی کە بەهۆی سەرمایە یان کارەوە پەیدابێت. ئەمەش دوو سەرچاوەی هەیە:

١) خاوەندارێتی کەسێك لەمایە، ئەم جۆرە (داهاتی نادەر دەست)ی پێی دەگوترێ.

٢) ئەو داهاتەی کە لەئەنجامی چالاکییەکە ئابووری دێتەدی، ئەم جۆرەش (داهاتی دەردەست)ی پێدەگوترێ.

داهات چەند شێوەیەکی هەیە، لەهەرە گرنگەکانیان:

| | |
|---|---|
| - سەرجەمی داهات | Gross Income |
| - داهاتی راستەکی (راستەقینە) | Real Income |
| - داهاتی ساڵانە | Annuitant |
| - داهاتی رووت | Net Income |
| - داهاتی نەتەوە | National Income |
| - داهاتی هەمەکی | Total Income |
| - داهاتی دەردەست | Earned Income |
| - داهاتی نەخت | Money Income |

- سەرجەمی داهات:

سەرجەمی ئەو داهاتەیە کە دەست کەسێك دەکەوێت لەماوەی کاتێکی دیاریکراودا

- داهاتی راستەکی (راستەقینە):

بڕی ئەو شمەكو خزمەتگوزارییانەیە کە ئەو خەڵکانە بە داهاتی نەخت دەستیان دەکەوێت.

- داهاتی ساڵانە:

ئەو کەسەی کە بە درێژایی تەمەنی مووچەیەکی یان کرێیەکی ساڵانە وەردەگرێت.

- داهاتی رووت:

ئەوەی لە مەرجەمی داهاتەوە دەمێنێت پاش پێدانی تێچوونی بەرهەم و بەکاربردن و چاککردنەوە.

- داهاتی نەتەوە:

لە گشت شمەك و خزمەتگوزارییانە پێکهاتووە کە لەماوەی ساڵێکدا دێتە بەرهەم.

- داهاتی هەمەکی (سەرجەمی داهات):

سەرجەمی داهاتی گشت کەسان لە شێوەی کرێ و موچە، یان خزمەتگوزاریی جۆرو جیاواز کە شێوەی قازانج یان سوود وەردەگرێ بەم واتایە سەرجەمی داهات = سەرجەمی هەموو بەرهەم لە ئابووری نیشتمانیدا لە ماوەو کاتێکی دیاریکراودا.

- داهاتی دەردەست:

ئەو داهاتەیە کە کەسێك دەستی دێنێت لە ئەنجامی ئەو رەنجەی کە بەختی دەکات، وەك کرێ و موچە.



- داهاتی نەخت:

بڕی ئەو پارەیەیە کە دەست خەڵکی دەکەوێت لە ماوە و کاتێکی دیاریکراودا.

**فەرهەنگی ئابووری**

ستاندارت: داوا لەسەر کاڵا و خزمەتگوزارییەکان کە ستاندارتن بەپێی زیادەی داهات زیاد دەکات، بەڵام داوا لەسەر کاڵا و خزمەتگوزارییەکان کە سیفەتی ستاندارتیان تێدا نییە واتە جۆریەتی نزمو خراپ بەپێی بەرزبوونەوەی قەوارەی داهات کەمتر دەبێتەوە.

- **پێشبینکردنی گۆڕانی نرخەکان**

یەکێك لە فاکتەرەکانی تر کە کاریگەری راستەوخۆ دەکەنە سەر داواکان خەرجی کریارە لە داهاتوودا بۆ نموونە ئەگەر کریار بزانێت کە دوای ماوەیەکی دیاریکراو (مانگێك) نرخی گۆشت بەرزدەبێتەوە ئەوا کریار یەکسەر دەکەوێتە گۆشت کرین و فرێزەرەکەی پڕدەکات لە گۆشت بۆئەوەی لە داهاتوودا بەنرخی گران گۆشت نەکرێت ئەمەش پێی دەوترێت پێشبینیکردنی گۆڕانی نرخەکانی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان. بەڵام ئەم فاکتەرە کاریگەری نییە لەسەر هەندێ خزمەتگوزاری بۆ نموونە ئەگەر سەرتاشەکان بڕیار بدەن نرخی سەرتاشین بەرزبکەنەوە ئەوا خەڵکی ناتوانن زیادبوونی قژ رابگرن وە سەرنەتاشن تاکو هەرزان دەبێت ناچاردەبێت کەی قژی زۆربوو سەربتاشێت هەرچەندە نرخی سەر تاشینیش بەرزبێت. کەواتە گۆڕانکاری نرخ لە داهاتوودا کارێکی راستەوخۆیان هەیە لەسەر داواکان بەرەو کەمبوونەوە یان بەرەو زیادبوون.

ئێستا هەوڵ دەدەین بەهۆی ئەم وێنەیەی خوارەوە رادەی گۆڕینی داواکان بەپێی گۆڕینی نرخی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان زیاتر روون بکەینەوە. وە هەروەها هەوڵ دەدەین بەهۆی وێنە و خشتەکانی خوارەوە سیفەتی فاکتەرەکانی سەرەوە لەسەر داواکان روون بکەینەوە.

وێنەی ژمارە (٤-٢) گۆڕانی داوا گشتییەکان:

D1 = بۆ سەرەوە (زیادبوونی داواکان)

D2 = بۆ خوارەوە (کەم بوونەوەی داواکان)




جارێکی تر گەڕاینەوە سەر کاریگەری نرخ لەسەر داواکان، لە وێنەکەی پێشوودا دەبینین کاتێك نرخی گۆشت لە (٤) دۆلارەوە بۆ یەك کیلۆ دادەبەزێت بۆ (٣) دۆلار بۆ یەك کیلۆ ئەوا قەوارەی گۆشت فرۆشتن لە (٤٠٠٠٠) کیلۆوە زیاد دەبێت بۆ (٦٠٠٠٠) کیلۆ وە ئەمەش بە هەردوو چەماوەی (D2) وە چەماوەی (D1) نیشان دراوە، بەڵام چەماوەی (D) نرخی گۆشتمان نیشان دەدات بە نەگۆڕی واتە (٥) دۆلار بۆ هەر کیلۆیەك.

ئێستا بۆ زیاتر روون کردنەوە وێنەکەی پێشوو لەشێوەی نەخشەکێشانی ئەم خشتەیەی خوارەوەدا نیشان دەدەین.

خشتەی ژمارە (٤—٢) سیفەتی گۆڕانی داواکان:

| | داوا نەگۆڕەکان | زیادبوونی داواکان | کەمبوونی داواکان |
|---|---|---|---|
| | چەماوەی D | چەماوەی D1 | چەماوەی D2 |
| نرخ بۆ یەك کیلۆ گۆشت (دۆلار) | کیلۆ گۆشت | گۆشت بە کیلۆ | کیلۆ گۆشت |
| ٥,٠٠ | ٢٠٠٠٠ | ٣٠٠٠٠ | ١٠٠٠٠ |
| ٤,٠٠ | ٤٠٠٠٠ | ٥٠٠٠٠ | ٣٠٠٠٠ |
| ٣,٠٠ | ٦٠٠٠٠ | ٧٠٠٠٠ | ٥٠٠٠٠ |
| ٢,٠٠ | ٨٠٠٠٠ | ٩٠٠٠٠ | ٧٠٠٠٠ |
| ١,٠٠ | ١٠٠٠٠٠ | ١١٠٠٠٠ | ٩٠٠٠٠ |



ئامارەکانی خشتەی سەرەوە جارێکی تر دەیسەلمێنێت کە قەوارەی گۆشت فرۆشتن پەیوەندی راستەوخۆی هەیە بە نرخی گۆشتەوە واتە داواکان بەپێی گۆڕینی نرخ دەگۆڕێت، بەڵام ئەگەر زۆر بە وردی لە ژمارەکانی ناو خشتەکە بکۆڵینەوە ئەوا دەبینین جگە لە نرخ سیفەتی بەرهەم کار دەکەنە سەر داواکان. دەبینین کاتێك نرخی گۆشت بۆ یەك کیلۆ بریتییە لە (٣) دۆلار ئەوا قەوارەی فرۆشتن زیادەبێت بە بڕی (٧٠٠٠) کیلۆ ئایا ئەبێ هۆکەی چی بێت؟ هۆ زۆرە بەڵام هەرە گرنگەکان رەنگە لەو ماوەیەدا نرخی گۆشتی سپی زۆر بەرز بێتەوە بۆیە خەڵکی زیاتر گۆشتی سوور دەکڕن، یان رەنگە داهاتی خەڵکی زیادی کرد بێت بەرێژەیەك کە دەتوانن زیاتر گۆشتی سوور بکڕن, بەڵام کاتێك نرخی گۆشت بەهەمان نرخدا (٣) دۆلار بۆ کیلۆیەك دەفرۆشرێت. سەیر دەکەین داوا کەم دەبێتەوە چاماوەی (D2) بۆ (٥٠٠٠٠) کیلۆ.

چۆن ئەم گۆڕانە روون بکەینەوە ، روونکردنەوە ئەم دیاردەیە لە خودی گۆڕانی سیفەتی داواکانە. چونکە رەنگە لەو کاتەدا گۆشتی سپی زۆر نرم بووبێتەوە بۆیە خەڵکی زیاتر گۆشتی سپی لەچاو گۆشتی سووردا دەکڕن، یان رەنگە داهاتی خەڵکی کەم بووبێتەوە بەهۆی تەنگەژی ئابوورییەوە یان رەنگە ژمارەی بێکاران زیادی کردبێت کەواتە دەتوانین بڵێین سیفەتی گۆڕانی داواکان کاریگەرییەکی راستەوخۆیان هەیە لەسەر قەوارەی فرۆشتنی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان.

**فەرهەنگی ئابووری**

خواست (Demand) : بڕی ئەو شمەکیە کەیەکێك ئارەزووی دەکات و دەتوانێت بەنرخی جیاواز لەکات و شوێنێکی دیاری کراودا بیکڕێت.

خواست چەند جۆر و شێوەیەکی هەیە, لەهەرە گرنگەکانیان:

- خواستی بەکاربردن — Consumption Demand
- خواستی جێگیر — Alterante Demand
- خواستی بازاڕ — Market Demand
- خواستی داخراو — Closed Demand
- خواستی بێجیر — Inelastic Demand
- زێدە خواست — Excess Demand
- خواستی کارا (هەرمێن) — Effective Demand
- خواستی هەمەکی (سەرجەمی خواست) — Aggregate Demand
- فرە خواست — Multiple Demand

| | |
|---|---|
| - خواستی هاوجێر | Unitary Elasticity Demand |
| - خواستی تەواوکەر | Complementary Demand |
| - خواستی ئاوێتە | Composite Demand |
| - خواستی بەجێر (بەپێز) | Elastic Demand |
| - خواستی بەکاربەر | Consumer’s Demand |
| - خواستی هاوبەش | Joint Demand |
| - خواستی وەرگیراو | Derived Demand |
| - خواستی گیرۆ | Limited Order |
| - خواستی دوایەکی (دواخواست) | Final Demand |

- خواستی بەکاربردن:

خواستی خەڵك لەسەر شمەکی بەکاربردندا.

- خواستی جێگیر:

خواست لەسەر زیاتر لەیەك شمەك بۆ تێرکردنی پێداویستییەکی مرۆیی دیارکراو.

- خواستی بازاڕ:

شمەك‌و خزمەتگوزاری خواستراو بەنرخی ڕەوەن و باو لەبازاڕێکی دیارکراودا.

-خواستی داخراو:

ئەم زاراوەیە لە مەیانی بازرگانی دەوڵەتیدا بەواتای خواستی کڕینی دەرەکی دێ، واتە ئەو خواستە دەرەکییەی کە لەرێگەی نێوانبەرو (Agent)ەوە جێبەجێ دەکرێت.

-خواستی بێجێر:

بارێکە تیایدا گۆڕانی ڕێژەیی لە بڕی خواستراودا کەمترە لە گۆڕانی ڕێژەیی لە نرخدا.

-زێدە خواست:

ئەو بارەیە کە تێیدا ئەو بڕەی کڕیارەکان ئارەزووی کڕینیان هەیە لە شمەك‌و خزمەتگوزاریی زیاترە لەو بڕەی کە فرۆشیارەکان ئامادەن بیفرۆشن.

- خواستی کارا (هەرمێن):

زاراوەیەکە (کینز)ی ئابووریناس بۆ دەربڕینی خواستی هەمەکی بەکاری دەهێنن واتە خەرجی هەمەکی لە کۆمەڵگەیەکدا، ئەم خواستەش لە خواستی بەکاربردن خواستی وەبەرهێنان پێکهاتووە.



- خواستی هەمەکی (سەرجەمی خواست):

سەرجەمی خواست لەسەر شمەك و خزمەتگوزاریی لە کۆمەڵێکدا.

- فرە خواست:

خواست لەسەر شمەکێك خواستێکی فرە دەبێت ئەگەر ئەم شمەکە توانای تێرکردنی چەند پێداویستییەکی جیاوازی هەبێت، واتە ئەگەر چەند جۆرە بەکارهێنانێکی هەبێت، وەك کارەبا کە بۆچەند مەبەستێك بەکار دێت.

- خواستی هاوجێر:

بارێکە تێیدا ڕێژەی گۆڕان لەبڕی خواستراودا یەکسانە بە ڕێژەی گۆڕان لە نرخدا.

- خواستی تەواوکەر:

دوو شمەك یان زیاتر خواستەکەیان تەواوکەری یەکتر دەبێت ئەگەر بێتوو زیاد بوونی خواست لەسەر یەکێکیاندا ببێتە هۆی زیاد بوونی خواست لەسەر هی دیکەدا، وەك گەرێن و بەنزین.

- خواستی ئاوێتە:

خواست لەسەر شمەك‌و خزمەتگوزاری بۆ چەند مەبەستێکی جیاواز.

- خواستی بەجێر (بەپێز):

بارێکە تیایدا گۆڕانی ڕێژەیی لەپڕی خواستراودا گەورەترە لە گۆڕانی ڕێژەیی لە نرخدا.

- خواستی بەکاربەر:

بڕی ئەو شمەکەو خزمەتگوزرارییەیە کە بەکاربەر ئارەزووی وەدەست هێنانیان دەکات لە ماوەی کاتێکی دیاریکراودا، بە مەرجێ ئەم ئارەزووە بەهێزی کڕین_واتە پارە) نیشان بدرێت.

- خواستی هاوبەش:

زاراوەیەکی ئابوورییە بەواتای پێوەندیی نێوان نرخەکانی هەندێ شمەك دێ، بەهۆی هاوبەشی خواست لەسەر ئەم شمەکانەدا، بۆ نموونەی خواست لەسەر چای و شەکر، خواستێکی هاوبەشە.

- خواستی وەرگیراو:

خواستی شمەکێك لە خواستی شمەکێکی دیکە وەرگیرابێ.

- خواستی گیرۆ:

ئەو کۆتانەی کە دەخرێتە سەر خواستی کڕین‌و فرۆشتن لە بازاڕی کاغەزی داراییدا. وەك خۆ بەنرخێك بەستن.

- خواستی دوایەکی (دواخواست):

ئەم زاراوەیە لە پلاندانانی ئابووریدا بە واتای بەکاربردنی دوایەکی بەکاردێت بەهەردوو جۆرییەوە (خێزانومیری )+ وە بەرهێنانو هەناردراو. ئەمەیش بە گوێرەی ئەم هاوکێشەیە.

بەرهەمی خۆجێیەکی + هاوردراو = خواستی نێوینە + خواستی دوایەکی = پێداویستییەکانی بەرهەم = دوا بەکاربردنی خێزان + دوابەکاربردنی میری + وەبەرهێنان + هەناردراو.

## خستنەڕوو و پێشنیازەکان

هەرچۆن کڕیار ئامادەیە بە نرخێکی گونجاو کالاّ و خزمەتگوزارییەکان بکڕێت، ئەوا بەرهەمهێنەریش ئامادەیە بە نرخێکی گونجاو کالاّ و خزمەتگوزارییەکانی بفرۆشێت. لە خشتەی ژمارە (٤—١) خشتەی داواکان لە نێوان نرخو قەوارەی بەرهەم روون کردەوە لە روانگەی کڕیارەوە. لە خوارەوە هەمان خشتە دووبارە دەکەینەوە لە روانگەی فرۆشیارەوە واتە خشتەی خستنەڕوو.

خشتەی ژمارە (٤—٣) خشتەی خستنەڕوو:

| نرخی یەك کیلۆ گۆشت (دۆلار) | بڕی گۆشتی فرۆشراو (کیلۆ) |
|---|---|
| ٥,٠٠ | ١٢٠٠٠٠ |
| ٤,٠٠ | ٩٠٠٠٠ |
| ٣,٠٠ | ٦٠٠٠٠ |
| ٢,٠٠ | ٣٠٠٠٠ |
| ١,٠٠ | ٠ |

لە خشتەکەی سەرەوەدا تێبینی دەکەین کە ژمارەکان کەمێك گۆڕان، چونکە بەکارهێنانی گۆشت بە نرخێکی دیاریکراو جیاوازی هەیە لەبەرهەمی گۆشت بەرامبەر نرخێکی دیاریکراو. لە خشتەکەدا دەبینین بەرهەمهێنەر (فرۆشیار) ئامادەیە تەنها ئەو بڕە گۆشتە بەرهەم بهێنێت کە بە نرخێکی گونجاو دەفرۆشرێت. چەند نرخ بەرزبێتەوە بەرهەمهێنەر زیاتر گۆشت بەرهەم دەهێنێت کاتێك نرخ (٥) دۆلارە بۆ هەر کیلۆیەك ئەوا بەرهەمهێنەر بڕی (١٢٠٠٠٠) کیلۆ گۆشت بەرهەم دەهێنێت بەلاّم چەند نرخ کەمبێتەوە



بەرهەمهێنەر کەمتر گۆشت بەرهەم دەهێنێت. هەروەك لە سەرەتای ئەم فەسڵەدا ئاماژەمان پێدا. خستنەڕوو دیوە پێچەوانەکەی داواکانە.

ئێستا ئەگەر ئەم خشتەیە لە شێوەی وێنەدا نەخشە بکێشین ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە پەیوەندی بڕی بەرهەمهێنان و نرخ، پێچەوانەی پەیوەندی نرخو بەرهەمهێنانە لە حاڵەتی سەیرکردنی داواکاندا.

وێنەی ژمارە (٤-٣) چەماوەی خستنەڕوو:




لە وێنەکەی سەرەوەدا دەبینین چەماوەی خستنەڕوو نیشانمان دەدات کە بەرهەمهێنەر ئامادەیی بەرهەمی چەندێ بڕی گۆشتی هەیە بۆ فرۆشتن بە نرخێکی دیاریکراو. سەیردەکەین بڕی بەرهەم جیاوازە لەو بڕەی کە کڕیار ئامادەیە بیکڕێت بە نرخێکی دیاریکراو، (لە دوایدا چارەسەرکردنی ئەم ناکۆکییە روون دەکەینەوە). بێگومان جگە لە گۆڕانی قەبارەی بەرهەم بەنرخەوە، چەند فاکتەرێکی تریش کاردەکەنە سەر قەبارەی بەرهەمهێنان، واتە ئەو فاکتەرانە چین کە کاردەکەنە سەر خستنەرووی کالاّ و خزمەتگوزارییەکان. هەرە فاکتەرە گرنگەکان کە کاریگەرییان هەیە لەسەر گۆڕانی خستنەڕوو بریتین لە:

- ئاستی بەرهەمهێنان.
- پێکهاتەی تێچوون.
- جیاوازی نرخەکان.

- پێشبینکردنی گۆڕانی نرخەکان.

ئێستا هەریەك لەو فاکتەرانە روون دەکەینەوە:

**– ئاستی بەرهەمهێنان:**

هەندێ جار لە راپۆرتە ئابوورییەکاندا گوێمان لێدەبێت کە ئاستی بەرهەمهێنان لە فلانە کەرتی ئابووریدا بەرزە یان زۆر بەرز بۆتەوە. بەرزبوونەوەی ئاستی بەرهەمهێنان لە ساڵی (٢٠٠٠)دا لە کەرتی تەکنۆلۆژیای زانیاریدا زۆر بەرزبوو، چونکە بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای زانیاریو داوایەکی زۆر لەسەر بەرهەمەکانی وەك کۆمپیوتەر، سەتەلایت، تەلەفونی دەستی..هتد. لە ساڵەکانی (١٩٩٠)دا زۆربەی زۆری کۆپانیاکانی کە لەم بوارەدا بەرهەم دەهێنن بە خێرایی بەرهەمەکانیان زیادی کرد ئەمەش بووە هۆی زیادبوونی خستنەرووی ئەو جۆرە بەرهەمانە لە بازارەکاندا ئەوەتا رۆژ بەرۆژ نرخی کۆمپیوتەر، سەتەلایت، تەلەفونی گەرۆك، کامێرای ڤیدیۆ..هتد. هەرزان دەبێت چونکە خستەروو زۆرترە وەك لە داوا.

بێگومان نەك تەنها بەرزبوونەوەی ئاستی بەرهەم بۆتە هۆی زیادبوونی خستنەرووی بەرهەمی تەکنەلۆژیای زانیاری بەڵکو فاکتەرێکی تری گرنگیش کاریگەری خۆیان کردۆتە سەر زیادبوونی بڕی بەرهەمی ئەو کەرتە ئابوورییە، ئەویش زۆری کۆمپانیا بەرهەم هێنەرەکانە لەو بوارەدا چ کۆمپانیا گەورەکان چ کۆمپانیا بچووکەکان. بێگومان چەند ژمارەی بەرهەمهێنەرانی کەرتێکی دیاریکراو زیاتر بن ئەوا بڕی بەرهەم زۆرتر دەبێت.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ نموونەکەی پێشومان کاتێك داوا لەسەر گۆشت زیاد دەبێت ئەوا بەرهەمی گۆشت لە لایەن بەرهەمهێنەرانەوە زیاتر دەبێت. بەرهەمهێنەر هەوڵ دەدات بەهۆی بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیای نوێوە ئاستی بەهەمهێنانو بڕی بەرهەم زیاد بکات. تا رادەیەکی وا خستنەروو زیاتر دەبێت لە داواکان. ئەمەش دەبێتە هۆی دابەزینی نرخ، بێگومان بەرهەمهێنەر نایەوێت بە نرخێکی هەرزان بەرهەمەکانی بفرۆشێت چارەسەری ئەم ناکۆکییە تەنها بەهۆی هێزی دەستی شاراوەی بازارەوە دەبێت واتە بەهۆی هاوسەنگی داوا و خستنەروو کە لەدوایدا باسی لێدەکەین.

**– پێکهاتەی تێچوون:**

ئەگەر بەهای یەکێك لە فاکتەرەکانی بەرهەمهێنان (کەرەسەی خاوو، کرێی کار، ئامێر و مەکائن) نزم بێت ئەوا نرخی تێچوونی گشتی بەرهەمهێنان کەم دەبێتەوە، ئەوکاتە بەرهەمهێنەر دەتوانێت بڕێکی زیاتر بەرهەم بهێنێت بێ ئەوەی نرخ بەرز بکاتەوە ئەمەش



دەبێتە هۆی زیادبوونی خستنەروو. کەواتە کەم بوونەوەی نرخی تێچوون دەبێتە هۆی دابەزینی نرخی کاڵای بەرهەمهێنراو.

بە پێچەوانەشەوە ئەگەر بەهای فاکتەرەکانی بەرهەمهێنان بەرزبن ئەوا نرخی تێچوونی بەرهەم زیاد دەکات ئەمەش دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی قەوارەی بەرهەمو کەمبوونەوەی رادەی خستنەروو لەئەنجامدا نرخی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان بەرز دەبنەوە، هەموو دەزانین زیادبوونی نرخ لەبەرژەوەندی کڕیار نییە لەبەرئەوە توانای کڕین کەم دەبێتەوە، یان کڕیار ئامادەیی تێدا نییە ئەو بەرهەمە بکڕێت پەنا دەباتە بەر کڕینی بەرهەمێکی تر کە هەمان سیفەتی هەبێت.

**فەرهەنگی ئابووری**

تێچوون Cost: ئەو بڕە پارەیەیە کە بەرهەمهێن بۆ وەبەرهێنانی شمەکێك لەبەرهەم ماکە جیاوازەکاندا خەرجی دەکات.

جۆرە سەرەکییەکانی تێچوون بریتین لە:

- تێچوونی رەها Absolute Cost
- تێچوونی ڕێژەیی Comparative Costs
- تێچوونی سەرەتایی Prime Costs
- تێچوونی فرۆتەنی Selling Costs
- تێچوونی خەملێنراو Estimated Cost
- تێچوونی نەگۆڕ Fixed Costs
- تێچوونی رادەدار Marginal cost
- تێچوونی راستەقینە Real cost
- تێچوونی نیمچە گۆڕاو Semi – Variable Costs
- تێچوونی شاراوە (نادیار) Implicit Costs
- تێچوونی ئاشکرا (دیار) Explicit Costs
- تێچوونی بەرهەم ماکەکان Factor Costs
- تێچوونی هەمەکی Total Costs
- تێچوونی راستەوخۆ Direct Costs
- تێچوونی گۆڕاو Variable Costs
- تێچوونی تێکرایی (تێکڕای تێچوون) Average Costs

- تێچوونی هاوبەش Joint Costs
- تێچوونی نەختینە Monetary Costs
- تێچوونی گواستنەوە Transfer Costs

- تێچوونی ڕەها:

تێچوونی هەر دانەیەك لـە دانـەکانی کەلوپـەلێکی دیـاریکراو، بـێ ئـەوەی بـە تێـچوونی بەرهەمهێنانێکی دیکەدا هاوسەنگ بکرێ.

- تێچوونی ڕێژەیی:

بریتییە لە ڕێژەی نێوان تێچوونی بەرهەمهێنانی دانەیەك لـە کەلوپـەلێکی دیـاریکراو لـە ولاتێکدا بە پێواری تێچوونی بەهەمهێنانی دانەیەك لە هەمان کەلوپەل لە ولاتێکی دیکەدا.

- تێچوونی سەرەتایی:

مەبەست لە تێچوونی گۆڕاوە، لـە ژمێریاریـشدا مەبەسـت لـە توخمـەکانی تێـچوونە وەك کەرەستەی سەرەتاییو کرێی کاری ڕاستەوخۆ خەرجی ڕاستەوخۆ.

- تێچوونی فرۆتەنی:

ئەو تێـچوونەیە کـە دەزگـا بەرگـەی دەگرێـت لـە ئـەنجامی سـازکردنەوە و بەخـشکردنی بەرهەمەکانی، ئەوەش تێچوونی جارِ لێدانو گواستنەوە و.. هتد. دەگرێتەوە.

- تێچوونی خەملکراو:

خەملاندن تێچوونی چاوەڕوانکراو پێش ئەوەی دەست بە چالاکی بەرهەمداری بکرێت.

- تێچوونی نەگۆڕ (ناڕاستەوخۆ):

ئەو تێچوونەیە کە بە گۆڕانی قەوارەی بەرهەم یان فرۆتەنی ناگۆڕێ.

- تێچوونی ڕادەدار:

بڕی ئەو تێچوونەیە کـە دەردێتـە پـاڵ سـەرجەمی تێـچوونەکان لـە ئـەنجامی فراوانکرنـی قەوارەی شمەکی بەرهەمهێنراو بە تاکە دانەیەك.

- تێچوونی ڕاستەقینە:

دەربڕینێکە بۆ ئەو بڕە ڕاستەقینەیەی بەرهەم ماکەکان کە لەبەرهەمهێنانا بەخت دەکرێت.

- تێچوونی نیمچەگۆڕاو:



ئەو تێچوونەیە کە بە گـۆڕانێکی کتـوپڕ لـە ئاسـتی چـالاکی دەزگایەکـدا دەگـۆڕێ بـەلاَم بەهەمان ڕێژە ناگۆڕێ.

- تێچوونی شاراوە (نادیار):

ئەو پارەیەیە کەدەبێت خاوەنی کـار بۆخـۆی دابینێـت کـە لـەجیاتی ئـەو خزمەتـەی کـە پێشکەش بە پرۆژەکە دەیکات، یا ئەو بەشەیە لە تێچوون کە لە شێوەی پێـوراوی ئاشـکرا بـە دیار ناکەوێت.

- تێچوونی ئاشکرا (دیار):

بریتییە لەو پارەیەی کە دەدرێتە خاوەنی هۆکانی بەرهەمهێنان، جگە لەخاوەن پرۆژەکە، لە جیاتی ئەو خزمەتەی کە پێشکەشی دەکەن.

- تێچوونی بەرهەم ماکەکان:

تێچوونی ئەو بەرهەمە ماکانەی کە بەشداری لە بەرهەمهێنانێکی دیاریکراودا دەکەن.

- تێچوونی هەمەکی (سەرجەمی تێچوونی):

سەرجەمی ئەو تێچوونانەیە کە بەرهەمهێن دەیدات، واتە تێچوونی نەگۆڕ + تێچوونی گۆڕاو.

- تێچوونی ڕاستەوخۆ (گۆڕاو):

ئەو تێچوونەیە کە بەگۆڕانی قەوارەی بەرهەم دەگۆڕێ، پێشی دەوترێت تێچوونی ڕاسـتەوخۆ یان بنەڕەت، وەك کرێی کرێکار و گواستنەوە.

- تێکرای تێچوون:

ئەمەش تێکڕای تێچوونی دانەیەکی بەرهـەمهێنراوە و ئـەم تێکڕاییـەش بـە دابەشـکردنی سەرجەمی تێچوون بەسەر ژمارەی دانەکانی شمەك بەرهەمهێنراوەکاندا دێتە کایەوە. هـەروەها (تێچوونی یەك دانە)شی پێ دەگوترێت.

- تێچوونی هاوبەش:

ئەو تێچوونەیە کە دەزگا بەرگەی دەگرێت کاتێ بەرهەمهێنانی دووشمەك یان زیاتر.

- تێچوونی نەختینە:

بریتییە لە تێچوونی یاسایی کە بەپارە نیشان دەدرێت.

- تێچوونی گواستنەوە:

بریتییە لەو تێچوونەی کە دەزگا بەرگەی دەگرێت لە گواستنەوەی کەرەستەی سەرەتایی بـۆ کارگە، یان گواستنەوەی شمەکی تەواو دروستکراو لە کارگەوە بۆ بازاڕ.

### - جیاوازی نرخەکان:

بۆچوونی بەرهەمهێنەر واتە فرۆشیار، جیاوازە لە بۆچوونی بەکاربەر، لەپێشەوە باسمان لێکرد ئەگەر نرخی بەرهەمێك بەرزبێتەوە ئەوا کڕیار هەوڵ دەدات بیگۆڕێت بۆ بەرهەمێکی تر کەهەمان سیفەتی هەبێت بەڵام بەمەرجێك نرخەکەی هەرزان بێت. بەڵام بەرهەمهێنەر بەجۆرێکی تر مامەڵە لەگەڵ ئەم دیاردەیە دەکات. بەرهەمهێنەر بۆ ئەوەی کڕیارەکانی لە دەست نەچێت، هەوڵدەدات چەند جۆرە بەرهەمێکی جیاواز بەرهەم بهێنێت بەمەرجێك هەمان سیفەتی بەکارهێنانیان هەبێت وە هەمان کات هەوڵی کەمکردنەوەی نرخەکانیش دەدات.

ئەگەر جارێکی تر بگەڕێینەوە بۆ نموونەکەی پێشوومان، بەرهەمهێنەری گۆشت دەتوانێت گۆشتی مانگا بەرهەم بهێنێت یان گۆشتی مەڕ، هەردووکیان هەر گۆشتن تەنها سیفەتەکانیان جیاوازن، کەواتە بەرهەمهێنەر بەپێی ئاستی داواکانی کڕیارو زەوقی کڕیار بڕ و جۆری بەرهەمهێنان دیاری دەکات. بێگومان بەرهەمهێنەر و بەکاربەر ڕاستە و هیچ پەیوەندییەکیان پێکەوە نییە بەڵکو پەیوەندییان تەنها لە ڕێگەی داوا و خستنەڕووەوە و لە بازاڕەکاندا بەدەردەکەوێ. هەرچەندە پەیوەندی کڕیار و فرۆشیار ناکۆکە بەڵام هێزی دەستی شاراوەی بازاڕ ئەم ناکۆکییە چارەسەر دەکات.

### فەرهەنگی ئابووری

گۆڕینی بەرهەمەکان: بەرهەمهێنەر دەتوانێت چەند جۆرە بەرهەمێك بەرهەم بهێنێت بەهەمان سیفەتی بەکارهێنان، بۆ نموونە جوتیار دەتوانێت گەنم بچێنێت یان جۆ، کارگەی جلوبەرگ دەتوانێت جلی ژنانە بدورێت یان جلوبەرگی پیاوانە. یاریگا دەتوانرێت بۆ یاری تۆپی پێ بەکاربهێنرێت، لە هەمان کاتدا یاریگا دەتوانرێت بۆ پیشاندانی کۆنسێرتی گۆرانی بێژێکی ناسراو بەکاربهێنرێت. ئەو بەرهەمهێنەرەی کەدەتوانێت چەند بەرهەمێکی جیاواز بەهەمان سیفەت بەرهەم بهێنێت هەمیشە شوێنی خۆی لە بازاڕەکاندا دەپارێزێت وە هەروەها جێگەی خۆی لەدڵی کڕیاردا دەکاتەوە.

### - پێشبینیکردنی گۆڕانی نرخەکان:

ئەگەر بەرهەمهێنەر بزانێت کەلە داهاتوودا دەتوانێت بەرهەمەکەی بە نرخێکی گرانتر دەفرۆشرێت ئەوا پرۆسەی بەرهەم هێنان ڕادەوەستێنێ وەلە چاوەڕواندا دەبێت تاکو نرخ بەرز دەبێتەوە. بۆ نموونە ئەگەر بەرهەم هێنەری گۆشت بزانێت دوای (٣) مانگی تر نرخی گۆشت بەرزدەبێتەوە چونکە (جەژن نزیك دەبێتەوە، گۆشتی هاوردە قەدەغە کراوە لەلایەن



حکوومەتەوە، ئەنفلۆنزای باڵندە پەیدا بووە لەناوچەکەدا.....هتد). بەرهەمی گۆشت کەمدەکاتەوە بەمەش خستنەروو کەمتر دەبێتەوە لە بازاڕدا. بەڵام ئەگەر زووتر نرخی گۆشت بەرزبێتەوە بەهۆی هەرچ هۆیەکی ترەوە بێت بەرهەمهێنەر چاوەڕێ ناکات بەڵکو یەکسەر بەرهەمی گۆشت زیاد دەکات دەمەوێت بیری خوێنەری بهێنمەوە کاتێك کڕیار دەزانێت نرخ بەرزدەبێتەوە دوای ماوەیەکی تر بەپێچەوانەی بەرهەمهێنەر، یەکسەر بڕێکی زۆر گۆشت دەکڕێتو فریزەرەکەی پڕدەکات لە گۆشت. کەواتە زیادبوونی نرخ لە داهاتوودا دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی داواکان لە ئێستادا وە لەهەمان کاتدا دەبێتە هۆی زیادبوونی خستنەڕوو لە داهاتوودا. بەڵام نزمبوونەوەی نرخ لە داهاتوودا دەبێتە هۆی زیادبوونی داواکان لە داهاتوودا وەهەمان کات دەبێتە هۆی زیادبوونی خستنەروو لەکاتی ئێستادا.

ئێستاکە بەهۆی ئەم وێنەی خوارەوە هەوڵدەدین گۆڕانی خستنەڕوو بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ ڕەچاوکردنی فاکتەرەکانی سەرەوەدا نیشان بدەین.

وێنەی ژمارە (٤-٤) گۆڕانی خستنەڕوو بەگشتی:



لە وێنەکەی سەرەوەدا دیارە ئەگەر خستنەڕوو بەگشتی زیاد بکات (بەهۆی هەر فاکتەرێکەوە بێت) ئەوا چەماوەی خستنەڕوو مەیلی لای ڕاست دەکات (S2). چونکە لەم حاڵەتەدا بەرهەمهێنەر ئامادەیە بڕی بەرهەم زیادبکات بەبێ گۆڕینی نرخ. بە پێچەوانەشەوە ئەگەر خستنەڕوو کەم بێتەوە چەماوەی خستنەڕوو مەیل دەکات بەلای چەپدا (S1)، چونکە لەم حاڵەتەدا بەرهەمهێنەر بڕی بەرهەمەکەی کەم دەکاتەوە. بەڵام بەهەمان نرخی پێشوو لە بازاڕەکاندا بەرهەمەکەی دەفرۆشێت، کەواتە دەتوانین بگەینە ئەم دەرئەنجامە. کاریگەری هەمان فاکتەر لەسەر داوا و خستنەڕوو کاریگەرییەکی پێچەوانەیە. واتە جارێکی تر ململانێ‌و ناکۆکی داواو خستنەڕوومان بۆ سەلمێنرا. تەنها بازاڕ دەتوانێت چارەسەری ئەم جیاوازییە لە نێوان داواو خستنەڕووەکاندا بکات. ئێستا هەوڵدەدەین ڕوونی بکەینەوە چۆن چۆنی بەچ شێوەیەك بازاڕ دەتوانێت ئەم ناکۆکییانە چارەسەر بکات؟.

**فەرهەنگی ئابووری**

خستنەڕوو Supply: بڕی ئەو شمەك و خزمەتگوزارییانەیە کە بۆ فرۆشتن بە نرخێکی دیاریکراو و لە کاتێکی دیاریکراودا خراوەتە ڕوو.

هەروەها کارتێکردنێکی لابەر هەیە نێوان نرخو خستنەڕوو خواستدا واتە خستنەڕوو بەیەك ڕووکار لەگەڵ نرخدا دەگۆڕێ.

لەگەڵ ئەمەش چەند هۆیەکی کاتی‌و هەمیشەیی هەیە کە کاردەکاتە سەر خستنەڕوو، وەك کارتێکردنی بارودۆخی ئاووهەوا لەسەر بەروبوومی کشتوکاڵی‌و کارتێکردنی مانگرتنی کرێکاران لەسەر بڕی پیشاندراو لەبەروبوومی پیشەسازی و هەروەها کارتێکردنی جەنگ و ڕابینینی نرخەکان لە دوارۆژدا.

جۆرەکانی خستنە ڕوو بریتییە لە:

- خستنەڕووی بێجیر Inelastic Supply
- خستنەڕووی زێدە Excess Supply
- خستنەڕووی هەمەکی Aggregate Supply
- خستنەڕووی هاوجیر Unit Elastic Supply
- خستنەڕووی ئاوێتە Complex Supply
- خستنەڕووی بەجیر Elastic Supply
- خستنەڕووی هاوبەش Joint Supply



- خستنەڕووی پارە Money Supply
- خستنەڕووی بێجیر:

بارێکە تێیدا گۆڕانی ڕێژەیی لە بڕی خراوە ڕوودا کەمترە لە گۆڕانی ڕێژەیی لە نرخدا.

- زێدە خستنەڕوو:

ئەو بارەیە کە تێیدا ئەو بڕەی کە فرۆشیارەکان ئارەزووی فرۆشتنیان هەیە لە شمەك و خومەتگوزاری زۆرترە لەو بڕەی کە کڕیارەکەن ئارەزووی کڕینیان هەیە بەم نرخە.

- خستنەڕووی هەمەکی (سەرجەمی خستنەڕوو):

خستنەڕووی هەمەکی شمەك‌و خزمەتگوزارییە کە بەرامبەر خواستی هەمەکی ڕادەوەستێت.

- خستنەڕووی هاوجیر:

بارێکە تیایدا گۆڕانی ڕێژەیی لە بڕی خراوە ڕوودا یەکسانە بە گۆڕانی ڕێژەیی لە نرخدا.

- خستنەڕووی ئاوێتە:

بوونی چەند بەرهەمێکی جیاواز کە هەمان پێداویستی تێر دەکەن، وەك ڕۆنی ئاژەڵ و ڕۆنی ڕووەك.

- خستنەڕووی بەجیر (بە پێز):

بارێکە کە تێیدا گۆڕانی ڕێژەیی لەبڕی خراوە ڕوودا گەورەترە لە گۆڕانی ڕێژەیی لە نرخدا.

- خستنەڕووی هاوبەشی:

پەیوەستی نێوان نرخەکانی کەلوپەلی جیاواز کە بەهاوبەشی دێنە بەرهەم. وەك زەیتون و دەنکەکەی.

- خستنەڕووی پارە:

بڕی ئەو پارەیەیە کە ئابوورییەکی دیاریکراو لە کاتێکی دیاریکراودا هەیە.

## هاوسەنگی داوا و خستنەڕوو

لەبەشەکانی پێشوودا بەدوورو درێژی باسمان لە ناوەڕۆکی داوا و خستنەڕوو کرد, وەهەروەها باسمان لە کاریگەری هەردوو فاکتەری داوا و خستنەڕوو کرد لەسەر دیاری کردنی نرخی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان, وە دەست نیشانی سیفەتی ململانێ و ناکۆکی نێوان داوا و خستنەڕوو کرد. باسمان لەکاریگەری پێچەوانەیی هەردوو فاکتەرەکە کرد لەدیاری کردنی نرخی بازاڕ, واتە کۆی نرخی کڕین و فرۆشتن. واتە کاتێك کۆی قەوارەی کاڵا و خزمەتگوزاری بەرهەمهێنراو

یەکسانە بەکۆی کاڵا و خزمەتگوزارییە فرۆشراوەکان. ئەم پەیوەندییە لە وێنەی (٤-٥)دا نیشان دەدەین.

**فەرهەنگی ئابووری**

نرخی بازار: بریتییە لە یەکسانی بڕی کاڵا و خزمەتگوزارییە بەرهەم هێنراوەکان بە کۆی کاڵا و خزمەتگوزارییە کڕاوەکان،

واتە نرخی بازاڕ = کڕین + فرۆشتن

وێنەی ژمارە (٤-٥) هاوسەنگی داوا و خستنەڕوو:




بڕی گۆشتی بەرهەم هێنراو (هەزار کیلۆ)

ئەگەر سەیری وێنەکەی سەرەوە بکەین، دەبینین خاڵی (E) هاوسەنگی ئەو خاڵەیە کەبڕی بەرهەمهێنان (خستنەڕوو) لەگەڵ بڕی کڕاو (داوا) یەك دەگرن، کەواتە داوا و خستنەڕوو لەخاڵی (E) هاوسەنگ دەبن. بابزانین چۆن ئەم هاوسەنگییە ڕوودەدات. ئەگەر سەیری خاڵی سەرەوەی (E) بکەین سەیر دەکەین کاتێك نرخی گۆشت بۆ هەرکیلۆیەك (٤) دۆلار بێت، ئەوا بەرهەمهێنەر لەتوانایدایە بڕی (٩٠٠٠٠) کیلۆ گۆشت پێشنیاز بکات. بەڵام ئەم پێشنیازە زیاترە لە داواکانی کڕیار چونکە کڕیارەکان تەنها بڕی (٤٠٠٠٠) کیلۆ گۆشت دەتوانن بکڕن بە نرخی (٤)دۆلار بۆ هەر کیلۆیەك کەواتە لە بازاڕدا بڕی گۆشت زیاد دەکات ئەمەش دەبێتە هۆی زیادبوونی خستنەڕوو وە کەمکردنەوەی داوا. کەواتە بەرهەمهێنەر دەبێت زیادەی



بەرهەمەکەی لە بازاڕ رابکێشێتەوە و لە فریزەرەکاندا بیپارێزێت. بەڵام بەرهەمهێنەر ناتوانێت بێ کۆتایی بەرهەمەکەی لە فریزەرەکاندا بپارێزێت، دوای چاوەڕوانکردن ناچار دەبێت نرخی گۆشت دابەزێنێت تاکو بتوانێت هەموو بەرهەمەکەی بفرۆشێت, کەواتە زیادبوونی بەرهەمی گۆشت دەبێتە هۆی دابەزینی نرخەکەی بەم شێوەیە نرخ دادەبەزێت تائەوڕادەیەی خستنەڕوو هاوسەنگ دەبێت لەگەڵ داواکاندا. لە نموونەکەی سەرەوەدا کە لەشێوەی وێنەی (٤-٥) نیشاندراوە. هاوسەنگی کاتێك دروست دەبێت ئەگەر نرخی گۆشت دابەزێت بۆ (٣) دۆلار بۆ هەر کیلۆیەك.

ئێستاکە ئەگەر سەیری خاڵی خوارەوەی (E) بکەین لە وێنەکەدا دەبینین بڕی گۆشت لە بازاڕەکاندا کەم دەبێتەوە (واتە قەیرانی گۆشت) دەست پێدەکات, چونکە کاربەران پێویستییان بە بڕی (٨٠٠٠٠) کیلۆ گۆشت هەیە، بەڵام بەرهەمهێنەر تەنها دەتوانێت (٣٠٠٠٠) کیلۆ گۆشت بەرهەم بهێنێت. ئەمەش دەبێتە هۆی زیادبوونی نرخی گۆشت، لەبەر ئەوەی داوا لە خستنەڕوو زۆرترە. بەرزبوونەوەی نرخ بەردەوام دەبێت تاکو ئەو ڕادەیەی کە خستنەڕوو هاوسەنگ دەبێتەوە بەئاستی داواکان. لە نموونەکەی سەرەوەدا ئەو هاوسەنگییە کاتێك ڕوودەدات ئەگەر بڕی گۆشتی بەرهەمهێنراو لە (٦٠٠٠٠) کیلۆ کەمتر نەبێت. ئێستاکە دەتوانین دەرئەنجام بکەین، کە هێزی دەستی شاراوە واتە نرخی بازاڕ ئەو هێزە بزوێنەر و کاریگەرەیە کە هاوسەنگی و هاوتایی نێوان (داوا و خستنەڕوو) دەپارێزێت وە ئەو فاکتەرە بەهێزەیە چالاکی و جموجۆڵ و مامەڵەی نێوان کڕیار و فرۆشیار لە بازاڕەکاندا ڕێکوپێك دەکات.

هەر وەك لە پێشەوە باسمان لێکرد بیرۆکەی فاکتەری هێزی دەستی شاراوەی بازاڕ بنچینەو بناغەی سیستێمی بازاڕی ئازادە. بەدەخالەت نەکردنی حکومەت لە چالاکییە ئابوورییەکاندا. بەڵام بنچینەی بناغەی ئابووری سیستەمی سۆشیالیستی بریتییە لە دەخالەت کردنی حکومەت لە گشت بوارەکانی چالاکی ئابووریدا. وە باسمان لەسیستەمی ئابووری تێکەڵاو کرد ئەویش بە دەخالەتی حکومەت لە هەندێ حاڵەتدا لەچالاکییە ئابوورییەکان, لەبەرئەوەی هەندێ قەیرانی ئابووری بە بێ دەخالەتی حکومەت چارەسەرکردنی مەحاڵە, کەواتە هەڵبژاردنی سیستەمی ئابووری هەر وڵاتێك ئەوەندە گرنگە کە دوارۆژ و هێز و لاوازی دیاری دەکات.

بەپێویستی دەزانم جارێکی تر بگەڕێینەوە سەر پەیوەندی و کاریگەری داوا و خستنەڕوو بە شێوەیەکی گشتی، هەوڵدەدەین بەهۆی ئەو دوو وێنەیەی خوارەوە جارێکی تر گۆڕانکاری

داوا و خستنەڕوو بە شێوەیەکی گشتی روون بکەینەوە، هەروەك لەسەرەوە سەلماندمان پەیوەندی (داوا و خستنەڕوو) کاریگەرترین و گرنگترین فاکتەرە لەگشت پرۆسە ئابووری و ئاستەکاندا چ تاکە کەس، چ کۆمپانیا و کارگەکان، چ بازرگان و کاسبکارەکان، چ دەوڵەت و تەنانەت ئابووری جیهانیش.

وێنەی ژمارە (٤-٦) کاریگەری گۆڕانکاری داوا گشتییەکان:




بڕی گۆشتی بەرهەمهێنراو (هەزار کیلۆ)

ئەگەر سەیری وێنەکەی سەرەوە بکەین دەبینین زیادبوونی داوا واتە زۆر بەکارهێنانی گۆشت بەنرخێکی دیاریکراو، بەڵام بەردەوامی داوا لەسەر گۆشت دەبێتە هۆی زیادبوونی نرخی گۆشت بێگومان ئەمەش لەبەرژەوەندی بەرهەمهێنەردایە، بەرهەمهێنەر دەتوانێت بڕێکی بە نرخێکی گران بفرۆشێت. هەروەك لە پێشەوە باسمان لێکرد هێزی دەستی شاراوەی بازاڕ کاری خۆی دەکات لە هاوسەنگی و هاوتایی ئەم بارە، لەوێنەکەی سەرەوەدا هاوسەنگی ئەوکاتە دروست دەبێت ئەگەر بڕی بەرهەم لە ئاستی (٧٥٠٠٠) کیلۆ گۆشتدا بێت بەمەرجێك نرخەکەی لە (٣,٥ )دۆلار زیاتر نەبێت. ئەوەتا هەردوو چەماوەی (D), (D1) لە هەردوو خاڵی (E), (E1) یەك دەگرنەوە و هاوسەنگ دەبن.

بەڵام ئەگەر هەمان وێنە نەخشە بکێشین بە کاریگەری گۆڕانکاری خستنەڕوو بە گشتی، پێچەوانەکەی حاڵەتی داوامان دەست دەکەوێت.



نەخشەی ژمارە (٤-٧) کاریگەری گۆڕانکاری خستنەڕووە گشتییەکان:




بڕی گۆشتی بەرهەمهێنراو (هەزار کیلۆ)

لەوێنەکەی سەرەوەدا دەبینین کاتێك بڕی بەرهەم زیاد دەکات ئەوا دەبێتە زیادبوونی خستنەڕوو لە بازاڕدا، ئەمەش دەبێتە هۆی دابەزینی نرخ. دەبینین کاتێك نرخ دادەبەزێت بۆ (٢,٥ ) دۆلار بۆ هەر کیلۆیەك ئەوا داوا لە بڕی (٦٠٠٠٠) کیلۆوە زیاد دەبێت بۆ (٧٠٠٠٠) کیلۆ گۆشت، ئەم پرۆسەیە بەردەوام دەبێت تاکو خاڵی هاوسەنگی دروست دەبێت لە بەیەکگەیشتنی داواو خستنەڕوو لە خاڵەکانی (E), (E1).

هیوادارم توانیبێتم بە شێوەیەکی ساکار و ئاسان ئاڵۆزترین یاسای ئابووری واتە یاسای (داوا و خستنەڕوو)م روون کردبێتەوە, تێگەشتن لەم یاسایە کلیلی سەرەکی تێگەشتنی زۆربەی زۆری دیاردە ئابوورییەکانە. هەر بۆیە ئابووریناسان پێی دەڵێن (هێزی دەستی شاراوەی بازاڕ).

# فەسڵی پێنجەم

## هەی لەو نرخە سەرسوڕهێنەرانە؟

پەندێکی کوردی دەڵێ: "هەر شتە بە قیمەتی خۆی" واتە هەر کاڵا و خزمەتگوزارییەك نرخێکی تایبەتی خۆی هەیە، وە هەندێ جار لە بازاڕەکاندا گوێمان لێ دەبێت دەڵێن ماڵ ئاوا فلانە شت لە کڕین نایەت ئەوەندە گرانە.

لە فەسڵی چوارەمدا بەدرێژی باسمان لەپەیوەندی نێوان (داوا و خستنەڕوو) کرد وە هەروەها باسمان لەکاریگەرییان لە قەوارەی بەرهەمهێنانی کاڵا و خزمەتگوزارییەکاندا کرد. وە باسمان لەمیکانیزمی نرخ کرد. چۆن دەبێتە هۆی هاوسەنگی لەنێوان داوا و خستنەڕوودا. لەم فەسڵەدا باس لە کاریگەری هەڵسوکەوتی کڕیار دەکەین لە سەرداواکان وە کاریگەرییان لەسەر گۆڕانکاری بە سەرنرخدا.

## مەوداو درێژە کێشانی توانای چەماوەی داوا*

هەریەکێك لە ئێمە ئەگەر رۆژێك لەڕۆژان چووبێتە بازاڕەکان گوێی لە ووشەی (تەنزیلات) بووە. مەبەست لە تەنزیلات فرۆشتنی کاڵا و خزمەتگوزارییەکانە بەنرخێکی هەرزانتر وەك لە نرخی سەرەتایی. خاوەن دوکان و فرۆشیارەکان بەهۆی تەنزیلاتەوە هەوڵی راکێشانی زۆرتر کڕیار دەدەن. بەڵام هەندێ جار تەنزیلاتی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان نابێتە هۆی فرۆشتنی بڕێکی زۆرتر کە فرۆشیار چاوەڕوانی دەکات. لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە ئایا هەموو نزمبوونەوەی نرخێك دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی بڕی داواکان؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لای کڕیارە،

* وشەی توانای چەمانەوە بەرامبەر وشەی (elasticity) ئینگلیزی بەکارهاتووە. لە فەرهەنگی (یاد)دا بەکوردی ئەم مانایانەی هەیە: گونجاو، نەرم، لاستیکی، توانای چەمانەوەی هەیە، ئێمە وشەی توانای چەمانەوەمان لەبری هەموو ماناکانی تر بەگونجاوتر زانی. لە ئینسکلۆپیدیای ئابووری (فەیسەڵ دەباغ) وشەی (بەجیر)ی بۆ دانراوە.



ئایا کڕیار تا چ رادەیەك پێویستی بە بەکارهێنانی ئەو جۆرە کاڵا و خزمەتگوزاریانەیە کە تەنزیلات کراون. ئەم پرۆسەیە بە زمانی ئابووری واتە (توانای چەمانەوەی داواکان) مەبەست لە توانای چەمانەوە  ئایا تا چ رادەیەك قەوارەی داواکان پەیوەستە بەنرخی کاڵا و خزمەتگوزارییەکانەوە.

**فەرهەنگی ئابووری**

توانای چەمانەوەی داوا (elasticity): بریتییە لەدیاریکردنی رادەی پەیوەندی داواکان بە نرخی بەرهەمەوە. ئابووریناسان بە هۆی پێڕستی توانای چەمانەوەی داوا بە شێوەیەکی دروست و تەواو پەیوەندی داوا و نرخ ژمێردەکەن.

بەشێوەیەکی گشتی سێ ئاستی توانای چەمانەوەی داواکان بەکاردەهێنرێت لە شرۆڤەکردنی داوا و نرخدا.

- بەرزترین ئاست: توانای چەمانەوەی داواکان.
- توانای چەمانەوەی داواکان.
- نزمترین ئاست: توانای چەمانەوەی داواکان یان (نەبوونی توانای چەمانەوەی داوا)

ئێستاکە هەریەك لەو حاڵەتە جیاوازانەی توانای چەمانەوەی داواکان روون دەکەینەوە و باس لەو فاکتەرانە دەکەین کەکاریگەرییان هەیە لە سەر توانای چەمانەوەی داواکان بۆ ئاسان کردن و تێگەیشتن لە ناوەڕۆکی توانای چەمانەوەی داوا.

**فەرهەنگی ئابووری**

چەماوەی خواست (Demand Curve): ئەم چەماوەیە لە شێوەی هێڵێکی روون کردنەوەدا پەیوەندی نێوان نرخی شمەك وبڕی خواستراو دەستنیشان دەکات بە گریمانەی جێگیری گشت هۆیەکانی دیکە کە کار دەکەنە سەر خواست.

**فەرهەنگی ئابووری**

چەماوەی خستنەڕوو (Supply Curve): ئەم چەماوەیە لە شێوەی هێڵێکی روون کردنەوەدا پەیوەندی نێوان نرخ وبڕی خراوەڕوو دەستنیشان دەکات، ئەم چەماوەیە بەرەوژوور و بەلای راستدا هەڵدەکشێت، واتە نرخی شمەك بەرزبێتەوە ئەوە ئەو بڕەی کە دەخرێتە روو زیاتر دەبێت.

سەیری ئەم نموونەیەی خوارەوە دەکەین.

بێگومان هەر کەسێك خاوەنی سەیارە (ئۆتۆمۆبیل) بێت پێویستی بە بەنزینە, ئەگەر نرخی بەنزین هەرزان بێت وە دابەزێت بۆ نیوەی نرخە سەرەتاییەکەی، ئەوا خاوەن سەیارە دەتوانێت بە

هەمان بڕە پارە دووئەوەندە بەنزین  بكڕێت، بەلاّم ئەگەر نرخی بەنزین گران بێت و بەرزببێتەوە بۆ دووئەوەندەی نرخی  سەرەتایی، ئەوا خاوەن سەیارەكان بەهەمان بڕە پارە دەتوانن نیوەی بڕی پێویست بەنزین بكڕن. گریمان نرخی یەك لیتر بەنزین لەسەرەتاوە بریتییە لە (١,٥) دۆلار وەخاوەن سەیارە پێویستی بە (١٠٠) لیتر بەنزین هەیە لەهەفتەیەكدا.

بەهۆی ئەم نموونەیەوە هەوڵ دەدەین پەیوەندی نێوان نرخی بەنزین و دەستكەوتی خاوەن بەنزینخانەكان لەلایەكەوە, وە قەوارە و بڕی فرۆشتنی بەنزین لەلایەكی ترەوە روون بكەینەوە. ئەم پەیوەندییە لەو هاوكێشەیەی خوارەوەدا نیشاندەدەین.

R=PxQ

كاتێك:

R- دەستكەوتی خاوەن بەنزینخانە

P- نرخی بەنزین

Q- بڕو قەوارەی بەنزینی فرۆشراو

ئێستاكە بەیارمەتی خشتەكەی خوارەوە پەیوەندییەكان روون دەكەینەوە.

خشتەی ژمارە (٥-١) گۆڕانی نرخ، دەستكەوت، قەوارەی فرۆشتن.

| | Q | × | P | = | R |
|---|---|---|---|---|---|
| نرخی سەرەتایی بەنزین | ١٠٠ لیتر | × | ١,٥٠ دۆلار | = | ١٥٠ دۆلار |
| دابەزینی نرخ دووجار | ٢٠٠ لیتر | × | ٠,٧٥ دۆلار | = | ١٥٠ دۆلار |
| بەرزبوونەوەی نرخ دووجار | ٥٠ لیتر | × | ٣,٠٠ دۆلار | = | ١٥٠ دۆلار |

بەهۆی ژمارەكانی ناو خشتەكەی سەرەوە حاڵەتی بەرزترین ئاستی توانای چەماوەی داواكان روون دەكەینەوە، ئەگەر تێبینی بكەین نرخی بەنزین كەم یان زیاد بكات دەستكەوتی خاوەن بەنزینخانەكان ناگۆڕێت و هەر وەك خۆی دەمێنێتەوە لە راددەی (١٥٠) دۆلاردا.

لە حاڵەتی بەرزترین ئاستی توانای چەماوەی داواكاندا بەرزبوونەوەی نرخ دەبێتە هۆی كەم كردنەوەی داواكان. ئەگەر خاوەن بەنزین نرخی بەنزین دووجار بەرزبكاتەوە ئەوا قەوارەی فرۆشتنی بەنزین دووجار كەم دەبێتەوە، بە پێچەوانەشەوە ئەگەر خاوەن بەنزین نرخی بەنزین نزم



بكاتەوە ئەوا دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی داواكان، بەلاّم لە هەردوو دۆخەكەدا دەستكەوتی گشتی گۆڕانی بەسەردا نایەت، لەبەرچەند هۆیەك كە لە (فەسڵی هەشتەمدا بە درێژی باسی لێدەكەین) ئێستاكە بۆ زیاتر روون كردنەوەی بەرزترین ئاستی توانای چەماوەی دواكان لە وێنەكەی خوارەوەدا نیشان دەدەین.

نەخشەی ژمارە (٥-١) بەرزترین ئاستی توانای چەماوەی داواكان:




بڕ و قەوارەی بەنزینی فرۆشراو (بە لیتر)

لە وێنەكەی پێشوودا بۆمان دەردەكەوێت كاتێك نرخی بەنزین لە (١,٥٠)دۆلارەوە خاڵی (A) دادەبەزێت بۆ (٠,٧٥) دۆلار خاڵی (A1)، ئەوا داهاتی گشتی خاوەن بەنزینخانەكان وەك خۆی دەمێنێتەوە لە ئاستی (١٥٠) دۆلاردا.

٢٠٠ لیتر × ٠,٧٥ دۆلار = ١٥٠ دۆلار

وە هەروەها لە وێنەكەدا دەبینین كاتێك نرخی بەنزین بەرزدەبێتەوە بۆ ئاستی (٣)دۆلار خاڵی(A2) ئەوا دەستكەوتی خاوەن بەنزینخانەكان وەكو خۆی لە ئاستی (١٥٠) دۆلاردا دەمێنێتەوە.

٥٠ لیتر × ٣ دۆلار = ١٥٠ دۆلار

ئێستاكە وێنەكەی پێشوو لە روانگەیەكی ترەوە سەیردەكەین بۆئەوەی بزانین (توانای چەمانەوەی داوا) چییە و گۆڕانكاری نرخ و قەوارەی فرۆشتن چ كاریگەرییەكیان دەبێت لەسەر كڕیار.

گریمان نرخی بەنزین بە ڕێژەی (٥٠٪) لە نرخی سەرەتایی نزم دەبێتەوە، بەڵام خاوەن سەیارە پێویستییەكانی لە بەكارهێنانی بەنزیندا زیاد دەكات بۆ (٣٠٠) لیتر لەهەفتەیەكدا.

خشتەی ژمارە (٥-٢) گۆڕانی نرخ، دەستكەوت، قەوارەی فرۆشتن.

| | Q | × | P | = | R |
|---|---|---|---|---|---|
| نرخی سەرەتایی بەنزین | ١٠٠ لیتر | × | ١,٥٠ دۆلار | = | ١٥٠ دۆلار |
| دابەزینی نرخ دووجار | ٣٠٠ لیتر | × | ٠,٧٥ دۆلار | = | ٢٢٥ دۆلار |
| بەرزبوونەوەی نرخ دووجار | ٢٥ لیتر | × | ٣,٠٠ دۆلار | = | ٧٥ دۆلار |

بابزانین دەستكەوتی خاوەن بەنزینخانەكان لەو حاڵەتەدا چی بەسەردێت. ژمارەكانی ناوخشتەكانی پێشوو وەڵامی ئەم پرسیارەمان دەداتەوە، گریمان نرخی بەنزین دووجار بەرز دەبێتەوە, بەڵام خاوەن سەیارەكان سێجار بەكارهێنانی بەنزین كەم دەكەنەوە، ئەوا لەو حاڵەتەدا دەستكەوتی بەنزینخانەكان نزم دەبێتەوە بۆ (٧٥) دۆلار. وەك لە خشتەكەدا دیارە، كەواتە ئایاجیاوازی لەنێوان بەرزترین ئاستی چەماوەی داواكان وە توانای چەماوەی داوادا چییە؟ لەحاڵەتی توانای چەماوەی داواكاندا چەند نرخ نزم بێتەوە ئەوا بڕ و قەوارەی فرۆشتن و دەستكەوت زیاد دەكات، كەواتە فرۆشیار بەهۆی نزم بوونەوەی نرخ دەتوانێت بڕێكی زۆرتر بەنزین بفرۆشێت بەمەش دەستكەوتی گشتی زیاد دەكات. بەڵام بەگوێرەی ژمارەكانی ناو خشتەكەی پێشوو لەحاڵەتی (توانای چەماوەی داوا) بەرزبوونەوەی نرخ دەبێتە هۆی كەمكردنەوەی بڕی فرۆشتن و دەستكەوتی گشتی. ئێستاكە بەهۆی وێنەكەی خوارەوە حاڵەتی توانای چەماوەی داوا نیشان دەدەین.



وێنەی ژمارە (٥-٢) توانای چەماوەی داواكان:




لە وێنەكەی پێشوودا دەبینین بە دابەزینی نرخی بەنزین بۆ (٧٥) سەنت بۆ هەریەك لیتر، ئەوا داوا زیاد دەكات تاكو (٣٠٠) لیتر بەنزین لە هەفتەیەكدا ئەمەش دەبێتە زیادبوونی دەستكەوتی خاوەن بەنزینخانەكان بۆ(٢٢٥) دۆلار.

٠,٧٥ دۆلار× ٣٠٠ لیتر = ٢٢٥ دۆلار

كەواتە لەحاڵەتی توانای چەماوەی داواكان بە پێچەوانەی حاڵەتی بەرزترین ئاستی توانای چەماوەی داواكان نزم بوونەوەی نرخ دەبێتە هۆی زیادبوونی دەستكەوت. هەر لە وێنەكەدا بەهۆی خاڵی (A1) نیشان دراوە, بەڵام ئەگەر سەیری خاڵی (A) بكەین دەبینین قەوارەی (١٠٠) لیتر بەنزین بفرۆشرێت, ئەگەر نرخەكەی (١,٥٠) دۆلار بێت، بەڵام كاتێك نرخ زۆر بەرز دەبێتەوە ئەوا رادەی فرۆشتن كەم دەبێتەوە, واتە داواكان كەم دەبنەوە وەك لە خاڵی (A2) نیشان دراوە، كاتێك نرخی بەنزین بەرز دەبێتەوە بۆ (٣) دۆلار بۆ هەر لیترێك, ئەوا قەوارەی فرۆشتن نزم دەبێتەوە بۆ (٢٥) لیتر دەستكەوت تەنها بریتی دەبێت لە (٧٥) دۆلار. ئێستاكە لە روانگەیەكی ترەوە سەیری نموونەكەی سەرەوە دەكەین لە حاڵەتی (نزمترین ئاستی توانای چەماوەی داواكان) بابزانین لەم حاڵەتەدا پەیوەندی لایەنە بەشدارەكانی بازاڕی بەنزین چی بەسەر دێت. هەندێ جار ئەم حاڵەتە دەبێتە هۆی سەرسوڕمانی خاوەن بەنزینخانەكان, چونكە بە نزم بوونەوەی نرخی بەنزین

قەوارەی فرۆشتن کەم دەبێتەوە کە دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی دەستکەوت. گریمان نرخی بەنزین بەڕێژەی (٥٠٪) نزم دەبێتەوە و لەچاو نرخی سەرەتاییدا. بەڵام خاوەن سەیارەکان تەنها بەڕێژەی (٢٠٪) پێویستییان لە بەکارهێنانی بەنزین زیاد دەکات.

خشتەی ژمارە (٥-٣) گۆڕانی نرخ، دەستکەوت، قەوارەی فرۆشتن.

| | Q | × | P | = | R |
|---|---|---|---|---|---|
| نرخی سەرەتایی بەنزین | ١٠٠ لیتر | × | ١,٥٠ دۆلار | = | ١٥٠ دۆلار |
| دابەزینی نرخ دووجار | ١٢٠ لیتر | × | ٠,٧٥ دۆلار | = | ٩٠ دۆلار |
| بەرزبوونەوەی نرخ دووجار | ٨٠ لیتر | × | ٣,٠٠ دۆلار | = | ٢٤٠ دۆلار |

لە خشتەکەی سەرەوەدا دەبینین لەحاڵەتی (نزمترین ئاستی توانای چەماوەی داواکاندا) نزم بوونەوەی هەرچەندە دەبێتە هۆی زیادبوونی فرۆشتنی قەوارەی بەرهەم, بەڵام دەستکەوتی فرۆشیار زیاد ناکات, بەڵکو کەم دەبێتەوە، واتە نرخ کاریگەرییەکی زۆر لاواز دەکاتە سەر قەوارەی فرۆشتن. واتە لەحاڵەتی (نزمترین ئاستی توانای چەماوەی داوا) نزم بوونەوەی نرخ داوا زیاد دەکات, بەڵام زیادبوونی داواکان ئەوەندە لاوازن بۆیە نابێتە هۆی زیادبوونی دەستکەوتی فرۆشیارەکان.

ئێستاکە بۆ زیاتر روون کردنەوە لە وێنەکەی خوارەوەدا کاریگەری (نزمترین ئاستی توانای چەماوەی داواکان) نیشان دەدەین لەسەر نرخ و دەستکەوت و قەوارەی بەرهەم.

وێنەی ژمارە (٥-٣) نزمترین ئاستی توانای چەماوەی داواکان:






لە وێنەکەی سەرەوەدا دەبینین کاتێك نرخی بەنزین بەڕێژەی (٥٠٪) بەرز دەبێتەوە، ئەوا بڕی داواکان تەنها بەڕێژەی (٢٠٪) ئەمەش دەبێتە هۆی زیاد بوونی دەستکەوتی فرۆشیار تەنها تاکو (٢٤٠) دۆلار، کە جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە بەرامبەر دەستکەوتی سەرەتایی.

کەواتە ئێستاکە دەتوانین ئەم دەرئەنجامە بکەین:

داواکانی کڕیار بەهۆی بەرزبوونەوە و نزم بوونەوەی نرخ کەم یان زیاد دەکات، بەڵام کڕیار ناتوانێت بە شێوەیەکی رەها واز لە داواکانی بهێنێت تەنها دەتوانێت بڕی داواکانی کەم بکاتەوە لەبەرئەوەی سەیارە بەبێ بەنزین کار ناکات.

**فەرهەنگی ئابووری**

- بەرزترین ئاست: بریتییە لەو حاڵەتەی بازاڕ، کاتێك گۆڕانی قەوارەی فرۆشتن ونرخی بەرهەم کارناکەنە سەر دەستکەوتی فرۆشیار.
- توانای چەماوەی داواکان: بریتییە لەوحاڵەتەی بازاڕ کاتێك قەوارەی فرۆشتن زیاد دەبێت وە نرخی بەرهەم نزم دەبێتەوە, دەستکەوتی فرۆشیار زیاد دەکات.
- نزمترین ئاست: بریتییە لەوحاڵەتەی بازاڕ، کاتێك داواکان کەم دەبنەوە, وەنرخ دادەبەزێت بۆنزمترین رادە دەستکەوت و قەوارەی فرۆشتن بە رادەیەکی کەم زیاد دەکات.

## ئەو فاکتەرانە چین کە کاریگەری دەکەنە سەر توانای چەماوەی داواکان؟

بە بێ ئاگابوون (کڕیار و فرۆشیار) لە ژیانی رۆژانەدا وە لە مامەڵە کردنیاندا لە بازاڕەکان دەکەونە ژێر کاریگەری توانای چەماوەی داواکان.

ئەو فاکتەرە گرنگانەش بریتین لە:

- گۆڕینی بەرهەمێك لە بری بەرهەمێکی تر کە هەمان سیفەتیان هەیە.
- کورت خایەن یان درێژ خایەنی داواکان.
- ئامادەیی کڕیار بە تەرخانکردنی بڕێك لە داهاتی بۆ کڕینی بەرهەمێکی دیاریکراو.

ئێستاکە هەر یەك لەو فاکتەرانە روون دەکەینەوە:

**- گۆڕینی بەرهەمێك لە بری بەرهەمێکی تر کە هەمان سیفەتیان هەیە:**

دوا لە بەکارهێنانی بەنزین بەشێوەیەکی گشتی هەمیشە لە زیاد بووندایە، بەهۆی زیادبوونی ژمارەی ئۆتۆمبیلەکان رۆژ لەدوای رۆژ وە هەروەها پێویستییەتی سەیارە وەکو ئامرازێکی هاتووچۆ بۆ مەبەستی جیاجیا هەر لە گوێزانەوەی خەڵکییەوە تاکو گوێزانەوەی بار

و بەرهەمەكان لە شوێنێكەوە بۆشوێنێكی تر. وە تاكو ئێستاش بەدیلێكی تر لە بری بەنزین نەدۆزراوەتەوە. بەلاّم ئەمە رێگە لە بەكاربەر ناگرێت كە بەدیلێكی تری هاتووچۆ بدۆزێتەوە لە بری بە كارهێنانی ئۆتۆمۆبێلی تایبەتی. گریمان بەهۆی بەرزبوونەوەی نرخی نەوت، نرخی بەنزینیش دوای ماوەیەك بەرز دەبێتەوە, ئەوا خاوەن سەیارەكان لەبەر سنوورداریەتی داهاتیان ناچارن پەنا بەرنە بەر ئامرازەكانی تری هاتووچۆ, وەك پاس یان میترۆ ...هتد ئەمەش دەبێتە هۆی كەم بوونەوەی داوا لە سەر بەنزین بە زمانی ئابووری ئەم پرۆسەیە پێی دەوترێت (توانای چەمانەوەی داوا)، گریمان خاوەن سەیارە بۆ جێبەجێ كردنی كاری رۆژانەی ناتوانێت بەدیلێكی تر بەكاربهێنێت, چونكە شوێنی نیشتەجێبوونی دوورە لە هاتووچۆی ئامرازی گواستنەوەی گشتی, بۆیە ناچارە بەنزین بە كاربهێنێت لە هاتووچۆ كردندا هەر چەندە نرخی بەنزینیش بەرزبێت بە زمانی ئابووری پێی دەوترێت (ناتوانایی چەماوەی داوا). كەواتە فاكتەری گۆڕینی كالاّ و خزمەتگوزارییەكان بە كالاّ و خزمەتگوزارییەكی تر كەهەمان سیفەتی بەكارهێنانیان هەیە، زیاد بوونی نرخ كار ناكاتە سەر قەوارەی بەرهەمهێنان.

**- كورت خایەن یان درێژ خایەنی داواكان:**

كورت خایەنی و درێژ خایەنی داواكان بەشێوەیەكی راستەوخۆ كاردەكەنە سەر (توانای چەماوەی داواكان), ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ نموونەكەی پێشوومان داوای كورت خایەن لەبەكارهێنانی بەنزیندا بریتییە لە (ناتوانایی چەماوەی داواكان), بەلاّم ئەم داوایە رەنگە بگۆڕێت بۆداوایەكی درێژ خایەن، رەنگە خاوەن سەیارە شوێنی كاركردنی بگۆڕێت بۆ ئەوەی لە شوێنی نیشتەجێیەوە نزیك بێت ئەوكاتە بڕی بەنزین بەكارهێنان كەمتر دەبێتەوە یان دەتوانێت سەیارەكەی بگۆڕێت بە سەیارەیەكی تر كە بەنزین كەمتر سەرف بكات، هەموو دەزانین بەنزین لە نەوت دروست دەكرێت وە نەوت وەك سامانی ژێر زەوی هەتا هەتایی نییە, بەلّكو كاتێك دێت دەرهێنانی نەوت كەم دەبێتەوە یان هەر بەتەواوەتی كۆتایی دێت. واتە بەنزین وەك سەرچاوەی وزە بۆ كاركردنی ئامێرەكانی هاتووچۆ داوای لەسەر نامێنێت. كەواتە داواكان لەماوەیەكی درێژدا لەسەر بەنزین كۆتایی دێت، ئەم پرۆسەیە پێی دەوترێت داوای درێژ خایەن, واتە (ناتوانایی چەماوەی داواكان).

**- ئامادەیی كڕیار بە تەرخان كردنی بڕێك لە داهاتی بۆ كڕینی بەرهەمێكی دیاریكراو:**

ئامادەیی كڕیار بە تەرخان كردنی بڕێكی بەرز لە داهاتی خۆی بۆ بەرهەمێكی دیاریكراو پێی دەوترێت (بەرزترین ئاستی توانای چەماوەی داواكان) بۆ نموونە, ئەگەر نرخی بنێشتی



سەهم بەرێژەی (١٠٪) زیاد بكات داوا لە سەر بنێشت كەم نابێتەوە, چونكە كڕیار ناچارە منداڵەكانی رازی بكات كە رۆژانە بنێشت بەكاردەهێنن. ئەوەی ئاشكرایە بنێشت خۆی لەخۆدا نرخی هەرزانە, چونكە نرخی سەرەتایی بنێشت هەرزانە بۆیە بەرزبوونەوەی نرخ كاریگەریەكی ئەوتۆ لە داهاتی كڕیار ناكات, وە نزم بوونەوەی نرخی بنێشت كاریگەرییەكی ئەوتۆ ناكاتە سەر زیادبوونی داوا لەسەر بنێشت. بەلاّم داوا لەسەر بەرهەمێك كە نرخی سەرەتایی گرانە بۆ نموونە ئۆتۆمبێل، كاریگەری راستەوخۆ دەكاتە سەر داهاتی كڕیار. لەم حاڵەتەدا كڕیار پێش بڕیاردانی كڕینی بەرهەمی گرانبەها هەوڵ دەدات هەرزانتر بیكڕێت بۆ ئەم مەبەستەش سەردانی هەموو پێشانگەكانی فرۆشتنی ئۆتۆمبێل دەكات، یان لەبری ئۆتۆمبێلی نوێ ئۆتۆمبێلی بەكارهاتوو دەكڕێت، چونكە گرانی نرخی ئۆتۆمبێل كاریگەری بەرچاو و راستەوخۆ دەكاتە سەر داهاتی كڕیار. بەلاّم كڕیار هیچ كاتێك سەردانی گشت دوكانەكان ناكات بۆ كڕینی بنێشتی هەرزان لەبەرئەوەی نرخی سەرەتایی هەرزانە و كاریگەرییەكی ئەوتۆ ناكاتە سەر داهاتی كڕیار.

ئێستاكە گرنگێتی (توانای چەماوەی داواكان)مان بۆ دەركەوت چونكە بەهۆیەوە دەتوانین هەڵسوكەوتی كڕیار لەبازاڕدا دەستنیشان بكەین وەهەروەها دەتوانین بڕیارەكانی كڕیار لە كڕین و بەكارهێنانی بەرهەمێكی دیاریكراو شیتەڵ بكەینەوە كە لە (فەسڵی شەشەم)دا باسی لێدەكەین.

**ئاگاداری**

بەرهەمهێنەرەكان پێویستە لە هەموو كەس زیاتر ئاگاداری رێسای (توانای چەماوەی داواكان) بن. كاتێك باری ئابووری توشی تەنگەژی دەبێت ئەوا خەڵكی خەرجی كەم دەكەنەوە توانای كڕین لاواز دەبێت. ئایا لەم دۆخەدا كالاّ و خزمەتگوزارییەكانی كەبەرهەم دەهێنرێت دەفرۆشرێت؟ ئایا تەنگەژی ئابووری چ كاردانەوەیەكی دەبێت لەسەر بەرهەمەكانتان؟ بۆ نموونە ئەگەر بەرهەم وخزمەتگوزارییەكان پەیوەندی بە تەندروستییەوە هەبێت ئەوا هەرچەندە تەنگەژی ئابووری قووڵ و درێژخایەن بێت خەڵكی ناچارن چارەسەری خۆیان بكەن لە دژی نەخۆشی. بەلاّم لە حاڵەتی تەنگەژیدا دەتوانن سەردانی رێستۆرانت نەكەن, یان گەشت و گوزار نەكەن, یان ئۆتۆمبێل نەكڕن,......هتد. كەواتە بە تێگەشتن لە ناوەڕۆكی (توانای چەماوەی دواكان) دەتوانین ئەو كەرتە ئابوورییە بۆ كاركردن هەڵبژێرین كە لە هەموو بارو دۆخێكدا بەكارە.

## ڕێکخستنی چالاکییەکانی بازاڕ

لە بەشەکانی پێشوودا و تاکو ئەم ساتە باسمان لە چالاکی و جموجۆڵی بازاڕ کرد تەنها لە ڕوانگەی یاساکانی بازاڕەوە, واتە (هێزی دەستی شاراوە) بەڵام دەستێوەردان و دەخالەتی حکوومەتمان لە ڕێکخستنی چالاکییەکانی بازاڕدا پشتگوێ خست، بێگومان دەخالەتی حکوومەت لە چالاکییەکانی بازاڕ کاریگەری ڕاستەوخۆ دەکاتە سەر نرخی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان هەروەها کاریگەری لە قەوارەی بەرهەم و هەڵسوکەوتی کڕیار و فرۆشیار لە بازاڕەکاندا دەکات. لێرەدا باس لەو ئامرازانە دەکەین کە حکوومەت بەهۆیانەوە دەتوانێت کاریگەری لە ڕێکخستنی بازاڕ بکات.

ئەو ئامرازانەش بریتین لە:

- زیادکردنی بڕی باجی فرۆشتن.
- ڕێکخستن و دیاریکردنی کرێ.
- دیاریکردنی کرێی کار.

لە خوارەوە هەریەك لەو ئامرازانە ڕوون دەکەینەوە.

- **زیاد کردنی بڕی باجی فرۆشتن:**

باجی فرۆشتن بە گشتی لە هەموو وڵاتێکدا هەیە، بەڵام بڕەکەی لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر دەگۆڕێت. مەبەست لە باجی فرۆشتن ئەو جۆرە باجەیە کە هەموو (کاڵا و خزمەتگوزارییەکان) دەگرێتەوە لە کاتی فرۆشتندا ئەم باجە بەداهاتێکی سەرەکی دەژمێردرێت لە پێکهێنانی بوودجەی گشتی، دانانی ئەم باجە لە لایەن حکومەتەوە دەستتێوەردانێکی ڕاستەوخۆیە لە ڕێکخستنی چالاکییەکانی بازاڕ. لە زۆربەی وڵاتاندا ئەم جۆرە باجە لەسەر هەندێ بەرهەم وەك (جگەرە، تووتن، مەی، شوێنی قومار,.....هتد) زۆر بەرزە. ئێمە دەزانین بەگوێرەی یاسای (داوا و خستنەڕوو) بەرز بوونەوەی نرخ دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی داواکان. بە هۆی وێنەکەی خوارەوە هەوڵ دەدەین کاریگەری باجی فرۆشتن لەسەر (داوا و خستنەڕوو) نیشان بدەین.



وێنەی ژمارە (٥-٦) کاریگەری باجی فرۆشتن لە سەر داوا و خستنەڕوو:




بۆ لێکدانەوەی وێنەکەی سەرەوە دەگەڕێینەوە بۆ نموونەی (بازاڕی گۆشت) کە لە (فەسڵی چوارەم)دا باسمان لێکردووە.

گریمان نرخی گۆشت پێش باجی فرۆشتن بریتییە لە (٣) دۆلار بۆ هەر کیلۆیەك، هەر وەك لە وێنەکەدا دیارە کاتێك نرخی گۆشت (٣) دۆلار بێت ئەوا کڕیار ئامادەیە تەنها (٦٠٠٠٠) کیلۆ گۆشت بەکاربهێنێت، ئەگەر حکوومەت بڕی (١) دۆلار باجی فرۆشتن بخاتە سەر یەك کیلۆ گۆشت ئەوا دەبێتە هۆی زیاد بوونی نرخی گۆشت، ئەوکاتە داوا لەسەر گۆشت کەم دەبێتەوە. وەك لەوێنەکەدا دەبینین هێڵی داوا لە خاڵی (S) بەرز دەبێتەوە بۆ خاڵی (ST) ئەوکاتە هاوسەنگی نێوان داوا و خستنەڕوو لەخاڵی (E) دەگۆڕێت بۆ خاڵی (ET). چونکە گۆشت بەهۆی باجی فرۆشتنەوە نرخەکەی دەبێت بە (٤) دۆلار. ئەوکاتە بەکارهێنانی گۆشت دادەبەزێت بۆ (٤٠٠٠٠) کیلۆ گۆشت لە هەفتەیەکدا. کەواتە حکوومەت توانی بە هۆی باجی فرۆشتنەوە کار بکاتە سەر نرخی گۆشت وە هاوسەنگی نێوان داوا و خستنەڕوو بە ئەنجام بگەیەنێت لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە بوودجەی گشتی زیاد بکات.

### - ڕێکخستن و دیاریکردنی کرێ:

لە زۆربەی وڵاتەکانی جیهاندا حکوومەت بەهۆی دیاریکردنی سنووری کرێ پشتگیری لەو توێژەی دانیشتوان دەکات کە داهاتیان کەمە. کرێ بە مانا فراوانەکەی بریتییە لە کرێی (خانووبەرە، زەوی، خزمەتگوزارییەکان وەك ئاوەڕۆ, ....هتد) خاڵێکی گرنگ دەمەوێت ئاماژەی پێبدەم پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ هەیە لە نێوان نرخی کرێ و بڕی بەرهەمهێنان لەکەرتی بیناسازیدا هەندێ جار دیاریکردنی کرێ لە لایەن حکوومەتەوە دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی چالاکی و سەرمایەگوزاری لەکەرتی بیناسازیدا ئەمەش دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی خانووبەرە و گران بوونی, چونکە سەرمایەدار ئامادە نییە سەرمایەکەی بە گەڕ بدات لەو بوارەدا ئەم پرۆسەیەش دەبێتە هۆی ناهاوسەنگی لە نێوان داوا و خستنەڕوو. بەهۆی وێنەکەی خوارەوە هەوڵ دەدەین کاریگەری دیاریکردنی کرێ لەسەر داوا و خستنەڕوو نیشان بدەین.

وێنەی ژمارە (٥-٧) کاریگەری دیاریکردنی کرێ لەسەر داوا و خستنەڕوو:




ژمارەی خانووبەرەی دروستکراو



سیاسەتی دیاریکردنی کرێ لە ئاست و ڕادەیەکی دیاریکراودا دەبێتە هۆی نزم بوونەوەی دروستکردنی خانووبەرە (قەیرانی خانووبەرە). واتە جیاوازی لەنێوان خاڵی هاوسەنگی ژمارەی خانووی دروستکراو خاڵی (QRC) وە ژمارەی خانووی پێویست بەپێی داواکانی بازاڕ خاڵی (Q). هەروەك لەوێنەکەی سەرەوەدا دیارە جیاوازی هەردوو خاڵی (QRC) وە (Q) قەیرانی خانووبەرە نیشان دەدات، بۆ ڕزگاربوون لەو قەیرانە زۆربەی حکوومەتەکان سیستەمی دووئاستی دیاریکردنی کرێ بەکاردەهێنن. بیرۆکەی ئەم سیستەمە لەوەدایە حکوومەت بڕی کرێ لەسەر خانووبەرە گران بەهاکان زیاد دەکات، وە لەسەر خانووبەرە ئاساییەکان کەم دەکاتەوە بۆ ئەوەی لە توانای خەڵکانی کەم دەرامەتدا بێت، کەواتە حکوومەت بەهۆی دیاریکردنی ئاستی بەرزتر و نزمتر لە نرخی بازاڕ لە کەرتی بیناسازیدا دەتوانێت هاوسەنگی دروست بکات بە مەرجێك پارێزگاری لە توێژە کەم دەرامەتەکانی کۆمەڵ بکات.

### فەرهەنگی ئابووری

سیاسەتی دیاریکردنی کرێ: ئەو ئامرازەیە کە حکوومەت بەهۆیەوە هاوسەنگی داوا و خستنەڕوو لە کەرتی بیناسازیدا جێبەجێدەکات. بەجۆرێك بەرزترین بڕی کرێ بۆ خانووبەرە گران بەهاکان دیاری دەکات کە بەرزترە لە نرخی بازاڕ، وە نزمترین بڕی کرێ بۆ خانووبەرە ئاساییەکان دیاریدەکات کە نزمترە لە نرخی بازاڕ، ئەمەش یارمەتی توێژی کەم داهات دەدات لە دروستکردن و کڕینی خانووبەرە.

### - دیاریکردنی کرێی کار:

دیاریکردنی کرێی کار گرنگترین ئامرازە بەدەست حکوومەتەوە کە بەهۆیەوە دەتوانێت ئاستێکی دیاریکراو لە کرێ دیاری بکات بەمەرجێك کە هەموو لایەنەکان چ کەرتی (گشتی و تایبەتی) پێی پابەند بن، حکوومەت بەهۆی ئەم دەستێوەردانەوە دوو ئامانج دەپێکێت، یەکەم بازاڕی کار ڕێکدەخات واتە هاوسەنگی لە نێوان (داواو و خستنەڕوو)ی هێزی کار جێبەجێ دەکات, دووەم سنووری کرێی کار بەجۆرێك دیاری دەکات نزمتر نەبێت لە ئاستی پێویستییەکانی بژێوی ژیان وەك (خۆراك، پۆشاك، خزمەتگوزارییە پێویستەکان,...هتد) لە زۆربەی وڵاتە پێشکەوتووەکاندا لە ڕێگەی سندوقی کۆمەڵایەتییەوە (سۆسیال) ئەم جۆرە یارمەتییە پێشکەش بە هەموو تاکێك دەکرێت لەکاتی بێکاریدا و چەندان حاڵەتی تر، بۆ نموونە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نزمترین کرێی کار نابێت لە بڕی (١٢٠٠٠) دۆلار

کەمتر بێت سالآنە. بێگومان دیاریکردنی نزمترین ئاستی کرێی کار کاریگەری راستەوخۆی هەیە لەسەر بازاڕی کار.

ئێستاکە بەهۆی وێنەکەی خوارەوە هەوڵ دەدەین کاریگەری دیاریکردنی نزمترین ئاستی کرێی کار لەسەر (داوا وخستنەڕووی) بازاڕی کار روون بکەینەوە.

وێنەی ژمارە (٤-٧) کاریگەری دیاریکردنی نزمترین کرێی کار لەسەر بازاڕی کار:




گریمان حکوومەت نزمترین کرێی کار لەئاستی (٥) دۆلار لە کاتژمێرێکدا دیاری دەکات وەك لە هێڵی (MW) لەوێنەکەدا نیشان دراوە، بەلآم کرێی کاری بازاڕ لەئاستی (٣) دۆلار لە کاتژمێرێکدایە وەك لە خاڵی (E)دا نیشان دراوە. نزمترین کرێی کار بریتییە لە (٥) دۆلار وەك لە خاڵی(EMW)دا نیشان دراوە. ئەو کاتە بە بڕی هەردووخاڵی (QMW) ,(Q) ناهاوسەنگی لە بازاڕی کاردا دروست دەبێت. ئەمەش دەبێتە هۆی زیاد بوونی ژمارەی بێکاری. بڕی ژمارەی بێکاران یەکسانە بە جیاوازی نێوان هەردوو خاڵی ((Q، QMW)). بەواتایەکی تر بە کرێی (٥) دۆلار لە کاتژمێرێکدا خەڵکی ئامادەن کار بکەن, چونکە نزمترین ئاستە بۆ بژێوی ژیان، بەلآم سەرکاران ئامادەن تەنها (٣) دۆلار لە کاتژمێرێکدا بدەن بە



کرێکاران. ئەم دۆخە بەردەوام دەبێت تاکو کرێی کار لە بازاڕدا بەرز دەبێتەوە بۆ (٥) دۆلار لەکاتژمێرێکدا، کەواتە حکوومەت بەهۆی دیاریکردنی نزمترین ئاستی کرێی کار هاوسەنگی لە بازاڕی کاردا بە ئەنجام دەگەیەنێت وە لە لایەکی ترەوە بڕی داهاتی کرێکاران زیاد دەکات. بەهەرحاڵ دەستێوەردان و دەخالەتی حکوومەت لەپرۆسەی ئابووری لایەنی پۆزەتیڤ و لایەنی نێگەتیڤی هەیە، بۆیە ئابووریناسان ئاگاداری حکوومەتەکان دەکەن لە رادە و ئاستی دەخالەتکردن لە پرۆسەی ئابووری بەتایبەتی لە ولآتە تازە پێگەشتووەکاندا.

**فەرهەنگی ئابووری**

کرێ (Wage): نرخ یان پاداشتی ئەو کارەیە، کە کرێکار وەری دەگرێت لە جیاتی ئەو رەنجەی دەیکێشێت بۆ خاوەن کار، یان ئەو پرۆژە بەرهەمدارییەی، کە ئیشی تیا دەکات.

کرێ چەند جۆرێکی هەیە لە هەرە گرنگەکانیان:

- کرێی کۆمەلآیەتی (ناراستەوخۆ) Social wage
- کرێی ناڤەکیی Nominal wage
- کرێی بەرهەمهێنان (ڕاستەوخۆ) Production wage
- کرێ بە پێی پارچە Piece wage
- کرێ بە پێی کات Time wage
- کرێی دنەدەر Incenitive wage
- کرێی راستەکیی Real wage
- کرێی کەسەکیی Personal wage
- کرێی شمەکی (ماڵینە) Kind wage
- کرێی ناڕاستەوخۆ Indirect wage
- کرێی راستەوخۆ Direct wage
- کرێی گەلەکی Collective wage
- کرێی پرۆژە Project wage
- کرێی پاداشت Primes wage
- کرێی نەختینە Money wage
- کرێ بار Freight
- کرێی سەربارە Back Freight

له خوارەوە هەریەك لە جۆرەكانی كرێ روون دەكەینەوە:

- كرێی كۆمەلآیەتی (ناڕاستەوخۆ):

كرێیە كە سەربەخۆیە لەچالاكی بەرهەمهێنانی كەسەكییدا.

- كرێی ناڤەكیی:

بڕی ئەو داهاتەیە، كە كرێكار بە پارە دەیـدرێتێ لـە جیـاتی ئـەو خزمەتگوزارییـەی كـە لەماوەیەكی دیاریكراودا پێشكەشی دەكات, ئەم كرێیە (كرێی نەختیینە)شی پێدەگوترێت.

- كرێی بەرهەمهێنان (ڕاستەوخۆ):

بڕی ئەو دەستكەوتەیە كە كرێكار وەری دەگرێت لە جیاتی ئەو رەنجەی، كە بـە شـێوەیەكی ڕاستەوخۆ دەیخاتە روو، هەروەها كرێی (بەروبووم)یشی پێدەگوترێت.

- كرێ بەپێی پارچە:

بەپێی ئەم سیستەمە پاداشتەكە بە گوێرەی بەرهەمهێنانی مایەكیی، یان بە گوێرەی كاری بەجێهێنراو دەدرێت.

- كرێ بە پێی كات:

كرێدان بە پێی كات، لەسەر بناغەی (ڕۆژە كارێك) بـە پێـی ئـەو سـەعاتانەی, یـان ئـەو رۆژانەی كە كرێكارەكە ئیشی تیاكردووە، لەگەڵ لێكدانەوەی كارامەیی ئەو كرێكارە.

- كرێی دنەدەر:

هەر شێوەیەك لە كرێی پێدراو بەرامبەر بەرهەمداری چاك كراو، پێی دەڵێن كرێی دنـەدەر, یان هاندەر.

- كرێی ڕاستەكیی:

ئەم كرێیە هێزی كڕینی كرێی نەختە، یان بڕی ئەو شمەك و خزمتگوزارییەیە كە دەتوانرێت بە كرێی نەخت بكڕدرێت.

- كرێی كەسەكیی:

كرێیەكی باوە لە گشت كەرتە ئابوورییە جیاوازەكانـدا (پیـشەسازی، كـشتوكاڵ,....هتـد) ئەمەش سێ شێوەی هەیە:

١ .كرێ بە پێی پارچە,
٢ .كرێ بە پێی كات,
٣ .كرێی پاداشت.



- كرێی شمەكی (ماڵینە):

پێدانی بەشێكی كرێ بە شمەك، بۆ نموونە وێدانی ئەو كرێكـارەی كـە لەكارگـەی سـابووندا ئیش دەكات، بە بڕێك سابوون وەك بەشێك لەو كرێیەی كە پێویستە بیدرێتێ.

- كرێی گەلەكی:

پێشی دەوترێت كریێ پڕۆژە، ڕێكەوتنێكە لە نێـوان خـاوەن دەزگـا و كۆمەڵـە كرێكارێـك لەسەر وەرگرتنی كرێیەكی گەلەكیی، كە لەدواییدا لەنێوان خۆیاندا دابەشی دەكەن.

- كرێی پاداشت:

ئەم جۆرە كرێیە بەئاسایی نێوان كرێ بەپێی پارچە و كرێ بەپێی كات كۆدەكاتەوە.

ناواخنی ئەم زاراوەیە دەتوانرێت بەم شێوەیە كورت بكرێتەوە:

دەستنیشان كردنی كرێیەكی دیاریكراو بەپێی كات یان بەپێی بەرهـەمهێنانی ژمارەیـەكی دیاركراو لە بەرهەم و سەربارەكردنی پاداشتێك، كە بەزیادبوونی بەرهەم ئەویش زیاد دەكات.

- كرێی بار:

كرێیەكە بەرامبەر بە هەڵگرتنی بارێك دەدرێت.

- كرێی سەربارە:

ئەو كرێ سەربارەیە كە بەهۆی گەڕاندنەوەی كەلوپەلی ڕەتكراو لەلایـەن ئـەو كەسـەی كـە كەلوپەلەكەی بۆ نێردراوە یان لەلایەن دەسەلاتی بەرپرس لە ولاتی بهێندا دێتە كایـەوە، بارگـە كەریش بەرگەی ئەم جۆرە كرێیە دەگرێ.

# بەشی دووەم

## سەرمایەداری لە چالاکیدایە!

ناوەڕۆکی سیستەمی سەرمایەداری واتە ئابووری ئازاد، بریتییە لە جیاوازی ئامانجی کڕیار و فرۆشیار، رووبەڕوو بوونەوە و ململانێی نێوان کڕیار و فرۆشیار (داوا و خستنەڕوو) سیستەمی سەرمایەداری چارەسەرەکەی بەجێ هێشتووە بۆ هێزی دەستی شاراوەی بازاڕ. لەم بەشەدا باس لە هەڵسوکەوت و بڕیارەکانی کڕیار لەبازاڕدا دەکەین. بێگومان کڕیار و فرۆشیار لەبازاڕەکاندا جێگۆڕکێ دەکەن، واتە کڕیار هەندێ جار دەبێت بە فرۆشیار وە بەپێچەوانەوە فرۆشیار دەبێت بە کڕیار. بۆ تێگەشتن لەجێگۆڕکێی (داوا و خستنەڕوو) پێویستە بە باشی لەمیکانیزم و دینامیکی بازاڕ تێبگەین. چونکە هەزاران کەس ئامادەن کار بکەن بەرامبەر کرێی کار یان موچەیەکی دیاریکراو, وە هەزاران کەس دەیانەوێت خۆیان بن بە خاوەن کار و کاری سەربەست بکەن. وە هەروەها لەم بەشەدا باس لە سوڕانەوەی ئابووری و گەشەکردن و تەنگەژی ئابووری و کاریگەریان لەسەر بازاڕەکان دەکەین. چونکە بە تێگەشتن لەگۆڕانکارییە ئابوورییەکان بڕیارەکانمان راست و دروست دەبێت و ناکەوینە هەڵەوە توشی زەرەر و زیانی ماددی نابین, وەڵامی هەموو ئەم پرسیارە ئاڵۆزانە لەم بەشەدا بە شێوەیەکی سادە و ساکار روون دەکەینەوە.

# فەسڵی شەشەم

## کڕیار لە کوێیە؟ هەڵسوکەوتی کڕیار لە بازاڕدا!

بۆ ئەوەی لە دینامیکی ئـابووری و میکـانیزمی بـازاڕ تێبگـەین، پێویـستە بەباشـی لـە سایکۆلۆژیا و هەڵسوکەوتی بە کاربەران (کڕیار) لە بازاڕەکاندا تێبگـەین. هـەروەك لەفەسـڵی دووەمدا باسمان لێکرد بەکاربەران بەشـێکی زۆری تێکـڕای بەرهـەمی نەتـەوەیی پێکـدەهێنن, جموجۆڵ وچالاکی کڕیار ئاراستەی بووژانەوە و داکشانەوەی ئابووری دیاریدەکەن. داهاتی بەرزی بەکاربەران دەبێتە هۆی زیاد بوونی خەرجی گـشتی ئـەویش دەبێتـە گەشـەکردن و زیـادبوونی بەرهـەمهێنان. چـونکە بەرهەمهێنـەر هەمیـشە هـەوڵی جێبـەجێکردنی داوا و خواسـتەکانی بەکاربەر دەدات لەپێناوی بەدەستهێنانی قازانجدا. بەڵاَم دەبێت ئەوەمان لە یاد نەچێت کە بـڕی داهاتی کڕیار هەمیشە تواناکانی سـنووردار دەکـات، بۆیـە لـەم فەسـڵەدا هـەوڵ دەدەیـن بـە شێوەیەکی درشت باس لە میکـانیزمی بـازاڕ و کاریگـەری راسـتەوخۆ و ناڕاسـتەوخۆ لەسـەر هەڵسوکەوتی بەکاربەران بکەین لە بازاڕدا.

### سودمەندێتی داواکان چییە؟

داوا و خواستە گشتییەکان بـریتین لـە کـۆی بەرهەمـە بـەکارهاتووەکان لەلایـەن هـەموو کڕیارەکانەوە، ئەگەر بگەڕێینـەوە بـۆ نموونەکـەی پێـشوومان (بـازاڕی گۆشـت) بـڕی گۆشـتی بەکارهاتوو (کڕراو) بە نرخێکی دیاریکراو بریتییە لە کۆی بڕی داوای گشتی بۆ گۆشتی ئـاژەڵ. بۆ زیاتر روون کردنەوە سەیری وێنەکەی خوارەوە بکە.

وێنەی ژمارە (٦-١) کۆی داوای گشتی بۆ گۆشت.





داوای بڕی گۆشت لەلایەن نەبەزەوە



داوای بڕی گۆشت لەلایەن هێرشەوە



داوای گشتی بڕی گۆشت (بەکیلۆ)

هەروەك لە وێنەکانی سەرەوەدا دیارە داوا گشتییەکان بریتین لە بڕی بەرهەمی بـەکارهاتوو لەلایەن بەکاربەرانـەوە. لـەم نموونەیـەدا داوای گـشتیمان بـە داواکـانی (نەبـەز و هێـرش) لـە بەکارهێنانی گۆشت دیاریکردووە. کاتێك نرخی یەك کیلۆ گۆشت بریتییـە لـە (٢) دۆلار ئـەوا هێـرش تـەنها (١) کیلـۆ گۆشـت بـەکاردەهێنێت بـەڵاَم نەبـەز (٢) کیلـۆ گۆشـت لـە ژەمـە خواردنەکانیدا بەکاردەهێنێت، بێگومان لە بازاڕدا کڕیارەکـانی گۆشـت تـەنها دوو کـەس نـین بـەڵکو ژمارەیـەکی زۆرتـرن کـە رۆژانـە گۆشـت بـەکاردەهێنن لـە ژەمـە خواردنەکانیانـدا. لەپراکتیکدا ناتوانین یەکە یەکە لە خەڵکی بپرسین کە رۆژانە چەند کیلـۆ گۆشـت بـەکاردەهێنن بۆیە داوا گشتییەکانمان بەهۆی چەماوەی داوا گشتییەکان لە وێنەکەی سەرەوەدا نیشانداوە کـە کۆی بەرهەمهێنانی هەموو کاڵا و خزمەتگوزارییەکان دەردەبڕێت، تـاکو ئێـستاکە باسمـان لـە

کاربەرەکان کرد بە شێوەی تاك واتە داواکانی تاکەکەس، ئێستا هەوڵدەدەین روونــی بکەینــەوە چــۆن هەریــەکێك لــە ئێمــە بڕیــاری تایبــەتی دەدات لــە بازاڕەکانــدا لــەکاتی کڕینــی کــاڵا و خزمەتگوزارییەکان. یەکێك لە فاکتەرە هەرە گرنگەکان کــە کڕیــار بەهۆیانــەوە بڕیــاری کــڕین دەدات پێی دەوترێـت (ئاسـتی سـوودمەندێتی) کـاڵا و خزمـەتگوزارییـەکان لـە دابینکردنـی پێویستییەکانی کڕیاردا.

**فەرهەنگی ئابووری**

**سوودمەندێتی-کەڵك-** (Utility):

توانـای شـتێکە بـۆ تێرکردنـی پێداویـستییەك، یـان ئارەزوویـەکی مـرۆڤ لـە کاتێـك و بارێکی تایبەتییدا.

هەندێ بەرهەم کەڵکێکی زۆری هەیە بۆ هەنـدێ کڕیـار بـەڵام هـیچ کـەڵکێکی نییـە بـۆ کڕیارێکی تر، بۆ نموونە ئۆتۆمۆبیلی بار (پیکاب) هیچ کەڵکێکی ئەوتۆی نییە بۆ فەرمانبەرێك کە لە دەزگای پەروەردە کاردەکات یان بۆ بەڕێوەبەرێکی بانـك, بـەڵام ئـەم جـۆرە ئۆتۆمۆبیلـە کەڵکێکی زۆری هەیە بـۆ جووتیارەکـان یـان بـۆ کاسـبکارەکان. کەواتـە داوا و خواسـتەکانی بەکاربەر بەپێی کەڵك و سوودمەندێتی لەیەکێکەوە بۆیەکێکی تر دەگۆڕێت.

سوودمەندێتی سێ حاڵەتی هەیە:

- سوودمەندێتی ئاسایی.
- سنووردارێتی سوودمەندێتی.
- کەم بوونەوەی سوودمەندێتی.

حاڵــەت و قۆناغــەکانی ســوودمەندێتی ســەرەتا و کۆتــایی کــەڵکی کــاڵا و خزمەتگوزارییەکان دەسەلمێنن. بـۆ نموونـە (کـاك زاهـیر) هـەموو ڕۆژێـك گۆشـتی ئـاژەڵ دەکڕێت و لەژەمە خواردنەکانیدا بـەکاری دەهێنێـت, بـەڵام مـەرج نییـە هـەموو ڕۆژێـك گۆشت بکڕێت بەڵکو هەندێ جار دەچێت بۆ چێشتخانە قۆزی گۆشـت دەخـوات هەرچـەندە کاك زاهیر زۆر حەزی لەگۆشتی ئاژەڵە. بەڵام هەندێ جـار دەیگۆڕێـت بـە گۆشـتی باڵنـدە (مریشك، قەل, ....هتـد) یـان بـە گۆشـتی ماسـی کەواتـە سـوودمەندێتی لـە حاڵـەتی ئاساییەوە بەرەو حاڵـەتی سـنووردارێتی دەڕوات. بـۆ زیـاتر روونکردنـەوەی حاڵەتـەکانی سوودمەندێتی سەیری ئەم وێنەیەی خوارەوە بکە.



وێنەی ژمارە (٦-٢) سنووردارێتی وکەم بوونەوەی سوودمەندێتی.




لەوێنەکەی سەرەوەدا دەبینین سوودمەندێتی بە خشۆکی بەرزدەبێتەوە تاکو بەرزترین نوختە خاڵی (A) دوابەدوا بۆ خوارەوە دادەبەزێت.

ئێستاکە بابزانین رادەی سوودمەندێتی بەرهەم چۆن کار دەکاتە سەر هەڵسوکەوتی کڕیار؟

بێگومان حەزو پێویستییەکانی مرۆڤ بێ سنوورە، بەڵام داهات و تواناکانی مـرۆڤ سـنووردارن، بەهۆی سنووردارێتی مرۆڤەوە داوا و پێویستییەکانیش سنووردار دەبن. ئەم سـیفەتە وا لـە کڕیـار دەکات لەکاتی کڕینی کاڵا و خزمەتگوزارییە هەمەجۆرەکانی بازاڕدا ئەو بەرهەمە بکڕێت کە زیاتر سوودی پێدەگەیەنێت یان زیاتر پێویستیەتی چ لەبەکارهێنانی تایبەتیدا یان گشتیدا، کەواتە کاتێك کڕیار دەچێتە بازاڕ بە مەبەستی کڕینی بەرهەمێکی دیاریکراو کە پێویستییەتی نەك هەر کاڵایـەك کە بەرچاوی دەکەوێت, هەرچەندە ئارەزووەکانی کڕیار بێ سنوورە بەڵام داهات و توانا ماددیـەکانی سنووردارە، پسپۆرانی کۆمەڵناسی بەم دیاردەیە دەڵێن ناکۆکی و ململانێی خودی (نـاوەکی) مـرۆڤ لەپرۆسـەی هەڵبژاردنـدا. ئـەم حاڵەتـەش هێمنـی و هاوتـایی و خـۆڕاگرتن لـە هەڵبـژاردنی پێداویستییەکاندا دروسـت دەکـات. هـەروەك دەزانـین هاوسـەنگی بـازاڕ بـەهۆی یاسـای (داوا و خستنەڕوو) بەرجەستە دەبێت کە پێشتر باسمان لێکرد.

**فەرهەنگی ئابووری**

- سوودمەندێتی ئاسایی: ئەو سوودەیە کە لەکاتی کڕینی بەرهەمێکی دیـاریکراودا کـەڵك لەبەکارهێنانیدا وەردەگرین.

- سنوورداریەتی سوودمەندێتی: کڕینی بەرهەمێکی دیاریکراوە کەدەتوانین بەشێوەیەکی خشۆکی (دوابەدوایی) کەڵك لە بەکارهێنانی وەربگرین.

- کەم بوونەوەی سنووردارێتی: واتە کەم بوونەوەی سوود لە کڕینی بەرهەمێکی دیاریکراو لە بەکارهێناندا لە قۆناغی کۆتایدا.

ئایا چ بەرهەمێك یان چ ماددەیەك لە (ئاو) بەسوود ترە یان گرنگترە لە ژیانی مرۆڤدا؟ بێگومان هەریەك لە ئێمە وەڵامی ئەم پرسیارە دەزانین. ئاو سەرچاوەی ژیانە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئاو هەرزانترین مادەی بەرهەم هاتووە هەرچەندە لە هەموو ماددە بەرهەم هاتووەکانی تر بەسوودمەند ترە. هەر لە کۆنەوە ئابووریناسان هەوڵیان داوە وەڵامی ئەو پرسیارە بدەنەوە ئایا بۆچی ئاو کە سەرچاوەی ژیانە هەرزانترە لەکەراتێك (ئەڵماس) یان مسقاڵێك (ئاڵتوون) لەبەرئەوەی بڕی ئاو بەشێوەیەکی زۆر و فراوان بوونی هەیە و بڵاوبۆتەوە بەسەر گۆی زەویدا. بەڵام بڕی ئەڵماس و ئاڵتوون زۆر کەمن و دەگمەنن، ئاو لە بەرهەمهێناندا ئاسان ترە و بڕی تێچوونی هەرزان ترە, بەڵام بڕی تێچوونی بەرهەمهێنانی ئەڵماس و ئاڵتوون گران بەهایە. ئەمە لە لایەکەوە لە لایەکی ترەوە سوودمەندێتی ئاو لە بەکارهێناندا سنووردارە. بۆ نموونە کاتێك مرۆڤ تێر ئاو دەخواتەوە ئیتر ناتوانێت جامێکی تر ئاو بخواتەوە تاوەکو تینوو نەبێتەوە. بەڵام ئەڵماس یان ئاڵتوون هەرچەندە سوودیان کەمترە مرۆڤ بێ سنوور دەتوانێت کۆی بکاتەوە و بەکاری بهێنێت. هەروەك لە سەرەوە باسمان لێکرد هەموو بەرهەمێك بەپێی سیفەتی سوودمەندێتی نرخێکی تایبەتی هەیە، واتە هەر بەرهەمە بەنرخی خۆی دەفرۆشرێت، کەواتە ئەگەر نرخی ئاو بەپێی سنووری سوودمەندێتی گران بوایە ئەوا هەموو کەسێك نەیدەتوانی ئاو بەکاربهێنت لە جێبەجێکردنی پێداویستیەکانی ڕۆژانەیدا. ئەمەش دەبووە هۆی لە ناوچوونی مرۆڤایەتی، کەواتە سوودمەندێتی بەرهەم بەستراوە بە کاریگەری سنووردارییەتی سوودەوە، نموونەکەی سەرەوە ئەو راستییەمان بۆ دەسەلمێنێت هەرچەندە ئاو سوودمەندێتی بەرزە بەڵام سنووردارە لە بەکارهێناندا.

کڕیار هەمیشە دەگەڕێت بەدوای ئەو کالاّ و خزمەتگوزارییانەدا کە زیاترین و زۆرترین کەڵکی لێ وەردەگرێت, بەڵام بەهۆی سنووردارییەتی داهات، هەوڵ دەدات پێداویستییەکانی بە نرخێکی هەرزانتر بکڕێت لەبەر ئەم هۆیەش هەندێ جار لەچاوەڕوانیدا دەبێت تاکو نرخ بەرەو دابەزین دەچێت, چونکە داهاتەکەی سنووردارە بەپێی یاسا ئابوورییەکان ئەگەر داوا لەسەر بەرهەمێکی دیاریکراو کەم بێتەوە, ئەوا فرۆشیار ناچارە نرخەکەی دابەزێنێت (لە فەسڵی چوارەمدا بە دوور و درێژی باسمان لێکردووە) بەڵام فرۆشیار زۆر پەلە ناکات لەدابەزینی نرخ تاکو بڕی قازانجی کەم نەبێتەوە. لەبەرئەوەی ژمارەیەکی دیاریکراو لە کڕیارەکان گوێ نادەن بە



گرانی کالاّ و خزمەتگوزارییەکان ئامادەن بە هەرچ نرخێك بێت ئەو بەرهەمە بکڕن کە پێویستیانە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ نموونەکەی پێشوومان (بازاڕی گۆشت)، کاك زاهیر لەبەرئەوەی بە بێ گۆشت لە ژەمە خواردنەکانیدا زەوق لە خواردن نابینێت ئامادەیە گۆشت بکڕێت هەرچەندە نرخەکەشی بەرزبێت. گریمان لەبەر هەندێ هۆی تایبەتی (پێش جەژن) نرخی (١) کیلۆ گۆشت دەبێتە (٧) دۆلار بەڵام دوای جەژن نرخەکەی دەبێت بە(٦) دۆلار، دواتر دادەبەزێت بۆ (٥) دۆلار تاکو نرخەکەی دادەبەزێت بۆ نرخی ئاسایی (٤) دۆلار بۆ هەر کیلۆیەك لەبەر ئەوەی کاك زاهیر ئامادە نییە چاوەڕوان بکات هەموو ڕۆژەکان گۆشت دەکڕێت ئەو کاتە بەرامبەر (٤) کیلۆ گۆشت بڕی (٢٢) دۆلار خەرج دەکات.

(٢٢ =٤ +٥ +٦ +٧)، بەڵام کڕیارێکی تر (کاك ئاراس) پەلەی نییە دەتوانێت لەبری گۆشتی ئاژەڵ گۆشتی باڵندە بەکاربهێنێت، چاوەڕێ دەکات تاکو نرخی گۆشتی ئاژەڵ دەگەڕێتەوە بۆ نرخە ئاساییەکەی (٤) دۆلار. ئەوکاتە کاك ئاراس بەرامبەر (٤) کیلۆ گۆشت تەنها بڕی (١٦) دۆلار خەرج دەکات.

(١٦ =٤ +٤ +٤ +٤), کەواتە ئەگەر بەراورد لە نێوان هەردوو کڕیارەکەدا بکەین ئەوا کاك زاهیر (٦) دۆلاری زیاتر خەرج کردووە، بێگومان لە بازاڕدا هەزارانی وەك (زاهیر و ئاراس) مامەڵە دەکەن، ئەمەش جارێکی تر سنووردارییەتی سوودمەندێتی پێداویستییەکان دەسەلمێنێت، ئێستاکە هەوڵ دەدەین نموونەکەی سەرەوە لە وێنەکەی خوارەوەدا نیشان بدەین.

وێنەی ژمارە (٦-٣) سوودمەندێتی کڕیار:



ئەگەر سەیری بەشی سەرەوەی وێنەکە بکەین دەبینین لە کڕینی هەمان بڕ گۆشت ((٤ کیلۆ)) کاك زاهیر (٦) دۆلاری زیاتر خەرج کردووە.

ئێستاکە بابزانین سوودمەندێتی بە کارهێنان بە شێوەیەکی گشتی چ کارێك دەکاتە سەر بارودۆخی ئابووری. هەروەك ئاماژەمان پێدا کڕیاری وەك کاك زاهیر لە بازاڕەکاندا ژمارەیان زۆرە کە ئامادەن کالاّ و خزمەتگوزارییەکان بە هەرنرخێك بێت بیکڕن. ئابووریناسان ئامۆژگاری و ئاگاداری بەکاربەران دەکەنەوە لە کاتی قەیرانی بەرهەمێکی دیاریکراودا چاوەڕوانی بکەن تاکو قەیرانەکە ئاسایی دەبێتەوە چونکە قەیرانەکان هەمیشە کاتین.

## شیر یان پسکیت!

بابزانین هەڵسوکەوتی کڕیار چۆنە لە بازاڕدا. بە هۆی ئەو نموونەیەی خوارەوە هەوڵ دەدەین بەشێوەیەکی ساکار هەڵسوکەوتی کڕیار لە بڕیاردانەدا لە کاتی کڕینی کالاّ و خزمەتگوزارییەکاندا روون بکەینەوە.

هێمن تەمەنی هەشت ساڵە، ئارەزووی لە خواردنی شیر و پسکیتە پێکەوە، بە رادەیەك هەموو رۆژێك بڕێك شیر و پسکیت دەکڕێت وەپێکەوە دەیخوات، بەلای هێمنەوە گرنگ نییە چەند شیر و پسکیت دەکڕێت, گرنگ ئەوەیە شیر و پسکیت پێکەوە دەکڕێت، چونکە پێکەوە زەوقی لێ دەبینێت و سوودی لێ وەردەگرێت.

خشتەی هاوسەنگی ئاوێتەی (شیر و پسکیت)

| | بڕی شـــــــیر | بڕی پســــــکیت |
|---|---|---|
| A | ٢ | ١٢ |
| B | ٤ | ٦ |
| C | ٦ | ٤ |
| D | ٨ | ٣ |

خشتەکەی سەرەوە ئاوێتەی شیر و پسکیت نیشان دەدات، هێمن تەنها رێژە و بڕی خواردنی رۆژانەی دەگۆڕێت بەلاّم جۆری خواردنەکە ناگۆڕێت، هەندێ جار دەیەوێت (٢) پاکەت شیر



بکڕێت بەرامبەر (١٢) پاکەت پسکیت، وەدەتوانێت (٦) پاکەت شیر بکڕێت بەرامبەر (٤) پاکەت پسکیت لە هەموو حاڵەتەکاندا شیرو پسکیت پێکەوە دەکڕێت. بەلاّم رۆژانە بڕی بەکارهێنانی هەردوو بەرهەمەکە دەگۆڕێت واتە سوودمەندێتی رۆژانەی کەم دەبێتەوە بۆ زیاتر روون کردنەوە ئەو خشتەیەی سەرەوە لە شێوەی وێنەدا نیشان دەدەین.

وێنەی ژمارە (٦-٤) چەماوەی ئاسایی (بێبایەخی) داواکانی هێمن:




بەکاربەر واتە هەریەك لە ئێمە رۆژانە بۆ جێبەجێکردنی پێداویستییەکانمان بەکارهێنانی هەندێ بەرهەم دەگۆڕین بۆ هەندێ بەرهەمی تر، وێنەکەی سەرەوە ئەو پەیوەندییەمان نیشان دەدات, دەبینین هێمن دەتوانێت (٦) پاکەت پسکیت خاڵی (A) بەرامبەر (٤) پاکەت شیر بەکاربهێنێت، بەلاّم ئەگەر سەیری خاڵی (B) بکەین ئەوا (٦) پاکەت شیر بەرامبەر (٤) پاکەت پسکیتە.

هەروەك لەپێشەوە ئاماژەمان کرد بەحاڵەتەکانی سوودمەندێتی، هەمیشە دوای قۆناغی سنووردارێتی سوودمەندێتی قۆناغی کەم بوونەوەی سوودمەندێتی دەستپێدەکات، واتە ئەو حاڵەتەی کاتێك کڕیار بڕێکی زۆر لەبەرهەمێکی دیاریکراو گەنجینە دەکات، ئەوا کڕینی ئەو جۆرە بەرهەمە سوودمەندێتییەکی ئەوتۆی نابێت بۆ کڕیار, چونکە بڕێکی زۆری لەو بەرهەمە

گەنجینە کردووە تاکو ئەو بڕە کەم نەبێتەوە، هەرچ کڕینێکی ئەو جۆرە بەرهەمە سوودمەندێتییەکەی کەم دەکاتەوە.

لە وێنەکەی ژمارە (٦-٤)دا، پێکهاتەی داواکانی (هێمن)مان لە بەکارهێنانی شیرو پسکیت نیشاندا، ئێستاکە بەهۆی ئەو وێنەیەی خوارەوە هەوڵدەدەین بەشێوەیەکی فراوانتر چەماوەی ئاسایی داواکان و خاڵی هاوسەنگێتییان نیشان دەدەین.

وێنەی ژمارە (٦-٥) چەماوەی ئاسایی داوا:




بڕی شیری بەکارهاتوو

ئەگەر سەیری چەماوەی (I2) بکەین دەبینین بڕی بەکارهێنانی (شیر و پسکیت) یەکسانن (٤) پاکەت پسکیت (٤) پاکەت شیر لەحاڵەتی دووەمدا لەهەمان چەماوەدا (٧) پاکەت شیر بەرامبەر (٢) پاکەت پسکیت، لەهەردوو حاڵەتەکەدا بەلای کاربەرەوە گرنگ ئەوەیە هەردوو بەرهەمەکە پێکەوە بەکاربهێنێت. هەموو چەماوەکانی تر (I4) (I1) بڕی بەکارهێنانی شیر و پسکیت لەچەند حاڵەتێکی جیاجیادا نیشان دەدەن، مەبەستی سەرەکی لەم روون کردنەوەیە سەلماندنی گۆڕینی بەرهەمێکە بە بەرهەمێکی تر بەمەرجێك بەرهەمەکان پێکەوە بەکاربهێنرێن، ئەوەی ئاشکرایە بڕی بەکارهێنانی بەرهەمەکان پەیوەندیەکی راستەوخۆیان هەیە بەئاستی داهاتەوە، ئێستاکە کاریگەری داهات لەبەکارهێنانی بەرهەمە جیاوازەکاندا بەهۆی ئەو وێنەیەی خوارەوە نیشان دەدەین.



وێنەی ژمارە (٦-٦) چەماوەی داهات (بوودجە):




بڕی شیری بەکارهاتوو

بێگومان هەر کاڵا و خزمەتگوزارییەك بەرامبەر نرخێکی دیاریکراو دەفرۆشرێت، وە هەر کاڵا و خزمەتگوزارییەك سوود و کەڵکێکی تایبەتییان هەیە، کەواتە بڕی داهات سنووردارێتی بەکارهێنان دیاری دەکات. لە نموونەکەی سەرەوەدا باسمان لە بەکارهێنانی شیر و پسکیت کرد لەلایەن هێمنەوە، بەڵام رووە ماددییەکەیمان پشتگوێ خست، گریمان پاکەتێ پسکیت نرخەکەی (٥٠) سەنتەوە پاکەتێ شیر نرخەکەی (٧٠) سەنتە. بابزانین نرخ و بەکارهێنانی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان چ کاریگەرییەك لەسەر بوودجەی حکوومەت دەکەن زۆربەی زۆری حکوومەتەکان لە بوودجەی گشتییەوە بڕێك پارە تەرخان دەکەن بۆ خواردنی قووتابییانی قۆناغەکانی سەرەتایی، گریمان حکوومەتی هەرێم بڕی (٦) دۆلاری بۆ خواردنی قوتابییانی سەرەتایی لە هەفتەیەکدا تەرخان کردووە، وەك لە وێنەکەی پێشوودا نیشان دراوە قووتابی دەتوانێت بەرامبەر (٦) دۆلار (١٢) پاکەت پسکیت و (٨) پاکەت شیر بکڕێت. چەماوەکەی کە هەردوو نوختەی (١٢) و (٨) بەیەك دەگەیەنێت پێی دەوترێت چەماوەی بوودجە یان چەماوەی توانای کڕین، کەواتە بڕی داهات دەستنیشانی بڕی بەکارهێنان دەکات. کەواتە بەهۆی سنووردارێتی داهاتەوە کڕیار هەمیشە دەگەڕێت بۆ کڕینی ئەو بەرهەمەی کە دەگونجێت

لەگەڵ داهاتەکانیدا، کەواتە گەڕان بەدوای خاڵی هاوبەشی داهـات و بەکارهێنانـدا. ئێـستاکە بەهۆی وێنەکەی خوارەوە ئەوخاڵە هاوبەشە نیشان دەدەین.

وێنەی ژمارە (٦-٧) گونجاوترین خاڵی هاوبەشی بەکارهێنان.




لەوێنەکەی سەرەوەدا سنووردارێتی بەکارهێنانی کاڵا و خزمەتگوزارییەکانمان بەپێی داهات نیشانداوە ئەگەر سـەرنج بـدەین دەبیـنین خـاڵی (oE) گونجـاوترین خـاڵی هاوبەشـە لـەنێوان بەکارهێنان و داهاتدا. واتـە ئـەو خاڵەیـە کـە کڕیـار دەتوانێـت زۆرتـر سـوود وەرگرێـت لـە بەکارهێناندا بەرامبـەر داهـاتی. هـەروەك ئاشـکرایە بـەپێی یاسـاکانی بـازاڕ نرخـی کـاڵا و خزمەتگوزارییـەکان جـێگیرنین بـەڵکو هەمیـشە لەگۆڕاندایـە کەواتـە گۆڕانکـاری نرخـەکان (بەرزبوونەوە و نزم بوونەوە) دەبێتە هۆی گۆڕانکاری لە هەڵسوکەوتی کڕیارەکاندا لـە بـازاڕدا، بەزیاد بوونی داهات و نزم بوونەوەی نرخ توانای کڕین زیاد دەکات ئەمەش دەبێتە هـۆی زیـاد بوونی بڕگەی (C)ی تێکڕای بەرهـەمی نەتـەوەیی واتـە گەشـەکردن و بووژانـەوەی بـارودۆخی ئابووری، بەڵام کاتێك نرخ بەرز دەبێتەوە ئەوا توانای کڕین کەم دەبێتەوە ئـەو کاتـە تەنگـەژی ئابووری دەست پێدەکات، کەواتە هەڵسوکەوتی کڕیار لەبازاڕەکاندا کشان و داکشانەوەی بـاری ئابووری نیشان دەدات.

# فەسڵی حەوتەم

## کەم - زیاد، داهات، خەرج کردن، سەرمایەگوزاری

لەفەسڵی شەشەمدا بە شێوەیەکی چڕوپڕ باسمان لە هەڵسوکەوتی کڕیار کرد لە روانگەی توانا و ئارەزووەکانییەوە لەبەکارهێنانی کاڵا و خزمەتگوزارییەکاندا. لەم فەسڵەدا باس لە کڕیار دەکەین لە روانگەیەکی ترەوە کڕیار وەك هێزی بزوێنەری ئابووری. چونکە تەنها کڕیار بڕیار دەدات چەندی داهاتەکەی خەرج بکات وەچەند پاشەکەوت بکات، چالاکی و جموجۆڵی کڕیار ئاراستەی گۆڕانکارییە ئابوورییەکان دەستنیشان دەکەن. کاتێك کڕیارەکان (دانیشتوان) بڕێك لە داهاتەکانیان پاشەکەوت دەکەن, واتە بڕی کەڵەکە بوونی سەرمایە زیاد دەکات ئەمەش دەبێتە هۆی گەشەکردنی سەرمایە گوزاری واتە زیاد بوونی چالاکی بازاڕی کار و بەرهەمهێنان و گەشەکردن و بوژانەوەی ئابووری.

## سەرچاوەی داهات

داهاتی خەڵکی بریتییە لەو دەستکەوتەی کە بەرامبەر کارێکی دیاریکراو لەپرۆسەی بەرهەمهێناندا وەری دەگرێت، فاکتەرەکانی پرۆسەی بەرهەمهێنان بریتین لە هەموو ئەو پێداویستییانەی کە بەهۆیانەوە کاڵا و خزمەتگوزارییەکان بەرهەم دەهێنرێت ئەو فاکتەرە گرنگانەش بریتین لە (زەوی، کار، سەرمایە، رێکخستن).

**فەرهەنگی ئابووری**

بەرهەمە ماکەکان، هۆیەکانی بەرهەمهێنان

بەرهەمهێنانی شمەك لە ئەنجامی هاریکاری چەند هۆیەکدا دەبێت کەپێیان دەگوترێ هۆ یان بەرهەمە ماکەکان، بەرهەمیش بەبێ هاریکاری کردنی گشت ئەو ماکانە یان بەلای کەمەوە هەندێکیان بە ئەنجام نادرێ.



بەرهەمە ماکە بنەڕەتییەکانیش ئەمانەن:

١- کار
٢- رێکخستن
٣- زەوی و سروشت
٤- سەرمایە

به واتایەکی تر هۆیەکانی بەرهەمهێنان بریتین لە پەیوەندی نێوان خەڵك لەبواری بەرهەمهێناندا، کە ئاڵوگۆڕ و دابەشکردنی خێروبێری مایەکیی سەقامگیر دەکات، هەروەها ژێرخانی ئابووری کۆمەڵیش پێك دێنێت.

کار: هەموو چالاکییەکی مرۆڤە لە دروستکردن و ئاڵوگۆڕ و بەرهەمهێنانی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان، بەرامبەر بەپارەیەکی دیاریکراو.

رێکخستن* یان بەرێوەبردن: ئەمرۆ کە یەکێکە لە هەرە فاکتەرە گرنگەکانی پرۆسەی بەرهەمهێنان.

زەوی: هەموو ئەو رووبەرانەیە کەبەکاردێت لەپرۆسەی بەرهەمهێناندا, زەوی کشتوکاڵی, زەوی پیشەسازی, زەوی بیناسازی,...هتد.

سەرمایە: هەموو ئەو بەرهەمە ماددیانەیە کە بەکاردەهێنرێت لە بەرهەمهێنانی بەرهەمێکی تردا, سەرمایە بریتییە لە (کارگەکان، ئامێر و ئامرازەکانی بەرهەمهێنان، تەکنەلۆژیا، کۆمپیوتەر، ئامرازەکانی هاتووچۆ، رێگاوبان ...هتد. (ئابووری ناسان سەرمایەی دارایی ناخەنە پاڵ سەرمایەی ماددی).

**فەرهەنگی ئابووری**

فاکتەری بەرهەمهێنان: بریتییە لە (زەوی، کار، سەرمایە، رێکخستن (بەرێوەبردن)). پێکهاتەی فاکتەرەکانی بەرهەمهێنان لە زمانی ئابووری ناسانەوە واتە ئامرازەکانی بەرهەمهێنان، ئاستی پەیوەندی بەرهەمهێنان بەهۆی ئاستی ئامرازەکانی بەرهەمهێنانەوە ئەندازە دەکرێت.

---

*رێکخستن - بەرامبەر وشەی (Management)ی زمانی ئینگلیزی بەکارهاتووە و هەندێ جار وشەی بەڕێوەبردن یان کارگێڕیش بەکاردێت

هەریەك لە فاکتەرەکانی بەرهەمهێنان بە شێوەیەك لە شێوەکان خەڵات دەکرێت، خاوەن زەوی بەرامبەر بەکارهێنان و بە کرێ دان یان فرۆشتنی زەویەکەی برێ پارە وەردەگرێت لە شێوەی کرێی زەویدا یان موڵکانەدا، کارکەر (کرێکار، فەرمانبەران, مووچە خۆر,... هتد) کرێی کار وەردەگرن، سەرمایەدار لە بەگەڕ خستنی سەرمایەکەیدا سوود (قازانج)ی دەستدەکەوێت. بەڕێوەبەران (مێنێژمێنت) بڕێ قازانج یان بڕێ پارەی دیاریکراویان دەست دەکەوێت, ئابووریناسان ئەو چوارشێوە داهاتە (کرێی زەوی، کرێی کار، رێژەی قازانج، سوود) بەداهاتی نەتەوەیی دادەنێن، واتە کۆی هەموو ئەو داهاتانەی سەرەوە داهاتی نەتەوەیی پێکدەهێنن.

لە خشتەکەی خوارەوەدا کۆی گشتی پێکهێنانی داهاتی نەتەوەیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە ساڵەکانی (١٩٩٠-٢٠٠١)دا نیشان دەدەین.

خشتەی ژمارە (٧-١) داهاتی نەتەوەیی (ملیارد دۆلار).

| سەرچاوەکان | ساڵی ١٩٩٠ | ساڵی ٢٠٠١ |
|---|---|---|
| کرێی کار | ٣٣٥١ | ٥٩٧٥ |
| کرێی زەوییەکان | ٤٣٠ | ٨٦٥ |
| قازانج لە بەگەڕخستنی سەرمایە | ٤٥٢ | ٦٥٠ |
| سوودی قازانجی بەڕێوەبەران | ٤٠٩ | ٧٣٢ |
| کۆی داهاتی نەتەوەیی | ٤٦٤٢ | ٨١٢٢ |

لە خشتەکەی سەرەوەدا بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا دیارە کە داهاتی نەتەوەیی لە کۆی فاکتەرەکانی بەرهەمهێنان پێکدێت.

ئێستاکە بەهۆی هێڵکارییەکەی خوارەوە پەیوەندی نێوان فاکتەرەکانی بەرهەمهێنان و سەرچاوەی داهات نیشاندەدەین.



هێڵکاری ژمارە (٧-١) داهاتی نەتەوەیی و فاکتەرەکانی بەرهەمهێنان:




لەبەشی خوارەوەی هێڵکارییەکەی سەرەوەدا، خەڵکی لە ئەنجامی بەشدارییان لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا دەستکەوتی ماددی وەردەگرن لە شێوەی (کرێی زەوی، کرێی کار، سوود و قازانج)دا بەلاّم لەبەشی سەرەوەی بازنەی داهاتی نەتەوایەتیدا خەڵکی لەبەکاربردنی کاڵا و خزمەتگوزارییە بەرهەم هێنراوەکان برێ لە داهاتەکانیان خەرج دەکەن، کەواتە پەیوەندییەکی لێك نەپساوی

شێوە بازنەیی دروست دەبێت. وە ئەم پرۆسەیە هەمیشە لە سوڕانەوەی بەردەوامدا دەبێت.

**فەرهەنگی ئابووری**

داهاتی نەتەوەیی: بریتییە لە کۆی (کرێی زەوی، کرێی کار، رێژەی سوود و قازانج لە بەگەڕخستنی سەرمایە، قازانجی بەڕێوەبەر و سەرکارەکان، کاسبکارەکان، بازرگانەکان, ... هتد)

## خەرج کردن یان پاشەکەوت کردن

داهات و دەستکەوتەکان کە لەئەنجامی بەشداری کردن لەپرۆسەی بەرهەمهێناندا خەڵکی وەری دەگرن, یان خەرجی دەکەن, یان پاشەکەوتی دەکەن، لەهەردوو حاڵەتەکەدا دەبنە هۆی بووژانەوەی ئابووری.

بێگومان هەریەك لە ئێمە سەربەستە لە بڕیارەکانیدا چۆن داهاتەکەی بەکاربهێنێت، دەتوانێت هەموو داهاتەکەی خەرج بکات، یان پاشەکەوت بکات, یان بەشێکی خەرج بکات وە بەشەکەی تری پاشەکەوت بکات، بەڵام پاشەکەوت کردن لە شێوەی هەڵگرتنی سستدا (خەوتوو) ناتوانێت هیچ بەشداریەك بکات لە پرۆسەی ئابووریدا (لە وڵاتە تازە پێگەشتووەکاندا ئەم دیاردەیە زۆر بڵاوە بەهۆی نەبوون, یان لاوازی سیستەمی دارایی و بانکی). ئەو کاتە پاشەکەوت چالاك دەبێت و دەبێتە سەرچاوەیەکی گرنگی سەرمایەگوزاری ئەگەر بەرامبەر رێژەیەکی سوودی دیاریکراو لە بانکەکاندا بپارێزرێت، یان متمانە بە دەزگا ئابوورییەکان و سەرمایەگوزارییەکان بکرێت. خەڵکی لەپێناوی بەرژەوەندی ماددی لەشێوەی رێژەی سوودا پارەکانیان دەسپێرن بە بانکەکان. بانك وەك سیستەمێکی دارایی و وێستگەیەکی ناوەندی پارە سپێردراوەکان بە بڕێ سوودی زۆرتر لە شێوەی قەرزدا دەدات بە کۆمپانیا سەرمایەگوزارییەکان. بەمەش پرۆسەی بووژانەوەی سەرمایەگوزاری دەستپێدەکات کە لەئەنجامدا دەبێتە هۆی گەشەکردن و بووژانەوەی ئابووری.

خاڵێکی گرنگ دەمەوێت ئاماژەی پێبدەم، گرنگترین سەرچاوەی سەرمایە بۆ سەرمایەگوزاری داهاتی دانیشتووانە لەشێوەی پاشەکەوت کردندا، بە زمانی ئابووریناسان پێی دەوترێت ﴿سەرمایەی دارایی ناوخۆیی (ناوەکی)﴾ لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا بەهۆی پێشکەوتن و چالاکی سیستەمی بانکی و داراییەوە لەلایەکەوە, وە چالاکی بۆرسەکان لە لایەکی ترەوە هاندانی هاووڵاتیان لە بەشداری کردنیاندا لە کڕینی پشك وشەیردا لە بۆرسەکاندا، سەرمایەیەکی زۆر کەڵەکە دەکەن ئەمەش دەبێتە هۆی دامەزراندنی بناغەیەکی دارایی بەهێز و پتەو بۆ جێبەجێکردنی پرۆژە سەرمایەگوزارییەکان. بۆ نموونە

پاشکەوتی دانیشتوانی (یابان) ئەمڕۆ کە بریتییە لە (یەك ترلیۆن وسێ سەد ملیارد دۆلاری ئەمەریکی).

هەروەك لە پێشەوە باسمان لێکرد هەموو دیاردەو پرۆسەیەکی ئابووری دوو جەمسەری هەیە، بەهۆی کاریگەری فاکتەرە ئابوورییەکان لە سەر یەکتری و پەیوەندییان پێکەوە هەندێ جار ئەنجام



و ئاکامی پێچەوانەیی لێدەکەوێتەوە، زیادبوونی قەوارە و بارستایی سەرمایەی کەڵەکەبوو رەنگە ببێتە هۆی پەیدابوونی نرخ هەڵاوسان، ئێستاکە هەوڵ دەدەین بەشێوەیەکی فراوانتر ئەم گۆڕانکارییانە روون بکەینەوە.

بەهۆی جیاوازی بڕی داهاتەکانی تاکەکەس بڕی پاشەکەوت کردن و خەرجکردن جیاواز دەبێت. دیارە ئەوانەی داهاتیان بەرزە دەتوانن پارە زیاتر خەرج بکەن یان پاشەکەوت بکەن وەك لەوانەی کە داهاتیان نزمترە، هەروەك لە سەرەوە ئاماژەمان پێدا، داهاتەکان چ پاشەکەوت بکرێن یان خەرج بکرێن دەبێتە هۆی سەرچاوەیەکی گرنگ لە پێکهێنانی بەرهەمی نەتەوەیی.

بێگومان هەرچەندە داهات بەرز یان نزم بێت، هیچ کەسێك ناتوانێت بڕی هەموو داهاتەکانی پاشەکەوت بکات, چونکە بۆ بەردەوامی و بژێوی ژیان مرۆڤ پێویستی بە کاڵا و خزمەتگوزارییەکانە، واتە لەهەموو حاڵەتێکدا بڕێك لەداهاتەکەی خەرج دەکات، بە زمانی ئابووریناسان پێی دەوترێت (سنووردارێتی خەرج کردن و سنووردارێتی پاشەکەوت کردن) کە بە شێوەیەکی راستەوخۆ کاردەکەنە سەر بارودۆخی ئابووری (لەبەشی سێهەمدا) لێی دەدوێین، ئێستاکە بەهۆی ئەو نموونەیەی خوارەوە سنووردارێتی خەرجکردن و پاشەکەوت کردن زیاتر روون دەکەینەوە.

خشتەی ژمارە (٧-٢) ناوەندێتی سنووردارێتی خەرجی و پاشەکەوت کردن (دۆلار).

| ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| داهات | خەرجی | پاشەکەوت کردن | سنووردارێتی ناوەندی خەرجکردن | سنووردارێتی ناوەندی پاشەکەوت کردن | سنووری مەیلی خەرجکردن | سنووری مەیلی پاشەکەوت کردن |
| ١٠٠٠٠ | ١١٠٠٠ | -١٠٠٠ | ١,١ | -٠,١ | - | - |
| ٢٠٠٠٠ | ٢٠٠٠٠ | ٠ | ١,٠ | ٠ | ٠,٩ | ر |
| ٣٠٠٠٠ | ٢٨٥٠٠ | ١٥٠٠ | ٠,٩٥ | ٠,٠٥ | ٠,٨٥ | ٠,١٥ |
| ٤٠٠٠٠ | ٣٦٠٠٠ | ٤٠٠٠ | ٠,٩ | ٠,١ | ٠,٧٥ | ٠,٢٥ |
| ٥٠٠٠٠ | ٤٢٥٠٠ | ٧٥٠٠ | ٠,٨٥ | ٠,١٥ | ٠,٦٥ | ٠,٣٥ |
| ٦٠٠٠٠ | ٤٨٥٠٠ | ١١٥٠٠ | ٠,٨١ | ٠,١٩ | ٠,٦ | ٠,٤٧ |
| ٧٠٠٠٠ | ٥٤٠٠٠ | ١٦٠٠٠ | ٠,٧٧ | ٠,٢٣ | ٠,٥٥ | ٠,٤٥ |
| ٨٠٠٠٠ | ٥٩٠٠٠ | ٢١٠٠٠ | ٠,٧٤ | ٠,٢٦ | ٠,٥ | ٠,٥ |

ئێستاكە هەوڵ دەدەین ژمارەكانی خشتەكەی سەرەوە شیتەڵ بكەینەوە. گریمان كۆڵۆم (زنجیرەی) یەكەم بریتییە لە داهاتی ساڵانەی خێزانی مامۆستا سەربەست, داهاتی ساڵی یەكەمی بریتییە لە (١٠٠٠٠) دۆلار، بەلاّم لە ماوەی ئەوساڵەدا (١١٠٠٠) دۆلاریان خەرج كردووە كۆڵۆمی ژمارە (٢) واتە بڕی (١٠٠٠) دۆلاریان زیاتر لە داهاتەكەیان خەرج كردووە كۆڵۆمی ژمارە (٣) لە ساڵی دووەمدا داهاتی خێزانەكەی مامۆستا سەربەست زیادی كردووەو بووە بە (٢٠٠٠٠) دۆلار بەلاّم هەموو بڕە داهاتەكەیان خەرج كردووە بۆجێبەجێكردنی پێداویستییەكانیان، واتە لە ساڵی دووەمیشدا خێزانی مامۆستا سەربەست نەیان توانیوە هیچ بڕە پارەیەك لە داهاتەكەیان پاشەكەوت بكەن. كەواتە ئەگەر داهاتی خێزانی مامۆستا سەربەست لە(٢٠٠٠٠) دۆلار زیاتر نەبێت ناتوانن هیچ پاشەكەوتێك بكەن. لە كۆڵۆمی ژمارە (٤)دا سنوورداریەتی قەوارەی ناوەندی خەرج كردن نیشاندراوە كە بەدابەشكردنی كۆڵۆمی (٢) بەسەر كۆڵۆمی (١)دا دەستمان دەكەوێت. هەروەك دەبینین رێژەی ناوەندی خەرج كردن بریتییە لە (١,١) دۆلار.

ئەگەر كۆڵۆمی (٣) دابەش بكەین بەسەر كۆڵۆمی (١)دا ئەوا سنوورداریەتی قەوارەی ناوەندی پاشەكەوت كردنمان دەست دەكەوێت كە لە كۆڵۆمی (٥)دا نیشاندراوە. هەروەك لە خشتەكەدا دیارە خێزانی مامۆستا سەربەست لە ساڵی یەكەمدا ناوەندی سنووردارێتی پاشەكەوت كردنیان بریتییە لە (١١٠٪) واتە رێژەی (١٠٪) زیاتر لەداهاتی ساڵانەیان خەرج كردووە چەند داهات زیاد بكات بڕی پاشەكەوت كردن زیاد دەكات. بابزانین ئەگەر بڕی داهاتی خێزانی مامۆستا سەربەست زیاد بكات چی روودەدات. ئەگەر سەیری كۆڵۆمی (٦) بكەین، سنووردارێتی مەیلی خەرج كردنمان نیشان دەدات كە لە ئەنجامی دابەشكردنی جیاوازی كۆڵۆمی (٢) بەسەر جیاوازی كۆڵۆمی (١)دا لەماوەی دوو ساڵی یەك بە دوای یەكدا دەستمان دەكەوێت. ئەگەر داهات لە ساڵی چوارەمدا بریتی بێت لە (٤٠٠٠٠) دۆلار ئەوا جیاوازی بڕی خەرجكردن بریتی دەبێت لە (٧٥٠٠) دۆلار لەساڵێكدا، بابزانین چۆن بڕی (٧٥٠٠) دۆلارمان دەستكەوت. كاتێك داهاتی ساڵی سێهەم بریتییە لە (٣٠٠٠٠) دۆلار، ئەوا بڕی خەرج كردن بریتییە لە (٢٨٥٠٠) بەلاّم كاتێك داهات بریتییە لە (٤٠٠٠٠) دۆلار ئەوا بڕی خەرجكردن بریتییە لە (٣٦٠٠٠) دۆلار، كەواتە كاتێك زیادەی داهاتی ساڵانە بریتی دەبێت لە (١٠٠٠٠) دۆلار ئەوا رێژەی سنووری مەیلی خەرج كردن بریتی دەبێت لە (٠,٧٥) دۆلار وەك لە كۆلۆمی (٦)دا نیشان دراوە. لە كۆڵۆمی (٧) مەیلی ئارەزووی پاشەكەوت كردن نیشان دەدات كە لەئەنجامی



دابەشكردنی كۆڵۆمی (٣) بەسەر جیاوازی داهاتدا كۆڵومی (١) لەماوەی دوو ساڵی یەك بە دوای یەكدا دەستمان كەوتووە، ئەگەر سەیری خشتەكە بكەینەوە دەبینین مەیلی ئارەزووی پاشەكەوت كردن بەپێی زیادەی داهات ساڵ بەساڵ زیاد دەكات كاتێك داهات بریتی دەبێت لە (٨٠٠٠٠) دۆلار ئەوا پاشەكەوت كردن بریتی دەبێت لە (٥٠٪)ی داهات. لێرەدا دەمەوێت سەرنجی خوێنەر رابكێشم بۆ خاڵێكی زۆر گرنگ، پەیوەندی بڕی خەرج كردن و پاشەكەوت كردن پەیوەندییەكی ئاڵۆزە و پابەندە بە چەندان فاكتەرەوە كە كاریگەریان لەسەر یەكتری هەیە، وە هەروەها ئەم پرۆسەیە كاریگەرییەكی راستەوخۆی هەیە لەسەر سەرمایەگوزاری. شیتەڵكردنەوە و ژمێركردنی ئەم پرۆسەیە لەئاستی دەوڵەتدا تەنها لە توانای ئابووریناساندایە. ئێمە بۆ ساكار كردن و ئاسان تێگەشتنی خوێنەر بەهۆی نموونەكەی سەرەوە تەنها مێتۆدی ژمێركردن و كاریگەری هەردوو پرۆسەی خەرج كردن و پاشەكەوتمان نیشاندا. بێگومان مەرج نییە هەموو بەرزبوونەوەیەكی داهات ببێتە هۆی پاشەكەوت كردنێكی زیاتر، بۆئەوەی لەم پەیوەندییە تێبگەین پێویستە بزانین ئەركی خەرج كردن چییە لە پرۆسەی ئابووریدا.

## ئەركی خەرج كردن و بەكارهێنان

ئێستاكە لەبەر رۆشنایی نموونەكەی سەرەوەدا و بەیارمەتی وێنەكەی خوارەوە هەوڵ دەدەین ئەركی خەرج كردن و بەكارهێنانی نیشان بدەین.

وێنەی ژمارە (٧-٢) مەیلی ئارەزووی خەرج كردن.



لە وێنەکەی سەرەوەدا پەیوەندی نێوان داهات و خەرج کردن نیشاندراوە، واتە پەیوەندی نێوان کۆڵۆمی (٢) وە کۆڵۆمی (١) خشتەی ژمارە (٧-٢). سەیردەکەین لە پلەی (٤٥)دا بڕی داهات یەکسان دەبێت بە بڕی خەرج کردن، لەوکاتەی بڕی داهات بریتییە لە (٢٠٠٠٠) دۆلار ئەوا خەرج کردنیش بریتی دەبێت لە بڕی (٢٠٠٠٠) دۆلار، بەڵام لەخاڵەکانی تردا دەبینین بە پێی زیادبوونی داهات بڕی خەرج کردنیش زیاد دەکات، بەڵام کاتێك بڕی خەرجکردن کەم دەبێتەوە ئەوا بڕی پاشەکەوت کردن زیاد دەکات، ئێستاکە باس لە ئەرکی پاشەکەوت کردن دەکەین.

## ئەرکی پاشەکەوت کردن

بێگومان هەردوو پرۆسەی خەرج کردن و پاشەکەوت کردن دوو چەمکی جیاوازی یەك دیاردەن، واتە هەردوو لە ئەنجامی داهاتەوە سەرچاوە وەردەگرن. واتە خەرجکردن و پاشەکەوت کردن دوو دیوی پێچەوانەی داهات نیشان دەدەن. کەواتە ئەرکی پاشەکەوت کردن پێچەوانەی ئەرکی خەرج کردنە.

وێنەی ژمارە (٧-٣) مەیلی ئارەزووی پاشەکەوت کردن.




لە وێنەکەی سەرەوەدا زۆر بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا پرۆسەی ئەرکی پاشەکەوت کردن دیارە، چەند داهات زیاتربێت ئەوا بڕی پاشەکەوت کردن زیاد دەکات. دەبینین چەماوەی



پاشەکەوت کردن دوای خاڵی (20000) (E) دۆلار، واتە خاڵی هاوسەنگی. وردە وردە چەماوەکە بەرز دەبێتەوە بەپێی بڕی داهات.

## لە ئاستی دەوڵەتدا

لە نموونەکەی پێشوودا پەیوەندی و دینامیکی گۆڕانی خەرجی و پاشەکەوت کردنی داهاتی ساڵانەی تاکە کەسمان لەسەر نموونەی داهاتی ساڵانەی خێزانی مامۆستا سەربەست نیشاندا، بەڵام بابزانین خەرجی و پاشەکەوت کردنی هەموو دانیشتوان پێکەوە چ کارێك دەکەنە سەرباری ئابووری دەوڵەت؟ بۆ زیاتر روون کردنەوە و تێگەیشتنی پرۆسەی خەرجکردن و پاشەکەوت کردن لەسەر ئاستی دەوڵەت بەهۆی نموونەکەی خوارەوە نیشان دەدەین, کە بریتییە لەبڕی داهات و خەرج کردن و پاشەکەوت کردنی دانیشتوانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەنێوان ساڵەکانی (١٩٩٠-٢٠٠١)دا.

خشتەی ژمارە (٧-٣) داهات، خەرج کردن، پاشەکەوت کردن (ملیار دۆلار)

| | ١٩٩٠ | ١٩٩١ | ١٩٩٢ | ١٩٩٣ | ١٩٩٤ | ١٩٩٥ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| داهات | ٤٢٩٤ | ٤٤٧٥ | ٤٧٥٥ | ٤٩٣٥ | ٥١٥٦ | ٥٤٢٣ |
| خەرجکردن | ٣٩٥٩ | ٤١٠٣ | ٤٣٤١ | ٤٥٨٤ | ٤٨٥٠ | ٥١٢٠ |
| پاشەکەوت کردن | ٣٣٥ | ٣٧٢ | ٤١٤ | ٣٥١ | ٣١٥ | ١٧٠ |
| ڕێژەی پاشەکەوت کردن | ٧,٨ | ٨,٣ | ٨,٠٧ | ٧,١ | ٦,١ | ٥,٦ |
| | ١٩٩٦ | ١٩٩٧ | ١٩٩٨ | ١٩٩٩ | ٢٠٠٠ | ٢٠٠١ |
| داهات | ٥٦٧٨ | ٥٩٨٦ | ٦٣٥٦ | ٦٦٢٧ | ٧١٢٠ | ٧٣٩٣ |
| خەرجکردن | ٥٤٠٦ | ٥٧١٥ | ٦٠٥٤ | ٦٤٥٣ | ٦٩١٩ | ٧٢٢٤ |
| پاشەکەوت کردن | ٢٧٢ | ٢٥٣ | ٣٠٢ | ١٧٤ | ٢٠٢ | ١٧٠ |
| ڕێژەی پاشەکەوت کردن | ٤,٨ | ٤,٢ | ٤,٧ | ٧,١ | ٢,٨ | ٢,٣ |

ئامارەکانی خشتەکەی پێشوو نیشانمان دەدەن کە ڕێژەی پاشەکەوت کردنی دانیشتوانی ئەمەریکا لەساڵی (١٩٩٠)دا بریتی بووە لە (٧,٨٪) بەلاّم لە ساڵی (٢٠٠١)دا نزم بۆتەوە بۆ ڕێژەی (٢,٣٪)، کەواتە دانیشتوانی ئەمەریکا ساڵ بە ساڵ مەیلی ئارەزووی خەرجکردنیان زیاتر دەبێت و بەرز دەبێتەوە، ئەم دیاردەیە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە سیاسەتی ئابووری حکوومەتەوە هەیە، (دانیشتوانی ئەمەریکا بەشێوەیەکی گشتی لە حاڵەتی قەرزدا دەژین) بەهۆی زیادبوونی خەرجی لە بواری پێداویستییە درێژخایەنەکاندا وەکو خانووبەرەو سەیارە. دینامیکی پەیوەندی داهات و خەرجکردنی دانیشتوانی ئەمەریکا لەماوەی (١٢) ساڵدا لە وێنەکەی خوارەوەدا نیشان دەدەین.

وێنەی ژمارە (٧-٤) دینامیکی داهات، خەرج کردن (ترلیون دۆلار)




لەوێنەکەی سەرەوەدا پەیوەندی نێوان داهات و خەرجکردنی دانیشتوانی ئەمەریکا لەماوەی (١٢) ساڵدا (١٩٩٠-٢٠٠١) نیشاندراوە، ئەگەر بەووردی سەرنجی نوختەکانی هێڵی ئەرکی خەرج کردن بکەین دەبینین دانیشتوانی ئەمەریکا مەیلی خەرجکردنیان زیاترە وەك لەمەیلی پاشەکەوت کردن. بێگومان ئەم دیاردەیە هیچ مەترسییەکی نییە لەسەر ئابووری ئەمەریکا چونکە هەروەك لەپێشەوە باسمان لێکرد چ خەرجکردن وە چ پاشەکەوت کردن بڕگەیەکی گرنگن لە پێکهێنانی تێکڕای بەرهەمی نەتەوایەتیدا.



## مانای سەرمایەگوزاری

پێشتر باسمان لەخەرجی و پاشەکەوتی دانیشتوان بەگشتی کرد، وە باسمان لە کاریگەری و پەیوەندی خەرجی و پاشەکەوت لەسەر باری ئابووری کرد، وە هەروەها بەشێوەیەکی فراوان باسمان لە خەرجکردنی دانیشتوان واتە بڕگەی (C) لە تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی کرد، ئێستاکە هەوڵ دەدەین باس لە پاشەکەوت کردن وەك سەرمایە گوزاری, واتە بڕگەی (I) لە تێکڕای بەرهەمی نەتەوەییدا بکەین.

هەروەك دەزانین دوو لەسەر سێی قەوارەی بڕی داهاتی نەتەوەیی بریتییە لە کۆی خەرجییە گشتیەکانی دانیشتوان، بەلاّم دەبێت ئەو ڕاستییە بزانین کە پێشکەوتن و گەشەکردن و بووژانەوەی بەبێ بەگەڕخستنی سەرمایە واتە سەرمایە گوزاری مەحاڵە. مەبەست لە سەرمایە گوزاری بەرهەمهێنانە لە پێناوی بەرهەمهێناندا وە لەپێناوی قازانجدا، کەواتە هەر بەگەڕخستنێکی سەرمایە لە پێناوی زیاد کردنی هێز و توانای بەرهەمهێناندا بەکاربهێنرێت پێی دەگوترێت سەرمایە گوزاری وەك (بیناسازی، کارگەی پیشەسازی، فراوانکردن و تازەکردنەوەی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان، دروستکردنی ڕێگاوبان، دەرهێنان و بەکارهێنانی کانزاکانی ژێر زەوی، گۆڕینی ماددە خامەکان بۆ بەرهەمی ئامادەکراو,... هتد).

سەرمایە گوزاری دەبێتە هۆی زیاد کردنی تواناکانی بەرهەمهێنان کە گەرانتی پێشکەوتنی کۆمەڵگایە. کاتێك سەرمایەدار بڕیاری بەرهەمهێنانی کالاّ و خزمەتگوزارییەکان دەدات پێویستی بە ئامێری بەرهەمهێنانە، بەلاّم ئامێرەکان بەبێ بەشداری کار و زەهنی مرۆڤ واتە (هێزی کار) ناتوانن هیچ بەرهەم بهێنن. هێزی کار بریتییە لە (کرێکار، ئەندازیار، بەڕێوەبەر,... هتد) دوا بە دوا بەرهەمەکان بەهۆی بازرگانەکانەوە دەگەنە بازاڕەکان و ئێمەی کڕیار دەتوانین بەکاریان بهێنین. کەواتە چەند قەوارەی سەرمایە گوزاری زیاتر بێت ئەوا بەشداربووانی پرۆسەی بەرهەمهێنان زیاتر دەبن ئەمەش دەبێتە هۆی زیاد بوونی داهاتەکان واتە توانای خەرجی و پاشەکەوت کردنی دانیشتوان زیاتر دەبێت، ئەم پرۆسەیە هەمیشە لە بەردەوامیدایە وەك لە وێنەی ژمارە (٧-١) نیشانماندا. بێگومان بەگەڕخستنی سەرمایە کارێکی ئاسان نییە، بەڵکو پێویستی بەلێکۆڵینەوەی چڕوپڕ و هەمەلایەنی و زانستانە هەیە, پێویستە بەر لەبەگەڕخستنی سەرمایە گشت فاکتەرە ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان ڕەچاو بکرێت، چونکە ئامانجی سەرمایەدار لە بەگەڕخستنی سەرمایەدا دەستکەوتنی زۆرترین قازانجە.

هەندێ جار بڕی پارەی پاشەکەوت کراو کەمترە لەو بڕە پارەیەی کەپێویستە بۆ سەرمایە گوزاری, ئەم ناهاوسەنگییە کاریگەری راستەوخۆیان هەیە لەسەر باری ئابووری بەگشتی.

## ناهاوسەنگی پاشەکەوت کردن و سەرمایەگوزاری

کاتێ ئابووری پێویستی بە سەرمایەگوزاری چالاك و فراوان هەیە، بەلاّم پاشەکەوتی دانیشتوان لەو رادده پێویستە نزمتر بێت ئەوا دەبێتە هۆی دروستکردنی ناهاوسەنگی لەنێوان پاشەکەوت کردن و سەرمایەگوزاریدا. بێگومان هەموو ناهاوسەنگییەك نێگەتیڤانە کاردەکەنە سەر بارودۆخی ئابووری. هەوڵ دەدەین بەهۆی وێنەکەی خوارەوە پەیوەندی نێوان پاشەکەوت کردن و سەرمایە گوزاری و کاریگەرییان لەسەر پێکهێنانی بەرهەمی نەتەوەیی روون بکەینەوە.

وێنەی ژمارە (٧-٥) پاشەکەوت، سەرمایەگوزاری، تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی.




ئەگەر سەیری وێنەکەی سەرەوە بکەین دەبینین هەردوو چەماوەی پاشەکەوت کردن و سەرمایەگوزاری بەرەو بەرزبوونەوە دەچن بەپێی بڕی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی، وەهەروەها تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی بەپێی زیادبوونی پاشەکەوت کردن و سەرمایە گوزاری زیاد دەکات. ناهاوسەنگی نێوان بڕی پاشەکەوت کردن و سەرمایە گوزاری لەهەردوو چەماوەی (S) وە (I) لەوێنەکەی پێشوودا دەستنیشان کراوە. بابزانین هاوسەنگی نێوان پاشەکەوت کردن و سەرمایە گوزاری چۆن روودەدات. ئەگەر دانیشتوان بەشێکی زۆری داهاتەکانیان پاشەکەوت



بکەن، واتە بڕی خەرجکردن کەم دەبێتەوە کەم بوونەوەی خەرجیەکان دەبێتە هۆی بێ بازاڕی واتە نەفرۆشتنی (کالاّ و خزمەتگوزارییەکان) ئەوکاتە بەرهەمهێنەر ناچار دەبێت بڕی بەرهەمهێنان کەمتر بکاتەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی زیادبوونی بێکاری کەم بوونەوەی داهات. لەلایەکی ترەوە کاتێك دانیشتوان بەشێکی زۆری داهاتەکانیان خەرج دەکەن ئەوا بڕی پاشەکەوت کردن کەم دەبێتەوە, کەم بوونەوەی پاشەکەوتیش دەبێتە هۆی نزم بوونەوەی پرۆسەی سەرمایە گوزاری, واتە تەنگەژەی ئابووری و کەم بوونەوەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی. ئەم ناهاوسەنگییە بەردەوام دەبێت تاکو هەردوو چەماوەی پاشەکەوت کردن و خزمەتگوزاری لەخاڵی (E) هاوسەنگ دەبن.

ئێستاکە دەزانین کە زیادبوونی سەرمایەگوزاری دەبێتە هۆی زیادبوونی داهاتی خەڵکی, بەلاّم کەم بوونەوەی سەرمایە گوزاری دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی داهاتی خەڵکی. کەواتە جارێکی تر دەبێت چاوەڕێی کاریگەری دەستی شاراوەی بازاڕ (داوا و خستنەڕوو) بکەین بۆ ئەوەی هاوسەنگی لەنێوان خەرجی و پاشەکەوت کردن و سەرمایەگوزاریدا بە ئەنجام بگەیەنێت. جارێکی تر ئەبێت ئەوە لەیاد نەکەین کە پرۆسەی ئابووری ئۆرگانیزمێکی پێکەوە بەستراو لەیەك نەپساوە، فاکتەرە ئابوورییەکان کاریگەری پێچەوانەیان لەسەر یەکتری هەیە، بۆیە دیاردە ئابوورییەکان دوو جەمسەرین.

# فەسڵی هەشتەم

## هونەری سەوداکاری*

لە فەسڵەکەی پێشوودا بە دوور و درێژی باسمان لە هەڵسوکەوتی بەکاربەران (کڕیار) لە بازارەکاندا کرد, وە باسمان لە کاریگەری داهاتی دانیشتوان کرد لە پرۆسەی ئابووریدا. لەم فەسڵەدا باس لە بەرهەمهێنەر دەکەین واتە باس لە گشت کارکەران، سەوداکاران، بازرگانەکان، کاسبکاران، خاوەن دوکانەکان، خاوەنی کۆمپانیاکان، کارگەکان، چێشتخانەکان, ...هتد)

باس لەوە دەکەین کێ وە چۆن کاڵا و خزمەتگوزارییەکان بەرهەم دەهێنن، هەوڵ دەدەین بزانین نهێنی دەستی شاراوە (داوا و خستنەڕوو) لە چیدایە. وە هەروەها باس لە خەرجییەکانی بەرهەمهێنان و کاریگەرییان لەسەر نرخی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان دەکەین.

**فەرهەنگی ئابووری**

قازانج (Profit): ئەو داهاتەیە کە لەدەرامەتی پرۆژە دەمێنێتەوە پاش داشکاندنی تێچوونی بەرهەمهێنان.

قازانج=بەهای فرۆتەنی _ سەرجەمی تێچوون

یان/ {(نرخی یەك دانە×بەرهەم داری کار×ژمارەی کرێکارەکان)-(تێچوونی یەکەی بەرهەمهێنراو)} × بڕی فرۆتەنی.

شێوە و جۆرەکانی قازانج:

| | |
|---|---|
| - سەرجەمی قازانج | Gross Profit |
| - قازانجی دەراوێتە (سەربارە) | Excess Profit |
| - قازانجی ئاسایی | Normal Profit |

※ سەوداکاری: بەرامبەر وشەی (Business)ی ئینگلیزی بەکارهێنراوە، وە هەندێ جار وشەی (پیشە، کاسبکار، کارکردن، پرۆژە، بازرگانی) بەکاردەهێنرێت.



| | |
|---|---|
| - قازانجی ئابووری | Economic Profit |
| - قازانجی سادە | Simple Profit |
| - سەرجەمی قازانجی بازرگان | Gross Trading Profit |
| - قازانجی کارپێکردن | Operating Profit |
| - قازانجی رادەدەر (دوا قازانج) | Marginal Profit |
| - قازانجی دەفتەری | Book Profit |
| - قازانجی سەرمایەیی | Capital Profit |
| - قازانجی رووت | Pure Profit |
| - قازانجی داڕسنەکراو | Undistributed Profit |
| - قازانجی نانەختینە | Scrip Dividend |
| - قازانجی پلاندار | Planned Profit |
| - قازانجی کۆتایی ساڵ | Year End Dividend |
| - قازانجی هاوبەشیی | Contribution Profit |

ئێستاکە هەریەك لە جۆرەکانی قازانج روون دەکەینەوە:

سەرجەمی قازانج - گشت دەستکەوتی پرۆژەیەکە پاش داشکاندنی تێچوونی بەرهەم ماکەکانی دیکەی بەرهەمهێنان.

قازانجی دەراوێتە (سەربارە) - ئەگەر قازانجی پرۆژەیەك زیاتر بوو لە قازانجە ئاساییەکەی، ئەو زیادەیە (قازانجی دەراوێتە) یان (قازانجی سەربارەی) پێ دەوترێت.

قازانجی ئاسایە - بڕی ئەو قازانجەیە کە پاڵ بە بەرهەمهێن دەنێت بۆ ئەوەی لە بەرهەمهێناندا بەردەوام بێت.

قازانجی رووت - ئەو بەشەیە کە لەسەرجەمی قازانج دەمێنێتەوە پاش داشکاندنی تێچوونە شاراوەکان و ئەوانەی لە جیاتی کاری رێکخستن دەدرێت، هەروەها (قازانجی ئابووری)یشی پێ دەوترێت.

سەرجەمی قازانجی بازرگانی- سەرجەمی قازانج پێش داشکاندنی پووان و سوودی دراو لەسەر قەرزی دەزگاو هەروەها بەبێ سەیارە کردنی زیادەیەك بۆ بەهای جرو جیاوەزەکان (ستۆکات).

قازانجی کارپێکردن – جوداوازی نێوان دەرامەتی هەمەکیی و سەرجەمی تێچووی ئیش پێکردن (تێچوونی گۆڕاو) پێش داشکانی تێچوونی نەگۆڕ.

قازانجی رادەدار (دوا قازانج) – ئەو قازانجەیە کە لەئەنجامی فرۆشتنی دوایەکەی بەرهەم دێتە ئەنجام.

قازانجی دەفتەریی – قازانجی بەدی نەهاتوو، کە لەکاتی بەسەر کردنەوەی شمەکی ئەمبارکراو دووبارە نرخاندنیدا دێتە ئەنجام.

قازانجی سەرمایەیی – زیادبوونی نرخی هەبووە مایەکییەکان لە چاو بەها دەفتەرییەکەی پاش داشکاندنی بەهای پووان.

قازانجی دابەشنەکراو – بەرکەوتی پشکەکان لەو قازانجەی کە هێشتا پڕۆژە بازرگانییەکە دابەشی نەکردووە.

قازانجی نانەختینە – ئەو قازانجەی کە بە نەخت یان پارە نادرێ، بەڵکە لەشێوەی قەواڵەی قەرزی کاتیی دەدرێ.

قازانجی پلاندار – واتە سەر رێژەی دانراو لەلایەن مەڵبەندی پلان داناندا.

قازانجی کۆتایی ساڵ – قازانجی زیادەیە کە لەکۆتایی ساڵی داراییدا سەرەڕای قازانجی ئاسایی دەدرێ.

## سەوداکەری راستەقینە

سەوداکەر (بیزنس مان) لەسەرەتاوە خەرجی دەکات لە بەرهەمهێنانی کاڵا و خزمەتگوزارییەکاندا، دوابەدوا بەرهەمەکانی دەفرۆشێت بە نرخێکی زیاتر بۆ ئەوەی قازانجی دەستکەوێت، کەواتە سەوداکار کاردەکات لەپێناوی بەدەست هێنانی قازانجدا. جیاوازی تێچوونی (نرخی) بەرهەمهێنان و نرخی فرۆشتن پێی دەوترێت قازانج، کەواتە (قازانج) بریتییە لەو برە پارەیەی کە دوای ژمێرکردنی هەموو خەرجییەکانی (ڕاستەوخۆ، لاوەکی) بەرهەمهێنان دەمێنێتەوە. دەمەوێت خوێنەر ئاگادار بکەم کە (دەستکەوت) لەگەڵ (قازانج) جیاوازن. مەبەست لە قازانج ئەو برە پارەیە کە پاك کراوەتەوە لە هەموو باجێك، بەڵام دەستکەوت ئەوبرە پارەیە کە هێشتا پاك نەکراوەتەوە لە باج. ئێستاکە هەوڵ دەدەین بەهۆی نموونەکەی خوارەوە پرۆسە و فاکتەرەکانی بەرهەمهێنان روون بکەینەوە.



گریمان کۆمپانیای ئاڤێستا پسپۆرە لە ئامادەکردن و پاککردنەوەو رێکوپێك کردنی زەویدا (زەوی، کشتوکاڵی، بیناسازی, باخچە گشتییەکان، یاریگاکان, ... هتد) بێگومان ئەم جۆرە کارە پێویستی بەهێزی کاری کرێکاران و ئەندازیارانە. تەنانەت تەکنۆلۆژیا و تەکنیکی نوێش ناتوانن جێگەی کاری مرۆڤ لەم بوارەدا بگرنەوە، بەهۆی خشتەکەی خوارەوە فاکتەرە سەرەکییەکانی بەرهەمهێنانی کۆمپانیای ئاڤێستا نیشان دەدەین.

خشتەی ژمارە (٨-١) خەرجی گشتی (نەگۆڕ، گۆڕاو)، سنوری خەرجی ناوەندی.

| ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| رووبەری زەوی (دۆنم) | خەرجی نەگۆڕ | خەرجی گۆڕاو | خەرجی گشتی | سنورداریەتی خەرجییەکان بۆ یەك دۆنم | ناوەندێتی خەرجی نەگۆڕ | ناوەندێتی خەرجی گۆڕاو | ناوەندێتی خەرجی گشتی |
| 0 | 5000 | 0 | 5000 | - | - | - | - |
| 50 | 5000 | 300 | 5300 | 6.00 | 100.00 | 6.00 | 106.00 |
| 100 | 5000 | 550 | 5550 | 5.00 | 50.50 | 5.50 | 55.5 |
| 150 | 5000 | 750 | 5750 | 4.00 | 33.33 | 5.00 | 38.33 |
| 200 | 5000 | 1050 | 6050 | 6.00 | 25.00 | 5.25 | 30.25 |
| 250 | 5000 | 1550 | 6650 | 10.00 | 20.00 | 6.20 | 26.20 |
| 300 | 5000 | 2250 | 7250 | 14.00 | 16.67 | 7.50 | 24.17 |
| 350 | 5000 | 3150 | 8150 | 18.00 | 14.29 | 9.00 | 23.29 |
| 400 | 5000 | 4250 | 9250 | 22.00 | 12.50 | 10.63 | 23.44 |
| 450 | 5000 | 550 | 10550 | 26.00 | 11.11 | 12.33 | 23.13 |
| 500 | 5000 | 7050 | 12050 | 30.00 | 10.00 | 14.10 | 23.10 |

ئێستاکە هەوڵ دەدەین ناوەڕۆکی خشتەکەی سەرەوە شیتەڵ بکەینەوە:

کۆلۆمی (١) بریتییە لە پانتایی ئەو رووبەرە زەوییانەی کە پێویستە ئامادەبکرێت بۆ بەرهەمهێنان لەهەفتەیەکدا. کۆلۆمی (٢) خەرجییە نەگۆڕەکانە، کە (پەیوەندی نییە بە

پانتایی رووبەری زەوییەکانەوە)، کۆلۆمی (٣) بریتییە لە خەرجییە گۆڕاوەکان کە بڕەکەی بەپێی قەوارەی پانتایی زەوییەکان دەگۆڕێت، وەك (کرێی کار، سووتەمەنی، ماددەی خاوو,... هتد) کۆلۆمی (٤) بریتییە لە خەرجە گشتییەکان. واتە کۆی کۆلۆمی (٢) وە کۆلۆمی (٣). سەوداکاران وبەرهەم هێنەران جگە لە ژمێرکردنی خەرجییە گشتییەکان هەولێ ژمێرکردنی هەر تاکە تاکەی (بڕگەی) پرۆسەی بەرهەم دەکەن بۆئەوەی سنوورو ناوەندێتی خەرجییەکان جوودا و پۆلێن بکەن. کۆلۆمی (٥) سنووری خەرجی یەك دۆنم نیشان دەدات، ئەگەر کۆمپانیای ئاڤێستا بۆ ئامادەکردنی رووبەری (١٥٠) دۆنم زەوی پێویستی بە (٥٧٥٠) دۆلار بێت وەك خەرجی گشتی، واتە بڕی (٢٠٠) دۆلار زیاتر وەك لە ئامادەکردنی (١٠٠) دۆنم زەوی، کەواتە زیاترکردنی (٥٠) دۆنم زەوی پێویستی بە (٢٠٠) دۆلار خەرجی زیاتر هەیە. لەو ئاستەدا سنووری خەرجییەکان بریتی دەبێت لە (٤,٠٠) دۆلار. کەواتە چەند رووبەری زەوی زیاد بکات ئەوا سنووری خەرجییەکان بەرەو کەم بوونەوە دەچێت. لە کۆلۆمی (٦) داناوەندێتی خەرجی نەگۆڕ نیشان دراوە کە لەئەنجامی دابەشکردنی کۆلۆمی (٢) بەسەر رووبەری زەویدا کۆلۆمی (١)دا دەستمان کەوتووە. هەروەها ناوەندێتی خەرجییە گشتییەکان کەم دەبێتەوە بەپێی زیاد بوونی قەوارەی بەرهەمهێنان، چونکە خەرجی نەگۆڕ بڕەکەی جێگیرە وەپەیوەندی نییە بە زیادبوونی روبەر و پێوانەی زەوی. کۆلۆمی (٧) ناوەندێتی خەرجی گۆڕاو نیشان دەدات، کە لەئەنجامی دابەشکردنی کۆلۆمی (٣) بەسەر کۆلۆمی (١)دا دەستمان کەوتووە. سەیر دەکەین ناوەندێتی خەرجی گۆڕاو بەرەو بەرزبوونەوە دەچێت بەپێی زیادبوونی رووبەری زەوی بەرهەمهێنراو. کۆلۆمی (٨) ناوەندێتی خەرجی گشتی نیشان دەدات، کە لەئەنجامی دابەشکردنی کۆلۆمی (٤) بەسەر کۆلۆمی (١)دا دەستمان دەکەوێت. دەبینیت ناوەندێتی خەرجی گشتی لەسەرەتاوە بەرەو کەم بوونەوە دەچێت بەلاَم وردە وردە بەرزدەبێتەوە.

بۆ زیاتر روون کردنەوە بەهۆی وێنەکەی خوارەوە پەیوەندی خەرجییەکانی بەرهەم هێنان نیشان دەدەین.



وێنەی ژمارە (٨-١) کاریگەری بڕی بەرهەم لەسەر بڕی خەرجییەکان.




لە وێنەکەی سەرەوەدا ناوەندێتی خەرجییە نەگۆڕەکان بەهۆی چەماوەی (AFC) نیشان دراوە. دەبینین بەپێی زیادبوونی قەوارەی رووبەری زەوی بەرەو نزم بوونەوە دەچێت. ناوەندێتی خەرجییە گۆڕاوەکان بەهۆی چەماوەی (AVC) نیشان دراوە، دەبینین بەپێی زیادبوونی رووبەری زەوی بەرەو زیاد بوون دەڕوات چونکە زیاتر بەستراوە بە (کارو کرێی کارە)وە، کەواتە چەند رووبەری زەوی بۆ بەرهەمهێنان زیادبکات خەرجی گشتی زیاد دەکات وەهەروەها خەرجییە گۆڕاوەکانیش زیاد دەکەن ئەمەش دەبێتە هۆی کەم کردنەوەی رێژەی قازانج، بۆیە بەرهەمهێنەرەکان هەمیشە هەولێ کەم کردنەوەی خەرجە گۆڕاوەکان دەدەن واتە بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیای نوێ و تەکنیکی پێشکەوتوو لەبەرهەمهێناندا لەبری هێزی کاری مرۆڤ.

ناوەندێتی خەرجی گشتی بەهۆی چەماوەی (ATC) نیشان دراوە، دەبینین بەشێوەیەکی خشۆکی لەگەڵ هەردوو چەماوەی (AFC) وە (AVC) هاوسەنگ دەبێت. ئەمەش مانای وایە هەردوو خەرجی نەگۆڕو گۆڕاو پێکەوە کاریگەری راستەوخۆیان هەیە لەسەر خەرجی گشتی. سنووری خەرجییەکان بەچەماوەی (MC) نیشان دراوە, دەبینین لەگەڵ چەماوەی ناوەندێتی خەرجی گشتیدا یەك دەبڕن (بەیەکتری دەگەن) واتە بەزیادبوونی خەرجییە گشتییەکان سنوورداریێتی خەرجییەکان بەرەو زیادبوون دەچن. کەواتە خەرجییە گشتییەکان هێدی هێدی

هاوسەنگ دەبن لەگەڵ ناوەندێتی خەرجییەکاندا، ئێستاکە بابزانین چ گۆڕانێك لەگەڵ سەوداکاردا روودەدات.

## سەوداکار چی بکات؟

لەسەرەتاوە پێویستە لەستروکتور و پێکهاتەی خەرجییەکان بکۆڵێتەوە، واتە دەبێت بەشێوەیەکی ورد و درشت خەرجییە (گۆڕاو نەگۆڕا)وەکان دیاری بکات لەپرۆسەی بەرهەمهێناندا. دەبێت هاوسەنگی نێوان خەرجی (گۆڕاو نەگۆڕ) رەچاو بکات لە بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای سەردەم و تەکنیکی نوێ لە بەرهەمهێناندا لەپێناوی کەمکردنەوەی بڕی خەرجییە گۆڕاوەکان، وە هەروەها دەبێت هەوڵی کەمکردنەوەی خەرجییە گشتیەکان بدات بە یەکسانکردنی سنووری خەرجییەکان بۆ هەر یەکەیەکی بەرهەمهێنراو لەگەڵ بڕی خەرجییە نەگۆڕەکان. ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ وێنەکەی پێشووی ژمارە(٨-١) دەبینین کاتێك چەماوەی (MC) هاوجووت دەبێت لەگەڵ چەماوەی (ATC) کاتێك رووبەری زەوی بەرهەم هێنراو بریتییە لە (٤٠٠) دۆنم خاڵی یەکگرتنی هەردوو چەماوەکە ئەو خاڵەیە کە بەرهەمهێنەر دەتوانێت زۆرترین بڕ بەرهەم بهێنێت بەبێ ئەوەی بڕی خەرجییەکان زیادبکات بەهۆی ئەم هاوسەنگییەوە بڕی قازانج زیاد دەکات. بەڵام ئەگەر سنووردارێتی خەرجی (گۆڕاوو نەگۆڕ) زیاد بێت ئەوا بەهای تێچوون بەگشتی زیاد دەکات ئەمەش دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی رێژەی قازانجی بەرهەمهێنەر، کەواتە بۆ دەستکەوتنی بەرزترین بڕی قازانج پێویستە سەوداکەر بڕی بەرهەم زیاد بکات بەجێگیر کردنی سنووردارێتی خەرجییەکان.

بێگومان لە پراکتیکدا گەشتن بەم ئامانجە هەروا ئاسان نییە، ئێمە تەنها بەشێوەیەکی تیۆری مێتۆدی خەرجی و تێچوونەکانی بەرهەمم هێنانمان روون کردەوە، چونکە لە پراکتیکدا چەندان فاکتەری تری دەرەکی کاردەکەنە سەر خەرجییەکانی بەرهەمهێنان وە دوا بەدوا نرخی (کاڵا و خزمەتگوزارییەکان) وەك ئاستی داواکان، کێبەرکێ لە بازاڕەکاندا، بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئاسایش,.... هتد. بۆیە جگە لە فاکتەرە ناوەکیەکان سەوداکار دەبێت رەچاوی فاکتەرە دەرەکیەکانیش بکات. لەخوارەوە هەوڵ دەدەین ستراتیژیەتی پێکهێنانی نرخی (کاڵا و خزمەتگوزارییەکان) روون بکەینەوە. ئابووریناسان بەشێوەیەکی گشتی سێ ستراتیژیەتی سەرەکی لە پێکهێنانی نرخی (کاڵا و خزمەتگوزارییەکان)دا دیاری دەکەن کە بریتین لە:



- دیاریکردنی نرخ بە شێوە کلاسیکییەکەی (خەرجی + قازانج).
- دیاریکردنی نرخ بە رەچاوکردنی فاکتەرە دەرەکییەکان (کێبەرکێ).
- دیاریکردنی نرخ بە رەچاوکردنی سوودمەندێتی بەرهەمەکان.

ئێستاکە هەریەك لەو خاڵانەی سەرەوە روون دەکەینەوە:

**- دیاریکردنی نرخ بە شێوە کلاسیکییەکەی (خەرجی + قازانج):**

ئەم شێوازە کلاسیکە و ئاڵۆز نییە, چونکە بەرهەم هێنەر دوای ژمێرکردنی خەرجییە گشتییەکان بۆ هەریەکەیەکی بەرهەم قازانجی دەخاتە سەر و بەنرخێکی دیاریکراو دەیفرۆشێت، بۆ نمونە ئەگەر بەرهەمی پاکەتێك پسکیت بڕی (١) دۆلاری تێ بچێت وە بڕی (٢٥) سەنت زیاد بکات لەسەر هەر پاکەتێك ئەوا نرخی پاکەتە پسکیتەکە دەبێت بە (١,٢٥) دۆلار, واتە دەستکەوتی بەرهەم هێنەر بریتی دەبێت لە (٢٥) سەنت، بێگومان دیاریکردنی نرخ بەم شێوە کلاسیکییە لەحاڵەتێکدا راست و دروست دەبێت ئەگەر بەرهەم هێنەر تەنها بێت وە کێ بڕکێ نەبێت لەبازاڕەکاندا.

**- دیاریکردنی نرخ بە رەچاوکردنی فاکتەرە دەرەکییەکان (کێ ڤڕکێ):**

بەرهەمهێنەرەکان بۆئەوەی توانای کێبەرکێیان هەبێت لە بازاڕەکاندا دەبێت بەرهەمەکانیان بەنرخێکی هەرزانتر بفرۆشن. کەواتە دەبێت هەمیشە هەوڵی کەمکردنەوەی خەرجییە گشتییەکان بدات جگە لەوەش پێویستە لە بازاڕ بکۆڵێتەوە چونکە بەبێ زانینی هونەری فرۆشتن (بازاڕگەری_مارکێتینگ) بازرگانی و فرۆشتن لەم سەردەمەدا سەردەمی جیهانگیری مەحاڵە.

**فەرهەنگی ئابووری**

بازاڕکاری (مارکێتینگ) Marketing:

بریتییە لەو چالاکییە بازرگانییانەی کە جموجۆڵی شمەك و خزمەتگوزاری لە بەرهەمهێنەرەوە بۆ دوابەکاربەر ئاڕاستە دەکات.

بەشێوەیەکی گشتی ئەم زاراوەیە ئەرکە جیاوازەکانی تایبەت بە فرۆتەنی و دابەشکردن وجارلێدان و پلان دانانی بەرهەم و توێژینەوەی بازاڕ دەگرێتەوە.

(توێژینەوەی بازاڕکاری) (Marketing Research) ئامرازێکی کاریگەرە بەدەست کارگێڕی گشتیی لەپرۆژەیەکدا لەپێناو دانانی پلانێکی بازاڕکاری بۆ ئێستا و دوارۆژ، بۆیە توێژینەوەی بازاڕکاری بە بەشێکی تەواوکەری کردەی بازاڕکاری دادەنرێ.

لە ئامانجە هەرە گرنگەکانی توێژینەوەی بازاڕکاری:

- کۆکردنەوەو پۆلێن کردن و شیکردنەوەی زانیاری ئامارەیی دەربارەی بازاڕ بەشێوەیەکی ڕێکوپێك و زانستی.
- دانانی پلان و ڕامیاری بازاڕکاری بەشێوەیەکی گشتی، وەك دابەشین و ئەمبارکردن نرخ دانان و داشکاندن و ...هتد.

هەروەها ئەم توێژینەوەیە چەند تۆژینەوەیەکی دیکە دەگرێتەوە وەك:

- تۆژینەوەی بەکاربردن Consumer Research
- تۆژینەوەی دابەشین Distribution Research
- تۆژینەوەی بەرهەمهێنان Production Research
- تۆژینەوەی فرۆتەنی Sale Research

- **دیاریکردنی نرخ بە ڕەچاوکردنی سودمەندێتی بەرهەم**

ئەم شێوازە زیاتر لەو کەرتە ئابوورییانەدا بەکاردەهێنرێت کە بەرهەمەکانیان بەدیلی نییە, بۆ نموونە پیشەسازی دەرمانسازی پیشەسازی تەکنۆلۆژیای بەرز بۆ کەشتییە ئاسمانییەکان، پیشەسازی فڕۆکە سازی، پیشەسازی چەك و تەقەمەنی,.... هتد، ئەم جۆرە بەرهەمانە تایبەتمەندێتی و سوودمەندێتییەکی دیاریکراویان هەیە, بۆیە بەرهەمهێنەر بەئارەزووی خۆی دەتوانێت نرخ دەستنیشان بکات.

**فەرهەنگی ئابووری**

شەڕی نرخەکان:

ئەو حاڵەتەیە کاتێك بەرهەمهێنەرەکانی یەك جۆرە بەرهەم، بەهۆی کێ بڕ کێی نرخەوە هەوڵ دەدەن بەرهەمەکانیان بفرۆشن, بۆیە هەر بەرهەمهێنەرێك پێویستە لەسەری نرخ کەم بکاتەوە بۆئەوەی کێ بەرکێی بەرامبەرەکەی پێبکات.

## بۆچی گەورەکان گەورەتر دەبن؟

ئەگەر سەیری ڕاپۆرتە ئابوورییەکان بکەین، دەبینین کۆمپانیا گەورەکانی جیهان لە سەدان کۆمپانیا تێ ناپەڕن, وەك جەنەراڵ مۆتۆڕ، مایکرۆسۆفت، ماکدۆلاندز، بۆینگ، تۆیۆتا، شێل، مێرسدیس بێنز، سیمنس، گازپرۆم,...هتد. ئەم کۆمپانیا گەورانە ڕۆژ بەڕۆژ فراوانترو گەورەتر



دەبن. چالاکییان لەهەموو قووژبنێکی جیهاندا بلاوبۆتەوە, وە هەروەها لەزۆربەی وڵاتەکانی جیهاندا لق و بریکاریان هەیە, ئەم کۆمپانیایانە بەهۆی گەورەیی و فراوانییانەوە هەمیشە قازانجیان لەسەر و قازانجی ئاساییەوەیە، سەرمایەی ئەم کۆمپانیانە ئەمڕۆ کە بەدەیان ترلیۆن دۆلار مەزەندە دەکرێت. ئەم کۆمپانیا مەزنانە بەشێوەیەك پرۆسەی بەرهەمهێنان و بازرگانییان ڕێکخستووە وەك زنجیرەیەکی پێکەوە بەستراو و نەپساو کە لەیەك سەنتەرەوە بەڕێوەدەبرێت، ئەمەش بۆتە هۆی زەمینەیەکی پتەو کەمەترسییان نەبێت لە هیچ قەیرانێکی ئابووری جیهانی و ناوچەیی. بۆ نموونە ئەگەر قەیرانی ئابووری لەئەوروپا دەست پێبکات ئەوا ئەو کۆمپانیایانە بەهۆی لقەکانی ئاسیا و ئەمەریکاوە قەرەبووی قەیرانی ئەوروپا دەکەن، ئەوەتا بۆ زیاتر خۆپاراستن یەکدەگرن و گەورەتر و فراوانتر دەبن.

کارڵ مارکس هەر لەزووەوە گوتویەتی لەبواری پیشەسازیدا تەنهاچەند کۆمپانیایەکی گەورە دەتوانن خۆڕابگرن لەبەردەم کێ بڕکێی ئابووریدا وە لە داهاتوودا ئەم کۆمپانیا پیشەسازییە گەورانە لەچوارچێوەی کۆمپانیایەکی زۆر گەورەتردا یەك دەگرن. لەبەرئەوە سوودو قازانجی ئەم کۆمپانیانە پێی دەوترێت قازانجی (مۆنۆپۆڵی) کە لەدوایدا باسی لێدەکەین، لەخوارەوە سەیری چەند فاکتەرێکی گرنگ دەکەین کەدەبێتە هۆی زیادکردنی قازانج و سوودی کۆمپانیا گەورەکان.

- پێویست بوون بەسەرمایەی گەورە.
- قەوارە و بڕی فرۆشتن.
- ڕێکخستن.
- ریکلام و مارکێتنگ.

ئێستاکە بەجیاجیا سەیری هەریەك لەو فاکتەرانەی سەرەوە دەکەین:

- **پێویست بوون بەسەرمایەی گەورە:**

لەو کەرتە ئابوورییانەی کە قەوارەی بەرهەمهێنانیان گەورە و فروانن پێویستیان بەهێزی کار و ئامرازی بەرهەمهێنانی قەبە و گران بەها هەیە، بێگومان بۆ دابینکردنیان پێویستییان بەسەرمایەی گەورە هەیە، بەتایبەتی لەکەرتی دەرهێنان و پاڵاوتندا، لەپیشەسازی پیترۆکیمیایی...هتد. لەبەر گەورەیی و بارستایی بەرهەمهێنان بڕی ناوەندێتی خەرج کردن (تێچوون) کەم دەبێتەوە، واتە خەرجی نەگۆڕ بەرەو کەم بوونەوە دەچێت ئەوکاتە ڕێژەی قازانج زیاد دەکات.

**- قەوارەی فرۆشتن:**

ناوەندێتی خەرجییە گۆڕاوەکانی کۆمپانیا گەورەکان نزمە بەهۆی زیادبوونی بڕی فرۆشتنەوە، چونکە بەهۆی گەورەیی و قەوارەیانەوە دەتوانن زۆرترین بڕ (کالاْ و خزمەتگوزاری) بەرهەم بهێنن ئەمەش دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی تێچوونی گشتی واتە دەتوانن بەرهەمەکانیان بەنرخێکی هەرزانتر و گونجاوتر بفرۆشن، هەروەك لەپێشەوە باسمان لێکرد چەند نرخ هەرزانتر بێت واتە فرۆشتن زیاتر دەبێت, کەدەبێتە هۆی زیادبوونی دەستکەوت و قازانج.

**- ڕێکخستن:**

کۆمپانیا گەورەکان لە توانایاندایە تێچوونی ستافی کارمەندان و بەڕێوەبەران کەم بکەنەوە، وەك دەزانین کرێی کارمەندان بەشێکە لەخەرجی گۆڕاو کە کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لەسەر زیادبوونی خەرجییە گشتییەکان, لەلایەکی ترەوە توانیویانە کارمەندان و بەڕێوەبەران بخەنە خانەی خەرجییە نەگۆڕەکان, چونکە خۆیان کادری پێویست و شارەزا لەڕێگەی خوێندنگا و زانکۆکانەوە پێدەگەیەنن و پشتگیری دارایییان دەکەن  لەکاتی بەدەستهێنانی بڕوانامەدا پابەند دەبن کاربکەن بەرامبەر مووچەیەکی جێگرو دیاریکراو، هەروەها بەهۆی جیاوازی کرێی کار لە شوێنە جیاجیاکانی جیهاندا دەتوانن هاوسەنگی لەخەرجییە گۆڕاوەکاندا جێبەجێ بکەن.

**- ریکلام و مارکێتینگ:**

کۆمپانیا گەورەکان پێویستیان بە ریکلام و مارکێتینگی هەمیشەیی نییە، چونکە بەرهەمەکانیان واتە مارکەی بەرهەمەکەیان لەهەموو جیهاندا ناسراون لەلایەن کڕیارەوە، بۆ نموونە سەیارەی مارسیدس دەبێت چ پێویستییەکی بە ریکلام هەبێت, هەموو کڕیارێك دەزانێت سەیارەی مارسیدس باشترین ئامرازی هاتووچۆیە. ئەمەش دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی خەرجییە گشتییەکان.

ئەوەتا ئەمڕۆ کە کۆمپانیا گەورەکان بازاڕەکانیان پڕ کردووە لەکالاْ و خزمەتگوزاری جۆراوجۆر کە بەنرخێکی گونجاو دەفرۆشرێن, بەلاْم کێبەرکێ لەنێوانیاندا هەمیشە بەردەوامە، ئەنجامەکەی یان پێکدادانە یان یەکگرتنە لەچوارچێوەی کۆمپانیایەکی گەورەتردا، ئەمەش بۆتە هۆی دروست بوونی کۆمپانیا فرە رەگەزەکان. کە توانیویانە بازاڕەکان قۆرخ بکەن و لەنێوان خۆیاندا دابەش بکەن.



## مۆنۆپۆڵەکان

لە فەسڵی چوارەمدا باسمان لە کاریگەری و میکانیزمی نرخ کرد لە بەدەستهێنانی هاوسەنگی نێوان (داوا و خستنەڕوو). بێگومان ئەم میکانیزمە کاتێك کاریگەر دەبێت ئەگەر لەبازاڕەکاندا کێ بەرکێ هەبێت، بەلاْم ئەگەر بەرهەمهێنەر تەنها یەك کۆمپانیا یان چەند کۆمپانیایەکی یەکگرتوو بێت ئەوا لەفەرهەنگی ئابووریدا پێی دەوترێت (مۆنۆپۆڵ), بەلاْم ئەگەر بەرهەمهێنەر چەندان کۆمپانیای جیاواز جیاوازبن ئەوا پێی دەوترێت (ئەلیگە پۆڵ) پێچەوانەی مۆنۆپۆڵ.

**ئاگاداری**

یەکێك لە جیاوازییەکانی کۆمپانیا مۆنۆپۆڵەکان لەگەڵ کۆمپانیا بێ ناسنامەکانی سەردەمی جیهانگیریدا، ئەوەیە کە ئەمەی دوایی چالاکی ئابووری لەیەك بواری تایبەتدا گیر نابێ و لەکەرتی ئابووری وادا سەرمایە بەگەڕ دەخا هیچ پەیوەندی بەکاروباری بنچینەیی کۆمپانیاکەوە نییە.

مۆنۆپۆڵ ئەوکاتە پەیدادەبێت کەهیچ کۆمپانیایەکی تر ناتوانێت هەمان کالاْ و خزمەتگوزاری بەرهەم بهێنێت، تەنها چەند کۆمپانیایەك دەتوانن بەرهەمەکانیان پێشنیاز بکەن. مۆنۆپۆڵەکان بەهۆی گەورەیی قەوارەی سەرمایەی دارایی و ماددیەوە دەتوانێت ڕێگە بگرێت لە هەرچ کۆمپانیایەکی تر کە ئارەزوو بکەن لەبەرهەمهێنانی هەمان کالاْ و خزمەتگوزاری. زۆربەی کۆمپانیا مۆنۆپۆڵەکان لەباروودۆخێکی مێژوویی تایبەتیدا هاتنە کایەوە, وە ماوەیەکی دوور و درێژی مێژوویيان بڕیوە بۆیە پێیان دەوترێت مۆنۆپۆڵە سروشتییەکان لەفەرهەنگی ئابووریدا. مۆنۆپۆڵ لە ئەنجامی چڕبوونەوەی سەرمایەدا هاتۆتە کایەوە. بۆ نموونە کۆمپانیای دێ بێرس (De Beers) گەورەترین کۆمپانیای مۆنۆپۆڵە لەبەرهەمهێنانی ئەڵماسدا کە ساڵی (١٨٨٩) دامەزراوە، هەر لە دەرهێنان و ئامادەکردن و گۆڕین و فرۆشتنیەوە تەنها ئەم کۆمپانیایە کۆنترۆڵی بازاڕی ئەڵماس دەکات. یان نموونەیەکی تر کۆمپانیای (دون-براد ستریت) (Dun - Brad Street) گەورەترین ڕێکخراوی دارایی جیهانی یە. کەقەرزو دارایی دابین دەکات بۆ کۆمپانیا هەرە گەورەکان، یان کۆمپانیایی مایکرۆسۆفت (Microsoft) کە هەموو دەزانین بەتەواوەتی کۆنترۆڵی بازاڕی پرۆگرامی کۆمپیوتەری کردووە بەهەردوو پرۆگرامی (DOS) و (Windows). لەبەرئەوەی بەرهەم هێنەر مۆنۆپۆڵە، بەئارەزووی خۆیان نرخی کالاْ و خزمەتگوزارییەکانیان دیاری دەکەن

وەهەمیشە قازانجی مۆنۆپۆڵی وەردەگرن. کۆمپانیا مۆنۆپۆڵەکان دەتوانن هاوسەنگی لەنێوان داوا و خستنەڕوو لەبازاڕی بەرهەمەکانیان کۆنترۆڵ بکەن، بۆئەوەی بە هیچ شێوەیەك تووشی زەرەر و زیان و کەمکردنەوەی بڕی قازانجی مۆنۆپۆڵی نەبن.

ئێستا بابزانین (ئەلیگە پۆڵ) چییە؟

بریتییە لەچەند کۆمپانیایەك کەهەمان کالا و خزمەتگوزاری بەرهەم دەهێنن بەجۆرێك کەهیچ کامێکیان ناتوانن کۆنترۆڵی بازاڕی فرۆشتن بکەن. بەلام ئەم کۆمپانیایانە بۆ ئەوەی تووشی بەیەکدادان نەبن و بڕی قازانجیان کەم نەبێتەوە پەیمانی تەکتیکی لەنێوان یەکتردا دەبەستن لەدیاریکردنی نرخی بەرهەمەکانیاندا. هەندێ جار پەیمانی ستراتیژیش لەگەڵ یەکتردا دەبەستن. ئەم جۆرە کۆمپانیایانە بڕێکی زۆر خەرجی لەبواری ریکلام و مارکێتینگدا دەکەن. هەندێ جار لەبەر کێبەرکێ لەگەڵ کۆمپانیا گەورەکان ئەم کۆمپانیایانە ناچارن یەك بگرن. جگە لە کۆمپانیا (مۆنۆپۆلەکان و ئەلیگە پۆلەکان) جۆرێکی تر یەکگرتن لەنێوان کۆمپانیاکاندا ڕوودەدات بەتایبەتی ئەو کۆمپانیانەی کەهەمان بەرهەمی ستراتیژی بەرهەم دەهێنن بەم جۆرە یەکگرتنە دەوترێت (کارتێل). بۆ نموونە ڕێکخراوی (ئۆپیك) دەتوانین بە کارتێل دابنێین، بێگومان دروستبوونی کۆمپانیا مۆنۆپۆڵەکان و ئاکامی نێگەتیڤانەیان لەسەر باری ئابووری و سیاسی و کۆمەلایەتی هەیە.

که لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی پێویستە.

**فەرهەنگی ئابووری**

مۆنۆپۆڵی (قۆرخکردن) Monopoly:

زاراوەی (Monopoly) لە وشەی (Monopolist)ی یۆنانییەوە وەرگیراوە، ئەمەش لە دوو وشە پێکهاتووە (Mono) کە بەمانای یەك دێت و (Polist)یش بەمانای فرۆشیار دێت.

بەشێوەیەکی گشتی مۆنۆپۆلی بریتییە لە دەستگرتنی چەند کەسانێك یان چەند بەشدارگەیەك بەسەر بازاڕدا لەپێناوی قازانجکردندا، وەك کڕین و فرۆشتن، هەناردن وهاوردن، سەوداگەری بە شمەکێکی دیاریکراو، قۆرخ کردنیش دابەش دەکرێتە سەر دوو جۆری سەرەکی:

١- قۆرخی تایبەتی

٢- قۆرخی گشتی

شێوەو ژینگەی قۆرخ کردن گەلێك زۆرن لەهەرە گرنگەکانیان:

- قۆرخی فرۆشیار — Sellers Monopoly



- قۆرخی تەواو — Perfect Monopoly
- قۆرخی دووانە — Duopoloy
- قۆرخی تایبەتی — Personal Monopoly
- قۆرخی هەمیشەیی — Persistent Monopoly
- قۆرخی کڕین — Monopsony
- درە قۆرخ — Predutory Monopoly
- قۆرخی ڕووت — Pure Monopoly
- قۆرخی سروشتەکیی — Natural Monopoly
- قۆرخی گشتیی — General Monopoly
- قۆرخی یاسایی — Legal Monopoly
- قۆرخی ناوبەناو — Intermittent Monopoly
- قۆرخی هاوبەش — Joint Monopoly
- قۆرخی کڕیارەکان — Buyers Monopoly
- قۆرخی ڕەها — Absolute Monopoly
- قۆرخی کاتی — Corne Monopoly

ئێستاکە هەریەك لەو شێوانەی سەرەوە ڕوون دەکەینەوە.

- قۆرخی فرۆشیار:

باری ئەو بازاڕەیە کەتیایدا یەك فرۆشیار (یان چەند فرۆشیارێك) بەکاری سەوداگەری هەڵدەستن و کاریش دەکەنە سەر نرخ بەو شێوەیەی کە دەیانەوێ.

- قۆرخی تەواو:

باری ئەو بازاڕەیە کە ئەم مەرجانەی تێدابێت:

١- نەبوونی جێگیر بۆ ئەو شمەکەی کە ئالۆویری پێدەکرێ.

٢- یەك دەزگا بە فرۆشتنی شمەکەکە هەڵدەستێ.

٣- زانینێکی تەواو دەربارەی نرخ و تێچوونی ئێستا و دوارۆژ.

- قۆرخی دووانە:

بارێکە کە تیایدا دوو پرۆژە دەست بەسەر پیشەسازییەکدا دەگرن، وەك پیشەسازی گۆگرد لە بەریتانیا.

- قۆرخی تایبەتی:

ئەم جۆرە قۆرخ کردنە کەسان یان بەشدارگە تایبەتییەکان پێی هەڵدەستن، وەك بەشدارگەکانی بەرهەمهێنانی گاز و مافی داهێنان و هی دیکە.

- قۆرخی هەمیشەیی:

ئەم جۆرە قۆرخە هەندێ جاریش پێی دەوترێت لووشدانی هەمیشەیی ( Permanent Dumping) جۆرێکە لە لووشدان یان قۆرخ کە بەگوێرەی رامیارییەکی دەستنیشان کراو خەڵك یان دەوڵەت پەنای بۆدەبەن و روخسارێکی بەردەوامیشی هەیە.

- قۆرخی کڕین:

باری ئەو بازاڕەیە کە لەیەك کڕیار و چەند فرۆشیارێك پێکدێت.

- درە قۆرخ:

هەندێ جار پێشی دەوترێت لووشدانی ناوبەناو جۆرێکە لە لووشدان کە لەچەند ماوەیەکی پچر پچردا روودەدات و بەندیشە بە رامیارییەکی دیاریکراو.

مەبەست لەم لووشدانە دوور خستنی هاڤرکێی بیانییە و زاڵبوونە بەسەر بازاڕدا.

- قۆرخی رووت:

باری ئەو بازاڕەیە، کەتیایدا سێ مەرجە سەرەتاییەکانی قۆرخی تەواو بەدی دەکرێت.

١- نەبوونی جێگر بۆ ئەو شمەکەی کە ئاڵوویری پێ دەکرێ.

٢- یەك دەزگا بە فرۆشتنی شمەکەکە هەڵدەستێ.

٣- زانینێکی تەواو دەربارەی نرخ و تێچوونی ئێستاو دواڕۆژ.

- قۆرخی سروشتەکیی:

هەندێ پیشەسازی هەن کە کەڵکی گشتی دەبەخشن، بۆیە بە هیچ جۆرێك ناتوانرێ باری هاڤرکێی لەسەر جێبەجێ بکرێت، وەك کارەبا و ئاو و گاز و هێڵی ئاسن و دەزگاکانی گواستنەوەی گشتی.

- قۆرخی گشتیی:

ئەم جۆرە قۆرخ کردنەش دەوڵەت یان دەزگا گشتییەکان پێی هەڵدەستن لەپێناوی چەند مەبەستێکی دارایدا، وەك قۆرخ کردنی پیشەسازی شەکرو جگەرە.



- قۆرخی یاسایی:

قۆرخ کردنێکە میری بەپێی یاسا دروستی دەکات، وەك قۆرخ کردنی نیشانەیەکی دیاریکراو، یان مافی بلاۆکردنەوە و هی دیکە.

- قۆرخی کەمینە:

دەست بەسەراگرتنی چەند پرۆژەیەکی کەم بەسەر پیشەسازییەکی دیاریکراودا، ئەم پرۆژانە بازاڕی ئەم پیشەسازییە لە نێو خۆیاندا دابەش دەکەن.

- قۆرخی هاوبەش:

بۆ نموونە، وتووێژی کرێکاران لەگەڵ خاوەن کارەکاندا دەربارەی چۆنیەتی دەستنیشان کردنی نرخی کار (کرێ). هەروەها دەشێ لە بازرگانێتی نێودەوڵەتیشدا روودات، دەربارەی فرۆشتن و ئاڵوگۆڕکردنی کەرەستەی خاو بەرامبەر بە کەرەستەی دروستکراو.

- قۆرخی کڕیارەکان:

بارودۆخی ئەو بازاڕەیە، کەتیایدا کڕیارێك یان کۆمەڵە کڕیارێك توانای ئاڕاستەکردنی نرخی ئەو شمەکەیان هەبێ کە ساووسەودای پێدەکەن.

- قۆرخی کاتیی:

کەڵەکە بوونی بەشێکی زۆری شمەکێك لەلای یەك کەس بە مەبەستی بەرزکردنەوەی نرخەکەی لەبازاڕدا. بەم جۆرە قۆرخ کردنێکی کاتی پەیدا دەبێت، بەلاّم زۆر ناخایەنێت، چونکە ئەم قۆرخ کردنە بەچەند هۆکارێکەوە بەندە، کە بەنەمانیان قۆرخ کردنەکەش نامێنێت.

# فەسڵی نۆیەم

## کار، کرێکار، کارمەند، کرێی کار

هەموو مرۆڤێك لەقۆناغەكانی تەمەنیدا بەرەنگاری دژواری و توند و تیژی بازاڕی كار بۆتەوە. چونكە بازاڕی كار بازاڕێكی تایبەتە لەبەر ئەوەی لەو بازاڕەدا كات و توانا و بەهرەمەندی و عەقڵ و زانین دەفرۆشرێت. تەنها لەئەنجامی كرینی كاتدا لەبازاڕی كاردا دەتوانین بەرهەمەكانی ترمان دەست بكەوێت. چونكە هەموو كاڵا و خزمەتگوزارییە بەرهەمهێنراوەكان لەئەنجامی چالاكی كاری مرۆڤەوە وە بەهۆی مرۆڤەوە وە لەپێناوی مرۆڤدا بەرهەم دەهێنرێت.

بازاڕی كار بازاڕێكی تایبەتە چونكە بڕیار بڕیاری تاكە كەسییە (خۆییە)، كرێكار، كارمەند،...هتد. كاتی خۆی دەفرۆشێت بەسەر كار، لەبەر ئەم هۆیەش كاركەر بەتەواوەتی سەربەخۆیی لەماوەی كاركردندا لەدەست دەدات، هەرچەندە كاركەر هەرچ كاتێك ئارەزوو بكات دەتوانێت دەست لە كار بكێشێتەوە, بەڵام دەستكێشانەوە لە كار واتە لەدەستدانی سەرچاوەی داهات، لەم فەسڵەدا هەوڵ دەدەین بە دووروودرێژی پەیوەندی ئابووری نێوان كرێكارو كارمەندو سەركار روون بكەینەوە.

## خەباتكردن لە پێناوی نان پەیداكردندا؟

بەشێوەیەكی گشتی سەركار، خاوەن كۆمپانیاكان، خاوەن كارگەكان,...هتد. لەشێوەی پارەدا (دراو) كرێی كاری كرێكار، ئەندازیار، كارمەند,...هتد, دەدەن. بە بۆچوون و لە روانگەی سەركارانەوە كرێی كار لە بڕی سوودو قازانجیان كەم دەكاتەوە، وەك لە فەسڵەكەی پێشوودا باسمان لێكرد (خەرجی گۆڕاو)، بەڵام لە روانگەی كارمەندان و كرێكارانەوە ئەو بڕە زیادەی كە لەكرێی كار كەم دەكرێتەوە لەلایەن سەركارانەوە سەرچاوەی سەرەكی بڕی سوودو قازانجی سەركارانە. لێرەدا دەمەوێت سەرنجی خوێنەر رابكێشم بۆ خاڵێكی گرنگ تێوری (زێدە



بایی) كارڵ ماركس لەسەر ئەم بنچینەیە دامەزراوە، دەرەنجامەكەی ماركس دەڵێت (سەرمایەدار لەئەنجامی چەوسانەوەی كرێكار قازانجی دەست دەكەوێت).

ئەوەتا هەموو رۆژێك لەشاشەكانی تەلەفزیۆنەوە مانگرتن و خۆنیشاندان دەبینین بۆ داواكردنی زیادكردنی كرێی كار و باش كردنی ژینگەی كاركردن. بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی ململانێ هەبووە لەنێوان كاركەران و سەركاراندا، وە لەهەر قۆناغێكی مێژوویدا بەشێوەیەك لەشێوەكان ئەم ململانێیە چارەسەر كراوە.

ئەمڕۆ كە كاركەران لەڕێگەی سەندیكاكانەوە داواكارییەكانیان بۆ زیادكردنی كرێی كار و باش كردنی ژینگەی كار داوا دەكەن، ئەمڕۆ كە شێوەی خەبات گۆڕاوە چونكە كرێكار و سەركار لەشێوە كلاسیكییەكەیدا نەماوە. سەردەم سەردەمی جیهانگیرییە، ستروكتور و پێكهاتەی چینی كاركەر گۆڕاوە. بۆ نموونە ئەمڕۆ كە ژمارەی كارمەندانی كەرتی خزمەتگوزاری زۆر زیاترن وەك لەكرێكارانی كارگە پیشەسازییەكان. هەروەك دەزانین كەرتی خزمەتگوزاری فراوان و جۆراوجۆرن بەشێوەیەك كە بەرژەوەندی كارمەندانی ئەوكەرتە لەیەكتری جیاوازن و چوونیەك نین، وەهەروەها ئەمڕۆ كەتوێژێكی گەورە كەپێی دەگوترێت (چینی ناوەند) دروست بووە كە لەناوەڕۆكدا هیچ جیاوازییەكیان نییە لە كرێكاران و كارمەندانی كەرتەكانی تری ئابووری, چونكە ئەوانیش كاردەكەن بەرامبەر بڕێك پارەی دیاریكراو ئەم توێژەش واتە (چینی ناوەندی) هاوئاهەنگ نین و جیاوازن تەنانەت سەندیكایەكی تایبەتی خۆشیان نییە. ئەمڕۆكە سەندیكاكان رۆڵێكی گەورە لەبواری سیاسەتدا دەبینن بەتایبەتی لەكاتی هەڵبژاردنەكاندا، بەڵام ئێمە باس لە رۆڵی سەندیكاكان لەسەر باری ئابووری دەكەین.

## سەندیكا چییە؟

سەندیكا: بریتییە لەو رێكخراوە كۆمەڵایەتییە - پیشەییانەی كەهەوڵی پاراستنی بەرژەوەندییەكان و جێبەجێكردنی داواكانی ئەندامەكانی دەدات. بەمانایەكی تر هەوڵی هاوئاهەنگی نێوان كاركەر و سەركارەكان دەدات، ئەندامانی سەندیكاكان گرێ بەستی كۆمەڵانە لەگەڵ سەركارەكاندا دەبەستن لەچوارچێوەی ئەو گرێ بەستانەدا هەموو ئەرك و مەرجەكانی كاركردن و كرێی كار لەنێوانیاندا دەستنیشان دەكرێت. بەڵام هەندێ جار بەهۆی جێبەجێ نەكردن و پێشێلكردنی هەندێ لە خاڵ و بەندەكانی گرێبەستەكە لەلایەن سەركارەوە، كارمەندان بە بڕیار و فەرمانی سەندیكاكان مان دەگرن و شوێنی كار بەجێ

دەهێڵن، بێگومان ئەمەش دەبێتە هۆی راگرتن و وەستاندنی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان و خزمەتگوزارییەکان کە لەئەنجامدا دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی بەرهەم و خزمەتگوزارییەکان کە دەبێتە هۆی تەنگەژی و قەیرانی ئابووری کۆمپانیاکان بەتایبەتی وە دەوڵەت بەگشتی. ئەوەی ئاشکرایە مانگرتن زیاتر لە کەرتە گشتیەکاندا (حکوومی) روودەدات، هەندێ جار مانگرتن لەهەندێ کەرتی ئابووریدا دەبێتە هۆی مەترسی لەسەر بەرژەوەندی نەتەوەیی. بۆ نموونە لەساڵی (١٩٨١)دا بەهۆی مانگرتنی کرێکاران و کارمەندانی کەرتی فڕۆکەوانی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەرژەوەندی نەتەوەیی ئەمەریکای خستە مەترسییەوە بۆیە سەرۆك کۆماری ئەوکاتە (رۆناڵد ریگان) بەشێوەیەکی راستەوخۆدا وای لێکردن کە بگەڕێنەوە شوێنی کارەکانیان وەپەیمانی جێبەجێکردنی داواکانیانی خستە ئەستۆی حکوومەتەوە (ئیدارەی کۆشکی سپی) بەلاّم ئەوەبوو کارکەرانی ئەو کەرتە بەردەوام بوون لە مانگرتندا, چونکە هەموو داواکانیان لەلایەن حکوومەتەوە جێبەجێ نەکرا، ئەمەش حکوومەتی ناچارکرد یاسایەکی تایبەت دابنێت بە قەدەغەکردنی مانگرتن لەچەند کەرتێکی ستراتیژیدا، ئەمەش پێچەوانەی پرینسپە دیموکراتیەکانی ئەمەریکایە، بەلاّم بەرژەوەندی نەتەوەیی لەسەرو هەموو بەرژەوەندییەکانەوەیە. ئەوەتا ئەمڕۆکە سەرکارەکان بەیارمەتی حکوومەت و پارتە سیاسییەکانەوە دەیانەوێت بەتەواوەتی رۆڵی بنچینەیی سەندیکاکان کەم بکەنەوە بەو بەهایەی گوایە مانگرتن کاریگەری نێگەتیڤانەی هەیە لەسەر باری ئابووری و بەرژەوەندی نەتەوەیی. لەلایەکی ترەوە دیاردەی جیهانگیری بۆتە هۆی لاوازبوونی ریزەکانی کرێکاران.

لێرەدا دەمەوێت ئاماژە بەخاڵێکی گرنگ بدەم، تەنانەت لە ولاّتە پێشکەوتووە دیموکراتییەکاندا جیاوازییەکی زۆر بەدی دەکرێت لە بڕی کرێی کاردا، کرێی کار بەپێی رەگەز و رەگەزنامە و رەنگی پێست پۆلێن کراوە. لەخشتەکەی خوارەوەدا ئەو جیاوازییانە نیشان دەدەین لەسەر نموونەی کرێی کار لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.



خشتەی ژمارە (٩-١) بڕی ناوەندێتی کرێی کار لە هەفتەیەکدا، لەنێوان ئەندامانی سەندیکاکان ئەوانەی کە ئەندام نین لە سەندیکاکاندا ساڵی (٢٠٠٠) بەدۆلار.

| | ئەندامانی سەندیکا | نا ئەندامانی سەندیکا | جیاوازی بە رێژە |
|---|---|---|---|
| هەموو کارکەران لە سەروو ١٦ ساڵەوە | ٦٩٦ | ٥٤٢ | ٢٨,٤ |
| پیاو | ٧٣٩ | ٦٢٠ | ١٩,١ |
| ژن | ٦١٦ | ٤٧٢ | ٣٠,٥ |
| کارکەرە رەگەز ئەوروپییەکان | ٧١٦ | ٥٦٥ | ٢٦,٧ |
| پیاو | ٧٥٧ | ٦٤١ | ١٨,١ |
| ژن | ٦٣١ | ٤٨٢ | ٣٠,٩ |
| کارکەرە پێست رەشەکان | ٥٩٥ | ٤٣٦ | ٣٦,٧ |
| پیاو | ٦١٩ | ٤٧٩ | ٢٩,٢ |
| ژن | ٥٦٤ | ٤٠٨ | ٣٨,٢ |
| کارکەرانی ئەمەریکای لاتینی | ٥٨٤ | ٣٧٧ | ٥٤,٩ |
| پیاو | ٦٣١ | ٣٩٤ | ٦٠,٢ |
| ژن | ٤٨٩ | ٣٤٦ | ٤١,٣ |

لە خشتکەی سەرەوەدا دەبینین کە کرێی کاری ئەندامانی سەندیکا بەرزترە وەك لەوانەی کە ئەندامی سەندیکا نین، کارمەندە رەگەز ئەوروپییەکان (پیاو)ەکانیان کە ئەندامی سەندیکان کرێی کاریان بە رێژەی (١٩٪) زیاترە وەك لەوانەی کە ئەندامی سەندیکانین، جیاوازی کرێی کاری کرێکارە پەنا بەرەکانی ئەمەریکای لاتینی بە رێژەی (٦٠٪) کەمترە وەك لە کرێکارەکانی تر، ئێستاکە هەوڵ دەدەین لە هۆی جیاوازی کرێی کار بکۆڵینەوە, لە ولاّتە پێشکەوتووەکاندا بەتایبەتی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بوون بە ئەندام لە سەندیکاکاندا هەروا ئاسان نییە، ئەندامی سەندیکا دەبێت چەند مەرجێکی تێدابێت، لەو مەرجانە: ئەندام دەبێت خوێندەواری هەبێت وە هەڵگری بڕوانامەی خوێندنی بالاّ یان پەیمانگا

بێت، ئەم مەرجەش دەبێتە هۆی ئاستەنگ لەبەردەم بەئەندامبوونی پەناهەندەکان و رەش پێستەکان، چونکە ژمارەی نەخوێندەواری لەنێوان ئەو توێژەدا گەلێك زۆرە، وە چەندان مەرجی تر کە پەنابەران یان کۆچکردووەکان لەتوانایاندا نییە جێبەجێی بکەن. بۆیە زۆربەی کۆمپانیا و کارگەکان کاری ئەو توێژە بەرامبەر کرێیەکی هەرزان بەکاردەهێنن. لەم سەردەمەدا سەندیکاکان رۆڵێکی گرنگ دەبینن لە رێکخستن و رێکوپێك کردنی بازاڕی کاردا وە دەتوانن کاریگەری راستەوخۆ بکەنە سەر داوا و خستنەڕووی هێزی کار لە بازاڕی کاردا. بەهۆی وێنەکەی خوارەوە پەیوەندی و کاریگەری سەندیکاکان لەسەر بازاڕی کار نیشان دەدەین.

وێنەی ژمارە (٩-١) کاریگەری سەندیکا لەسەر داوا و خستنەڕووی هێزی کار لە بازاڕی کاردا:




لە وێنەکەدا دەبینین کە سەندیکا چۆن کاردەکاتە سەر بازاڕی کار. ئەرکی سەرەکی سەندیکاکان جێبەجێکردنی داواکانی ئەندامەکانییەتی کە بەخاڵی (W1) بۆ (W2) نیشاندراوە، بەلاّم ئەگەر سەرکار ئەو داوایانە جێبەجێ نەکات، ئەوا سەندیکاکان لەبری رێکخستنی مانگرتن هەوڵی کەمکردنەوەی هێزی کار لەبازاڕی کاردا دەدەن واتە بڕی خستنەڕوو کەم دەکەنەوە کە لەخاڵی (S1) و (S2)دا نیشاندراوە، کاتێك کرێی کار بەرز دەبێتەوە بۆ ئاستی خاڵی (W2). ئەوکاتە چەماوەی خستنەڕوو لەخاڵی(S1)ەوە دەچێتە قۆناغی خاڵی (S2)، بەم شێوەیە سەندیکاکان دەتوانن بازاڕی کار ئاڕاستە بکەن وە



هاوسەنگی داوا و خستنەڕووی هێزی کاردا دروست بکەن وەك لەخاڵی (E2)دا نیشاندراوە. لەئەنجامی گەشتن بەو هاوسەنگییە سەندیکاکان بەبێ پەنابردنە بەر مانگرتن دەتوانن داوای ئەندامەکانیان جێبەجێ بکەن.

بێگومان سەقامگیری بازاڕی کار کارێکی گەورەی هەیە لەسەر باری ئابووری بەگشتی. هەروەك دیاردە ئابووریەکانی تر هێزی کار و کرێی کار پەیوەندییەکی پێچەوانەیان هەیە وە کاریگەری جیاواز دەخەنە سەر باری ئابووری.

کاتێك سەندیکا هەمیشە هەوڵی زیاد کردنی کرێی کار دەدات ئەوا لەئەنجامدا خەرجی گۆڕاو زیاد دەکات, ئەمەش دەبێتە هۆی زیادبوونی خەرجییە گشتییەکان و بەرز بوونەوەی نرخی کالاّ و خزمەتگوزارییەکان ئەوکاتەش توانای کڕین کەم دەبێتەوە, کەم بوونەوەی توانای کڕینیش دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی بڕگەی (C) لەهاوکێشەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوایەتیدا واتە ئابووری نەتەوەیی تووشی داکشانەوە و تەنگەژی دەبێت. بەهۆی داوای هەمیشەیی کارکەران بۆ زیادکردنی کرێی کار، خاوەن کۆمپانیا و سەرکارەکان ناچارن پەنا بەرنە بەر بەکارهێنانی تەکنەلۆژیا و ئامێری نوێ لە بەرهەمهێناندا لەپێناوی کەمکردنەوەی خەرجی گۆڕاو. ئەمەش دەبێتە هۆی زیادبوونی قەوارەو بڕی بەرهەم, واتە نرخی کالاّ و خزمەتگوزارییەکان تا رادەیەك بەرەو نزم بوونەوە دەچێت ئەمەش دەبێتە هۆی زیادبوونی توانای کڕین واتە گەشەکردن و بووژانەوەی باری ئابووری.

ئەمڕۆکە حکوومەتەکان بەشێوەیەکی چالاك و راستەوخۆ دەتوانن کاریگەری لە بازاڕی کاربکەن بۆ ئەوەی هێمنی و سەقامگیری ئابووری و کۆمەلاّیەتی بەرقەرار بکەن، باشترین شێواز بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە، جارێکی تر دابەشکردنەوەی داهاتی نەتەوەییە، لەرێگەی یارمەتی کۆمەلاّیەتییەوە بۆ دانیشتوان. بۆ نموونە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا یارمەتی کۆمەلاّیەتی بریتییە لە (٧٣٪)ی داهاتی نەتەوەیی. ئەمڕۆکە (دەسەلاّت، پارتە سیاسییەکان، ئۆپۆزسیۆن،... هتد) بە سەرزارەکی هەوڵی باشکردن و خۆشگوزەرانی دانیشتوانی ولاّتەکەیان دەدەن، بەلاّم هەمووحکوومەتێك ناتوانێت ئەم ئەرکە جێبەجێ بکات چونکە لەبەر هەندێ هۆ ناتوانێت داهاتی نەتەوەیی دابەش بکاتەوە، دابەشکردنەوەی چەندجارەکی داهاتی بەرهەمی نەتەوەیی تەنها ئامرازە بۆ باشکردنی باری ژیان و بژێوی دانیشتوان. هەندێ ولاّت ئەم ئامرازە دەیان ساڵە بەکاردەهێنن وەك سوید, ولاّتە سکەندەناڤییەکانی تر، دەوڵەتانی کەنداوی عەرەبیش.

## جیاوازی و جیاوازکاری بێسووده!

چ لەڕوانگەی ئابوورییەوە چ لە روانگەی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە، بوونی جیاوازی لە کرێی کاردا لەنێوان خەڵکیدا بەپێی رەگەز و رەگەزنامە و رەنگی پێست کاریگەرییەکی نێگەتیڤانەیان دەبێت لەسەر سەرجەم, باری ئابووری هەروەك لە خشتەی ژمارە (٩-١) نیشانمان دا. لەزۆربەی ولاٚتانی جیهاندا بەتایبەتی لە ئەمەریکا و ئەوروپای رۆژئاوا پێست سپییەکان (ئەوروپییەکان) کرێی کاریان بەرزترە, وە دۆزینەوەی کار بۆیان ئاسانترە وەك لە رەگەزەکانی تر، ئەمەش دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی خستنەرووی کاری رەگەزە ئەوروپییەکان کە لەئەنجامدا دەبێتە هۆی نزم بوونەوەی کرێی کار ئەمە لە لایەکەوە, لە لایەکی ترەوە ژمارەیەکی زۆر لە رەگەزەکانی تر ناتوانن بەشدارییەکی چالاك بکەن لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا واتە کۆمەڵگا ژمارەیەکی زۆر لە هێزی کاری ئامادەکراو لەدەست دەدات, ئەمەش دەبێتە هۆی دابەزینی توانای بەرهەمهێنان، کەواتە بە نەهێشتنی جیاوازی و یەکسان کردنی کرێی کار ئابووری ولاٚت بەرەو بووژانەوە و زیاتر گەشەکردن دەچێت، چونکە ژمارەی بەشداربووان لەپرۆسەی ئابووریدا زیاد دەکات. کەواتە دەتوانین بڵێین بازاڕی کار کاریگەرییەکی راستەوخۆی هەیە لەسەر باری ئابووری بەگشتی دەبێت لەیادمان نەچێت (مرۆڤ لە هەموو سوود و قازانجێکی ماددی بەسوود ترە).

# فەسڵی دەیەم

## سوڕی ئابووری!

هەموو ئابوورییەك هەوڵی هاوسەنگی نێوان داواو خستنەڕووە، بەلاّم لە پراکتیکدا گەشتن بە هاوسەنگی پرۆسەیەکی ئاڵۆزە و چەندان فاکتەر کاردەکەنە سەر هاوسەنگی و ناهەوسەنگی (داوا و خستنەروو) کە تەوەری سەرەکی و ناوەڕۆکی هەموو دیاردە ئابوورییەکان پێك دەهێنن. لەبەشەکانی پێشوودا باسمان لە هاوسەنگی نێوان داوا و خستنەڕوو کرد، ئەم هاوسەنگییە لە هەندێ کەرتی ئابووریدا هەندێ جار روودەدات، بەلاّم هاوسەنگی بەشێوەیەکی هەمیشەیی و جێگیر بەردەوام نابێت، جارێکی تر ناهاوسەنگی دروست دەبێتەوە کە ئاکامەکانی بریتییە لە رووداني بێکاری، هەلاّوسان، بەرزبوونەوەی نرخ ...هتد.

هەرچی دیاردەیەکی ئابوورییە سیفەتێکی کاتی وەردەگرن، ئەم سیفەتەش پێی دەوترێت سووڕی ئابووریانە لەم فەسڵەدا هەوڵ دەدەین باس لە سووڕە ئابوورییەکان بکەین کە بریتییە لە هەڵکشان و داکشانەوەی ئابووری. باری ئابووری پرۆسەیەکی سروشتی و بابەتییانەیە روودەدات لە ئەنجامی چالاکییە ئابوورییەکاندا. چونکە هەمیشە مرۆڤ (کارکەران) دەیانەوێت داهاتیان بەرز بکەنەوە، بەلاّم سەرکار دەیەوێت قازانج زیاد بکات، حکومەتەکان و دەسەلاّت هەوڵی پتەوکردن و بەهێز کردنی ئابووری ولاّت دەدەن، هەموو ئەم دیاردانە لەم فەسڵەدا باس دەکەین.

**فەرهەنگی ئابووری**

گۆڕانی ئابووری (سوڕی ئابووری)Economic Fluctuation : زیادبوونی داهاتی نەتەوەیی دەبێتە هۆی فراوان کردنی چالاکی ئابووری و بووژانەوەی ژیانی ئابووری .

هەڵچوونی ئەم جۆرە جولاّنەوەیە ئابووریناسەکان پێی دەڵێن (قۆناغی بوژانەوە) لە کاتێکیشدا داهات ئیتر زیاد نابێت و ئابووری دووچاری باری وەستاندن دەبێت لەو بارەدا ئابووریناسەکان پێی دەڵێن (قۆناغی وەستاندن). لە کاتێکیشدا باری کشاوە دەست پێ دەکات ئابووری دەچێتە (قۆناغی لێژ بوونەوە). ئەم بارەش تا بەرەو لێژ بوونەوە بڕوات ئابووری دەگەیەنێتە (قۆناغی بێ بازاڕی)یەوە یاخود باری تەنگەژە .



ئەم بەرزبوونەوە و نزم بوونەوەش ئابووریناسەکان پێی دەڵێن گۆڕانی ئابووری یان سووڕی ئابووری.

ئەم گۆڕانەش چەند شێوەیەك وەردەگرێ:

١- گۆڕانی خولاو.

٢- گۆڕانی سالاّنە.

٣- گۆڕانی ماوە درێژ.

## سوڕی ئابووری چییە؟

ئابووری هەموو ولاّتێك پێوانە دەکرێت بەگوێرەی ئەندازە و بڕی تێکڕایی بەرهەمی نەتەوەیی. کە هەمیشە لە گۆڕاندایە بەرەو گەشەکردن و داکشانەوە. قۆناغی گەشەکردن واتە بوژانەوەی بارودۆخی ئابووری. قۆناغی داکشانەوە واتە تەنگەژی و قەیرانی بارودۆخی ئابووری. لە قۆناغی بووژانەوەدا داوا و خواستەکانی بەکاربەران زیاد دەکات، وەهەروەها داوای کۆمپانیا و دەزگا حکوومییەکانیش زیاد دەکات، بێگومان پرۆسەی بوژانەوە بە کتوپڕی روونادات, بەڵکو بەخشۆکی و پلەپلە دەست پێ دەکات. دیاردەکانی گەشەکردن داوا و خواستە گشتییەکان زیاد دەکات لە کڕینی کالاّ و خزمەتگوزارییەکان، کارگە بەرهەم هێنەرەکان بڕ و قەوارەی بەرهەم زیاتر دەکەن, چونکە بازاڕ پێویستی بە داوایەکی زۆرتر هەیە لە کالاّ و خزمەت گوزاری، کەواتە دیاردەی بێ کاری کەم دەبێتەوە و داهاتی تاکە کەس زیاد دەکات ئەمەش دەبێتە هۆی زیادکردنی توانای کڕین و خەرج کردن و پاشەکەوت کردن لە لایەن دانیشتوانەوە. ئەمەش دەبێتە هۆی بووژانەوەی زۆربەی کەرتە ئابوورییەکان، ئەو کاتە بودجەی گشت حکوومەت زیاد دەکات، کەواتە حکوومەت دەتوانێت زیاتر پارە خەرج بکات لە بواری پرۆگرامە کۆمەلاّیەتییەکاندا وەك پەروەردە، رۆشنبیری، تەندروستی ... هتد. بەجۆرێك هەموو تاکەکانی کۆمەڵ و توێژ و چینەکان هەست بە باش بوونی باری ژیانی رۆژانەیان دەکەن. بەلاّم بەهۆی فاکتەر و یاسا ئابوورییەکانەوە کە هەمیشە لە ناکۆکی و ململانێدان دیاردەی بوژانەوە و گەشەکردن زوو یان درەنگ بەرەو داکشانەوە دەچێت. لە دیاردەکانی داکشانەوەی تەنگەژی ئابووری کەم بوونەوەی داوا و خواستەکانی بەکاربەرانە بە گشتی وە بێکاری زیاد دەکات، داهاتی دانیشتوان بەرەو کەم بوونەوە دەچێت، بودجەی حکومەت تووشی کورت هێنان دەبێت. خەرجی پرۆگرامە کۆمەلاّیەتییەکان کەم دەبێتەوە ئەو کاتە زۆربەی چین و توێژەکانی کۆمەڵ

هەست بە تەنگەژی و خراپ بوونی گوزەرانی ژیانیان دەکەن. کەواتە رادەی خەرج کردن و سەرمایەگوزاری بەرەو کەم بوونەوە و داکشان دەچن واتە بڕگەی (C) و (I) هاوکێشەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی کەم دەبێتەوە ... بێگومان قۆناغی قەیران و تەنگەژی ئابووریش زوو یان درەنگ کۆتایی پێ دێت. کە لەفەرهەنگی ئابووریدا پێی دەوترێت سووڕی ئابووری.

**فەرهەنگی ئابووری**

تەنگەژی ئابووری توند و تیژ: بریتییە لەو قۆناغە ئابوورییەی کە بۆماوەیەکی درێژ داوا و خواستەکان نزم دەبێتەوە، بڕی سەرمایەگوزاری لە نزمترین رادەدا دەبێت، توانای بەرهەمهێنان لە نزمترین ئاستدا دەبێت. رێژەی بێکاری زیاد دەکات، وە هەندێ جار پێی دەوترێت قۆناغی کاول کەر.

کەواتە دەتوانین بڵێین سووڕی ئابووری بە چوار قۆناغدا دەڕوات:

– قۆناغی بووژانەوە: پلەو پایەی ئابووری بەرەبەرە لەسەرخۆ بەرەو گەشە کردن دەڕوات .

– قۆناغی برەو سەند: پلەو پایەی بەرهەم هێنان زیاد دەکات, بازرگانی دەبوژێتەوە, داهات زیاد دەکات.

– قۆناغی داکشانەوە: پلەو پایەی بەرهەم هێنان کەم دەکاتەوە, داهاتی نەتەوەیی کەم دەبێتەوە, بێکاری زیاد دەکات.

– قۆناغی بێ بازاڕی: پلەو پایەی بەرهەم هێنان زۆر دەڕواتە نزمی, بازرگانی تووشی بێ بازاڕی دەبێت.

## بێکاری و نرخ هەڵاوسان

سەدان ساڵە ئابووریناسان لە تیۆرییەکانیاندا سەلماندویانە کەسازدان (توافق) هەیە لەنێوان بێکاری و هەڵاوسان. ئەو سازدانەش بریتیە لە (هەڵاوسان یان بێکاری). بابزانین لە پراکتیکدا ئەم سازدانەش چۆن چۆنی روودەدات.

کاتێك ئابووری دەبووژێتەوە و دەگاتە بەرزترین پلەی قۆناغی گەشەکردن، واتە داوا و خواستەکان زیاد دەکەن وە بێکاری کەم دەبێتەوە, ئەم دیاردەیەش دەبێتە هۆی پەیدابوونی هەڵاوسان، چونکە نرخ بەرەو بەرز دەچێت ئەمەش لەبەرژەوەندی بەهەمهێنەر و فرۆشیارەکاندایە, ئەمەش بەهۆی بەرز بوونەوەی نرخەوەیە کە قازانجێکی زیاتر دەکەن, ئەم



حاڵەتەش لە فەرهەنگی ئابووریدا پێی دەوترێ هەڵاوسانی داواکان. چونکە زیاد بوونی داوا و خواستەکان دەبێتە هۆی زیادبوونی نرخ.

جۆرێکی تری هەڵاوسان ئەوکاتە روودەدات کاتێ ژمارەی بێکاران زۆر کەم دەبێتەوە کەرتە ئابوورییەکان زیاتر پێویستییان بە کارکەران هەیە، کەواتە سەرکار ئامادەیە کرێی کار بەرز بکاتەوە، بەرز بوونەوەی کرێی کار دەبێتە هۆی زیاد بوونی خەرجی بەرهەم هێنان، بەلاّم بەرهەمهێنەر بۆئەوەی بڕی رێژەی قازانج کەم نەبێتەوە ناچارە نرخ لەسەر کاڵا و خزمەت گوزارییەکان زیاد بکات ئەمەش دەبێتە هۆی هەڵاوسان لە فەرهەنگی ئابووریدا پێی دەوترێت هەڵاوسانی تێچوون.

کەواتە گرنگ نییە چ فاکتەرێك دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی نرخ، هەموو بەرزبوونەوەیەکی نرخ واتە پەیدابوونی هەڵاوسان، هەر بۆیە هەمیشە دەڵێن نرخ هەڵاوسان یان هەڵاوسانی دراو.

کەواتە چی بکەین لەگەڵ دیاردەی هەڵاوسان، چۆن چارەسەر دەکرێت؟

چارەسەر کردنی دیاردەی هەڵاوسان تەنها لە توانای حکوومەتدایە و ئەرکی سەرەکی حکوومەتە. لەم حاڵەتەدا دەبێت حکوومەت هەوڵی کەم کردنەوەی بڕی پارە بدات، بۆ ئەوەی زەمینەی هاوسەنگی لەنێوان داوا و خستنەڕوودا ئامادە بکات. ئامرازی سەرەکی حکومەت لە نەهێشتنی دیاردەی هەڵاوسان داڕشتنی سیاسەتی دارایی و نەختینەی و قەرزییە بەشێوەیەکی زانستییانە کە هەمەئاهەنگ بێت لەگەڵ یاسا ئابوورییەکاندا. دیاردەی هەڵاوسان ئەو کاتە کەم دەبێتەوە ئەگەر بڕی داوا کەم ببێتەوە, واتە دەبێت ئابووری بەرەو داکشانەوە ئاڕاستە بکرێت، چونکە چارەسەری هەڵاوسان تەنها داکشانەوەی گەشەکردنی بارودۆخی ئابوورییە. هەروەك لەپێشەوە باسمان لێکرد داکشان و تەنگەژەی ئابووری دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی داهاتی دانیشتوان، کەم بوونەوەی قەوارەی بەرهەم، کەواتە وردەوردە نرخەکان دادەبەزێت. بۆ نموونە ئەمڕۆ کە ئابووری چین زۆر بەشێوەیەکی خێرا گەشە دەکات ساڵی (٢٠٠٥) تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی بە رێژەی لە (١٢٪) زیادی کردووە. ئەوەتا ئێستا هەموو هەوڵی حکوومەتی چین دابەزینی رێژەی زیاد بوونی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەییە بۆ ( ٨٪) تاکو ئابووری چین تووشی دیاردەی هەڵاوسان نەبێت. بۆیە دەزگا تایبەتییەکانی کەرتی ئابووری حکوومەت دەبێت هەمیشە چاودێری بڕی زیاد بوونی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی بکەن. چونکە دیاردە ئابوورییەکان دووجەمسەرین بەپێی یاسای یەکێتی و ناکۆکی ململانێی هەمیشەیی نێوان فاکتەر و جەمسەرە ئابوورییەکان لە بەردەوامیدایە.

**فەرهەنگی ئابووری**

– هەڵاوسانی داواکان: لەئەنجامی کەم بوونەوەی بێکاری و زیاد بوونی داهات روودەدات.

– هەڵاوسانی کرێی کار: کاتێك روودەدات کە سەرکارەکان کرێی کار زیـاد دەکـەن، بـەڵام بەهۆی کەم نەکردنەوەی رێژەی قازانج نرخی بەرهەمەکانی بەرز دەکاتەوە.

– هەڵاوسانی تێچوون: لە ئەنجامی زیاد کردنی کرێی کار و بەرزبوونەوەی نرخی کەرەستەی خاوو روودەدات، چونکە هەردوو دیاردەکە دەبنە هۆی بەرزبوونەوەی نرخ.

بێگومان نرخی هەڵاوسان گەلێك جۆری هەیـە, بـەڵام لـە هـەموویان توندوتیـژ تـر پێـی دەوترێت نرخی هەڵاوسانی سەرکێش. ئەم جۆرە دەبێتە هۆی ئێجگار لاواز بوونی نرخـی پـارە، واتە پارە ئەو برە و هێزەی نامێنێت و وەك کاغەزی ئاسایی لیٚ دێت .. ئەم جـۆرە هەڵاوسـانە دژوارترین و درێژ ترین هەڵاوسانەوە چارەسەرکردنی پێویستی بەکات و ئەرکێکی زۆر هەیە.

**فەرهەنگی ئابووری**

ئابووریناسان ئاست و بڕ و جۆری هەڵاوسان بـە دوو شـێوە دیـاری دەکـەن، بـەهۆی نرخـی بەکاربردن (CPI) وە نرخی بەکارهێنەرەکان (PPI).

CPI: بریتییە لە گۆڕینی ئاست و بڕی نرخەکان لەسەر داوای کاڵا و خزمەت گوزارییـەکان لەماوەی مانگێکدا یان سیٚ مانگدا یان ساڵێکدا.

PPI: بریتییە لە گۆڕانی ئاستی نرخ لەسەر کار، مەودای خاو و، ماددە پێویستییەکانی تر بۆ بەرهەم هێنان لەماوەی مانگێکدا یان سیٚ مانگدا یان ساڵێکدا.

## گۆڕانکارییەکانی سوڕە ئابوورییەکان

لەسەرەوە باسمان لە پەیوەندی و ململانێتی نێوان دیاردەی بـیٚ کـاری و هەڵاوسـان کـرد وە باسمان لە سـووڕی ئـابووری کـرد بەشـێوە کلاسـیکییەکەی، بـەڵام بـەهۆی ئـەو گۆڕانکارییـە گرنگانەی کە ئەمڕۆ لە سیستەمی ئابووری و تیۆری و بۆچوونە ئابوورییەکاندا هاتۆتـە گـۆڕیٚ, سوڕی ئابووریش گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە و ئەو گۆڕانکارییانەش بریتین لە:

– هەڵاوسان کەم دەبێتەوە: هەڵاوسان دەبێتەهۆی کەم کردنەوەی نرخـی دراو، بۆیـە ئـەمڕۆ کە حکوومەتەکان لە رێگەی بانکی ناوەندییەوە و بـەهۆی سیاسـەتی تونـد و تیـژی دارایـی و



قەرزییـەوە هـەوڵی کـەم کردنـەوەی رادەی هەڵاوسـان دەدەن، ئـەویش بـە چـاودێری کردنـی هەمیشەیی و بەشدارکردنی راسـتەوخۆیی لـە کـڕین و فرۆشـتنی دراودا لـە بۆرسـەکاندا، بـە تایبەتی ئەو وڵاتانەی کە بەقۆناغی گۆڕانکاری ئابووریدا تیٚ دەپەڕن هەمیشە گەنجینەی دراوی قورس لە بانکی ناوەندی زیاد دەکەن بۆئەوەی لە هەموو حاڵەتێکدا بتـوانن تـەداخولی بـازاڕی دارایی بکەن و دراوی نەتەوەیی لە پاڵەپەستۆی دراوە قورسەکانی جیهان بپارێزن.

– بەرزبوونەوەی توانای بەرهەم هێنان: ئەمڕۆ کە بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو شۆڕشـی زانیارییـەوە کۆمپانیـا بەرهەمهێنـەرەکان توانیویانـە بـڕی خـەرجی گـشتی بەرهـەم هێنـان لەئاسـتێکی دیـاری کـراودا رابگـرن وەهەنـدیٚ جـار کەمیـشی بکەنـەوە. واتـە نرخـی کـاڵا خزمەتگوزارییەکان تا رادەیەك بە نەگۆڕی دەمێنێتەوە وە زیاد بوونی نرخ بەشـێوەیەکی کتـوپڕ روونادات، ئەگەر زیادیش بکات ئەوا بەشێوەیەکی خشۆکی و پلە پلـە بەرێژەیـەکی کـەم زیـاد دەکات، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی دیاردەی هەڵاوسان کەم بکرێتەوە.

– بـەجیهان بـوونی بازاڕەکـان: ئـەمڕۆ کەبـەهۆی گەشـەکردنی بازرگـانی نێودەوڵـەتی و پێـشکەوتنی ئامرازەکـانی گواسـتنەوە لەجیهانـدا، بەشـێوەیەکی خێراتـر کـاڵا و خزمـەت گوزارییـەکان دەتوانرێـت بگەیەنرێتـە دوورتـرین شـوێنی گـۆی زەوی. کەواتـە بازاڕەکـان لـە ماوەیەکی کەمدا پڕ دەبن لە کاڵا و خزمەتگوزاری وە بەنرخێکی گونجـاو ئەمـەش رێگەبەسـت دەبێت لەبەر هەڵاوساندا.

– سەرمایە گوزاری: ئەمڕۆ کەسەرمایە هەموو سنوورەکانی بەزانـدووە، هـیچ رێگەیـەکی ئابووری و یاسایی نییە لەبەر گەڕخستنی سەرمایە لەجیهاندا، واتە جیهانگیر بوونی سەرمایە، ئەمەش دەبێتە هۆی کەم کردنەوەی هەڵاوسان لەهەندیٚ جاردا، بەڵام لەهەنـدیٚ حاڵـەتی تـردار بەپێچەوانەوە (ئەم دیاردەیە لێرەدا تەنها ئاماژەمان پێـدا) لەڕاسـتیدا باسـێکی زۆر گرنگـە و پێویستی بەلێکۆڵینەوەی تایبەتی هەیە.

## قەیرانی ئابووری توندوتیژ و درێژخایەن

کاتێك داکشانەوە و تەنگەژی ئابووری شێوەی قووڵ و توندوتیژ و درێژخایەن وەردەگرێت, ئابووریناسان بە دژوارترین قۆناغی ئابووری دادەنـێن وە ئـەم حاڵەتـە مەترسـی و ئاکـامی نێگەتیڤانەی کۆمەڵایەتی و سیاسی لیٚ دەکەوێتەوە. دیاردەکانی ئـەم قۆناغـەش زۆربـوونی ژمارەی بێکاری، کەمبوونەوەی داهاتی دانیشتوان بەڕادەیەکی زۆر، بـڕ و قـەوارەی بەرهـەم

هێنان دادەبەزێت، گەنجینەکان خاڵی دەبن لە کاڵا و مادده پێویستییەکانی بەکارهێنان، تونای کڕین کەم دەبێتەوە، بێ بازاڕی دروست دەبێت، هەڵاوسان دەگاتە قۆناغی سەرکێشییەوە ..هتد.

### فەرهەنگی ئابووری

تەنگەژەی ئابووری Crisis:

تەنگەژەی ئابووری تێکچوونێکی کتوپڕە، تووشی هەمبەری ئابووری وڵاتێك یان کۆمەڵە وڵاتێك دەبێت، هەروەها بەو تێکچوونەش دەگوترێ تێکچوونی هەمبەری کە لەنێوان بەرهەم و بەکاربردندا پەیدا دەبێت.

ئەم تەنگەژەیە زۆر بەتین دەبێت یان شێنەیی دەبێت، هەروەها خۆجێییەکی دەبێت واتە تووشی یەك وڵات دەبێت، یان کۆگر واتە تووشی چەند وڵاتێك دەبێت. هۆی ڕوودانی ئەم دیاردەیە ئابووریناسەکان دەیگەڕێننەوە بۆ بەرەڵایی بەرهەم هێنان و نایەکسانی لە دابەشبوندا، یان کەمی بەکاربردنی چینی کرێکار، هەروەرها هەندێ لە ئابووریناسان هۆی پەیدابوونی ئەم دیاردەیە بۆ هۆیە نەختییەکان دەگەڕێننەوە بەتایبەتی بەکارهێنانی بڕوا پێدان بەشێوەیەکی کرێت.

قەیرانی ئابووری توندوتیژ و درێژخایەن ڕەنگە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا زۆر جار ڕووی دابێت, بەڵام ئەوەی ئێمە دەیزانین قەیرانی ئابووری گەورەی پێ دەڵێن کە لە ساڵەکانی (١٩٢٩) تا (١٩٤١)دا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ڕوویدا. وردە وردە هەموو جیهانی گرتەوە تەنانەت لە مێژووی ئابووریدا بەم ڕۆژە دەڵێن (چوار شەممەی ڕەش)، زۆربەی ئابووریناسان هۆکاری هەڵگیرساندنی جەنگی جیهانی دووەم کە بە ترسناکترین و دژوارترین جەنگی جیهانی دەژمێردرێت دەگێڕنەوە بۆ ئەنجامی قەیرانی ئابووری ساڵی (١٩٢٩). دەمەوێت ئاماژە بەخاڵێکی گرنگ بدەم تەنانەت تاکو ئێستاش لەنێوان ئابووریناساندا یەك بۆچوون نییە لە ڕوون کردنەوە و شیتەڵ کردنی هۆکانی قەیرانی ئابووری ساڵەکانی (١٩٢٩)دا. هەندێ لە ئابووریناسان دەڵێن هۆی قەیرانی ئابووری ساڵی (١٩٢٩) کڕینی ناسروشتی و فێڵبازی جامبازەکانی بازاڕی دراو بووە لەسەرەتای ساڵەکانی (١٩٢٠)دا. لە کڕین و فرۆشتنی کاغەز بە نرخی فوو تێکراو کە هیچ بنچینەیەکی ئابووری نەبووە. زۆربەی کۆمپانیا و ڕێخراوە ئابوورییەکان و دانیشتوان بۆ پاراستنی داهاتەکانیان لە دیاردەی هەڵاوسان کاغەزی بەنرخ دەکڕن بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ, چونکە کاغەزی بەنرخ پاڵپشتە بەگەرەنتی حکوومەت و بانکی



ناوەندی. بەڵام حکوومەت نەیتوانی ئەرکەکانی خۆی وەك گەرەنتی جێبەجێ بکات و ئەمەش بووە هۆی ڕماندنی بازاڕی دارایی و بێ نرخی پاشەکەوتی دانیشتوان و کۆمپانیاکان. هەندێ ئابووریناسانی تر دەڵێن هۆی سەرەکی قەیرانی ئابووری لە ساڵی (١٩٢٩)دا هەڵەی بانکی ناوەندی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بووە، لەپێناوی ڕێگە گرتن لە هەڵاوسان لە ساڵی بیستەکاندا بڕی پارەی کەم کردەوە و ڕێژەی سوودی قەرزی نزم کردەوە .. ئەمەش بووە هۆی کەم کردنەوەی داواکان کە بووە هۆی داکشانەوە و تەنگەژی ئابووری، ئەمەش بووە هاندەرێك لە ڕاکێشانەوە و دەرهێنانی پارە دانراوەکان لە بانکەکاندا. بەمەش بانکەکان واتە سیستەمی دارایی توشی شەلەل و قەیران بوون, تەنانەت زۆربەی بانکەکان توشی ئیفلاسی بوون و دەرگاکانیان داخست. ئەمەش بووە هۆی کەم کردنەوەی سەرمایەگوزاری بۆ نزمترین ئاست. بێگومان چەندان بۆچوونی تریش هەن کە دیاردەی قەیرانی ئابووری گەورەی ساڵی (١٩٢٩) ڕوون دەکەنەوە بە هەرحاڵ ئەو قۆناغە کۆتایی هات. بۆ جارێکی تر بۆئەوەی جیهان توشی تەنگەژەی قەیرانی ئابووری توندوتیژ و درێژخایەن نەبێت، بانکە ناوەندییەکان زۆر بەوریاییانەوە سیاسەتی دارایی و قەرز دادەڕێژن.

## ڕاکەن نرخ داشکاوە!

هەروەك دەزانین دیاردە ئابوورییەکان دووجەمسەرین، فاکتەرە ئابوورییەکان کار و کاردانەوەیان هەیە لەسەر یەکتری، وە ئێستا دەزانین سووڕی ئابووری چییە، وە دەزانین دوای هەموو گەشەکردن و بووژانەوەیەکی ئابووری تەنگەژی و داکشانەوە دەست پێ دەکات.

ئێستا باس لە دیاردەیەکی تر دەکەین ئەویش دیوەکەی ئەو دیوی دیاردەی هەڵاوسان کە لەفەرهەنگی ئابووریدا پێی دەوترێت ناهەڵاوسان یان نرخ نزم بوونەوە.

مەبەست لە ناهەڵاوسان: دابەزینی نرخە بەشێوەیەکی خشۆکی پلە پلە, دیاردەی ناهەڵاوسان لە بەرژەوەندی بەکاربەراندایە, چونکە کڕیار دەتوانێت بە نرخێکی نزم و دیاری کراو و جێگیر کاڵا و خزمەت گوزارییەکان بکرێت. بەڵام وەك هەموو دیاردە ئابوورییەکانی تر دیاردەی ناهەڵاوسان زوو یان درەنگ کۆتایی پێ دێت. چونکە لەحاڵەتی ناهەڵاوساندا واتە نرخ نزمی، کۆمپانیا بەرهەم هێنەرەکان ناچارن بڕو قەوارەی بەرهەم هێنان کەم بکەنەوە بۆئەوەی خستنەڕوو کەم بێتەوەو نرخ بەرز بکاتەوە لەسەر کاڵا و خزمەت گوزارییەکانی لەپێناوی لە دەست نەدانی بڕی قازانج. بەهۆی کەم کردنەوەی ڕادەی بەرهەم هێنان ڕێژەی بێکاری زیاد

دەكات، داهات كەم دەبێتەوە، توانای كڕین كەم دەبێتەوە و جارێكی تر نرخ بەرز دەبێتەوە, واتە سووڕی ئابووری دەچێتە قۆناغی داكشان و تەنگەژی.

لەلایەكی ترەوە دیاردەی ناهەڵاوسان كاریگەری نێگەتیڤانەی هەیە لەسەر كەرتی دارایی و قەرز واتە بانكەكان و رێكخراوە داراییەكان. بەهۆی كەمی بڕی پارەوە سوودی قەرز بەرزدەبێتەوە ئەمەش دەبێتە هۆی كەم كردنەوەی پرۆسەی سەرمایەگوزاری واتە سەرەتای پەیدابوونی سوڕێكی تری ئابووری بێگومان دیاردەی ناهەڵاوسان وەك دیاردەی هەڵاوسان ئاكامی نێگەتیڤانەی ئابووری لێ دەكەوێتەوە، بۆیە پێویستە ئەم دیاردەیەش چارەسەر بكرێت، چارەسەر كردنی ئەم دیاردەیەش زیاتر لەئەستۆ و ئەركی حكوومەتدایە. رێگەی چارەسەركردنی ناهەڵاوسان كەم كردنەوەی بڕی بەرهەمهێنانە كە دەبێتە هۆی داخستنی زۆربەی كۆمپانیا بەرهەم هێنەرەكان بەڵام رێگەیەكی تر نییە.

وە چارەسەرێكی تری دیاردەی ناهەڵاوسان بریتییە لەبەرز كردنەوەی ئاستی داواو خواستەكان وەهەروەها كەم كردنەوەی رێژەی سوودی قەرز لەلایەن بانكی ناوەندییەوە. هەموو چارەسەرێكی ئابووری پێویستە بەشێوەیەكی زانستانەو هەنگاو بەهەنگاو بكرێت چونكە هەموو چارەسەرێكی كتوپڕ ئاكامی كتوپڕی لێ دەبێتەوە. ئەمڕۆ كەئابووری ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا لەحاڵەتی ناهەڵاوساندایە ئەمەش ئابووریناسان و پسپۆڕانی دارایی ئەمەریكای خەریك كردووە تاكو چارەسەرێكی گونجاو بدۆزنەوە و چارەسەری ئەم دیاردەیەی پێ بكەن. یەكێك لەچارەسەرەكان كەم كردنەوەی هەمیشەیی رێژەی سوودی قەرزە ئەمەش بۆتە هۆی دابەزینی بەهای دۆلار بەرامبەر ئیرۆ و یەنی یابانی.

**فەرهەنگی ئابووری**

- ناهەڵاوسان: نزم بوونەوەی نرخە بە شێوەیەكی خشۆكی لەسەر زۆربەی كاڵا و خزمەت گوزارییەكان. ئەم دیاردەیەش تەواو پێچەوانەی دیاردەی هەڵاوسانە. كاتێك بڕی پارە زۆر دەبێت نرخ بەرز دەبێتەوەو بەهای پارە نزم دەبێتەوە.

# بەشی سێیەم

## ئابووری دەوڵەت

هەمیشە حکوومەت رۆڵێکی کاریگەر و چالاك دەنوێنێت لە ئابووری ولاّتدا. هەرچەندە ئەم رۆڵە بەپێی سیستەمە ئابوورییەکان جیاوازی هەیە، بەلاّم تەنانەت لە سیستەمی ئابووری سەرمایەداریدا واتە ئابووری ئازادە. حکوومەتەکان رۆڵێکی سەرەکییان هەیە لە چالاکییە ئابوورییەکاندا. ئەمڕۆکە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کە بە ئازادترین سیستەمی ئابووری دادەنرێت، بەلاّم بەشێوەیەکی راستەوخۆ کاریگەری هەیە لەسەر جموجۆلی چالاکی ئابووری. تاکو ئێستاش رێژەی لە (٢٨٪) کەرتەکانی ئابووری لەژێر دەسەلاّتی حکوومەتدایە.

هەرچەندە حکوومەتەکان هەندێ کالاّ و خزمەتگوزاری بەرهەم دەهێنن کە دانیشتوان پێویستییان نییە وەك بەرهەمی چەك و تفاقی سەربازی یان خەرجییەکی زۆری حکوومەتەکان لە پارێزگاری بەرژەوەندی نەتەوەییدا لە رێگەی بەکارهێنانی سیاسەتی دەرەوەیدا. چەند ئامرازێکی ئابووری گرنگ لەژێر دەسەلاّتی حکوومەتدایە کە بەهۆیەوە دەتوانێت ئاڕاستەی ئابووری بگۆڕێت وەك چاپ کردن و دەرکردنی پارە، دانان و وەرگرتنی باج، گومرگ ...هتد. لەم بەشەدا هەوڵ ئەدەین هەموو چالاکی و ئەرکەکانی حکوومەت لەبواری ئابووریدا باس بکەین.

# فەسڵی یانزەهەم

## دەوڵەمەندی و هەژاری

هەریەکێك لەئێمە بەتوانای بیرکردنەوەی خۆی دەزانێت دەوڵەمەندی و هەژاری چییە، هەندێ کەس دەڵێن ئەگەر هەر کەسێك هەمیشە لە کارکردندا بێت و بێ ووچان هەوڵ بدات و کار بکات ئەوا دەوڵەمەند دەبێت، هەندێکی تر دەڵێن دەوڵەمەند بوون رێکەوتە،...هتد، بۆچوون و بیرۆکەی جیاواز جیاواز لەئارادایە لە روون کردنەوە و لێکۆڵینەوەی دیاردەی هەژاری و دەوڵەمەندی، ئێمە هەوڵ دەدەین دیاردەی دەوڵەمەندی و هەژاری لە روانگەی ئابوورییەوە لەسەر بنەما ئابوورییەکان روون بکەینەوە وە هەوڵ دەدەین لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەیەکی زانستییانەی دیاردەی هەژاری و دواکەوتوویی بکەین. وە هەروەها لەم فەسڵەدا باس لە سیاسەتی ئابووری حکومەت دەکەین وە باس لە رۆڵی حکومەت دەکەین لە هەوڵدانیدا بۆ لەناوبردنی دیاردەی هەژاری و دواکەوتوویی.

### هەژاری چییە؟

دیاردەی هەژاری ئەمرۆکە گیروگرفتی زۆربەی زۆرینەی دانیشتوانی گۆی زەمینە ئەمەش بۆتە هۆی بەگیر هێنان و سەر ئێشەی ئابووریناسان و سیاسەتمەداران لەجیهاندا, چونکە زیاد لە دووبەش یان سێ بەشی دانیشتوانی سەر زەمینی گرتۆتەوە بە ملیۆنەها خەڵك و منداڵ دووچاری نەخۆشی و ژیان لەدەست دان دەبن بەهۆی کەمی خۆراك و رادەی نزمی و هەندێ جار نەبوونی خزمەتە تەندروستییەکان, ئابووری ناسان دیاردەی دەوڵەمەندی و هەژاری لەسەر بنچینەی سێ پێرستی سەرەکی پێوەردەکەن.

- داهات.
- موڵك و ماڵ (پاشکەوتی دارایی، خانووبەرە، زەوی، شەیر).



- ئاستی ئابووری و کۆمەڵایەتی (تەندروستی، پەروەردە، خۆراك, رێژەی لە دایك بوون, مردن, تەمەن,...هتد).

ئێمە لەم فەسڵەدا باس لە پێرستی * (داهات) دەکەین, چونکە پێوەری ئەم پێرستە لە هەموو پێرستەکانی تر روون ترە، وە زۆربەی دانیشتوان سەرچاوەی بژێوی ژیانیان داهاتە جا چ لە شێوەی کرێی کاردا، مووچە، خانەنشینی، قازانج لەئەنجامی کاروکاسپیدا.

پێوەر و رادەی دەوڵەمەندی و هەژاری لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی تر، لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر دەگۆڕێت.

بۆ نموونە لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکاندا بوونی کارەبا، گازی سەنترالّ، جل و بەرگی تازەو جوان، خواردنی بەسوود، خزمەتی تەندروستی، خوێندن و خوێندەواری، ئۆتۆمۆبێل, خانوو...هتد. پێوەری دەوڵەمەندی تاکەکەس و خێزانەکانن، بەلاّم لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا بە تایبەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەموو تاکێکی کۆمەڵ یان بڵێین زۆربەی زۆری دانیشتوان خاوەنی خانووی خۆیانن یان ئوتومبێلی خۆیانیان هەیە، وە هەموو هاوڵاتییەك دەتوانێت جل و بەرگی جوان لەبەربکات، خواردنی بەسوود بخوات، باری ژیان و تەندروستی بیمە کراوە...هتد. کە واتە دیاردەی هەژاری رێژەییەوە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر دەگۆڕێت.

لەم خشتەیەی خوارەوەدا بۆ بەراوردکردن داهاتی خەڵکی لە کیشوەر و وڵاتە جیاجیاکان نیشان دەدەین کە بەپێی ئاماری بانکی نێودەوڵەتی ژمێرکراوە لە ساڵی(٢٠٠٠)دا.

* وشەی پێرست لەبری وشەی (index ، exponent)ی ئینگلیزی بەکارهێنراوە. لەزمانی کوردیدا هەروەها ئەم وشانەش بەکاردێت: لێکدەر، لاگر، رابەر، کاریگەر، بەڵگە بۆ. بەلاّم ئێمە وشەی پێرستمان لەلا پەسەندترە.

خشتەی ژمارە (١-١١). داهاتی تاکەکەس لە (١) دۆلار لە رۆژێکدا ساڵی (٢٠٠٠).

| ناوچەکان | ژمارەی دانیشتوان (ملیۆن - خەڵك) | ژمارەی دانیشتوان کە داهاتیان لە یەك دۆلار کەمترە لە رۆژێکدا (ملیۆن - خەڵك) | رێژە بە گوێرەی هەموو دانیشتوان |
|---|---|---|---|
| ولاتانی ئەمەریکای لاتینی | ٤٣٢ | ٤٩ | ١٢ |
| رۆژئاوای ئاسیا و باکووری ئەفەریقا | ٢٠٤ | ٥ | ٣ |
| ئەفەریقا و ولاتە بیابانییەکان | ٣٨٨ | ١٦٩ | ٤٤ |
| باشووری ئاسیا | ١٢٦٦ | ٥١٥ | ٤١ |
| رۆژهەلات و باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا | ١٧٢٦ | ٣٢٠ | ١٩ |

ئەگەر سەیری خشتەکەی سەرەوە بکەین دەبینین کە زیاتر لە (٤٤٪) دانیشتوانی ئەفەریقا و ولاتە بیابانییەکان داهاتی سالانەیان لە (٣٦٥) دۆلار تێپەڕ ناکات بەپێی ئامارە نێودەوڵەتییەکان. ئەمرۆکە زیاتر لە یەك ملیار دانیشتوانی سەر زەوی لەو رادە نزمەی ژیاندا دەگوزەرێنن، واتە لە نێوان مردن و ژیاندا، تەنگەژی ئابووری و دواکەوتوویی ولاتە تازە پێگەیشتووەکان باسێکی تایبەتە لە بەشی پێنجەمدا بە درێژی لێی دەدوێین.

## کێ چەندی دەست دەکەوێت؟

بۆ ئەوەی دەستنیشانی نایەکسانی داهات بکەین، یان راست تر ئەگەر بمانەوێت پێوانەی ئاستی هەژاری و دەوڵەمەندی بکەین پێویستە پەنا بەرینە بەر چەند پێوەر و لێکۆڵینەوەیەك. ئەم پێوەرکردنەش بریتییە لە سیستەمی دابەش کردن بەپێی گروپەکان. بێگومان ئەم پێوەرە دەتوانرێت بەکاربهێنرێت بۆ هەموو کۆمەڵگا و ولاتێك بەمەرجێك ئاماری تەواو دروستمان لە بەردەستدا بێت. لەم خشتەیەی خوارەوەدا لەسەر ئاماری داهاتی دانیشتوانی ویلایەتە



یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نیشانی دەدەین کە چ گروپێك چەندی دەست دەکەوێت. دانیشتوان پۆلێن کراون بەسەر پێنج گروپدا بەپێی بڕی داهاتیان.

**فەرهەنگی ئابووری**

نایەکسانی داهات: بریتییە لە جیاوازی داهات لە نێوان گروپ و توێژ و چینەکانی کۆمەڵدا.

خشتەی ژمارە (٢-١١) داهاتی سالانەی خێزانی ئەمەریکی بەپێی نرخی ئێستەکی (دۆلار).

| ساڵەکان | هەژارترین گروپ (١) | گروپی (٢) | گروپی (٣) | گروپی (٤) | دەوڵەمەندترین گروپ (٥) |
|---|---|---|---|---|---|
| ٢٠٠٠ | ١٨٠٠٠ | ٣٣٠٠٠ | ٥٢٣٠٠ | ٨٢٠٠٠ | ١٤٥٥٠٠ |
| ١٩٩٠ | ١٢٥٠٠ | ٢٣٧٠٠ | ٣٦٢٠٠ | ٥٥٠٠٠ | ٩٤٧٠٠ |
| ١٩٨٠ | ٧٦٠٠ | ١٤١٠٠ | ٢١٦٠٠ | ٣١٧٠٠ | ٥١٥٠٠ |
| ١٩٧٠ | ٣٧٠٠ | ٧١٠٠ | ١٠٣٠٠ | ١٤٧٠٠ | ٢٣٢٠٠ |

ئەگەر سەیری خشتەکەی سەرەوە بکەین ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە لە ساڵی (٢٠٠٠) دا:

- لە ٢٠٪ خێزانی ئەمەریکی داهاتیان لە رادەی ١٨٠٠٠ دۆلار بووە.
- لە ٢٠٪ خێزانەکان داهاتیان لە نێوان ١٨٠٠١ دۆلار تاکو ٣٣٠٠٠ دۆلار بووە.
- لە ٢٠٪ خێزانەکان داهاتیان لە نێوان ٣٣٠٠١ دۆلار تاکو ٥٢٣٠٠ دۆلار بووە.
- لە ٢٠٪ خێزانەکان داهاتیان لە نێوان ٥٢٣٠١ دۆلار تاکو ٨٢٠٠٠ دۆلار بووە.
- لە ٢٠٪ خێزانەکان داهاتیان لەسەر و ٨٢٠٠٠ دۆلار بووە.

هەروەها لە خشتەکەدا دیارە کە لەساڵی (٢٠٠٠)دا لە (٥٪)ی خێزانەکان داهاتیان لە ١٤٥٥٠٠ دۆلار بەرەوژوور بووە. مەبەست لە (٥٪)ی ناو گروپی هەرە دەوڵەمەندەکانە.

بەلام بۆ زیاتر راستکردنەوە و دروستی ئامارەکان پێویستە داهاتی تاکەکەس یان خێزانەکان بەپێی نرخی ئاستەکی ژمێربکرێت واتە بە رەچاوکردنی فاکتەری (هەڵاوسان) ئەوا لەوکاتەدا ئەم ژمارانەمان دەست دەکەوێت.

خشتەی ژمارە (٣-١١) داهاتی سالأنەی خێزانی ئەمەریکی بە نرخی ئاستەکی (دۆلار).

| ساڵەکان | هەژارترین گروپ (١) | گروپی (٢) | گروپی (٣) | گروپی (٤) | دەوڵەمەندترین گروپ (٥) |
|---|---|---|---|---|---|
| ٢٠٠٠ | ١٨٥٠٠ | ٣٣٩٠٠ | ٥٣٧٠٠ | ٨٤٢٠٠ | ١٤٩٦٠٠ |
| ١٩٩٠ | ١٦٤٠٠ | ٣١١٠٠ | ٤٧٥٠٠ | ٧٢٥٠٠ | ١٢٤٤٠٠ |
| ١٩٨٠ | ١٥٤٠٠ | ٢٨٧٠٠ | ٤٤٠٠٠ | ٦٤٥٠٠ | ١٠٤٨٠٠ |
| ١٩٧٠ | ١٤٦٠٠ | ٢٧٩٠٠ | ٤٠٦٠٠ | ٥٧٩٠٠ | ٩١٥٠٠ |
| زیاد بوونی ڕێژەی داهات لە ساڵی (١٩٧٠-٢٠٠٠) | ٢٦,٧ | ٢١,٥ | ٣٣,٣ | ٤٥,٤ | ٦٣,٥ |

ئەگەر سەیری ئاماری خشتەکەی سەرەوە بکەین بۆمان دەردەکەوێت کە لەساڵی (١٩٧٠)ەوە تاکو ساڵی (٢٠٠٠) داهاتی هەژارەکان بەڕێژەی (٢٦,٧٪) زیادی کردووە, بەلأم داهاتی دەوڵەمەندەکان بەڕێژەی (٦٣,٥٪) زیادی کردووە. واتە دەوڵەمەندەکان زیاتر دەوڵەمەند بوون.

ئێستا بۆ ئەوەی زیاتر لە ئاستی داهاتی خەڵکی و تاکەکەس و خێزانەکان تێبگەین پێویستە بزانین بڕی ئەو داهاتە بە پێی گروپەکان چەندە لە داهاتی نەتەوەییدا. واتە هەر گروپێ چەندی بەر دەکەوێت لە تێکڕای داهاتی نەتەوەیی.

خشتەی ژمارە (٤-١١) بڕ و بەشی هەر گروپێك لە تێکڕای داهاتی نەتەوەیی لە ساڵێکدا (دۆلار) بەڕێژە.

| ساڵەکان | هەژارترین گروپ (١) | گروپی (٢) | گروپی (٣) | گروپی (٤) | دەوڵەمەندترین گروپ (٥) |
|---|---|---|---|---|---|
| ٢٠٠٠ | ٣,٦ | ٨,٩ | ١٤,٩ | ٢٣,٠ | ٤٩,٦ |
| ١٩٩٠ | ٣,٩ | ٩,٦ | ١٥,٩ | ٢٤,٠ | ٤٦,٦ |
| ١٩٨٠ | ٤,٣ | ١٠,٣ | ١٦,٩ | ٢٤,٩ | ٤٣,٧ |
| ١٩٧٠ | ٤,١ | ١٠,٨ | ١٧,٤ | ٢٤,٥ | ٤٣,٣ |



بە تێڕوانین لەخشتەکەی سەرەوە بۆمان دەردەکەوێ کە لەماوەی ٣٠ ساڵدا ڕێژەی داهاتی گروپی یەکەم لەکۆی داهاتی نەتەوەیی زۆر کەمترە وەك لە ڕێژەی داهاتی گروپی (٥). لێرەشەوە دەتوانین دەرئەنجامی ئەوە بکەین کە سیاسەتی کۆمەلآیەتی و دابەشکردنی دەسهاتی نەتەوایەتی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا یەکسان نییە وە جیاوازییەکی زۆری هەیە. ئەمە جێگەی سەرسوڕمان نییە ئایدۆلۆژی سیستەمی سەرمایەداری و ئابووری ئازاد لەسەر بنچینەی نایەکسانی بەرجەستەکراوە بەپێی ئەو ئایدۆلۆژییە ئەگەر هەموو داهاتەکان یەکسان بن واتە هیچ هاندەرێکی ماددی و مەعنەوی نامێنێت بۆ گەشەکردنی ئابووری ئەوەی جێگەی سەرنجە سیاسەتی ئابووری زۆربەی زۆری ولآتە پێشکەتووەکان دروست بوونی توێژ و چینی ناوەندییە کە بە داینەمۆی پێشکەوتن و بڕبڕەی پشتی ئابووری ئەندازە دەکرێت. ئەگەر سەیرێکی تری خشتەکەی سەرەوە بکەین بۆمان دەردەکەوێت کە توێژ و چینی ناوەندی داهاتەکانیان بەراورد بەگروپە هەرە دەوڵەمەندەکان ئەو جیاوازییە بنەڕەتییەی نییە. بەهەرحاڵ لە ماوەی (٣٠) ساڵدا داهاتی چینی هەژاریش زیادی کردووە. کەواتە دەتوانین بڵێین بوونی توێژی چینی ناوەندی لە پێکهاتەی کۆمەلآیەتیدا زۆر پێویست و گرنگە، حکوومەت پێویستە زەمینە خۆشبکات بۆ دروستبوونی چینی ناوەندی بە تایبەتی لە ولآتە تازە پێشکەوتووەکاندا چونکە بوونی چینی ناوەندی لە کۆمەڵگادا واتە گەرەنتی پێشکەوتن و گەشەی ئابووری.

**فەرهەنگی ئابووری**

دابەش کردنی داهاتی نەتەوەیی: بریتییە لە بەشی هەر گروپ و تاکە کەسێك لە کۆی دەستهاتی نەتەوەیی.

جارێکی تر دابەشکردنەوەی داهاتی نەتەوەیی: بریتییە لە دابشکردنەوەی دەستهاتی نەتەوەیی لە ڕێگەی پرۆگرامە کۆمەلآیەتییەکانی حکوومەتەوە.

تکایە دابەشکردن و دابەشکردنەوەی دەستهاتی نەتەوایەتیتان لێ تێك نەچێت.

## بۆچی داهات و دەستکەوتەکان بە ناهاوسەنگی و نایەکسانی دابەش دەکرێت؟

هەندێ فاکتەری گرنگ بوونەتە هۆی دابەشکردنی داهات بەشێوەیەکی نایەکسان ئەو فاکتەرانەش بریتین لە:

- گۆڕانکاری لە سیفەتی کارکردندا.
- زۆر بوونی ژمارەی کادری زانستی و خوێندەوار.
- گۆڕانی پێکهاتەی خێزان.

ئێستاکە هەریەك لەوفاکتەرانەی سەرەوە بە جیا سەیردەکەین:

**- گۆڕانکاری لە سیفەتی کارکردندا:**

لەفەسڵی نۆهەمدا بە دووروودرێژی باسمان لەجیاوازی داهـاتی کارمەنـدان و کرێکـاران کـرد بەپێی ئەندام بوونیان لە سەندیکاکاندا، ئەندامەکان داهاتیـان (کرێـی کـار)یـان بـەرزترە وەك لەوانەی کە ئەندام نین. ئەمەش بۆتە هۆی نزمی داهاتی ملیۆنەها ئیشکەر ئەمـە لەلایەکـەوە، لەلایەکی ترەوە سەرکاران ئامادەنین کرێی کاری بەرز بـدەن. بۆیـە هـەوڵی گەڕانیانـە بـە دوای ئەوکارکەرانەی کە ئامادەن بە کرێیەکی نزمتر کاربکەن، ئەمـەش دەبێتـە هـۆی بلاوبوونـەوەی بێکاری لەنێوان ئەو کارمەندانەی کە هەڵگری بڕوانامەی خوێندنی باڵاْ بەتایبەتی لـە کـەرتی خزمەتگوزاریدا، هەروەك ئاشکرایە کەرتی خزمەتگوزاری رۆژ بە رۆژ بەرەو زیادبوون و فراوانـی دەچێت، ئەمڕۆکە کۆمپانیا گەورەکان کەرتی بەرهەمهێنانیان لەو ولاْتانە دەکەنەوە کـە کرێـی کار زۆر نزمترە لەچاو ولاْتە ئەوروپییەکاندا. بۆ نموونە بەرهەمهێنـەرەکانی ئۆتۆمۆبیـل کـەرتی بەرهەمهێنانیان لە ولاْتەکانی وەك، مەکـسیك ومالیزیـا و چـین,...هتـد. کردۆتـەوە، کەواتـە گۆڕینی سیفەتی کار هۆیەکی سەرەکییە لە نایەکسانی داهاتەکاندا.

**- زۆربوونی ژمارەی کادری زانستی و خوێندەوار:**

جگە لەوەی مرۆڤەکان جیاوازن لە توانا و بیر و هۆشدا، بەلاْم دەرگای هەل و مەرجەکان لە بەردەم هەموو کەسێکدا کراوەیە. ئەمڕۆ کەزۆربەی زۆری کەرتـە ئابوورییـەکان پێویـستییەکی زۆریان هەیە بە پسپۆرانی وەك پارێزەر، یاسا ناسان، ئابووریناسان، پسپۆرانی کەرتی دارایـی و کۆمپیوتەر و بەرنامەڕێژ,...هتد. بێگومان کرێی کار و دەرماڵەی ئـەو کەسـانەی کەهـەڵگری بڕوانامەی خوێندنی باڵاْن یان پسپۆڕن لەبوارێکی دیاریکراودا هەمیشە زۆرترە لـە کارکـەرێکی ئاسایی ئەمەش هۆیەکی ترە لە نایەکسانی دابەشکردنی داهاتەکان.

لەخشتەکەی خوارەوەدا کرێی کاری چەند گروپێك نیشان دەدەین کـە پلەیـەك لـە پلـەکانی خوێندنیان تەواو کردووە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.



**خشتەی ژمارە (٥-١١) داهاتی ناوەنـدی بـە (دۆلار) لـەنێوان ئـەو گروپانـەی کـە پلـەی خوێندنیان تەواو کردووە ساڵی (٢٠٠٠).**

| | پیاو | ژن |
|---|---|---|
| تەواونەکردووی قۆناغی ئامادەیی | ٢١٦٠٠ | ١٢٣٠٠ |
| تەواوکردووی قۆناغی ئامادەیی | ٣٢١٠٠ | ١٧٧٠٠ |
| تەواونەکردووی خوێندنی باڵاْ | ٤٠٢٠٠ | ٢٣٥٠٠ |
| هەڵگرانی بڕوانامەی خوێندنی باڵاْ (زانکۆ) | ٤٢٤٠٠ | ٢٥٢٠٠ |
| هەڵگرانی بڕوانامەی بەکالۆریۆس | ٦١٢٠٠ | ٣٢٨٠٠ |
| هەڵگرانی بڕوانامەی ماجیستێر | ٧١٨٠٠ | ٤٢٧٠٠ |
| هەڵگرانی بڕوانامەی دکتۆرا | ٩٨٨٠٠ | ٦١٣٠٠ |
| پرۆفیسۆرەکان | ١١٩٠٠٠ | ٥٩٥٠٠ |

لە خشتەکەی سەرەوەدا جیاوازییەکی بەرچاو بەدی دەکەین لـەنێوان داهـاتی پیـاو و ژنـدا (نێرینە و مێینە)، بەلاْم چ داهاتی پیاو یان ژن بەپێی بەرزی پلـەی زانـستی و خوێنـدن زیـاتر دەبێت. پیاوانی هـەڵگری بڕوانامـەی بـەکالۆریۆس بـە ریـژەی (٩٠٪) داهاتیـان زیـاترە وەك لەداهاتی ئەوانەی کەتەنها قۆناغی ئامادەییان تەواو کردووە. بەلاْم ژنانی هـەڵگری بڕوانامـەی بەکالۆریۆس تـەنها بەرێـژەی (٨٥٪). هـەڵگرانی بڕوانامـەی دکتـۆرا (٧٢٢٠٠) دۆلار زیـاتر وەردەگرن لەساڵێکدا وەك لەوانەی تەنها قۆناغی ئامادەییان تەواوکردووە. ئەمەش دەبێتە هۆی نایەکسانی دابەشکردنی داهات.

**- گۆڕانی پێکهاتەی خێزان:**

یەکێك لەفاکتەرە گرنگەکانی تر کە کاریگەرییان هەیـە لەسـەر نایەکـسانی دابەشـکردنی داهات باری خێزانە. زگورتییەکان یان ئەوانەی لەحاڵەتی جیابونەوەدان، یان ئەو ئافرەتانەی کە

شوویان نەکردووە یان تەڵاق دراون داهاتیان کەمترە وەك لەوانەی کە لەحاڵەتی پێکەوە ژیانـدان واتە (خێزان) بۆ زیاتر روون کردنەوە سەیری ئەو خشتەیەیی خوارەوە بکە.

خشتەی ژمارە (٦-١١) باری خێزان لەساڵەکانی (١٩٧٠-٢٠٠٠) ملیۆن_خێزان.

| | ١٩٧٠ | ٢٠٠٠ | جیاوازی ڕێژەکان |
|---|---|---|---|
| ژمارەی هەموو دانیشتوان | ٢٠٣ | ٢٨٢ | ٣٩٪ |
| ژمارەی خێزانەکان | ٦٣ | ١٠٥ | ٦٧٪ |
| ژمارەی ناوەندێتی تاکەکانی خێزان | ٣,٢ | ٢,٧ | ١٥,٦٪- |
| ژمارە لە حاڵەتی خێزانیدا | ٤٥ | ٥٥ | ٢٢٪ |
| ڕێژەی خێزانەکان لەچاو هەموو دانیشتواندا | ١٩,٥٪ | ٢٢,٢٪ | - |

ئەگەر بەسەرنجەوە سـەیری خـشتەکەی سـەرەوە بکـەین دەبیـنین ژمـارەی دانیـشتوان لەساڵی (١٩٧٠) تاکو ساڵی (٢٠٠٠) بەرێژەی لە (٣٪) زیادی کـردووە. بـەڵام ژمـارەی ئەوانەی خێزانیان پێکهێنـاوە تـەنها بریتییـە لـە رێـژەی (٢٢٪) چـونکە لـە (ویلایەتـە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا) لەتەمەنێکی دواکەوتوودا خێـزان پێکـدەهێنن, بـەڵام رێـژەی زیادبوونی خێزان بەگوێرەی ژمارەی هەموو دانیشتوان بریتییە لەرێـژەی (٦٧٪). کەواتـە ئەگەر سەرجەم داهات دابەشی ژمارەی خێزانەکان بکەین ئەوا داهاتی ناوەندی تاکەکـەس کەم دەبێتەوە. لەحاڵەتی جیابوونەوەدا ئەگەر ئەو خێزانـە منـداڵیان نـەبێت ئەوکاتـە لـە دابەشکردنی داهاتدا وەك دووخێزان ئاماردەکرێن ئەمەش جارێکی تر دەبێتـە هـۆی کـەم بوونـەوەی داهـات بـە واتایـەکی تـر چـەند خێـزان داهاتیـان کـەم بێـت ئـەوا لـەکاتی جیابوونەوەدا داهاتیان زیاتر کەم دەبێت، بۆیە لەخێزانە هەژارەکاندا حاڵـەتی جیابوونـەوە کەمترە وەك لە خێزانە دەوڵەمەندەکان.



## رۆڵی حکوومەت

هەروەك لەپێشەوە ئاماژەمـان پێـدا حکوومـەت رۆڵێکـی گـرنگ دەگێرێـت لەچـالاکی و جموجۆڵی ئابووریدا, رادەی دەستتێوەردانی حکوومەت لەکاروباری ئـابووری بـەپێی سیـستەمە ئابوورییـەکان دەگۆڕێـت، بـەڵام لـە هـەموو سیـستەمەکاندا ئـەرکی سـەرەکی حکوومـەت پێشکەشکردنی باشترین خزمەتگوزارییە بۆ هاولاتیان. حکوومـەت بـەهۆی چـەندان ئـامراز و مێتۆدەوە دەتوانێت کاریگەری لەسەر بارودۆخی ئابووی بکات، ئەو ئامرازانەش بریتین لە:

- سیستەمی باج.
- پرۆژە و پرۆگرامە کۆمەلایەتییەکان.
- بەرنامە و پرۆگرامی گەشەکردنی ئابووری.
- کۆنترۆڵ کردنی پرۆسە ئابوورییەکان.

لە خوارەوە هەریەك لەو ئامرازانە بە جیاجیا باس دەکەین.

**- سیستەمی باج:**

زۆربەی حکوومەتەکان بەتایبـەتی لـە ولاتـە پێـشکەوتووەکان، سیاسـەتی بـاج وەرگـرتن بەشێوەیەك دادەڕێژن کە لەفەرهـەنگی ئابووریـدا پێـی دەگوترێـت (بـاجی کاریگـەر). بـەپێی بەرزبوونەوەی داهات بڕی باج زیاددەکات بەهۆی ئەم جـۆرە باجـەوە حکوومـەت جـارێکی تـر دەستهاتی میللی دابەش دەکاتەوە. بۆ نموونـە بـڕی ئـەم باجـە لـە ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمەریکا بریتییە لە رێژەی (١٥٪) تاکو رێژەی (٣٩٪) زۆربەی زۆری دانیـشتوانی ئەمـەریکا پشتگیری لەو جۆرە سیاسەتە دەکەن. چونکە دەزانن حکوومەت بەهۆی ئەو باجەوە جارێکی تر دەستکەوتی نەتەوایەتی دابەش دەکرێتەوە و بەشێکیان بەردەکەوێتەوە.

**فەرهەنگی ئابووری**

باجی کاریگەر: بەپێی بڕی زیادبوونی داهات بڕی باج زیـاد دەکـات. بـۆ نموونـە لەهەنـدێ ولات ئەگەر بڕی داهاتی ساڵانە لەئاستی (٢٠٠٠٠) دۆلاردا بێت ئەوا رێژەی باج بریتی دەبێت لـە (١٥٪). بـەڵام ئەگـەر بـڕی داهـاتی سـالانە لـە سـەر و (٢٠٠٠٠)دۆلارەوە بێـت تـاکو (٣٥٠٠٠)دۆلار لەساڵێکدا ئەوا رێژەی باج بریتی دەبێت لە (٢٠٪) بەوشێوەیە بڕی باج بـەپێی زیادبوونی داهات زیاد دەکات. لەزۆربەی ولاتە سکەندەنافییەکان بەتایبەتی سوید بـڕی بـاجی کاریگەر لەسەر داهاتی بەرز دەگاتە رێژەی (٦٥٪).

**- پرۆژە و پرۆگرامە کۆمەڵایەتییەکان:**

حکومەتەکان لە ڕێگەی پرۆژە و پرۆگرامە کۆمەڵایەتیەکانەوە پشتگیری و یارمەتی هاوڵاتیان و خێزانە کەم دەرامەتەکان دەدات لەشێوەی یارمەتی ماددی ڕاستەوخۆ یان لاوەکی یان لەشێوەی فۆرمی خواردن و ئازووقەدا وەك (عێراق)، یان لەشێوەی بڕێکی دیاریکراو پارە بۆ بێکارەکان، چارەسەرکردنی بە خۆرایی، خوێندن بەخۆڕایی....هتد. بەمەش دەوترێت جارێکی تر دابەشکردنەوەی داهاتی نەتەوەیی، لەپێناوی زیاتر یەکسان کردنی بڕی داهاتە جیاوازەکان. بەرزترین ڕادەی یارمەتی کۆمەڵایەتی لە نێوەند وڵاتە پێشکەوتووەکاندا وڵاتانی سکەندەنافیە.

**- بەرنامە و پرۆگرامی گەشەکردنی ئابووری:**

بەرنامەو پرۆگرامە ئابووریەکان بەشێکە لەسیاسەتی ئابووری حکومەت بۆ پشتگیری کردن لە کاسبکار و سەوداکار و بازرگانە ناوەنجی و بچووکەکان. لەڕێگەی دانی قەرز بەرێژەی سوودێکی کەم، وەهەروەها بەسەرفرازکردن لەهەندێ باج و پیتاکی حکوومی، کردنەوەی خولی فێرکردن، دیالۆگی هەمیشەیی بۆ چارەسەرکردنی داواکانیان لەزۆربەی وڵاتاندا حکوومەت بەهۆی ئەم ئامرازەوە هەوڵی دروستکردن و فراوانکردنی چین و توێژی ناوەندی دەدات.

**- کۆنترۆڵ کردنی پرۆسە ئابوورییەکان:**

سیاسەتی ئابووری حکومەت بەشێوەیەکی سەرەکی بریتییە لە کۆنترۆڵ کردنی دیاردەی هەلاوسان، کەم کردنەوەی بێکاری، چاودێریکردنی نرخی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان لەبازارەکاندا. کۆنترۆڵ کردنی کۆمپانیا مۆنۆپۆڵە ناوخۆییەکان...هتد، لەفەسڵی دوانزەهەم و سیانزەهەمدا بەشێوەیەکی دوور و درێژ باس لە ڕۆڵی حکوومەت لەسەر پرۆسەی ئابووری دەکەین.

## هەندێ زانیاری زیاتر دەربارەی دەوڵەمەندی و هەژاری

پێش ئەوەی کۆتایی بەم فەسڵە بهێنین دەمانەوێت ئاماژە بەچەند زانیارییەکی تری گرنگ بدەین. جگە لەو فاکتەرانەی سەرەوە چەند فاکتەرێکی گرنگی تر کاریگەری ڕاستەوخۆیان هەیە لەسەر باری هەژاری و دەوڵەمەندی کە بریتین لە:

- جۆری خەرجییە سەرەکییەکانی دانیشتوان.
- وەرگرتنی قەرز و قەرزاری.



- سوودی دیاردەی هەلاوسان.

ئێستاکە هەریەك لەو فاکتەرانە ڕوون دەکەینەوە:

**- جۆری خەرجیە سەرەکییەکانی دانیشتوان:**

خەرجیە سەرەکییەکانی دانیشتوان چەند جۆرێکی هەیە لەوانە خەرجی بۆ کڕینی کاڵا درێژ خایەنەکان، خەرجی بۆ کڕینی کاڵا کورت خایەنەکان، خەرجی لەبەکارهێنانی خزمەتگوزارییەکاندا. لەخشتەکەی خوارەوەدا پێکهاتەی خەرجیە گشتییەکانی دانیشتوانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نیشان دەدەین.

خشتەی ژمارە (٧-١١) پێکهاتەی جۆری خەرجیە گشتییەکانی دانیشتوانی ئەمەریکا بەپێی نرخی ئاستەکی (ملیۆن دۆلار)

| جۆری خەرجییەکان | ١٩٧٧ | ١٩٩٣ | ڕێژەی ناوەندێتی ساڵانەی گەشەکردن ساڵی ١٩٧٧ بۆ ١٩٩٣ | پێشبینی کردن بۆ ساڵی ٢٠٠٥ | پێشبینی کردنی ڕێژەی ناوەندێتی ساڵانەی گەشەکردن ١٩٩٣ بۆ ٢٠٠٥ |
|---|---|---|---|---|---|
| خەرجی لەکڕینی کاڵای درێژخایەن | ٢٨٠ | ٤٩٠ | ٤,٧ | ٧٤٦ | ٤,٤ |
| خەرجی لەکڕینی کاڵای کورت خایەن | ١٠٧٩ | ٨٢٠ | ٢,٠ | ١٢٩٩ | ١,٧ |
| خزمەتگوزاری | ١١٩٧ | ١٨٩٠ | ٣,٦ | ٢٥١٠ | ٢,٧ |
| کۆی هەموو خەرجییەکان | ٢٢٩٧ | ٣٤٥٩ | ٣,٢ | ٤٥٥٥ | ٢,٦ |

لە خشتەکەدا دەبینین بڕی خەرجی لەبواری خزمەتگوزارییدا زیاترە وەك لەبوارەکانی تردا بەتایبەتی لەشێوەی (کرێی نیشتەجێ بوون، ئاو و کارەبا و ئاوەڕۆ، تەندروستی، هاتووچۆ، خوێندن,...هتد). لەپلەی دووەمدا خەڵکی خەرجی دەکەن لەکڕینی کاڵا کورتخایەنەکان وەك (ژەمە خواردنی ڕۆژانە، کڕینی جل و بەرگ و پۆشاك، پێویستیەکانی تر,....هتد). لەپلەی سێهەمدا خەرجی دەکرێت بۆ کڕینی کاڵا درێژخایەنەکان وەك (کڕینی ئۆتۆمۆبێل، پێداویستییەکانی ناوماڵ، کۆمپیوتەر....هتد). (کڕینی خانووبەرە لە خشتەکدا ژمێر

نەکراوە﴾ هەرچەندە بڕی خەرجی بۆ کڕینی کاڵا درێژخایەنەکان کـەمترە لـەجۆرە خەرجیـەکانی تر, بەڵام ڕێژەی گەشەکردنی لە هەموو جۆرەکانی تر بەرزترە. کاتێك داهات کەم دەبێتەوە ئەوا خەرجی لە بەکارهێنانی کاڵا کورت خایەنەکاندا (تەمەن کورتەکان) زۆرتر دەبێت، کەواتە بـڕی پاشەکەوتکردن و کڕینی کاڵا درێژخایەنەکان (تەمەن درێژەکان) کەم دەبێتەوە.

**- وەرگرتنی قەرز و قەرزاری:**

لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا حکوومەت لەرێگەی بانکی ناوەندییەوە سیاسەتی سوودی قەرز بەشێوەیەك دادەڕێژێت کە بانکە بازرگانییەکان و تایبەتەکان بتوانن قەرزی درێژخایەن بدەن بـە دانیشتوان بۆئەوەی بتوانن (خانوو، ئۆتۆمۆبیل، پێداویستییە درێژخایـەنانی ناومـاڵ,...هتـد) بەمەش حکوومەت جیاوازی نێوان داهاتەکان کەمتر دەکاتەوە بەپێی ئامـارە جیهانیـەکان لـە (٨٠٪)ی دانیشتوانی وڵاتە پێشکەوتووەکان بەقەرز دەژین، بەڵام قەرزاری هیچ کارێـك ناکاتـە سەر پلەوپایە و خۆش گوزەرانی ژیانیان لە هەندێ وڵاتدا ماوەی قەرز دەگاتـە (٣٠ تـاکو ٥٠) ساڵ، کەواتە بەشێك لەداهاتی ساڵانە بۆ گەڕانەوەی قەرزەکان خەرج دەکرێـت ئەمـەش دەبێتـە هۆی گەشەکردنی سیستەمی دارایی و بانك.

**فەرهەنگی ئابووری**

دڵنیایی قەرزدار: بریتییە لەو متانـە مادییانـەی کـە قـەرزوەرگر دەبێـت گـەرانتی قـەرزداری پێبکات بۆحاڵەتی نەگەڕانەوەی قەرز. بەڵام لەکاتی وەرگرتنی قەرزدا بۆ کڕینی کاڵا درێژخایەنەکان قەرز بەبێ متمانە وەردەگیرێت, چونکە ئەو کاڵایە خۆی دەبێت بە متمانەی قەرزدانەوە.

**- سوودی دیاردەی هەڵاوسان:**

لەفەسڵی دەیەمدا باسمان لە هەڵاوسان و جۆرەکانی کـرد. لـەکاتی هەڵاوسـاندا بـڕی پـارە (داهات) زیاد دەکات. بەڵام ئەگەر خێرایی ڕێژەی داهات کەمتربێت لەڕێژەی بەرزبوونەوەی نرخ ئـەوا هەڵاوسـان کاردەکاتـە کەمکردنـەوەی توانـای کـڕین بـە دراوی نەتـەوەیی. ئەمـەش کاریگەرییەکی نێگەتیڤانەی دەبێت لەسەر داهاتی گروپە داهات بەرز و ناوەنجییـەکان، چـونکە لەو حاڵەتەدا نرخی خانووبەرە (موڵك)و شەیرەکان بەرزدەبێتەوە. بەڵام کـارێکی ئـەوتۆ ناکاتـە سەر گروپە داهات نزمەکان واتە گروپە هەژارەکان، چونکە ئەو گروپانـە نـە خـاوەنی موڵـك و شەیرن بۆ ئەوەی دانیشتوان و سەرمایەگوزارەکان تووشی دڵەڕاوکێ نەبن حکوومەت پێویـستە هەوڵی هاوسەنگ کردنی بازاڕی دراو بدات. ئەویش بەهۆی جێگیرکردنی نرخ و کەمکردنـەوەی بێکاری, ئەوکاتە خەڵکی متمانە دەکەن بە دراوی نەتەوەیی.



بێگومان دیاردەی هەژاری و کەم دەرامەتی دیاردەیـەکی کوشـندەیە کـە چـەندان ئاکـامی کۆمەڵایەتی نێگەتیڤانەی لێدەکەوێتەوە، وەك بەرزبوونەوەی ڕادەی نەخۆشی، دزیـن، کوشـتن و بـڕین، زیـادبوونی بـەکارهێنانی مـاددە بـێ هۆشـکەرەکان، تێکـچوون و جیابوونـەوەوی خێزانەکان,...هتد. بۆیە ئـەرکی سـەرەکی حکوومـەت لـەناوبردن و کەمکردنـەوەی دیـاردەی هەژارییە، بەتایبەتی لە وڵاتە تازە پێشکەوتووەکان.

**فەرهەنگی ئابووری**

- باج Tax: پارەیەکی سەپێنراوە دەوڵەت بەپێی ئەو دەسەڵاتەی کەهەیەتی بەسەر خەڵکدا وەریدەگرێت، ئەمەش بەمەبەسـتی هێنانـەدی ئـەو ئامانجـە ئـابووری و کۆمەڵایەتیانـەی کـە لەپێناوی هێنانەدییاندا هەوڵ دەدات.

هەرە جۆرو شێوە گرنگەکانی باج بریتییە لە:

| | |
|---|---|
| - باجی قازانج (قازانجانە) | Profit Tax |
| - باجی قازانجی دەراوێتە | Excess Profit Tax |
| - پاشانگانە | Inheritance Tax |
| - زەوییانە | Land Tax |
| - بەرهەمانە | Production Tax |
| - خەرجیانە | Expenditure Tax |
| - باجی دەرامەتی گشتی | General Revenue Tax |
| - میراتانە | Estate Duty |
| - باجی هەڵکشاو | Progressive Tax |
| - باجی داشکاو | Degressive Tax |
| - باجی گومرگی | Custom Duties |
| - سنورانە | Boarder Tax |
| - داهاتانە | Income Tax |
| - سەرمایانە (باجی سەرمایە) | Capital Levy |
| - سەرانە | Capitation Tax |
| - باجی کەسەکی | Personal Tax |
| - باجی کڕین (کڕینانە) | Purchase Tax |

| | |
|---|---|
| - باجی بەشدارگەکان (بەشگانە) | Corporation Tax |
| - ئاقارانە (ئەملاکانە) | Property Tax |
| - هاوردانە (باجی هاوردن) | Imports Tax |
| - هەناردانە (باجی هەناردن) | Exports Tax |
| - باجی بەهای دراوە پاڵ | Value Added Tax |
| - باجی فرۆتەنی | Sales Tax |
| - باجی ماڵینە (راستینە) | Imptneel |
| - بەرانە (باجی بەروبووم) | Valid Tax |
| - باجی ناڕاستەوخۆ | Indirect Tax |
| - پێوانە باج | Index Tax |
| - باجی مایەی گوێزەرەوە | Movable Property Tax |
| - بەها باج | Advolorem Tax |
| - باجی راستەوخۆ | Direct Tax |
| - باجی شاراوە (نادیار) | Hidden Tax |
| - باجی پێوەند | Proportional Tax |
| - جۆرە باج | Specific Tax |

ئێستاکە هەریەك لەو باجانە پێناسە دەکەین.

- قازانجانە:

ئەو باجەیە کە بەرێژەیەکی دیارکراو دەخرێتە سەر قازانجی ساڵانەی بەشدارگەو دەزگا بازرگانییەکان و پیشەسازییەکاندا.

- باجی قازانجی دەراوێتە:

لەکاتی شەڕدا نرخ بەشێوەیەکی ناوێزە (شاژ) بەرز دەبێتەوە، بۆیە دەزگاکان قازانجێکی دەراوێتە دێنێتەدی، ئەم قازانجە بەرێژەیەکی دیاری کراو باجی دەخرێتە سەر.

- پاشمانگانە:

باجێکە لەسەر بەرکەوتنی هەریەکێك لە نزیکەکانی مردو دەسەپێنرێت و ئەویش بەر پرسیارە بە پێوانی ئەو باجە بە دەوڵەت.

- زەوییانە:

باجی زەوی، پیتاکی زەوی.



- بەرهەمانە:

ئەو باجەیە کە لەسەر شمەکی بەرهەمهێنراوی خەرجییەکی دەسەپێنرێت، یان ئەو باجەیە کە بابەتەکەی شمەکێکی نیشتیمانییە.

- خەرجیانە:

مەبەست لەو باجەیە کە لەسەر بەکاربردن دەسەپێنرێت، چونکە رێژەیەکی گرنگ پێك دێنێت لە داهاتی خەرج کراودا، سەرەڕای خەرجی وەبەرهێنان کە لەساد و سەودایەکی تایبەتی لەگەڵ دەکرێت.

- باجی دەرامەتی گشتی:

لەهەندێ ولاتدا باج لەسەر پوختەی سەرجەمی دەرامەتی ساڵانەی پارەداری نیشتەجێی خۆجێیەکی دەسەپێنرێت و بۆ ئەم مەبەستەش داوا لەهەر پارەدارێك دەکرێ کە دەرامەتی ساڵانەی زیاتر بێت لە رادەی باج دان. ئیقرارێکی ساڵانە بە دەرامەت و سەرچاوە جیاوازەکانی پێشکەش بە دەوڵەت بکات .

- میراتانە:

باجێکە لەسەر جرِو جیازی کەسێك دەسەپێنرێت پاش مردنی و پێش دابەشکردنی لەسەر نزیکەکانی واتە بنەماڵەکەی.

- باجی هەڵکشاو:

ئەو باجەیە کە نرخەکەی بە زیادبوونی بابەتەکەی ئەویش زیاد دەکات.

- باجی داشکاو:

ئەو باجەیە کە نرخەکەی بەکەم بوونەوەی بڕی بابەتەکەی لەرادەیەکی دیاریکراو تێکڕای باجەکە کەم دەبێتەوە.

- باجی گومرگیی:

ئەو باجەیە کە دەوڵەت لەسەر شمەکی هاوردراو و هەناردراو بە رێژە و مەرجێکی تایبەتی دایان دەنێت. باجیش دووجۆرە (باجی هەناردن و باجی هاوردن) واتە هەناردانەو هاوردانە. یەکەمیان پەیوەندی بەوشمەکانەوەیە کە دەنێردرێنە دەرەوە وە دووەمیشیان پەیوەندی بەو شمەکانەوەیە کە دەهێنرێتە ناوەوە. مەبەست لە سەپاندنی ئەم باجە پاراستنی بەرهەمی نیشتیمانیی و هاندانی پیشەسازیی نیشتیمانیی و دەستکەوتنی سوودی دارایی و هەروەها بەجێهێنانی هەندێ مەبەستی کۆمەلایەتییە.

- سنوورانە:
جۆرێکە لە باج کەهەندێ جار بۆ پاراستنی پیشەسازییەکی خۆجێییەکی بەکاردێت، هەندێ جاریش دەوڵەت بۆ راستکردنەوەی تەرازووی پێدانەکەی پەنای بۆ دەبات بەتایبەتی ئەگەر کورتهێنانێکی تێدابێ.
- داهاتانە:
باج لەسەر کەسیی کارکردن و باجی گشتی لەسەر دەرامەت و باج لەسەر داهاتی ئەو کارەی کە خەڵك پێی هەڵدەستن دەگرێتەوە. وەك باج لەسەر قازانجی بازرگانیی و پیشەسازی و باج لەسەر دەرامەتی سەرمایەی گوێزەرەوە و باج لەسەر پیشەی ئازاد.
- باجی سەرمایە:
بریتییە لەو باجەی کە لەهەمان سەرمایە وەردەگیرێ نەك لە قازانجەکەی.
- سەرانە:
ئەم جۆرە باجە لە کۆمەڵگە کۆنەکان لەسەدەی ناوەڕاستدا باو بوو کە بە دوو شێوە وەردەگیرا.
١- دانانی هەمان بڕ بەبێ رەچاوکردنی داهات و بەکاربردن و سامان و بارودۆخی باج دەرەکە.
٢- خەڵك دابەش دەکرانە سەر چەند چینێك، هەر چینێکیش بڕێکی جیاوازی لێ وەردەگیرا.
- باجی کەسەکیی:
ئەم جۆرە باجە بەگوێرەی باری کۆمەڵایەتی و ئابووری باجدەر دادەنرێ، وەك کەمی لەسەر خاوەن خێزان لەچاو بێ خێزاندا، یان کەمی لەسەر داهات و سەرمایەی بچووك لەچاو داهات و سەرمایەی زۆر گەورەدا.
- باجی کڕین:
باجێکی ناڕاستەوخۆیە لەناو نرخی ئەو شمەکانەی کە لە بازاڕی هەندێ وڵاتاندا دەفرۆشرێت بەدیدەکرێت. ئەمەش بەچەند رێژەیەکی جیاواز لەسەر شمەکە جیاوازەکاندا دەسەپێنرێت.
- باجی بەشدارگەکان:
ئەم باجە لەسەر قازانجی رووتی ئەو بەشدارگانە دەسەپێنرێت کە لەناو سنووری وڵاتێکدا کاردەکەن، ئەویش پاش دەرکردنی گشت خەرجی و تێچوونی دیکە.
- ئاقارانە (ئەملاکانە):
ئەم باجە لەسەر خانووبەرەی دروستکراو دەسەپێنرێت.
- باجی بەهای دراوە پاڵ:
باجێکە لەهەر قۆناغێکی ئاڵوگۆڕکردنی شمەك و خزمەتگوزاری دەسەپێنرێت، واتە لەبەرهێنانی کەرەستەی سەرەتاییەوە تا بەکاربردنی دوایەکیی.
- باجی فرۆتەنی:



باجێکی گشتییە لەسەر گشت شمەك و خزمەتگوزاریی بەکاربردن دەسەپێنرێت.
- باجی ماڵینە (راستینە):
لەم جۆرە باجانەدا گوێ نادرێتە باری ئابووریی و کۆمەڵایەتی باجدەر، بەڵکو تەنها سەیری ئەو مایەیە دەکرێ کە باجەکەی دەخرێتە سەر. بۆ نموونە باجی گومرکی و باجی سەپێنراو بەسەر بەکاربردن و باجی خانووبەرە.
- باجی بەروبووم:
ئەو باجەیە کە دەخرێتە سەر بەری بەرهەمی کشتوکاڵیی.
- باجی ناڕاستەوخۆ:
ئەو باجەیە کە بەسەر دەستاو دەستکردنی سامان و خەرجکردنی داهاتدا دەسەپێنرێت.
- پێوانە باج:
ئەو باجەیە کە یاسادانەر نرخەکەی دەستنیشان دەکات، ساڵە شێوەی رێژەیەکی دیارکراوی ئەو ماددەیەی کە بابەتی باجەکەیە، یان لەشێوەی گوژمەیەك لەسەر هەر دانەیەکی ئەم ماددەیە بەبێ دەستنیشانکردنی سەراپای وەرگرتنی باجەکە.
- باجی مایەی گوێزەوە:
ئەم باجە لەسەر ئەو دابەشکردنانە دەسەپێنرێت کە بەشدارگەی هاوئەرك و راسپاردە بە پشك و کۆمەڵەی هەرەوەزی رێکی دەخات.
- بەها باج:
ئەو باجەیە کە بەرێژەیەکی دیارکراو لەبەهای شمەك وەردەگیرێت، ئەمەش جۆرێکە لەو باجانەی کە لەسەر کەلوپەلی هاوردراو دەسەپێنرێت، بەم شێوەیە جۆرێك لەجۆرەکانی تاریفەی گومرگیی پێك دێنێت.
- باجی راستەوخۆ:
ئەو باجانە دەگرێتەوە کە لەسەر داهات و سەرمایە دادەنرێن، ئەمەش بەپێی سیابیەك بەناوی ئەو کەسەی پرساوە بە باجدان و بابەتی باج و بڕی باجەکە ئەنجام دەدرێ.
- باجی شاراوە (نادیار):
باجێکی راستەوخۆیە تێکەڵ بەنرخی کەلوپەلەکە دەبێت بەبێ ئەوەی لێی جیابکرێتەوە، وەك نرخی جگەرەو نرخی مەی خواردنەوە.
- باجی پێوەند:
ئەو باجەیە کە نرخەکەی بەگۆڕانی بابەتەکەی ناگۆڕێ.
- جۆرە باج:
باجێکی راستەوخۆیە کە بەپێی گوژمەیەکی دیارکراو لە یەکەیەکی شمەکدا دەسەپێنرێت.

# فەسڵی دوانزەهەم

## بودجەی گشتی دەوڵەت

بودجەی گشتی بریتییە لە خەملاندنی ئەو داهاتەی کەوا چاوەڕوان دەکرێ دەوڵەت دەردەستی بکات و لە هەڵسەنگاندنی ئەو خەرجە گشتییەش کـە دەوڵـەت بـۆ وەدیهێنـان و جێبـەجێکردنی ئامانجەکانی لەپرۆسەی ئابووریدا. بودجە ئامێرێکی ئابوورییە بەدەست حکوومەتەوە هەر لەسـەر بنچینە و بڕی بودجە حکوومەت سیاسەتی ئابووری نەخشە دەکێشێت.

لەم فەسڵەدا هەوڵ دەدەین بزانین حکوومەت پـارەی دەسـت دەکـەوێت وە بـە چ شـێوەیەك خەرجی دەکات، بە واتایەکی تر لەم فەسـڵدا بـاس لەبڕگـەی (G) لـە پێکهاتـەی هاوکێـشەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی دەکەین.

### ڕۆڵی حکوومەت لە سیستەمی ئابووری ئازاد (سەرمایەداری)

ڕۆڵی حکوومەت لە پرۆسەی ئابووریدا کاریگەرییەکی گـەورە و گرنگـی هەیـە لـە ڕەوت و ئاراستەکردنی هەموو چالاکییە ئابوورییەکاندا. کە بەشێوەیەکی سەرەکی بریتین لە:

- ڕەخساندن و دابینکردنی خۆش گوزەرانی بۆ دانیشتوان.
- چاپکردنی دراوی نەتەوەیی.
- سەقامگیرکردنی سیستەمی ئابووری و چەسپاندن و جێبەجێ کردنی یاسا.

ئێستاکە هەریەك لەو ئەرکانەی سەرەوە بەجیا باس دەکەین.

**- ڕەخساندن و دابینکردنی خۆشگوزەرانی بۆ دانیشتوان:**

خۆشگوزەرانی هاوڵاتیان- بریتییە لە هەموو ئەو کاڵا و خزمەتگوزارییانەی کە دانیـشتوان سوودی لێوەردەگرن وە بەکاری دەهێنن بەبێ هیچ بەرامبەرو خەرجییەکی ڕاستەوخۆ، بۆ نموونە پارێزگاری سنووری دەوڵەت، دەزگاکانی ئاسایـشی دەرەکـی ڕێگاوبـان و سـەدەکان، ترافیـك، ئاوهەوا و ژینگەی پاك,....هتد، حکوومـەت لەڕێگـەی بودجـەی گـشتییەوە ئـەو خەرجیانـە دەکات، کەواتە دابینکردنی ئاسایش و خۆشگوزەرانی ئەرکی سەرەکی حکوومەتە.



**فەرهەنگی ئابووری**

خۆشگوزەرانی دانیشتوان: بریتییە لە بەکارهێنانی کاڵا و خزمەتگوزارییە پێویـستییەکانی خەڵکی بەبێ هیچ خەرجییەکی ڕاستەوخۆ. خزمەتگوزارییـەکانی کـە حکوومـەت پێـشکەشی دەکات دەبێت دانیشتوان هەموو وەك یەك وە بەیەکسانی و ئاسانی سوودی لێ وەربگرن.

**- چاپکردنی دراوی نەتەوەیی:**

چاپکردنی دراوی نەتەوەیی و کۆنترۆڵ کردنی بڕی پارەیە یەکێکە لە ئەرکـە سـەرەکییەکانی حکوومەت. وە هەروەها وەرگرتن و کۆکردنەوەی باج، ئەگەر کـۆی باجـەکان کـەمتر بێـت لـە خەرجییە گشتییەکانی حکوومەت ئەوا کورتهێنانی بودجە ڕوودەدات، بۆیە حکوومـەت ناچـار دەبێت پەنابەرێتە بەر قەرز (قەرزی ناوەکی و دەرەکی). لە فەسڵی سیانزەهەمدا بەدرێژی بـاس لە کورتهێنانی بودجە و چارەسەرەکانی دەکەین.

**- سەقامگیرکردنی سیستەمی ئابووری و چەسپاندن و جێگیرکردنی یاسا:**

بێگومان هەموو حکوومەتەکان هەوڵی سەقامگیری و چەسپاندنی یاسـاو ئـارامی و ئاسـایش دەدات لەپێناوی گەشەکردن و دابینکردنی خۆشگوزەرانی بۆ دانیشتوان. چونکە ناسەقامگیری باری ئابووری دەبێتە هۆی گەرەلاوژێ و ناارامی و شێواندنی ئاسایشی وڵات. ئەگەر سەیری لاپەڕەکانی مێـژوو بکـەین دەبیـنین هـۆی سـەرەکی ڕمانـدنی ئیمپراتۆرییـەکان و حکوومەتـەکان بـەهۆی ناسەقامگیری باری ئابوورییەوە ڕوویانداوە. ڕمانـدنی یـەکێتی سـۆڤیەت باشـترین نموونەیـە. جگـە لەوەش ئەرکێکی تری سەرەکی حکوومەت چاودێری و ڕێکوپێك کردنی میکانیزمی دارایییە.

**ئاگاداری**

ڕێسای ئابووری ئازاد واتە هێزی یاسای (داوا و خستنەڕوو) بەڵام ئەمە مانـای ئـەوە نییـە کە حکوومەت بەتـەواوەتی بەشـێوەیەکی خۆڕسـك بـازاڕ ئازادبکـات. چـونکە بـەرەڵاکردن و ئازادکردنی بازاڕ بەشێوەیەکی ڕەها واتە گەڕەلاوژێ. بەپێی ئامارەکـان ئـەوەتا ئەمڕۆکـە ئـەو وڵاتانـەی کـە دامەزرێنـەر و پابەنـدی سیـستەمی ئـابووری ئـازادن بەشـێکی زۆری کەرتـە ئابوورییەکان لەلایەن حکوومەتەوە کۆنترۆڵ دەکرێـت، بـۆ نموونـە لەویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکا لـە (٢٨٪) کەرتـە ئابوورییـەکان حکـوومین، بەشـی حکوومـەت لـە کەرتـە ئابوورییەکانی ئەڵمانیا، فەرەنسا و ئیتالیـادا بریتییـە لـە (٤٠٪) تـا (٥٠٪)، لـە بـەریتانیا بریتییە لە (٤٥٪).

## ئامادەكردنی بودجەی گشتی

هەر ولاٚتێك یاسای تایبەتی خۆی هەیە بۆ بودجەی گشتی، لەو یاسایەدا ساڵی دارایی لە ولاٚتەكەدا دەستنیشان دەكرێت. بۆ نموونە لە عێراق هەموو ساڵێ لەرۆژی یەكەمی كانونی دووەمدا دەست پێدەكات لە (٣١)ی كانونی یەكەمی هەمان ساڵدا تەواو دەبێت. ئامادەكردنی بودجە پرۆسەیەكی بەردەوام و هەمیشەییە. لەسەرەتاوە وەزارەتی دارایی بلاٚوكراوەیەك بەسەر گشت وەزارەتەكانی تردا بلاٚودەكاتەوە، وەزارەتەكانیش پێویستە ئاگاداری هەموو یەكە ئیدارییەكانی خۆیان لە بچووكترین تاكو گەورەترین یەكەی ئیداری، بۆ ئەوەی پرۆژە و پێویستییەكان و خەرجییەكانی خۆیان بە بەڵگەنامە دەستنیشان بكەن و پێشكەشی بكەن.

لەقۆناغی دووەمدا ئەو پرۆژانە پلەبەپلە دەڕوات و تەتەڵە و پوختە دەكرێت و كەم و كوڕییەكانی لێ لادەدرێ تا لەوەزارەتی دارایی لە دواشێوەی خۆیدا ئامادە دەكرێ، چونكە وەزارەتی دارایی بەیارمەتی وەزارەتی پلان و نەخشەكێشان جارێكی تر ئەو پرۆژە و بەرنامە جۆربەجۆرانە تاوتوێ دەكەن لەگەڵ پلانی ستراتیژی و توانای قەوارەی بودجە دەیانگونجێنن و رێكوپێكیان دەكەن بۆ ئەوەی باشترین ئەنجامی لێ دەردەست بكات. دوای تەواوكردن و رەزامەندی تەواوەتی وەزارەتی دارایی لەسەر بودجە ئەوسا دەسەلاٚتی یاسادانان (پەرلەمان) لەرێگەی لیژنەی بودجە وە هەموو رەنووسەكانی بودجە دەخاتە بەرباس و لێكۆڵینەوە، ئەوسا كەپەرلەمان یەك بەیەك وتووێژ لەسەر بەندەكانی دەكات و ساغیان دەكاتەوە، ئەوجا بڕیاریان لەسەر دەدا بەپێی یاسای تایبەتی بودجە. ئەوسا كە بودجە دەبێتە بەرنامەی كاركردنی دەسەلاٚتی یاسای بەكارخستن، دوابەدوا قۆناغی جێبەجێكردنی بودجە دەست پێدەكات و هەموو لایەنەكان ئاگاداردەكرێنەوە و دەسەبەر دەبن بۆ بەكارهێنانی بودجەی دیاریكراو بۆیان لەچوارچێوەی ئەو ئەندازەیەی كە دەسەلاٚتی یاسادانان بۆی داناون و دەكەونە خەرجكردن. بەكارخستنی بودجە تەنها لەئەستۆی دەسەلاٚتی یاسای بەكارخستنە بەهەموو یەكەكانییەوە، دەسەلاٚتی یاسای بەكارخستن (جێبەجێكردن بەتایبەتی وەزارەتی دارایی) پێویستە بەپێی رەنووسەكانی بودجە ئامانجی پرۆژەكان مسۆگەر بكات و دارایی تەواویان بۆ دابین بكات. پرۆسەی بەكارخستن و جێبەجێكردنی بودجە پرۆسەیەكی زۆر هەستیارە، بۆ ئەوەی دیاردەی گەندەڵی روونەدات پێویستە چاودێری بەكارخستن و خەرجكردنی بەشێوەیەكی هەمیشەیی بكرێت، قۆناغی چاودێریكردن زۆر گرنگە. چاودێریكردنی خەرجكردنی بودجە راستەوخۆ لەلایەن وەزارەتی دارایی و یەكەكانییەوە جێبەجێ دەكرێت، وە هەروەها لەلایەن لیژنەی



بودجەی دەسەلاٚتی یاسادانانەوە كۆنترۆڵ دەكرێت. لەزۆربەی ولاٚتاندا هەروەها لیژنەی بالاٚی چاودێریكردن و ژمێركردن هەیە كە سنووری دەسەلاٚتیان زۆر فراوانە. چاودێریكردن و كۆنترۆڵ كردنی خەرجی بودجە بەچەند شێوەو شێوازێك دەكرێت كە هەریەكەیان تەواوكەری ئەویترن و دووبارە كردنەوەی یەكترن بۆ ئەوەی ئەگەر لەهەر شوێنێكدا كەموكورتیەك هەبێت بەدەربكەوێت و لێپرسینەوەی لەسەر بكرێت. لە هەرە جۆرە گرنگەكانی چاودێری كردنی بودجە ژمێریاریە. مەبەست لە ژمێریاری ژمێركردنی سەرلەنوێ و بەراوردی داهاتی گشتی و خەرجی گشتییە بەقۆناغی یەكەمی ئامادەكردنی بودجەوە بەشێوەیەكی ورد و درشت پێداچوونەوە و دروستی و نادروستی هەڵسوڕانی دارایی ساغ بكرێتەوە.

شێوازێكی تری كۆنترۆڵ كردنی خەرجی بودجە چاودێریكردنی ئابوورییە، ئەم ئەركەش دەكەوێتە سەرشانی وەزارەتی ئابووری و نەخشەكێشان و لیژنەی تایبەتی دەسەلاٚتی یاسادانان. مەبەست لەم چاودێری كردنەش كۆنترولكردنی ماوەی جێبەجێكردنی پرۆژەكانە ئایا كامیان تەواوبووە چەند ماوەی تر تەواو دەبێت؟ ئەرك و خەرجیان چەندبووە؟ ئایا كاروبارو پرۆسەی بەكارخستن بودجە باش بەڕێوەدەچێ یان نا؟ ئایا ئەو پڕۆژانە چ كاریگەرییەكی هەیە لەسەر باری كۆمەلاٚیەتی؟ ئەم شێوە چاودێرییە لەرێگەی وەزارەتی كار و كۆمەلاٚیەتییەوە بەئەنجام دەدرێت. هەروەك لەپێشەوە ئاماژەمان پێدا چاودێریكردن قۆناغێكی گرنگە لەكاتی ئامادەكردن و جێبەجێكردنی بودجەدا، كۆنترۆڵ و چاودێری سیفەتی ئیدارییان هەیە، بەلاٚم لەكاتی دەركەوتنی كەموكوڕی و گەندەڵیدا پێویستە دەسەلاٚتێكی سەربەخۆی دادگایی هەبێت كەدەستنیشانی تەواوەتی ژمێركردن و ژماركردنی هەموو بڕگەكانی بودجە بكات و بڕیاری كۆتایی لەسەر بدات و لایەنە تاوانبەرەكان دادگایی بكرێن و سزای یاسایی بدرێن.

ئامادەكردن و دارِشتنی بودجە تەنها پرۆسەیەكی ئابووری و دارایی نییە, بەڵكو پڕۆسەیەكی سیاسی و كۆمەلاٚیەتیشە، كاتێ دەسەلاٚتی یاسادانان (پەرلەمان) وتووێژ و لێكۆڵینەوە لەسەر بڕگەكانی بودجە دەكەن، تێبینی دەكەین هەر پارت و لایەنەكانی ناو پەرلەمان لەڕوانگەی ئایدۆلۆژی خۆیانەوە وتووێژ لەسەر ئەو بەڵگەنامەیە دەكەن. چونكە بودجە رەنگدانەوەی هەڵسوكەوتە و شێوەی دەسەلاٚت نیشان دەدات.

بودجە (بەربیج) Budget:

ئەو بروانامەیە كە سیاسەتی دەوڵەت بەژمارە نیشان دەدات و ئامرازێكی گرنگە لە پلاندانان و ئاراستەكردنی كاروباری دارایی دەوڵەت یان دەزگا لەماوەیەكی ئایندەدا. لێرەدا پێویستە نێوان بودجەی خەمڵكراو بودجەی گشتی دوایەكییی (كە پایەی دارایی راستەقینەی دەزگا پیشان دەدات) جیابكەینەوە.

جۆرەكانی بودجە بریتین لە:

| | |
|---|---|
| - بودجەی وەبەرهێنان | Budget of Investment |
| - بودجەی خێزان | Family Budget |
| - بودجەی ئاسایی | Ordinary Budget |
| - بودجەی بەرنامەكان | Program Budget |
| - بودجەی ئاڵوگۆڕی بێیانی | Foreign Exchange Budget |
| - بودجەی نەگۆڕ | Fixed Budget |
| - بودجەی كەسەكیی | Personal Budget |
| - بودجەی گشتگر | Balance Budget |
| - بودجەی فرۆتەنی | Sells Budget |
| - بودجەی داهات وخەرجییەكان | Income and Expenditure Budget |
| - بودجەی پارەی بیانیی | Foreign Exchange Budget |
| - بودجەی نەختینە | Cash Budget |

ئێستاكە هەریەك لە جۆرەكانی بودجە پێناسە دەكەین:

- بودجەی وەبەرهێنان: گشت جۆرەكانی خەرجی وەبەرهێنان دەگرێتەوە جا پارەدانەكە خۆجێیەكی بێت یان لە دەسەلاتی بالاوە بێت.
- بودجەی خێزان: بریتییە لە هاوتابوونی داهاتی نەخت و داهاتی شمەكیی خێزانێك ئەویش بەدیاریكردنی سەرچاوەكانی داهات و بەندەكانی خەرجی.
- بودجەی ئاسایی: بریتییە لە خەرجییەكانی میری و دەرامەتەكانی.



- بودجەی بەرنامەكان: بریتییە لە كردەی دابەشكردنی دەرامەتە گشتییەكان بەسەر داواكارییەكانی دەزگا میرییەكان.
- بودجەی نەگۆڕ: بریتییە لە داهات و خەرجیی كە بۆ پرۆژەیەك یان چالاكییەكی دیاریكراو ئامادە دەكرێت و ئەو گۆڕانەی كە لە قەبارەی بەرهەم و فرۆتەنیی پرۆژەكەش روودەدات بە هیچ شێوەیەك كارناكاتە سەری.
- بودجەی كەسەكیی: رێبازێكە بۆ هێنانەدی هاوسەنگیی نێوان داهات و خەرجییەكانی كەسێك.
- بودجەی گشتگر: كەشفێكی ژمێرەییە باری دارایی دەزگایەك پیشاندەدات لە ماوەیەكی دیاریكراودا.
- بودجەی فرۆتەنیی: بریتییە لە رابینینی باری چالاكی فرۆتەنیی لە ماوەیەكی دیاریكراوی داهاتوودا، ئەم بودجەیەش لە ئامادەكردنی بودجەكانی دیكەشدا پشتی پێدەبەسترێت، وەك بودجەی خەملكراوی بەرهەمهێنان و بودجەی خەملكراوی دابەشكردن و.... هتد.
- بودجەی هامبەر: بودجەی میریی ناوەندی هامبەر دەبێت ئەگەر بێتو دەرامەتە رەوەنەكانی یەكسان بێت لەگەڵ خەرجییە رەوەنەكانیدا، بەشێوەیەكی گشتی پێویستە باج لەسەر دەسكەوت و سامان و خەرجییە جیاوازەكان بایی ئەوەندە بێت كە بەشی پێوانەكان بێت.
- بودجەی داهات و خەرجییەكان: پارەی دانراو لەشێوەی بودجە كە بەپێی چەند ئامۆژگارییەكی دیاریكراودا لەلایەن ژمێریارەكانی فەرمانگە میرییەكانەوە خەرج دەكرێت.
- بودجەی پارەی بیانیی: بەڵگە نامەیەكە یان كەشفێكی هەر ژمارەییە دەرامەت و خەرجییەكانی ئابووریی نیشتمانیی بەرامبەر بەوڵاتانی دیكەدا هەڵدەسەنگێنێت كە (بودجەی ئاڵوگۆڕی دەرەكیی)یشی پێدەگوترێت.
- بودجەی نەختینە: بریتییە لە هۆیەكانی پارەداركردنی پلان بەپێی دەرامەتە داراییەكانی رابینراو رەوەكانی بەكارهێنانی ئەم دەرامەتە و هەروەها ئەو قەرزانەی كەپێویستە لەسەر دەزگا لەماوەی بەردەوام بوونی بودجەكە بیداتەوە.

## سەرچاوەی دارایی بودجە

پێكهێنانی هەر بودجەیەك پێویستی بەچەند سەرچاوەیەكی دارایی هەیە. ئەو سەرچاوانەش جیاوازن لە هەرە گرنگەكانی كۆكردنەوەی باجی جیاواز جیاواز و گومرگی حكوومەتە. بۆ

نموونە بودجەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کە بە گەورەترین بودجە پێناسە دەکرێت لـە جیهاندا لەم سەرچاوانەی خوارەوە پێك دێت.

- باجی کەسەکیی: بریتییە لە ٤٨٪
- باجی داهاتانە: بریتییە لە ١٠٪
- باجی گومرگ بەهەموو جۆرەکانییەوە: بریتییە لە ٩٪
- باجەکانی تر (باجی کڕین، فرۆتەنی، ئاقارانە، ناڕاستەوخۆ,...هتد): بریتیین لە ٣٣٪

لەوێنەکەی خوارەوەدا سەرچاوەی دارایی پێکهێنانی بودجەی ئەمەریکا نیشان دەدەین.

وێنەی ژمارە (١٢-١) سەرچاوەی دارایی پێکهێنانی بودجەی ئەمەریکا.




دەمەوێت یادی خوێنەر بێنمەوە کە بودجەی ئەمەریکا بریتییـە لـەزیاتر (٢)ترلیـۆن دۆلار سالآنە. خالێکی تری گرنگ کە دەمەوێت ئاماژەی پێبـدەم سەرچـاوەی سـەرەکی پێکهێنـانی بودجەی ولآتە دەرهێنەرەکانی نەوت بریتییە لە فرۆشتنی نەوتی خـام کـە بریتییـە لـە ڕێـژەی (٩٠٪) هەموو بودجەکە.



## خەرجکردنی (بەکارهێنانی) بودجە

جارێکی تر بودجەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا وەك نموونە دەهێنینـەوە، لەبڕگـەی پێشوودا باسمان لەچۆنیەتی پێکهێنانی بودجە کـرد، هەنووکـە بـاس لـە خـەرجکردنی بودجـە دەکەین لە ئەمەریکا:

- خەرجی بیمەی کۆمەلآیەتی: بریتییە لە ٢٣٪
- خەرجی بۆ پرۆگرامی بیمەی تەندروستی بەتایبەتی بۆ خەڵکانی بەسالآچوو: بریتییە لە ١٢٪
- خەرجی بۆ خەڵکانی کەم دەرامەت (پەروەردە و تەندروستی): بریتییە لە ٧٪
- خەرجی بۆ بێکارەکان: بریتییە لە ٦٪
- خەرجییە گشتییە کۆمەلآیەتییەکانی تر: بریتییە لە ٦٪
- خەرجییە ناڕاستەوخۆکانی حکوومەت (سوپا، چەك، ئاسایش,...هتد): بریتییە لە ١٦٪
- خەرجییە ڕاستەوخۆکانی حکوومەت (کاروباری دەرەوە، ئاسایشی نەتـەوەیی,...هتـد): بریتییە لە ١٩٪
- خەرجی بۆ دانەوەی قەرزەکانی حکوومەت: بریتییە لە ١١٪

بەهۆی وێنەکەی خوارەوە خەرجییەکانی بودجەی ئەمەریکا نیشاندەدەین.

وێنەی ژمارە (١٢-٢) خەرجییەکانی بودجەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.



له وێنەکەی سەرەوەدا دەبینین کە کۆی خەرجی حکومەت بۆ جێبەجێکردنی پرۆگرامە کۆمەڵایەتیەکان بریتییە لە (٤٢٪) کەواتە حکومەتی ئەمەریکا لەڕێگەی بودجە وە بەشێوەیەك لەشێوەکان داهاتی نەتەوەیی جارێکی تر دابەش دەکاتەوە، بێگومان ڕێژەی خەرجییەکان ساڵ بە ساڵ دەگۆڕێن. بەڵام بەشێوەیەکی گشتی گۆڕانکارییەکان ئەوەندە زۆر نینن تاکو کاریگەری قوڵ و بەرچاو بکاتە سەر بژێوی ژیانی خەڵکی جگە لەهەندێ حاڵەتی تایبەتی وەك هەڵگیرساندنی جەنگ، کارەساتە سروشتییەکان,...هتد.

## دەستەبەرکردنی پرۆگرامی کۆمەڵایەتی چییە؟

هەندێ کەس وادەزانن کە بارمەتە و یارمەتی کۆمەڵایەتی تەنها بۆ چینوتوێژە کەم دەرامەتەکانە، بەڵام لەڕاستیدا لەڕێگەی پرۆگرامە کۆمەڵایەتییەکانەوە هەموو توێژ و چینەکانی کۆمەڵ سوودی لێوەردەگرن. دەستەبرکردنی کۆمەڵایەتی پەیوەستنامەیەکە لەنێوان حکومەت و دانیشتواندا. هەرکەسێك کە بەشداری دەکات لەچالاکی ئابووریدا لەماوەی کارکردنیدا بڕێك باج دەدات تاکو لەحاڵەتی خانە نشین کردن و پەك کەوتن لە کار بڕێك پارە وەربگرێت بۆ گوزەرانی ژیانی. بۆ نموونە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەساڵی (١٩٣٥)دا کۆنگرێس (پەرلەمان)ی ئەمەریکی پرۆگرامی دەستەبر کردنی کۆمەڵایەتی لەشێوەی یاسادا چەسپاند. ئەمرۆکە (٤٤) ملیۆن کەس لە ئەمەریکا پارەی فۆندی پرۆگرامی کۆمەڵایەتی وەردەگرن. لەو (٤٤) ملیۆنە (٣٠) ملیۆن کەس خانەنشینی وەردەگرن بەهۆی تەمەنەوە، (٦) ملیۆن کەس خانەنشینی کەم ئەندامێتی وەردەگرن، (٧) ملیۆن کەس خـــــانەنشینی لەدەستدانی ئەندامی خێزانەکانیان وەردەگرن. (٣) ملیۆن کەس پارەی بێکاری و یارمەتی وەردەگرن. ئەمرۆکە لە ئەمەریکا (٩٦٪)ی کارمەندان باج دەدەن. بەواتایەکی تر حکومەت پارە لە باجدەرەکان کۆدەکاتەوە دوابەدوا دابەشی دەکاتەوە بەسەر تاکەکانی کۆمەڵدا.

ئەمرۆکە زۆربەی زۆری وڵاتە پێشکەوتووەکان تووشی تەنگەژی بوونەتەوە بەهۆی زۆربوونی ژمارەی کەسانی خانەنشینەوە، ئەم ڕێژەیە ڕۆژ بەڕۆژ لەزیادبووندایە. ئەم دیاردەیەش بۆتە هۆی سەرئێشەی ئابووریناسان وە بەدوای چارەسەرێکی گونجاودا دەگەڕێن، هەندێ لەئابووریناسان پێشنیاری ئەوە دەکەن کە پرۆگرامە کۆمەڵایەتییەکان بەتەواوەتی ئازادبکەن و بیخەنە ئەستۆی سەرکار و کارکەر، بەهەرحاڵ هەر وڵاتە بەشێوەیەك لەشێوەکان چارەسەری ئەم دیاردەیە دەکەن, بەڵام ئەمرۆکە مرۆڤایەتی پێویستی بەڕێسایەکی گونجاو و نوێ هەیە بۆ چارەسەرکردنی دیاردەی خانەنشینی.



## دام و دەزگا حکوومییەکان کە سەرپەرشتی کەرتی ئابووری دەکەن:

بێگومان حکوومەت بە هەموو یەکە ئیدارییەکانییەوە بەشێکی گرنگی چالاکییە ئابوورییەکانن، بەڵام هەندێ وەزارەت و یەکەی ئیداری بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەشداری و سەرپەرشتی کەرتە ئابوورییەکان دەکەن واتە ئەرکە ئابوورییەکانی حکوومەت جێبەجێ دەکەن. بەشێوەیەکی گشتی لەهەر وڵاتێکدا ئەم وەزارەت و یەکە ئیدارییانەی خوارەوە سەرپەرشتی کەرتی ئابووری دەکەن، لێرەدا پێکهاتەی وەزارەت و یەکە ئیدارییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەنموونە دەهێنینەوە وەك دەوڵەتێکی فیدراڵ:

- **وەزارەتی دارایی** (The Department of Treasury):

وەزارەتی دارایی گرنگترین یەکەی ئیداری حکوومییە بۆ کاروباری دارایی، ئەم وەزارەتە لە چەند دەزگایەکی گرنگ پێکدێت:

_ دەزگای باج:

(Internal Revenue Service)

ئەم دەزگایە ئەرکی کۆکردنەوەی باجە لە چوارچێوەی دەوڵەتدا، ئەم دەزگایە گەورەترین یەکەی ئیداری وەزارەتی داراییە.

_ دەزگای کۆنترۆڵی دارایی:

(Office of the Controller of the Currency)

ئەم دەزگایە کۆنترۆڵی جموجۆڵ و چالاکی و سوڕانی دارایی دەکات، هەروەها چاودێری چالاکی بانکەکان دەکات لە وڵاتدا.

_ دەزگای چاپکردنی دراو:

(Bureau of Printing and Engraving)

ئەم دەزگایە هەڵدەسێت بە چاپکردنی دراوی نەتەوەیی و چاودێریکردنی.

_ دەزگای دروستکردنی دراوی ئاسن:

(U.S Mint)

ئەم دەزگایە دراوی ئاسن دروست دەکات و چاودێری دەکات.

_ دەزگای قەرزە حکوومییەکان:

(Bureau of the Public Debt)

ئەم دەزگایە ئەرکی وەرگرتنی قەرز و دانەوەی قەرزە حکومییەکانی لە ئەستۆدایە.
ـ دەزگای بەڕێوەبردن و ئاراستەکردنی دارایی:
(Financial Management Service)
ئەم دەزگایە خەرجییە حکومییەکان لەبودجەی گشتی دیاری دەکات. هەروەها هەڵدەستێت بەچاودێرکردنی خەرجییەکان و ژمێرکردنی.
جگە لەم دەزگایانە هەندێ دەزگا و یەکە ئیداری تر لە چوارچێوەی وەزارەتی داراییدا کاردەکەن وەك:
ـ دەزگای گومرگ: (*US Customs Service*)
ـ دەزگای نهێنی چاودێری ئابووری: (*Secret Sevice*)
ـ دەزگای کۆنترۆڵکردنی بازرگانی مەی و تووتن:
(Bureau of Alcohol and Tobacco and Firearms)
- **وەزارەتی بازرگانی** (Department of Commerce):
وەزارەتی بازرگانی یەکێکە لە هەرە وەزارەتە گرنگەکان کە سەرپەرشتی کەرتی ئابووری دەکات. ئەم وەزارەتە لەم دەزگایانەی خوارەوە پێکدێت:
ـ دەزگای شیتەڵ کردنەوەی (لێکۆڵینەوەی) ئابووری:
(Bureau of Economic Analysis)
ئەم دەزگایە بە هاریکاری دەزگاکانی ئامارکردن و پلان دانان زانیاری کۆدەکاتەوە و، دوابەدوا ئەو زانیارییانە شرۆڤە دەکات و پێشنیار و پێشبینی خۆی پێشکەش بەحکومەت دەکات، ئەم دەزگایە شرۆڤەی هەموو بوارەکانی چالاکییە ئابوورییەکان دەکات.
ـ دەزگای سەرژمێری دانیشتوان:
(US Census Bureau)
ئەم دەزگایە زانیاری تەواو لەسەر دانیشتوان کۆدەکاتەوە، هەروەها پۆلێنیان دەکات بەپێی تەمەن و رەگەز و چالاکی ئابووری و سەرقاڵی خەڵکی لە کەرتە ئابوورییەکاندا.
ـ دەزگای پەتێنت و مارکی (هێمای) بازرگانی:
(Patent And Trademark Office)
ئەم دەزگایە هەڵدەستێت بە تۆمارکردنی پەتێنت و رەمزی بازرگانی لە ولاتدا.
ـ دەزگای گەشەکردنی ئابووری:
(Economic Development Administration)



ئەم دەزگایە ئەرکی دارشتن و پلان و نەخشەکێشانی ئابووری لەئەستۆدایە وە هەروەها ئەرکی دۆزینەوەی کار بۆ بێکارانیش لە ئەستۆی ئەم دەزگایەدایە, واتە ئەرکی وەزارەتی کار بەڕێوە دەبات.
ـ دەزگای بەڕێوەبردنی سەوداکارە مام ناوەندەکان (بچووکەکان):
(Small Business Administration)
ئەم دەزگایە ئەرکی یارمەتی و بەڕێوەبردن و چاودێری سەوداکار و کۆمپانیا و کارگە مام ناوەند و بچووکەکانی لەئەستۆدایە.
ـ دەزگای بەڕێوەبردنی سەوداکاری نەتەوە بچووکەکان (کەمایەتییەکان):
(Minority Business Development Agency)
ئەم دەزگایە کاری کەمایەتییەکان و دیاسپۆرەکانی (جالیە) ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە بواری ئابووریدا جێبەجێ دەکات.
ـ دەزگای بەڕێوەبردنی بازرگانی دەرەوە:
(International Trade Administration)
ئەم دەزگایە ئەرکی چاودێریکردن و جێبەجێکردنی هاوردە و ناردەی کاڵا و خزمەتگوزارییەکانی لەئەستۆدایە.
- سیستەمی یەدەکی (گەنجینەیی) فیدراڵی (Federal Reserve):
ئەم دەزگایە ئەرکی رێکوپێککردن و چاودێریکردنی چالاکییە داراییەکانی (نەختی) دەوڵەتی لەئەستۆدایە، وە هەروەها ئەم دەزگایە سیاسەتی بانکی ناوەندی دیاری دەکات لەدەستنیشان کردنی (رێژەی سوودی قەرز) وە هەروەها کۆنترۆڵی ئەو کۆمپانیانەی کە لەبواری بیمەدا کار دەکەن، لەبەشی چوارەمدا بەشێوەیەکی فراوانتر باس لە ئەرکی ئەم دەزگایە دەکەین.
- لیژنەی راوێژکارە ئابوورییەکان (Consule of Economic Advisors):
ئەم لیژنەیە رۆڵێکی زۆر گرنگ دەبینێت لە دارشتنی ستراتیژیەتی سیاسەتی ئابووری دەوڵەتدا. راوێژکارە ئابوورییەکان لەلایەن سەرۆك کۆمارەوە دەستنیشان دەکرێن, ئەم لیژنەیە پێکهاتووە لە باشترین پسپۆرانی ئابووری پێشنار و پێشبینەکانیان پێشکەش بە سەرۆك کۆمار و دەزگا حکومییەکانی تر دەکەن.
ـ دەزگاکانی رێکوپێککردن و ئاراستەی ئابووری حکومەت:
ئەم دەزگایە ئەرکی کۆکردنەوەی زانیاری و شرۆڤەکردنیان لە بواری پیشەسازی قورس و بەرهەمهێناندا لەئەستۆدایە، هەروەها ئەم دەزگایە ئەرکی کەرتی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری و پاراستنی ژینگەشی لەئەستۆدایە.
ئەو دەزگا و یەکە ئیداریانەی سەرەوە بەشێوەیەکی ناهەرەمی کاردەکەن لەسەرەوە بۆ خوارەوە وە لەخوارەوە بۆ سەرەوە.

# فەسڵی سیانزەهەم

## سیاسەتی دارایی و بودجە، گەشەکردنی ئابووری

هەروەك لە فەسڵی دوانزەهەمدا باسمان لێکرد، باج کۆکردنەوە و بڕی باج ڕۆڵێکی گرنگ و بەرچاو دەبینن لەپێکهێنانی بودجە. ئەمڕۆکە لە ولاتە پێشکەوتوو و دیموکراتەکاندا بەتایبەتی لەکاتی هەڵبژاردندا زۆربەی پارت و ڕێکخراوەکان تەنها باس لە کەم کردنەوەی باج دەکەن کەواتە باج جگە لەوەی کە ئامرازێکی ئابوورییە ئامرازێکی سیاسیشە، بۆیە حکوومەتەکان بەشێوەیەکی ورد و هەستیار مامەڵە لەگەڵ سیاسەتی باج و دارایی دەکەن، چونکە گەشەکردنی ئابووری و خۆشگوزەرانی دانیشتوان راوەستاوە لەسەر قەوارەی بودجە، چەند قەوارەی بودجە گەورە و زۆربێت ئەوا حکوومەت دەتوانێت هەموو پرۆگرامە ئابووری و کۆمەلایەتیەکانی بەئەنجام بگەیەنێت، بەلام چەند قەوارەی بودجە لاواز و کەم بێت ئەوا حکوومەت تواناکانی لەجێبەجێکردنی پرۆژەکاندا سنووردار دەبێت، ئەمیش دەبێتە هۆی نائارامی باری کۆمەلایەتی و تەنگەژی ئابووری، لەم فەسڵەدا باس لە سیاسەتی دارایی بودجە و ئاکامەکانی دەکەین وە هەروەها باس لە کورتهێنانی بودجە و قەرزی حکوومەت دەکەین, چونکە لەم سەردەمەدا قەرزی دەرەکی بۆتە گەورەترین بەربەست لە بەردەم گەشەکردن و پێشکەوتنی ئابووری زۆربەی ولاتانی جیهاندا.

## حکوومەت یەکەی بەشداری بازاڕە؟

هەرچی سیاسەتی ناوخۆی حکوومەتەکانە پابەندە بەسیاسەتی بودجەی گشتییەوە، بەواتایەکی تر سیاسەتی پێکهێنانی بودجەوە. کاتێك حکوومەت بڕیاری کەمکردنەوەی باج دەدات بێگومان هەموو توێژ و چینەکانی کۆمەڵگا دڵخۆش دەبن، بەپێچەوانەشەوە کاتێك حکوومەت بڕیاری زیادکردنی بڕی باج دەدات خەڵکی دەستدەکەن بە دەربڕینی ناڕەزایی لەشێوەی خۆنیشاندان و مانگرتندا ئەمەش کاردەکاتە سەر گەشەی ئابووری.



ئەگەر هاوکێشەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی بێنینەوە یاد (C+I+G) ئەوا کاتێك بڕگەی (G) واتە خەرجییە گشتییەکانی حکوومەت زیاد دەکات ئەوا بڕی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی زیاد دەکات. کەواتە دەتوانین بڵێین حکوومەت لەڕێگەی بودجە وە دەتوانێت بەشێوەیەکی راستەوخۆ کاربکاتە سەر بارودۆخی ئابووری ولات، کەواتە حکوومەت یەکەیەکی سەرەکییە لە پرۆسەی ئابووریدا. جگە لە کۆکردنەوەی باج و دابشکردنەوەی حکوومەت دراو چاپ دەکات و گۆڕینەوەی دراوی نەتەوەیی بەرامبەر دراوە بیانییەکان دەستنیشان دەکات وە هەروەهاحکوومەت بەهۆی سیاسەتی گومرگییەوە دەتوانێت کاریگەری راستەوخۆ لەسەر بازاڕ بکات. بە واتایەکی تر حکوومەت بەهۆی دەسەلاتییەوە دەتوانێت کاریگەری راستەوخۆ بکاتە سەر پێکهێنانی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی وە هەروەها بەهۆی دەسەلاتی داراییەوە دەتوانێت هاوسەنگی لەنێوان بڕگەکانی هاوکێشەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوایەتیدا بەدەست بهێنێت، بەیارمەتی وێنەکەی ژمارە (١٣-١) ئەم پرۆسەیە نیشان دەدەین.

وێنەی ژمارەی (١٣-١) هاوسەنگێتی بەرهەمی نەتەوەیی



لەوێنەکەی سەرەوەدا دەبینین کە هەموو بڕگەکانی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی هاوسەنگن لەخاڵی (E)دا بۆ ئاسان کردن بڕگەی (Ex. – Imp.) یەکسان دەکەین بە سفر. چەماوەی (C) خەرجییە گشتییەکانی دانیشتوان نیشان دەدات، بڕگەی (C+I) پێکەوە خەرجییە گشتییەکانی دانیشتوان و بڕی سەرمایەگوزاری نیشاندەدات. بڕگەکانی (C+I+G) پێکەوە خەرجی گشتی دانیشتوان، سەرمایەگوزاری و خەرجییە گشتییەکانی حکوومەت نیشان دەدەن. هێڵی پلەی (٤٥°) پەیوەندی نێوان خەرجی و داهات نیشان دەدات، کەواتە هاوسەنگێتی خەرجی و داهاتی بودجە نیشان دەدات. واتە کاڵا و خزمەتگوزارییە بەرهەمهێنراوەکان یەکسانن بە داوا و خواستە گشتییەکان ئەمەش واتە هاوسەنگی باری ئابووری و بودجە بەگشتی.

## جارێکی تر باج

لەوێنەی ژمارە (١٣-١)دا فاکتەری (باج)مان پشتگوێ خست، ئێستاکە هەوڵ دەدەین کاریگەری فاکتەری باج روون بکەینەوە لەسەر سیاسەتی دارایی و بودجەی حکوومەت.

زیاد بوونی باج دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی خەرجییە گشتییەکانی دانیشتوان واتە کەمبوونەوەی بڕگەی (C)ی هاوکێشەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی، بەڵام ئەگەر حکوومەت بڕی زیادکراوی باج ئاڕاستەی زیادکردنی خەرجییە گشتییەکانی حکوومەت بکات ئەوا سەرجەم بالانسی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی ناگۆڕێت، واتە داوا وخستنەڕوو هاوسەنگ دەبێت ئەمەش مانای هاوسەنگی بارودۆخی ئابووری.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە, ئایا ئەگەر خەرجییەکانی حکوومەت زیاتر بوو لەو بڕە باجەی کە حکوومەت کۆی دەکاتەوە چی روودەدات؟

ئەوکاتە کۆی گشتی خەرجییەکان و هاوسەنگی قەوارەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی کەم دەبێتەوە، بۆ نموونە گریمان حکوومەت پلانی داناوە بۆ دوورینی جلوبەرگی سەربازی بۆ وەزارەتی بەرگری، بەڵام لەبەر هەندێ هۆی تایبەتی لەو بەرنامەیە پاشگەز دەبێتەوە ئەوکاتە کوتاڵی پێویست بۆ دوورینی ئەو جلوبەرگانە نافرۆشرێت، بەرگدروو کاری نابێت ...هتد. هەموو ئەم فاکتەرانە دەبنە هۆی کەم کردنەوەی داهاتی تاکەکەس واتە توانای کڕین کەم دەبێتەوە بەمەش گەشەکردنی ئابووری لاواز و سست دەبێت، بۆیە سیاسەتی دارایی و ئامادەکردنی بودجە دەبێت بەشێوەیەك دابڕێژرێت کە توانای بالانس کردنی کەرتە ئابوورییەکانی هەبێت، ئەمەش لەفەرهەنگی ئابووریدا پێی دەوترێت سیاسەتی ئابووری



(بەرگر). لەحاڵەتی هەڵاوساندنی نرخدا، واتە کاتێك داواکان زیاد دەکەن دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی نرخ، لەم حاڵەتەدا پێویستە حکوومەت بڕی باج بەرزبکاتەوە بەبێ ئەوەی خەرجییە گشتییەکانی زیاد بکات ئەوکاتە نرخ بەرەو دابەزین دەڕوات. ئەم هەنگاوە تەنها چارەسەرە بۆ نەهێشتنی هەڵاوسانی نرخ. لەلایەکی ترەوە کاتێك بڕی باج نزم دەبێتەوە کاریگەری پێچەوانە دەکاتە سەر قەوارەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی. ئەمەش لە فەرهەنگی ئابووریدا پێی دەوترێت ئابووری (پەڕاو).

کەواتە کەم کردنەوە و زیادکردنی خەرجییە گشتییەکانی حکوومەت کاردانەوەی پێچەوانەی لەسەر کەم کردن و زیادکردنی باجە واتە کاریگەری کەمکردنەوەی خەرجییە گشتییەکان (لەحاڵەتی جێگیربوونی باجدا) هەمان کاریگەری دەبێت لەکاتی بەرزبوونەوەی بڕی باجدا، جیاوازییەکەی تەنها لەوەدایە داهاتی دانیشتوان کەم نابێتەوە واتە بڕگەی (C) لە هاوکێشەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوایەتیدا ناگۆڕێت. بەڵام بڕگەی (G) واتە خەرجی گشتی حکوومەت لە هاوکێشەکەدا کەم دەبێتەوە. ئەمەش دەبێتە هۆی لاوازی و سستی بەرهەمهێنان، لەئەنجامدا ڕێژە و بڕی هەڵاوسان کەم دەبێتەوە، بۆ زیاتر تێگەیشتن سەیری خشتەکەی خوارەوە بکە:

خشتەی ژمارە (١٣-٢) سیاسەتی دارایی و بودجەی حکوومەت:

| خەرجییەکان | باج | |
|---|---|---|
| کەم کردنەوە | زیاد بوون | ئابووری بەرگر (زیادبوونی داوا و خواستەکان) |
| زیاد بوون | کەم کردنەوە | ئابووری پەڕاو (کەم بوونەوەی داوا و خواستەکان) |

بۆ ئەوەی دیاردەی هەڵاوسان کەم بکرێتەوە پێویستە بڕی باج بەرز بکرێتەوە، بەمەرجێك دەستکەوتی حکوومەت جێگربێت یان دەبێت خەرجییە گشتییەکانی حکوومەت کەم بکرێتەوە، بەڵام بڕی باج زیاد بکرێت.

لەهەندێ حاڵەتدا کە تەنگەژی ئابووری دەستپێدەکات پێویستە حکوومەت هەندێ هەنگاوی شاز بگرێتەبەر بۆ ئەوەی ناڕەزامەندی دانیشتوان هێمن بکاتەوە. بۆ ئەمەش پێویستە لە یەك کاتدا بڕی باج و خەرجییە گشتتییەکان بگۆڕێت، واتە زیادکردنی بڕی باج و زیادکردنی

خەرجییە گشتییەکان بەشێوەیەکی کتوپڕی. دوابەدوا لەماوەیەکی زۆر کورتدا خەرجییە گشتییەکان کەم بکرێتەوە, بەلاّم بڕی باج زیادبکرێت. ئێستاکە بۆمان روون بووەوە کە حکوومەت یەکەیەکی گرنگە لە چالاکی و پرۆسەی ئابووریدا.

## کورتهێنانی بودجە - قەرزی حکوومەت

هەندێ جار لە راپۆرت و بلاّوکراوە ئابوورییەکاندا گوێمان لێدەبێت، کە فلاّنە ولاّت بەبڕی ئەوەندە ملیار دۆلار بودجەکەی کورتهێناوە، یان فلاّنە ولاّت بڕی ئەوەندە ملیار دۆلار قەرزارە ...هتد، ئەوکاتە دانیشتوانی ئەو ولاّتە یەکسەر رەشبین دەبن چونکە دەزانن کورتهێنانی بودجە دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی خەرجییەکانی حکوومەت لەجێبەجێکردنی پرۆگرامە کۆمەلاّیەتیەکاندا، وە هەروەها ئەم بارودۆخە لەلایەن پارتە ئۆپۆزسیۆنەکانەوە دەقۆزرێتەوە بەتایبەتی لەکاتی هەڵبژاردندا ئابووریناسان دەربارەی دیاردەی کورتهێنانی بودجە و قەرزەکانی حکوومەت بوون بە دوو بەشەوە یان دوو بۆچونی جیاوازییان هەیە، ئەوانەی دەڵێن کورتهێنانی بودجە و قەرزی حکوومەت کاریگەری نێگەتیڤانەیان هەیە لەسەر باری ئابووری و گوزەرانی خەڵکی بەم شێوەیە بۆچوونەکانی خۆیان روون دەکەنەوە.

- کورتهێنانی بودجە، واتە هەڵەی سیاسەتی دارایی حکوومەت، وە ناپرسیاری حکوومەت و دانیشتوان لە بەکارهێنانی خزمەتگوزارییەکان بەرامبەر ئەوەش ئامادەنین خەرجی بکەن بەڵکو بەبێ هیچ بەرامبەرێك و هەست بەلێپرسینەوە خزمەتگوزارییە گشتییەکان بەکاردەهێنن (عێراق و هەرێمی کوردستان نموونەیەکی کت ومتن).

- نادسپلین و نەبوونی نەخشە و پلانی خەرجییەکان، دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی بڕی پارە ئەمەش دەبێتە هۆی پێداویستی زیادبوونی قەرزکردن.

- بڕی رێژەی سوودی قەرزەکان دەبنە هۆی ئەوەی کە بەشێکی زۆری داهات لەشێوەی دانی سوودی قەرزەکان دەچێتە گیرفانی قەرزدەرەکانەوە، ئەمەش کاریگەرییەکی نێگەتیڤانە دەکاتە سەر خەرجی گشتی بەکاربەرەکان.

- ئەو قەرزانەی کە ئەمڕۆکە کەڵەکە دەبێت لەسەر حکوومەت، دەبێتە بارێکی قورس و گران لەسەرشانی نەوەکانی داهاتوو.

- کورتهێنانی بەردەوامی بودجە دەبێتە هۆی ئەستەنگ لەبەردەم گەشەی ئابووریدا، بە ئەندازەی کورتهێنانی بودجە گەشەکردنی ئابووریش توشی تەنگەژی دەبێت.



- هەرچی متمانە و گەرانتی حکوومەتە بۆ وەرگرتنی قەرزی گشتی و تایبەتی لە بانك و دەزگا داراییەکان دەبێتە هۆی ناهاوسەنگی و کورتهێنانی بودجە. بەلاّم لایەنەکانی تر دەڵێن کورتهێنانی بودجە و قەرزی حکوومەت هیچ کاریگەرییەکی ئەوتۆ و نێگەتیڤانە ناکاتە سەر گەشەی ئابووری، ئەوانەش بۆچوونەکانی خۆیان بەم شێوەیە روون دەکەنەوە.

- کورتهێنانی بودجە و قەرزە حکوومییەکان نابنە هۆی سستی و ئەستەنگی لەبەردەم گەشەی ئابووریدا، بەڵکو رادەی بێکاری، توانای بەرهەمهێنان، هێزی کار و بەرهەمهێنان، نرخ ...هتد. کاریگەرییان هەیە لەسەر گەشەی ئابووری، کورتهێنانی بودجە و قەرزی حکوومی زیاتر پرسیارێکی سیاسییە وەك لە ئابووری.

- قەرزە ناوخۆییەکانی حکوومەت چەند قەوارەکەی زیاتر بێت کاریگەری پۆزەتیڤانە دەکاتە سەر گەشەی ئابووری. چونکە گەڕانەوەی رێژەی سوودی قەرز لە چوارچێوەی ولاّتدا دەمێنێتەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی زیادبوونی خەرجییەکان.

- قەوارە و بڕی کورتهێنانی بودجە و قەرزی حکوومی هەمیشە کەمترە لەچاو قەوارەی زیادبوونی تێکڕایی بەرهەمی نەتەوەیی وە هەروەها زۆر کەمترە لەداهاتی دانیشتوان بەگشتی، وە هەروەها رێژەکەی زۆر کەمترە بەرامبەر سەروەت و سامانی حکوومەت، بۆیە کورتهێنانی بودجە و قەرزی حکوومی کاریگەرییەکی ئەوتۆو بەرچاو ناکەنە سەر گەشەکردنی ئابووری.

مەسەلەی کورتهێنانی بودجە و قەرزی حکوومەت، هەمیشە باسێکی سیاسییە لە سەرزاری سیاسەتمەداران، ئەگەر سیاسەت بخەینە ئەولاوە، تەنها لەڕوانگەی ئابوورییەوە لە دیاردەی کورتهێنانی بودجە و قەرزی حکوومەت بکۆڵینەوە دەتوانین ئەم دەرئەنجامانەی خوارەوە بکەین.

- قەرزە دەرەکییەکانی حکوومەت کاریگەرییەکی راستەوخۆی نێگەتیڤانە دەکەنە سەر نەوەکانی داهاتوو، چونکە سەرمایە و سەرجەمی کالاّ و خزمەتگوزارییە بەرهەمهێنراوەکان لەلایەن نەوەکانی داهاتووە بە بڕی قەرزەکان کەم دەکات، ئەمەش دەبێتە هۆی خراپ بوونی رادەی ژیانی ئەو نەوانە.

- قەرزی دەرەکی دەبێتە هۆی کەم کردنەوەی قەوارەی بەرهەمی نەتەوەیی، چونکە بە بڕی قەرزەکە داهاتی نەتەوەیی دەچێتە دەرەوەی ولاّت. بەلاّم ئەگەر قەرزی دەرەکی بەکاربهێنرێت بۆ بەرهەمهێنان و پیشەسازی ئەوا قازانج و سوودەکەی بڕەکەی زۆرترە لەچاو بڕی قەرزەکاندا، ئەمەش دەبێتە هۆی زیادبوونی داهاتی نەتەوەیی.

- کورتهێنانی بودجە بە بەردەوامی دەبێتە هۆی هەڵاوسانی هەمیشەیی، لەئەنجامدا تەنگەژی ئابووری دەستپێدەکات، وە هەروەها قەرزی بەردەوام دەبێتە هۆی لەدەستدانی بڕواپێدان لەلایەن دەزگا داراییە بیانییەکان و خۆماڵییەکان.

**فەرهەنگی ئابووری**

کورتهێنان - Deficit: بریتییە لە زیادبوونی خەرجی لەچاو دەرامەتدا بەپێی تەرازووی گشتی، یان کورتهێنانی تەرازووی پێدان بەزیادبوونی لایەنی قەرزدار لەسەر لایەنی قەرزەوەردا.

## کێ راستە؟

ئەگەر بەکورتی تاوتوێی باسەکانی پێشوو بکەین، دەبینین چەند فاکتەرێکی گرنگمان پشتگوێ خستووە کە کاریگەرییەکی راستەوخۆیان هەیە لەسەر بودجە بەتایبەتی و بارودۆخی ئابووری بەگشتی. ئەو فاکتەرانەش بریتین لە سووڕی ئابووری، زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان، کاتێك ژمارەی دانیشتوان بەرەو زیادبوون دەچێت، ئەوا دەبێتە هۆی زیادبوونی شوێنی کار، زیادبوونی پێکهێنانی خێزان کە لەئەنجامدا دەبێتە هۆی زیادبوونی داوا وخواستەکانی (بەکاربەران) وەك (خانووبەرەی نوێ، کاڵا پێداویستییەکانی ناوماڵ، نەخۆشخانە، خوێندنگا....هتد). کەواتە زیادبوونی دانیشتوان دەبێتە هۆی هاندانی چالاکییە ئابوورییەکان، ژمارەیەکی زۆرتر خەڵکی بەشداری پرۆسەی ئابووری دەکەن وە زیاتر بەرهەم دەهێنن. ئەمەش دەبێتە هۆی زیادبوونی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی، بەتایبەتی زیادبوونی برگەی (C) لە هاوکێشەی بەرهەمی نەتەوایەتیدا، وە هەروەها جموجۆڵ و چالاکی ئابووری دەبێتە هۆی خێراکردنی سوڕی ئابووری. چەند سوڕی ئابووری خێراتر بێت ئەوا داهاتی نەتەوەیی زیاتر دەبێت، واتە بارودۆخی ئابووری بەرەو گەشەکردن دەچێت، لەم حاڵەتەدا کورتهێنانی بودجە و قەرزی حکوومەت (قەرزی ناوخۆ) هیچ کارگەرییەکی نێگەتیڤانەی ئەوتۆی نابێت لەسەر گەشەسەندنی ئابووری.

# بەشی چوارەم

## پارە، بانك، سیاسەتی دارایی و نەختینەیی

سیستەمی بانك و بڕی پارە و سیاسەتی دیاری کردنی بڕی سوودی قەرز، ئامرازێکی تری گرنگە بە دەست حکوومەتەوە کە بەهۆیەوە دەتوانێت بەشێوەیەکی فراوانتر کاربکاتە سەر ڕەوشی ئابووری و ئاراستەی چالاکە ئابوورییەکان. لەبەشەکەی پێشوودا باسمان لە باج کردووە کە ئامرازێکی ئابووری گرنگ بەدەست حکوومەتەوە، لەم بەشەدا باس لەڕۆڵی پارە و ئەرکەکانی لەپرۆسەی ئابووریدا وە هەروەها باس لە سیستەمی بانك و سیاسەتی دارایی و نەختینەیی حکوومەت دەکەین. حکوومەت لەڕێگەی سیاسەتی ماڵ و داراییەوە وە سیاسەتی نەختینەکی لەڕێگەی بانکی ناوەندییەوە دەتوانێت کاریگەری تەواو لەهەموو ئەو فاکتەرانە بکات کە دەبنە هۆی لاسەنگی و تەنگەژی ئابووری.

لە فەسڵی چواردەیەمدا باس لە ڕۆڵی پارە لە سیستەمی ئابووریدا دەکەین، لەفەسڵی پانزەیەمدا باس لە بانك و سیستەمەکانی دەکەین، لەفەسڵی شانزەیەمدا باس لە سیاسەتی دارایی و نەختینەیی دەکەین.

# فەسڵی چواردەیەم

## ڕەنگی پارە

دەتوانین بڵێین پارە ئامرازێکە یان هۆیەکە دەشێت بەکاربهێنرێت لەلایەن مرۆڤەوە بۆ ریکوپێك کردن و بەکارخستن و ئاسان کردنی مامەڵە کردن و سەوداگەری لەناو خۆیاندا، پارە هۆیەکە بەهاکەی لە ئارەزووی کۆمەڵەوە وەرگرتووە، هەندێك لە ئابووریناسان پارە بە بڕوانامەیەك دادەنێن کە هەڵگرەکەی مافی ئەوەی هەیە هەموو جۆرە مایە و کارگوزارییەك و شتی تری پێ بەدەستبهێنێت، هەندەکەی تریان پارەیان بەهۆیەك داناوە کەهێزێکی بەتوانایە هەموو کەلوپەلێك و خزمەتگوزارییەك پەیدادەکات بە رادەیەك دەشێت ببێتە پێوەرێك بۆ نرخ و کرێ و بەها و خەڵکیش وەری دەگرن و مامەڵەی پێدەکەن حکوومەتیش مافی گۆڕینی هەیە.

لەڕاستیدا رۆڵی پارە (دراو) لەپرۆسەی ئابووریدا بۆتە هۆی سەرقاڵی ئابووریناسان، بەتێگەشتن لە ناوەڕۆك و ئەرکەکانی پارە دەتوانین زیاتر لەدیاردە ئابوورییەکان تێبگەین و روونیان بکەینەوە، لەم فەسڵەدا هەوڵ دەدەین بەشێوەیەکی چڕوپڕ باس لەپارە و ئەرکەکانی بکەین وە باس لەکاریگەری پارە دەکەین لە پرۆسەی ئابووریدا.

### پارە چییە؟

لەفەسڵی یەکەمدا باسمان لە چالاکی و پرۆسە ئابوورییەکان کرد کە بریتیین لە مامەڵەکردن لەنێوان خەڵکیدا لەگۆڕینەوە و بەکارهێنانی کالا و خزمەتگوزارییەکاندا بەهۆی (پارەوە)، کەواتە پارە ئامراز و فاکتەرێکی هاوبەشە لەنێوان هەموو مامەڵەکردن و سەوداکارییەکدا، هەرچی دیاردە ئابوورییەکانە بەهۆی پارەوە پێوەر دەکرێن.

پارە (دراو) دیاردەیەکی مێژووییە لەسەرەتای دروستبوونی کۆمەڵگادا مرۆڤ بیری لە پارە کردۆتەوە بۆ ئاسانکردنی پرۆسەی کڕین و فرۆشتن و تێرکردنی پێویستی و خواستەکان، دراو بە درێژایی مێژوو چەندین گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، لەسیستەمی ئاڵشتەوە گۆڕاوە بۆ دراوی شمەکی و لەوەشەوە گۆڕاوە بۆ دراوی کانزایی لەویشەوە بۆ دراوی کاغەزی (بانکەنۆت) پارە



لەهەموو سیستەمێکی ئابووریدا بەکارهاتووە، وە بەچاوێکی پڕبەهاوە سەیرکراوە, چونکە دەسەلاتی ئابووری دەولەتە وە هەروەها پارە بۆتە هۆی دروستکردنی پەیوەندییەکان لەنێوان تاکەکانی کۆمەڵگا و کۆمەڵگاکان. پارە (دراو) کارتێکە کە بەشێوەی پەسەندکردنی لەیاساوە یان نەرێتەوە وەردەگرێت. هۆی پەسەندکردنی پارە دەگەڕێتەوە بۆ بەهاکەی خۆی لەبەکارهێناندا. لەبەر ئەم هۆیە دەتوانین بڵێین پارە ئەم سیفەتانەی هەیە:

- هێزی کڕین: ئەم سیفەتە واتە توانای گۆڕینەوەی پارەیە بەدانە شمەکێك یان چەند شمەکێك وە هەروەها گۆڕینەوەی بەرامبەر خزمەتگوزارییەکان، پارە دەبێت هێزی یاسایی هەبێت بۆ کڕین و ئاڵوگۆڕ، خەڵکی دڵنیابن لەبەکارهێنانیدا.

- بەهای پارە: دەبێ پارە بەهاکەی ئاشکراو دیاریکراوبێت، لەسەر کارتەکە (بانکنۆت)ەکە بەهاکەی نووسرابێت وەکو(١ دینار، ١٠٠ دۆلار) بەم نووسینە بەهای پارە دەردەکەوێت و لە یەکدی جیادەکرێتەوە و ئەم بەهایە هێزی کڕین دیاری دەکات.

- کۆڵەگەی پارە: دەبێت پارە کۆڵەگەیەکی هەبێت کە پێکهاتبێت لە زێڕ یان هەر کانزایەکی گرانبەها یان دراوی قورس بۆ دیاریکردنی بەهاکەی.

ئەگەر پارە ئەوسێ سیفەتەی سەرەوەی تێدانەبوو لەبازاڕەکانی ئاڵوگۆڕ و ئاڵوێردا بێ بەهایە، جگە لەوسیفەتانەی سەرەوە پارە چەند ئەرکێکی گرنگی تری هەیە کە بریتین لە :

_ پارە وەك پێوەری بەها: دەربڕینی نرخی کەلوپەل و دیاریکردنی نرخەکانێتی، هاوسەنگی نرخ دروست دەکات بەگرێدانی ئەرکی پێوەری بەهاکان، ئەویش کێشی ئەو هێندە کانزایەیە کە یاسا دایناوە و یەکەی دراوی لەسەر دروستکراوە بۆ مەبەستی پێوانەی نرخ لەڕووی یاساوە ئەگەر پێکهاتەی زێڕ بۆ یەکەی دراو دابەزی ئەوکاتە نرخی هەموو کالاکان بەرز دەبێتەوە هەتا نرخەکان زیاتر هاوسەنگ بن وا لەدراو دەکات کەپێوانەی بەهاکەی باشتر بێت.

_ پارە هۆیەکە بۆ ئاڵوگۆڕ: پارە بەهۆی داڕشتەی زێڕ ئەرکی ئاڵوگۆڕ هەڵدەگرێ، خۆپەنادانی کێشی زێڕە لەهەموو کردارەکانی ئاڵوگۆڕدا، شێوەکانی داڕشتەی زێڕ جۆرو پێوانەی گونجاو وەردەگرن... ئەم سکانە لەئاڵوگۆڕدا کێشی راستەقینەی خۆیان بزر دەکەن، بەلام لەبازاڕەکاندا بە هەمان کێش و پەسەندی دەمێننەوە بەگوێرەی کێشی رەسەنی خۆیان، بۆ نموونە ئەگەر پارچە پارەیەکی زێڕ کێشەکەی (٥) گرام بێت بەماوەیەك لە مەیدانی ئاڵوگۆڕدا کێشەکەی کەم دەکات لەوانەیە ببێتە(٤,٧٥) گرام، بەلام هەر بەبڕی پێنج گرام ئاڵوگۆڕی پێدەکرێت، بۆیە حکوومەت ناچار دەبێت جۆرە سکەیەکی تر بخاتە بازاڕەوە بۆ ئاڵوگۆڕ وەکو سکەی رەمزی کە لە زیو و مس دروستکرابێت.

ـ پارە هۆیەکە بۆ کۆکردنەوە و کەڵەکە کردن: ئەگەر بەرهەمهێنەرێك شمەکی خۆی فرۆشت و شمەکێکی تری نەکڕی، ئەوا پارەکە هەڵدەگرێ، وە هەروەها قازانج کە لەئەنجامی کڕین و فرۆشتندا دەستدەکەوێت هەڵدەگیرێ، بەم شێوەیە کرداری کۆکردنەوە و کەڵەکەبوون دروست دەبێت.

ـ پارە هۆیەکە بۆ پێدان: ئەم ئەرکە لە کاتی ئاڵوگۆڕدا دەردەکەوێ بەرامبەر بەنرخی شمەك و خزمەتگوزارییەکان لەکاتی کڕین و فرۆشتندا کە پێی دەوترێت بەهای شەمەکەکان، بواری پێدان فراوانە بۆ نموونە گرێدان یان پێدانی هەموو جۆرە ئیش و کارێکی دارایی لەهەموو کاتەکاندا دراو نابێتە نێوانێك (هۆیەك) بۆ پێدانی جوڵەی شمەك (کالاٌ — دراو - کالاٌ) بەڵکو هەڵدەستێت بە جوڵەی بێلایەن لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دی، بەستنەوەی پارە بە بەهای شمەکێك شێوەیەکی تایبەتی وەردەگرێت کە پێی دەوترێت (دراوی بڕوایی) کە ئەو دراوەیە پشتگیری پارە دەکات و هۆیەکە بۆ ئاڵوگۆڕو پێدان، بەهۆی هێمای بەهای ناوەکی، بەرهەمهێنێك کە بەرهەمەکەی دەفرۆشێت بە پارە بێت یان بە کۆمپیالە، کڕیار ئەو کۆمپیالەیە بەکاردەهێنێت وەکو پارە.

ـ پارە وەك دراوی جیهانی: پارە بەکاردێت بۆ بازرگانی لەنێوان ولاٌتاندا، ئەو دراوانەی کە بەهایان نزمە ناتوانرێ بە بەهای دراوە جیهانییەکان پێوانە بکرێن، زێڕ هۆیەکی سەرەکییە بۆ کڕینی ئەو دراوە جیهانییانە یان بۆ پێدان لە بری شمەك.

**فەرهەنگی ئابووری**

پارە - Money : دیاردەیەکی مێژووییە، لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا پارە چەند ئەرکێکی گرنگی هەیە وەك تەواوکردنی ئاڵوگۆڕ و ئاسان کردنی بڕواپێدان و پاشەکەوتکردن و هەروەها بەیەکەی ژمێریاری ئابووری دادەنرێ، بەلاٌم لەکۆمەڵگای هاوبەشایەتیدا پارە ئامرازێکی ئابوورییە بەدەست دەوڵەتدا بۆ چاودێری بەرهەم دابەشکردن و ئامرازێکی ئاڵوویریشە بۆ چەسپاندنی نرخی فرۆشتنی خۆجێیەکی و کەم کردنەوەی لە مەودای دووردا.

بەشێوەیەکی گشتی پارە هۆیەکە لەلایەن مرۆڤەوە بەکاردێت بۆ رێکخستن و ئاسانکردنی سەوداگەریی و ئاڵوگۆڕکاریی لەناو خۆیاندا.

ئێستاکە دەتوانین بڵێین بە هۆی ئەو سیفەت و ئەرکانەیەوە پارە لای هەمووان پەسەندە و لەنێوان ولاٌتاندا ئاڵوویر و بازرگانی پێدەکرێت و سیاسەتێکی سەربەخۆی بۆخۆی دروستکردووە، پارە شوێنێکی بەرچاو و گرنگی هەیە لە زانستی ئابووریدا. پسپۆڕان و شارەزایانی بواری دراو



چەندین بیردۆز و لێکۆڵینەوەیان لەسەر دراو نووسیوە، ئێمە دوابەدوا هەوڵ دەدەین باس لە بارستایی و چەندێتی پارە بکەین، هەروەها باس لە خواست لەسەر دراو دەکەین وە هەروەها باس لە هاوکێشەی ئاڵوگۆڕکردنی پارە و سوڕی (خولانی پارە) دەکەین.

## بارستایی پارە!

مەبەست لە بارستایی پارە ئەو بڕە پارەیەیە کە لە ژیانی رۆژانەدا سەوداگەری و مامەڵە و ئاڵوویری پێدەکرێت، ئەویش لەشێوەی پارەی کاشدا یان لەشێوەی سپاردان لە بانکەکاندا یان هەر شێوەیەکی تری کاغەزی بەنرخدا وەك سەنەد، پشك، کۆمپیالە ...هتد، ئابووریناسان و پسپۆڕانی بواری دارایی بارستەی پارە دابەش دەکەن بەسەر چوار گروپدا:

M-١: بریتییە لە پارەی کاش کە خەڵکی رۆژانە ئاڵوویری پێدەکەن.
- پارەی سپاردراو بە بانکەکان.
- پارەی پاشەکەوت کراو.
- پارەی سپاردراو بە کڕین لەشێوەی پشکدا(شەیر).
- پارە لەشێوەی شێك یان کومپیالە.

M-٢: هەموو شێوەکانی پارەی گروپی (M-١).
- پەیوەستنامە (گرێ بەند)ی نێوان بانکە بازرگانییەکان بۆ کڕین و فرۆشتنی پارە لەرێگەی کاغەزی بەنرخەوە لەماوەی (٢٤) کاتژمێردا.
- مامەڵەکردن بەدراوی قورس لەماوەی یەك رۆژدا.
- سپاردنی پارە بە رێکخراوە داراییەکان جگە لە بانکەکان.
- سپاردنی پارە تاکو بڕی (١٠٠٠٠٠) دۆلار لە بانکەکاندا.
- بڕی بەشدارگەیی لە سندووقە دراوییەکاندا.

M-٣: هەموو شێوەکانی پارەی گروپی (M-٢).
- سپاردنی پارە لەبڕی (١٠٠٠٠٠) دۆلار زیاتر لە بانکەکاندا.
- پێوەستنامە لەنێوان بانکی ناوەندی و بانکە تایبەتەکان بۆ دەرکردن و چاپکردنی کاغەزی بەنرخ.

L: هەموو شێوەکانی پارەی گروپی (M-٣).
- کۆمپیالەی پاڵپشت کراو.

- سەنەد، سەنەدی قەرز و قەواڵە.
- کۆمپیالەی بازرگانی.
- کۆمپیالەی بانك.
- پارەی پاشەکەوت کراو لەشێوەی دراوی (قورس) ئەوروپیدا.

**هەندێ روون کردنەوە:**

- گرێ بەست لەنێوان بانکە بازرگانییەکاندا بۆ کڕین و فرۆشتنی پارە لەرێگەی کاغەزی بەنرخەوە لەماوەی شەو و رۆژێکدا. ئەم پرۆسەیە بریتییە لە پەیوەستنامە لەنێوان (قەرزدەر و قەرزدار). لەنێوان کۆمپانیاکان و بانکەکاندا بۆ ماوەی ٢٤ سەعات.

لەهەندێ حاڵەتدا کۆمپانیاکان پارەی ئازادیان هەیەو پێویستییان نییە لەوکاتەدا بەو بڕە پارەیە کاغەزی بەنرخ لەبانکەکان دەکڕن بەمەرجێك بانك لەماوەی ٢٤ سەعاتدا ئەو کاغەزە بەنرخانە بکڕێتەوە و بەنرخێکی زیاتر (واتە سوود)، ئەوکاتە کۆمپانیاکان بەپێی بڕی پارەکە و رێژەی سوودی دیاریکراو قازانج دەکەن، وە بانکیش دەتوانێت لەو ماوەیەدا واتە ٢٤ سەعات، ئەو بڕە پارە بەگەڕ بخات. ئەم مامەڵەیە زیاتر لەچالاکی داراییدا بەکاردێت.

- هەندێ جار هەمان پرۆتسێسی سەرەوە دووبارە دەبێتەوە, بەلاّم بۆ ماوەیەکی زۆرتر تاکو ماوەی دوو هەفتە.
- دۆلاری ئەوروپی _ بریتییە لە پاشەکەوت کردنی دۆلاری ئەمەریکی لەبانکەکاندا لەدەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.
- بڕی کڕینی کاغەزی بەنرخ (بەها) لەسندوقە داراییە جیاجیاکان _ بریتییە لە کڕینی کاغەزی بەنرخ لەکۆمپانیا بیانییەکان و ناوخۆییەکان لەپێناوی کۆکردنەوە و کەڵەکەکردنیان لە سندوقێکی دیاری کراودا بۆ بەگەڕخستنی لەبوارە جیاجیا و مامەڵە داراییەکاندا. بەمەرجێك هەرلایەك بەشێك لەقازانجی گشتی پێ دەبەخشرێت.
- کۆمپیالەی پاڵپشتکراو _ هەندێ جار لەحاڵەتی تایبەتیدا بانکەکان کۆمپیالە (کاغەزی بەنرخ) لە کۆمپانیا گەورەکان لەرێگەی بۆرسەی دراوەوە دەکڕن. بەمەش بانکەکان دەتوانن قەرزی کورت خایەن بدەن بەکۆمپانیا ناوەنجی و بچووکەکان بەمەرجێك ماوەکەی لە (٢٧٠) رۆژ تێ پەڕنەکات.
- کۆمپیالەی بازرگانی _ هەمان پرۆتسێسی کۆمپیالەی پاڵپشتکراو. تەنها ماوەکەی جیاوازی هەیە. لەنێوان (٢ تا ٢٧) رۆژ تێپەڕ ناکات.



لێرەدا دەمەوێت سەرنجی خوێنەر رابکێشم بۆ خاڵێکی زۆر گرنگ. ئەویش ئەوەیە بارستەی پارە لە مامەڵەکردنی ئەمڕۆی پرۆسەی ئابووری و دارایی جیهاندا رۆڵێکی گرنگ دەبینێت وە پرۆسەیەکی زۆر ئاڵۆزە ئێمە تەنها بەشێوەیەکی روخساری و ئاسان باسمان لێکرد. تەنها بۆ ئەوەی خوێنەر تێگەیشتنێکی سەرەتایی هەبێت دەربارەی بارستەیی پارە.

## خواست لەسەر پارە

هەردوو ئەرکی پارە وەك ئامرازی ئاڵوگۆڕکردن و پاشەکەوتکردن سیفەتی خواستەکان لەسەر پارە دیاری دەکەن. بەشێوەیەکی گشتی دوو جۆر خواست هەیە لەسەر پارە.

یەکەم - خواستی هەنووکەیی واتە خواستی رۆژانە. واتە ئەو هێندە پارەیە کە بۆ مامەڵەکردنی شمەك و خزمەتگوزارییەکان پێویستە. بۆ نموونە مامەڵەی رۆژانە وەك کڕینی خواردەمەنی، جلوبەرگ، کڕینی بلیت و پێداویستییە رۆژانەکانی تر.

دووەم — خواستی پارە لەلایەن خەڵکان و کۆمپانیاکانەوە لەشێوەی پاشەکەوتکردندا. هەموو کەسێك یان کۆمپانیایەك هەوڵ دەدات. بڕێك لە پارەکەی پاشەکەوت بکات بۆ رۆژی رەش. یان لەپێناوی وەبەگەڕخستنی و دەستکەوتی سوود لەو پارەیە. بۆ نموونە ئەگەر کەسێك یان کۆمپانیایەك بڕی لە (٤٠٪)ی پارەکەی لەشێوەی پشك کڕیندا پاشەکەوت بکات، وەبڕی لە (٤٠٪)ی پارەکەی لەشێوەی کۆمپیالەدا. بەکاربهێنێت وە لە (٢٠٪)ی پارەکەی بە کاش لەبەردەستایە بۆ مامەڵەکردن. کەواتە ئەو کەسە یان کۆمپانیایە لە (٨٠٪)ی پارەکەی پاشەکەوت کردووە لەپێناوی بەدەستهێنانی سوود و قازانجی. بەشێوەیەکی گشتی سێ فاکتەری گرنگ کاریگەری راستەوخۆیان هەیە لەسەر خواستی پارە. ئەو فاکتەرانەش بریتین لە:-

نرخ، داهات، رێژەی سوودی قەرز.

نرخ:- کاتێك نرخی کالاّ و خزمەتگوزارییەکان بەرز دەبێتەوە، ئەوا خواست لەسەر پارە زیاد دەکات بۆ ئەوەی پێویستییەکان جێبەجێ بکرێت، بەلاّم کاتێك نرخ نزم دەبێتەوە. ئەوا خواست لەسەر پارە کەم دەبێتەوە, چونکە بۆ کڕینی کالاّ و خزمەتگوزارییەکان بڕێکی کەمتر پارەی پێویستە.

داهات:- کاتێ داهاتی خەڵکی زیاد دەکات واتە خەرجی زیاد دەکات ئەمەش دەبێتە هۆی زیاد بوونی خواست لەسەر پارە، بەلاّم کاتێك داهاتی خەڵکی نزم دەبێتەوە ئەوا بڕی خەرجییەکان کەم دەبێتەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی کەم کردنەوەی خواست لەسەر پارە.

ڕێژەی سوودی قەرز:- کاتێك بڕی ڕێژەی سوودی قەرز بەرز دەبێتەوە ئەمەش دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی خواست لەسەر پارە, بەڵام کاتێك بڕی ڕێژەی سوودی قەرز نزم دەبێتەوە خواست لەسەر پارە زیاد دەکات. بەهەرحاڵ خواست لەسەر پارە سنوری نییە، چەند پارەمان هەبێت هەمیشە کەمە وە هەوڵ دەدەین پارەمان زیاتر هەبێت، بەڵام تەنهاخستنەڕوو سنوورداریەت بۆ پارە دادەنێن، لەبەر ئەم هۆیەشە پارە هەمیشە دەستاو دەست دەکات و لەیەکێکەوە دەچێت بۆ یەکێکی تر بەمەش پارە هەمیشە لە ئاڵوگۆڕ و سوڕدانەوەدایە وە هەر بەهۆی پارەوە سوڕە ئابوورییەکان لەگەڕدان.

## یاسای سوڕانەوەی پارە

بۆ ئاسان کردن و باش تێگەیشتن لە یاسای سوڕانەوەی (ئاڵوویری) پارە هەوڵ دەدەین لەسەر نموونەی سوڕانەوەی پارە لە ئابووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەساڵی (٢٠٠١) روون بکەینەوە.

گریمان لەساڵی (٢٠٠١) بری پارەی کاش گروپی (M-1) لە ئابووری ئەمەریکادا بریتی بووە لە (١,١) ملیار دۆلار. واتە تەنها بڕی (١,١) ملیار دۆلار لەماوەی ساڵی (٢٠٠١) بەکارهاتووە لەمامەڵەکردن (کڕین و فرۆشتن) لەبازاڕەکانی ئەمەریکادا. وە هەروەها ئێمە دەزانین کە کۆی هەموو مامەڵەکان (کڕین و فرۆشتن) لەساڵێکدا بریتییە لە سەرجەمی بەرهەمی نەتەوەیی. کەواتە پەیوەندی نێوان بارستەی پارە و تێکڕایی بەرهەمی نەتەوەیی چییە؟ واتە پەیوەندی نێوان (M-1 وە G.N.P.) چییە؟

هەروەك باسمان لێکرد پارە هەمیشە لە جوڵەدایە و دەستاودەست دەکات لەلایەنێکەوە بۆ لایەنێکی تر جا ئەم جێگۆڕکێ یەی پارە و ئاڵوویرکردنی رەنگە هەزاران مامەڵەی پێ بکرێت رۆژانە. ئەم مامەڵەکردنانە لەماوەیەکی دیاریکراودا ساڵێك کۆدەکرێتەوە تاکو قەوارەی تێکڕایی بەرهەمی نەتەوەیی پێوانە دەکرێت.

گریمان لەساڵی (٢٠٠١)دا تێکڕایی بەرهەمی نەتەوەیی ئەمەریکا بریتی بووە لە (١٠) ملیار دۆلار، بەڵام بارستەی پارە بریتی بووە لە (١,١) ملیار دۆلار. کەواتە چەند جار پارە ئاڵۆێرکراوە یان چەند جار پارە سوڕاوەتەوە تاکو کۆی بەرهەمی نەتەوەیی بگاتە قەوارەی (١٠) ملیار دۆلار. وەڵامەکەی ئاسانە (٩) جار. چونکە ئەگەر بڕی (١٠) ملیار دۆلار دابەش بکەین بەسەر بڕی (١,١) ملیار دۆلاردا یەکسانە بە (٩). ئابووریناسان بەم پرۆسەیە دەڵێن خێرایی سوڕانەوەی پارە.



### فەرهەنگی ئابووری

خێرایی سوڕانەوەی پارە بریتییە لە تێکڕایی ئەو جارانەی (ژمارانەی) ئاڵوێری پارە لەلایەکەوە بۆ لایەکی تر لەماوەیەکی دیاریکراودا. خێرایی سوڕانەوەی پارە ژمێردەکرێت بەهۆی دابەشکردنی سەرجەمی بەرهەمی نەتەوەیی بەسەر بارستەی پارەدا واتە دابەشکردنی G.N.P. بەسەر (M-I) دا.

پرۆسەی خێرایی سوڕانەوەی پارە دەتوانین بەهۆی ئەم هاوکێشەیەی خوارەوە نیشان بدەین.

$$V=G.N.P / M\text{-}I$$

V: بریتییە لە خێرایی ئاڵوویری پارە.

M: بارستەی پارە.

G.N.P: تێکڕایی بەرهەمی نەتەوەیی.

بێگومان پرۆسەی خێرایی سوڕانەوەی پارە لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێکی تر دەگۆڕێت بەکاریگەری چەند فاکتەرێك.

کاتێك ڕێژەی سوودی قەرز بەرز بێتەوە، خێرایی سوڕانەوەی پارەش زیاد دەکات, چونکە بڕێك لە پارە دەبێت بە سەرمایەگوزاری، ئەوکاتە بارستەی پارە (M-I) کەم دەکات. بەڵام خێرایی سوڕانەوەی پارە زیاد دەکات بۆ ئەوەی قەوارەی تێکڕایی بەرهەمی نەتەوەیی جێگیربێت.

کاتێك داهات بەرزدەبێتەوە، خێرایی سوڕانی پارەش بەرزدەبێتەوە چونکە خواست لەسەر پارە زیاد دەکات، ئەگەر خواست لەسەر پارە زیاد بکات، ئەوا جموجوڵی بارستەی پارەش زیاد دەکات بۆ دابین کردنی مامەڵەکانی (کڕین و فرۆشتن) لە هاوکێشەی خێرایی سوڕانەوەی پارە بۆمان دەرکەوت ئەگەر خێرایی سوڕانەوەی پارە زیاد بکات کاتێك بارستەی پارە نەگۆڕ بێت دەبێتە هۆی زیادبوونی تێکڕایی بەرهەمی نەتەوەیی. ئەم پرۆسەیە بەم شێوەیە دەردەکەوێت و ژمێردەکرێت.

$$V\times \quad G.N.P=M$$

ئەم هاوکێشەیە پێناسەی ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە کۆی مامەڵەکردنەکان (کڕین و فرۆشتن) بریتییە لە قەوارەی تێکڕایی بەرهەمی نەتەوەیی. ئەگەر ژمارەی نموونەکەی سەرەوەمان بخەینە جێگەی هێماکانی هاوکێشەکەی سەرەوە دەبینین.

١٠ مليار دۆلار = ١,١ مليار دۆلار × ٩

یاسای خێرایی سوڕانەوەی پارە، بەلای ئابووریناسانەوە ئەوەندە گرنگ بوو، بۆیە هەندێ لە ئابووریناسان توانیان لەسەر ئەو بنچینەیە تیۆریەکی ئابووری دابڕێژن کە پێی دەوترێت (مۆنیتاریزم).

**فەرهەنگی ئابووری**

مۆنیتاریزم:- ئەو تیۆرییە ئابوورییە کە بیرۆکەی سەرەکی بریتییە لەوەی بەهۆی کۆنترۆڵی بارستە پارەوە دەتوانرێت بارودۆخی ئابووری سەقامگیر بکرێت. ڕێبەرانی ئەم تیۆریە دەڵێن بەهۆی سیاسەتی بانکی ناوەندییەوە لەبواری دیاریکردنی ڕێژەی سوودی قەرز دەتوانرێت بەتەواوەتی کۆنترۆڵی چالاکییە ئابوورییەکان بکرێت.

## تیۆری چەندێتی پارە (هاوکێشەی ئاڵوگۆڕکردن)

هەروەك دەزانین تێکرایی بەرهەمی نەتەوەیی (G.N.P) بریتییە لە سەرجەمی کۆی هەموو کاڵا و خزمەتگوزارییە بەرهەم هێنراوەکان و بەکارهاتووەکان. واتە تێکرایی بەرهەمی نەتەوەیی بریتیە لە نرخی بڕی هەموو شمەك و خزمەتگوزارییە بەرهەم هێنراوەکان.

$$P.Q= \quad G.N.P$$

P- بریتییە لە نرخی هەموو کاڵا و خزمەتگوزارییە بەرهەم هێنراوەکان.

Q- کۆی بڕی کاڵا و خزمەتگوزارییە بەرهەم هێنراوەکان.

دامەزرێنەرانی تیۆری بیرۆکەی مۆنیتاریزم، لەسەر بنچینەی هاوکێشەکەی سەرەوە هاوکێشەی ئاڵوگۆڕکردنیان دروست کرد. کە بەهۆیەوە پەیوەندی نێوان بارستەی پارە، خێرایی سوڕانەوەی پارە و بڕ و نرخی شمەك و خزمەتگوزارییە بەرهەم هێنراوەکانیان دیاری کرد.

$$P \times Q = V \times M$$

M- بریتییە لە بارستایی پارە.

V- خێرایی سوڕانەوەی پارە.

P- تێکڕای نرخ.

Q- کۆی بڕی (قەوارەی) شمەك و خزمەتگوزارییە بەرهەمهێنراوەکان.



ئەگەر بە سەرنجەوە سەیری هاوکێشەکانی پێشوو بکەین دەبینین بیرۆکەی سەرەکی هاوکێشەی ئاڵوگۆڕکردن بریتییە لە یەکسانی هەردوو لاکەی هاوکێشەکە بە قەوارەی تێکڕایی بەرهەمی نەتەوەیی (G.N.P).

بەیارمەتی هاوکێشەی ئاڵوگۆڕکردنەوە، ئابووریناسان تیۆری چەندێتی پارەیان داڕشت، بیرۆکەی ئەم تیۆریەش دەڵێت. ڕادەی نرخ بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەستراوە بە بارستایی پارەوە (بڕی پارە). واتە ئەگەری بڕی پارە زیاتر بێت. بەهاکەی کەم دەبێتەوە, نرخەکانیش بەرزدەبنەوە بەپێچەوانەشەوە ئەگەر بڕی پارە کەم بێت بەهاکەی بەرزبێتەوە نرخەکانیش نزم دەبنەوە. ئەمەش هاوکێشەکەیە واتە هاوکێشەی تیۆری چەندێتی پارە.

$$Q / M \qquad \times V = P$$

## چی بکەین؟

دەمەوێت سەرنجی خوێنەر ڕابکێشم بۆ خاڵێکی گرنگ، لەنێوان ئابووریناساندا وتوویژ و بۆچوونی جیاواز هەیە لەکاریگەری خێرایی سوڕانەوەی پارە لەسەر بارودۆخی ئابووری. بێگومان تەنها بانکی ناوەندی بەهۆی دەسەلاتی باڵای دارایی حکومەت. دەتوانێت کار بکاتە سەر خێرایی سوڕانەوەی پارە. هەندێ لە ئابووریناسان دەڵێن دەبێت بانکی ناوەندی بەشێوەیەکی رووکەش کۆنترۆڵی بازاڕی دارایی بکات و دەست نەخاتە پرۆسەی داوا وخستنەڕووی دراو، پێویستە، ئەم کارە بەجێ بهێنرێت بۆیان و ڕێساکانی بازاڕ، تەنها بازاڕ دەتوانێت ئەو پرۆسەیە ڕێك بخات. بەڵام هەندێکی تر لە ئابووریناسان دەڵێن دەبێت بانکی ناوەندی بەشێوەیەکی تەواو فراوان کۆنترۆڵی بازاڕی دارایی بکات و بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەست بخاتە کاروباری بازاڕی داراییەوە وە بەهۆی ئەوەش کاربکاتە سەر خێرایی سووڕانەوەی پارە. بەهەرحاڵ هەردوو لایەنەکە بۆچونیان یەکە لەسەر دەست تێوەردانی بانکی ناوەندی لەسەر بازاڕی دارایی، بەلاّم شێوە و سنوری ئەو دەستێوەردانە بۆتە هۆی ناکۆکی و جیاوازی بۆچوونەکان.

بەهەرحاڵ وەك لەپێشەوە بۆمان دەرکەوت ئەمڕۆکە فاکتەری خێرایی سووڕانەوەی پارە کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لەسەر بارودۆخی ئابووری. وە هەروەها ئامرازێکە کە بەهۆیەوە دەتوانرێت کۆنترۆڵی نرخ و دیاردەی بێکاری هەلاّوسانی پێ بکرێت. بێگومان بەکارهێنانی ئامرازی خێرایی سوڕانەوەی پارە لە چارەسەرکردنی کەموکوڕی و تەنگەژە ئابوورییەکاندا دەبێت بەشێوەیەکی زۆر پسپۆڕانە و زانستانە دوای لێکۆڵینەوەی ورد و درشت بکرێت. چونکی ئاکامەکەی گەلێك گیروگرفت و تەنگ و چەڵەمەی ئابووری و کۆمەلاّیەتی لێ دەکەوێتەوە کە چارەسەرکردنیان کاتێکی زۆری دەوێت.

# فەسڵی پانزەهەم

## بانكی بانكەكان و سیستەمەكانی بانك

بانكەكان دامەزراوێكن یەكەمین پیشەیان دانی قەرزە بە خەڵكی یـان بـە پرۆژەكـان، واتـە دەزگایەكن سەوداگەری بەقەرزەكان دەكەن و هەروەها بازرگانی پێوە دەكەن.

ئەمرۆكە بانكەكان رۆڵێكی گرنگ و دیار دەبینن لەپرۆسە و چالاكی ئابووریدا لە سەرتاسـەری جیهاندا. بۆیە لەم فەسڵەدا هەوڵ دەدەین بەشێوەیەكی چڕوپڕ باس لە بانك و رۆڵـی بانكـەكان لـە گەشەی ئابووری ولاتدا بكەین، وە باس لەرۆڵی بانكی بانكەكان (بانكی ناوەندی) دەكەین.

چونكە بانكە ناوەندییەكان ئامرازێكی كاریگەرە بەدەست حكوومەتەكانەوە بـۆ كاریگـەری لەسەر هەموو پرۆسە دارایی و ئابوورییەكانی دەوڵەت.

## بانك وەك پێویستیەك!

سەرەتا هەندێ زانیاری دەربارەی بانكە ناوەندییەكان. بانكە ناوەندییـەكان دامەزراوەیـەكن كە پارەی نیشتیمانی دەردەكەن و سەرەوكاری كاروباری دەكەن، لەلایەكی تریـشەوە كردەكـانی دڵنیایی و سەرافی بەجێ دەهێنن و سەرپەرشتی رامیارییان دەكـەن تـا گونجـاوتر بێـت لەگـەڵ ئابووری ولاتدا، ئەمرۆكە گرنگی بانكە ناوەندییەكان لەوەدایە شـان بەشـانی ئـەوەی كـە پـارە دەردەكەن بەڵكو رۆڵی بانكی بازرگانیش دەگێرن. ئەمەش وای كردووە كە بانكـە ناوەندییـەكان بالاترین شوێنیان هەبێت لە رژێمی بانكیدا. لەهەرە ئەركە گرنگەكانی بانكی ناوەندی.

- ئەركی دەركردنی پارەیە.
- ئەركی سەرافی میرییە.
- ئەركی سەرافی بانكەكانە.

بەهۆی ئەم ئەركە گرنگانەوە بانكـە ناوەندییـەكان دەتـوانن بەشـێوەیەكی راسـتەوخۆ ئـەركی رێكخستنی پارە لێدان و رێكو پێكی و خەرجكردن بخەنـە ئەسـتۆی خۆیـان. وە هـەروەها بانكـە ناوەندییەكان یارمەتی داپۆشەری دراوەكان دادەنێن، وە پشتگیری دەستاوەدست كردنی وەرگرتنـی لە بازارەكاندا دەكات تاوەكو نرخ و كرێ و داهات و رادەی ئابوورییەكان چەسپاو و نەگۆڕاو بن.

وە هەروەها بانكە ناوەندییەكان كۆمەڵێكی زۆر كـارگوزاری پێـشكەش بەحكومـەت و دام ودەزگا هەمەجۆرەكانی دەكـات. جگـە لەمانـە بـانكی ناوەنـدی بـەهۆی دەسـەلاتی بالایـەوە سەرپەرشتی هـەموو بانكـەكان دەكـات و ئاراسـتەیان دەكـات، بـەهۆی سیاسـەتی دارایـی و قەرزییەوە كاریگەری راستەوخۆ دەكاتەسەر سیاسەتی بانكەكانی تر.

لەبەر گرنگی بانكی ناوەندی و رۆڵی كاریگەری لە روداوە ئابوورییەكانـدا سـەرۆك لیژنـەی بالای بانكی ناوەندی لەلایـەن بـەرزترین دەسـەلاتی دەوڵەتـەوە كاندیـد دەكـرێن و پەرلـەمان رەزامەندیان لەسەر دەدات وە ماوەی كاركردنیان لەزۆربەی ولاتەكاندا بریتییە لـە (١٢) سـاڵ. جگە لەو ئەركە بنچینیانەی سەرەوە بانكە ناوەندییەكان ئەمرۆكە واتـە قۆنـاغی جیهانگیریـدا چەند ئەركێكی گرنگی تر جێبەجێ دەكەن، چونكە جگە لە ئەركە ئابووری و داراییەكان ئەركی دارشتنی سیاسەتی دارایش بە بانكە ناوەندییەكان سپێردراوە.

بانكە ناوەندییەكان ئەمرۆكە كۆمەك و یارمەتی هەموو سیستەمە داراییەكانی حكومـەت دەكات وە هەروەها كۆمەك و یارمەتی بانكە تایبەتی و بازرگانییەكانی دەكات لە ستراتیژیەتی كاركردنیاندا. وە هەروەها ئاگاداری دانیشتوان دەكاتەوە لە گۆڕانكارییە داراییەكانی جیهانی و ئاكامەكانیان بۆ سەر دانیشتوان.

وە هەروەها بانكی ناوەنـدی سـنورداریێتی مامەڵـەكردن بـە دراوە قورسـەكان دەستنیـشان دەكات و كـۆنترۆڵی حەواڵـەكانی وەزارەتـی دارایـی لـە دانـەوەی قـەرزی نـاوەكی و دەرەكـی حكومەت دەكات. جگە لە ئەركی چاودێری كردن و پێشنیاز و پلان و نەخشەكێشانی ئـابووری بانكی ناوەندی وەك یەكەیەكی گرنگ بەشـداری دەكـات لـە ئەركـە بازرگـانی و داراییەكانـدا بەتایبەتی بەشـداری راسـتەوخۆی بـانكی ناوەنـدی لـە بۆرسـەكاندا وەك كڕیـار و فرۆشـیاری، كاغەزی بەنرخ و كڕین و فرۆشتنی داروی قورس بۆ ئەوەی رێگە لـە گـۆڕانی كتـوپڕی گـۆڕانی پارەی نەتەوەیی بە پارە بیانییەكان كۆنترۆڵ بكات.

**فەرهەنگی ئابووری**

بانكی بانكەكان Bankers Bank :

ئەو بانكەیە كە بەپیشەی بانكی ناوەندی یان بانكی دەوڵەت هەڵدەسـتێ، بـەهۆی ئـەو پایە بەرزەی كە لەلایەن میرییەوە هەیەتی كە لە رووی نەخت و دارایی و ئابوورییـەوە ئـەو

مافەی دراوەتێ کە سەرپەرشتی هەموو بانکەکان بکات و سپاردەیان لێ وەرگرێ و قەرزیش بداتە بانکەکان کردەی پاکۆکاریش لە نێو بانکەکاندا بەجێ بهێنێ، بۆیە (بانکی بانکەکان)ی پێ دەگوترێ.

## کەمێك دەربارەی بانك

بەشێوەیەکی گشتی سیستەمی بانك لە هەموو ولاّتێکدا وەك یەکە وە لەسەر چەند بنچینە و رێسایەکی دیاریکراو و ستاندارد دامەزراوە.

بانکی ناوەندی خۆی وەك یەکەیەك بەشدارە لە پرۆسەی ئابووری ولاّت پێویستی بە پاشەکەوت کردنی برێك لەپارەی پارێزراو هەیە. بێگومان بەپێی یاسا ئابوورییەکان برِی ئەو پارەیەی کە لە ولاّتێکدا هەیە لەیەك کاتدا هەمووی بەکارناهێنرێت و خەرجی ناکرێت.

بۆ نمونە گریمان لەبانکەکاندا برِی (١٠) ملیۆن دۆلار پاشەکەوت کراوە بریتین لە پاشەکەوتی خەڵکی و کۆمپانیاکان و دەزگا حکومییەکان,...هتد. لەرۆژێکدا رەنگە تەنها برِی (١) ملیۆن دۆلار رابکێشرێت لەلایەن خەڵکییەوە، کەواتە برِی (٩) ملیۆن دۆلار لەبانکەکاندا دەمێنێتەوە، ئەوسا بانك دەتوانێت بەئاسانی بەو برە پارەیە قەرز بدات بەخەڵکی و کۆمپانیاکان (بەشێوەیکی گشتی هەموو بانکەکان ئەو پارەیەی کە لەسەر حسابەکاندا پاشەکەوت کراون بەکاردەهێنێت بۆ قەرزدان واتە بەکار هێنانی پارەی خەڵکی، وە بانکەکانیش بەهۆی ئەم پرۆسەیەوە قازانجی تایبەتی خۆیان دەکەن) هەرچەندە هەموو دەزانین کە بانك پارەکانمان بەکار دەهێنێت، بەلاّم هەموومان رەزامەندین بەو کارە, چونکە رۆژێك لە رۆژان خۆشمان پێویستمان بەو قەرزە دەبێت، بۆ متمانەیی و پاراستنی پارەی یاوەرەکانی بانك، بانکی ناوەندی بەشێوەیەکی هەمیشەیی کۆنترۆڵی پرۆسەی قەرزدان لەلایەن بانکەکانەوە دەکات.

هەموو بانکێك پێویستی برێك لە سەرمایەکەیان بارمتە بکەن لە بانکی ناوەندیدا ئەم برە لە ولاّتێکەوە بۆ ولاّتێکی تر دەگۆرێت هەندێ جار دەگاتە (٢٥٪)ی سەرمایەی جێگیری بانك. بەهۆی دیاریکردنی رێژە و برِی بارمتە لەلایەن بانکی ناوەندییەوە. حکومەت دەتوانێت کۆنترۆڵی بارودۆخی ئابووری بکات. ئەگەر هاتوو برِی بارمتە بەرزبوو ئەوا توانای قەرزدان لەلایەن بانکەکانەوە کەم دەبێتەوە، چونکە برِی پارە کەم دەبێتەوە ئەمەش کار دەکاتە سەر گەشەکردنی ئابووری و حکومەت بەهۆیەوە دەتوانێت چارەسەری دیاردەی هەڵاوسان بکات. بەپێچەوانەشەوە کاریگەریی و ئاکامی پێچەوانە دەبێت.





بانك : Bank بانکەکان دامەزراوێکن یەکەمین پیشەیان دانی قەرزە بە خەڵك یان پرۆژەکان، واتە دەزگایەکن سەوداگەری بەقەرزەکان دەکەن و هەروەها بازرگانی پێوەدەکەن. بانکەکان بەم شێوەیەی ئێستایان لەچەند سەدەیەکی درێژەدا پەیدابوون. بانکەکان لەسەدەکانی ناوەراستدا لە کۆمەڵێك پارەگۆڕ پەیدابوون کە بەگۆرینەوەی پارەی کانزا لەگەڵ یەکتردا خەریك بوون بە دەست خۆشانەیەکی کەم لەبری ئاڵوگۆڕکردنی پارە بۆ وردە و چەندجارەی، هەروەها گۆڕینەوەی دراوی بیانی بە دراوی ناوخۆیی.

کاتێك بازرگانی فراوان بوو لە شارە گەورەکان و بەندەرەکاندا بانکەکانیش گورجوگۆڵ بوون بەتایبەتی کاتێك کە بانکەکان دەستیان کرد بەوەرگرتنی پارە و سپاردەکانی بازرگانەکان لەسەدەی شانزەهەم بەدواوە کردەی پارە سپاردن گۆرِا بە قەرزدان لە پارە سپێردراوەکانی بازرگانەکان ئەم دوو کردەیە لەو دوو سەدەی دواییەدا بوونە هۆی پەیدابوونی کردەکانی دیکەی بانك کەئەمرۆ دەزانێن وەك داشکاندن و برواپێدان و کردەکانی دیکەی برواپێدان و سەرافی کە ئەمرۆ دەکرێن.

بانکەکان بەپێی سروشتی کارەکانیان بۆ چەند جۆرێك دابەش دەکرێن لەهەرە گرنگەکانیان لەخوارەوە دەدوێین.

- بانکی برواپێدان Credit Bank :

ناوێکی جێگرە بۆ بانکی بازرگانی (Commercial Bank) یان بانکی هاوبەش ( Joint Stock Bank).

- بانکی پاشەکەوتیی Saving Bank:

ئەم بانکە هەوڵ دەدات کردەی پاشەکەوتی گورجوگۆڵ بکات و دنەدەری پاشەکەوت کران بێ بۆ زیادکردنی پاشەکەوتەکانی و بەکارهێنانیان لەزۆر بواری ئابووریدا.

- بانکی وەبەرهێنان Investment Bank :

جۆرێکە لە دەزگاکانی بازاری دارایی کە بەکۆکردنەوەی پارەی بەشدارەکان تیایدا و هەروەها هی قەرزدەرەکان لەهەڵگرانی قەواڵە هەڵدەستێت، پاشان ئەم پارانە لەکرینی پشك و قەواڵەی پرۆژەکانی تردا بەکاردێت، بۆ ئەوەی لەدوا رۆژدا بەنرخێکی بەزتر بفرۆشێتەوە.

- بانکی دەرچواندن Bank of Lssuse :

ئەو بانکەیە مافی دەرکردنی کاغەزی نەختینە (کاغەزی بانکەنوت)ی هەیە، هەروەها پێشی دەگوترێت (بانکی ناوەندی) یان بانکی بانکەکان.

- بانکە دێهاتییەکان Country Bank :

ئەو بانکەیە کە لە دەرەوەی شارەکاندا دروست دەرکێ، واتە لەناوچە دێهاتییەکاندا.

- بانکە ناوچەییەکان Regional Bank :

مەبەست لە دروستکردنی ئەم بانکە، پێشکەشکردنی کۆمەکە بۆ ئەو ولاّتانەی کە تیایدا بەشدارن، وەك بانکی پەرەپێدانی ئەمریکایی و بانکی پەرەپێدانی ئاسیایی و بانکی پەرەپێدانی ئەفریقایی، ...هتد.

- بانکی بازرگانیی دەرەکی Bank Of Foreign Trade :

دەزگایەکی نەختینە بە کۆکردنەوەی پارە بۆ ماوەیەکی کورت هەڵدەستێ، ئەویش بەمەستی پارەدارکرنی بازرگانی دەرەکیی.

- بانکی بازرگانی Commercial Bank :

ئەرکی بنەڕەتی ئەم بانکانە وەرگرتنی پارەیە بەشێوەی سپاردە بەرامبەر بەسوودێکیان بەبێ سوود لە هەندێ کەس، دوایی هەندێ لەم پارانە بەقەرز دەداتە کەسانی دیکە بەرامبەر بەسوودێکی تر.

ئەم ئەرکە تووشی گۆڕان بووە لەگەڵێك بواری بازرگانی سەرافیدا و گورجوگۆڵ و جێگیر بووە، وەك وەبەرهێنانی پارە بۆ ماوەیەکی کورت لە کردەکانی داشکاندن و پێشەکی پێدانی جۆراوجۆر، کردنەوەی بڕواپێدان و کاری سەرافی و بازرگانی بە واتایەکی کورت، ئەم بانکانە بازرگانی بەپارەی سپێردراوەکانەوە دەکات بە مەبەستی وەبەرهێنانی لەکردەکانی بانك و بڕواپێدانی ماوەکورتدا.

- بانکی هەناردن و هاوردن Export & Import Bank :

ئاژانسێکی میرییە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، مەبەستەکەی هاندانی بازرگانی دەرەکییە لە ڕێگەی بەخشینی بڕوا پێدان بە ولاّتە بیانییەکاندا.

- بانکی تایبەتی Private Bank :

ئەو بانکەیە کە خاوەنەکەی کەسێك یان بەشدارگەیەك یان کۆمەڵەیەکی هەرەوەزی بێت و سەوداگەری بەسپاردە و بڕواپێدان بکات.

- بانکی داشکاندن Discount Bank:

ئەو بانکەیەکە بەکردەی بڕواپێدانی ماوەکورت هەڵدەستێ، وەك داشکاندنی کاغەزی بازرگانی.



- بانکی پیشەسازی Industrial Bank :

ئەو بانکەیە بە هەموو کارەکانی بانکە بازرگانییەکان هەڵناسێ، بەڵکو بە بەخشینی قەرز بە پڕۆژە پیشەسازییەکان (بەتایبەتی بچووکەکان) هەڵدەستێ، ئەویش بەمەبەستی یارمەتیدان لە کڕینی ئامێر و کەرەستەی خاوو...هتد.

- بانکی خانووبەرە Mortgage Bank :

جۆرێکە لەدەزگاکانی بازاڕی دارایی کە بە کۆکردنەوەی پارە هەڵدەستێ لەڕێگەی دەرچوواندنی قەواڵەی بارمتەکراو بەپارەی رەهنی خانووبەرەی وێڕای پێشەکی پێدانی ماوە درێژ بۆ دروستکردنی و فراوانکردنی و چاککردنەوەی خانووبەرە.

- بانکی پاکۆکاری Clearing Bank :

ئەو بانکەیە کە سەوداگەری بەرێکخستنی قەرزەکان و پاکۆکردنیان لەگەڵ بانکە جیاوازەکانی دیکەدا دەکات، ئەویش لەڕێگەی ئاڵوگۆڕکردنی چەك و کۆمپیالە و کۆککردنی قەرزێك بەقەرزێکی دیکە. وە بانکی پاکۆکاری ناوێکی جێگیرە بۆ بانکی بازرگانی.

- بانکی سپاردە Deposit Bank :

پەیداکردنی سپاردە یەکێکە لە ئیشە سەرەکییەکان و گرنگەکانی بانکی بازرگانی، بەڵکو بەو ئیشە بانکە بازرگانییەکان لە بانکەکانی دیکە جیادەکاتەوە. بانکی بازرگانی سپاردەکانی سەوداکاران وەردەگرێت لەپاشاندا ئەم سپاردانە دەخاتە ئیشەوە کە ئەمەش دەبێتە هۆی خولڤاندنی سپاردەی تازە.

## جموجۆڵ و چالاکی پارە

هەروەك لەپێشەوە باسمان لێکرد بانکی ناوەندی چەند ئامرازێکی بەدەستەوەیە بۆ کاریگەریکردن لە بارودۆخی ئابووری ولاّتدا. ئێستا باس لە سێ ئامرازی گرنگ دەکەین کە بانکی ناوەندی بەهۆیانەوە کاریگەریەکی راستەوخۆ دەکاتە سەر رێکوپێك کردنی و ئاڕاستەکردنی بازاڕی دارایی.

- کارکردن لە بازاڕی سەربەستدا.
- گۆڕینی ڕێژەی سوودی قەرز.
- گۆڕینی بڕی بارمتە.

ئێستا هەریەکە لەم ئامرازانەی سەرەوە بەجیاجیا روون دەکەینەوە.

### - کارکردن لەبازاڕی سەربەستدا:

بریتییە لە چاکی کڕین و فرۆشتنی کاغەزی بەنرخی حکوومی لەڕێگەی بانکی ناوەندییەوە. چونکە کڕین و فرۆشتنی کاغەزی بەنرخ لە (بۆرسەکان)دا سەربەستە، بەلاّم بۆ کۆنترۆڵ کردنی بازاڕی دارایی حکوومەت لە ڕێگەی بانکی ناوەندییەوە ڕۆژانە بەشداری دەکات لە مامەڵەکردنی بۆرسەکاندا، چونکە حکوومەتیش هەمیشە پێویستی بەپارەیە بۆ ئەوەی پرۆگرام و خەرجییە گشتییەکانی بەئەنجام بگەیەنێت. مەبەست لە کڕین و فرۆشتنی کاغەزی بەنرخ چییە؟ وە چۆن کار دەکاتە سەر بارستایی پارە؟

کاتێ بانکی ناوەندی کاغەزی بەنرخی حکوومی دەفرۆشێت. ئەوا بانکەکانی تر بە بڕی بەهای ئەو کاغەزە بەنرخانە پارەیان کەم دەبێتەوە.

واتە پارەیەکی زۆر لەسەر حسابی بانکی ناوەندی کەڵەکە دەبێت. کەواتە توانای دانی قەرز لەلایەن بانکەکانەوە کەم دەبێتەوە ئەنجامەکەشی کەم کردنەوەی بارستەی پارە و خێرایی سوڕانەوەی پارەیە. ئەم پرۆسەیەش باشترین چارەسەرکردنە بۆ نەهێشتنی هەڵاوسان. بەلاّم کاتێك بانکی ناوەندی دەست دەکات بە کڕینی کاغەزی بەنرخ، ئەوکاتە بانکەکان دەتوانن قەرز بدەن بە یاوەرەکانیان (قەرزی کورت خایەن و قەرزی درێژ خایەن). واتە خێرایی سوڕانەوەی پارە زیاد دەکات و ئابووری بەرەو گەشەکردنی دەڕوات.

مامەڵە و سەوداکەری لەبازاڕی سەربەستدا (بۆرسەکاندا) کارێکە هەموو ڕۆژێك دووبارە دەبێتەوە. ئەوەتا هەندێ جار لەشاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە دەبینین کە چەرچییەکان لە گۆڕەپانێکی گەورەدا کۆدەبنەوە و هەریەکە دەست بەرز دەکاتەوە و خەریکی تەلەفۆن کردن و چاودێری شاشەکانی کۆمپیوتەرەکان دەکەن.

هەموو ئەو دەلاّلانە پسپۆڕانە خەریکی کڕینی و فرۆشتنی کاغەزی بەنرخن. بۆ کۆمپانیا و دەزگا داراییەکان بە جموجۆڵ و چالاکی بۆرسەکان ئابووریناسان دەتوانن بارودۆخی ئابووری وڵاتەکان یان کەرتە ئابوورییەکان دیاری بکەن.

**فەرهەنگی ئابووری**

بۆرسە Bourse : وشەیەکی فەرەنسییە مانای بازاڕی ئاڵۆگۆڕکردن یان گۆڕین دەگرێتەوە، وەك گۆڕینی پشك و قەواڵە (کاغەزی بەنرخ) بەناوبانگترین بۆرسەی جیهانی بۆرسەی نیویۆرك، تۆکیۆ، پاریس و فرانکفۆرتە.



### - گۆڕینی ڕێژەی سوودی قەرز:

پلان و نەخشەکێشانی ستراتیژی بانکی ناوەندی یە کە بەهۆیەوە بڕی سوودی قەرز لە وڵاتدا دیاری دەکات. بەم شێوەیە بانکی ناوەندی دەتوانێت سنورێکی دیاریکراو دابنێت بۆ دانی قەرز لەلایەن بانکەکانەوە بە یاوەرەکانیان.

بانکی ناوەندیش لەلای خۆیەوە قەرز دەدات بە بانکەکانی تر بەرامبەر بارمتە و متمانەیەکی دیاری کراو کە زیاتر بریتییە لە (کاغەزی بەنرخ)، بێگومان بڕی ڕێژەی سوودی قەرز لەلایەن بانکی ناوەندییەوە بۆ بانکەکانی تر نزمترە لەچاو ڕێژەی سوودی گشتی. وە هەروەها بانکی ناوەندی چاودێری تەواوی جموجۆڵی پارە دەکات لەڕێگەی قەرزدانەوە. بانکی ناوەندی دەزانێت بارستایی پارە چەندە و چۆن کۆنترۆڵی بکات.

**فەرهەنگی ئابووری**

چەرچیی، دەلاّڵ Broker :

ناوەنگیرێکە لەنێوان کڕیار و فرۆشیار لە بازاڕێکدا، وەك چەرچیی کاغەزی دارایی و چەرچیی بیمەکردن و چەرچیی داشکاندن، بەرامبەر، بە دەست خۆشانەیەك کەپێی دەگوترێ (دەلاّڵی یان چەرچێتی).

چەرچیی لە بازاڕی پارەدا ئەو کەسەیە کە کارەکەی تەنها بەیەك گەیاندنی ئەو بانکانەی کە پارەیەکی زیادیان هەیە دەیانەوێت بەقەرزی بدەن بەو دەزگایانەی کە ئارەزووی قەرزکردنیان هەیە.

بەلاّم چەرچیی داشکاندن ئەو کەسەیە کە کارەکەی تەنها بەیەك گەیاندنی ئەو کەسانەی کە کاغەزی داراییان هەیەو دەیانەوێت بیفرۆشن و ئەو کەسانەی کە ئارەزووی کڕینیان هەیە.

چەرچیی بۆرسەش ئەو کەسەیە کە کارەکەی تەنها بەیەك گەیاندنی ئەو کەسانەی کە ئارەزووی کڕینی پشك و قەواڵەیان هەیە لە بۆرسەی کاغەزی داراییدا (بازاڕی سەرمایە) و ئەو کەسانەی کە ئارەزووی فرۆشتنیان هەیە.

### - گۆڕینی بڕی بارمتە (پاشەکەوت کردن):

بانکی ناوەندی لەسەر بنچینەی یاسای تایبەتی، بڕ و قەوارەی پارەی پاشەکەوت کراو بۆ بانکەکانی تر دیاری دەکات. بێگومان ئەو ڕێژەیە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر دەگۆڕێت, بەگشتی ئەو ڕێژەیە لەنێوان (١٠٪ هەتا ٢٥٪) دەبێت. بەم شێوەیە بانکی ناوەندی دەتوانێت کاریگەری ڕاستەوخۆ بکاتە سەر خێرایی سوڕانەوەی پارە. هەندێ جار بانکەکان ناتوانن

مەرجەکانی ڕێژەی پاشەکەوت کردن جێبەجێ بکەن، ئەمەش دەبێتە هۆی ناپووتی (ئیفلاسی) بانکەکە و زەرەر و زیانی یاوەرەکانی، بۆیە لە هەندێ وڵاتدا ڕێگە بە بانکەکان دەدەن قەرزی دەرەکی وەربگرن یان بانکی هاوبەشی لەگەڵ بانکە بیانییەکان دابمەزرێنن بێگومان ئەم جۆرە ڕێ پێوانە لایەنی پۆزەتیڤ و لایەنی نێگەتیڤی هەیە. تاکو ئابووری و دارایی وڵاتێك بەهێز و مەتین نەبێت ڕێدان بەهاتنی بانکە بییانییەکان ئاکارێکی زۆر نێگەتیڤانەی دەبێت, چونکە بڕێکی زۆری بارمتەی پارە دەچێتە دەرەوەی وڵات ئەمەش دەبێتە هۆی کەم کردنەوەی خێرایی سوڕانەوەی پارە واتە دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی.

**فەرهەنگی ئابووری**

بانکی ناوەندی Central Bank : ئەو دامەزراوەیە کە پارەی نیشتمانی دەردەکات. سەروەکاری کاروباری دەکات و لە لایەکی تریشەوە کردەکانی بڕواپێدان سەرافی بەجێ دەهێنێت و سەرپەرشتی ڕامیارییەکانیان دەکات بەمەبەستی:

– جێگیرکردنی دراو هێنانەوەی یان ساغ کردنەوەی هاوسەنگی ناوەکی و دەرەکی لە ڕێگەی:

+ پارە دەرکردن.
+ بەڕێوەبردنی پاڵپشتەی دەوڵەت لە زێڕ و جڕ و جیازی بیانی.
+ دانانی سیاسەتی گۆڕینی دەرەکی و چاودێری کردنی پلانی پارەی بیانی.
+ ڕێکخستن و پلاندانان بۆ بڕواپێدان و چاودێری کردنی سەرافی و دەزگا داراییکانی.
+ بەشداری کردن لە چارەسەرکردنی هەڵبەز و دابەزی نەختی و دارایی.

– هاوبەشی لە خێراکردنی گەشەی ئابووری و بەرزکردنەوەی ئاستی گوزەران بە زۆرکردنی دەرامەتە نەختینەکان و داراییەکانی پێویست بۆ پلانی پەرەپێدان.

## دروستکردنی پارە

چۆن پارە دروست دەکرێت؟ مەبەست لە دروستکردنی پارە چاپکردنی پارە نیە بەڵکو مەبەست لە زیادکردنی بارستایی پارەیە. هەروەك باسمان لێکرد ئەرکی سەرەکی بانکەکان دانی قەرزە بە یاوەرەکانیان لەپرۆسەی قەرزداندا پارە دروست دەبێت. دوای جێبەجێ کردنی بڕیارەکانی بانکی ناوەندی لەلایەن بانکەکانەوە (مەبەستمان بڕیاری بڕی پاشەکەوتکردنی پارەیە لە بانکی ناوەندی).

ئەوکاتە بانکەکان بە ڕێژەی سودێکی دیاریکراو دەتوانن قەرز بدەنە یاوەرەکانیان.



لە پراکتیکدا بانکەکان هەندێ جار هەمان بڕی پارە چەند جارێك دەدەن بەقەرز بەچەند یاوەرێکی جیاجیا، ئەمەش پێی دەڵێن فێڵ و فرت و نهێنی بانکەکان، چونکە بەپێی یاساکانی بانکی ناوەندی هیچ بەربەستێك نییە لەبەردەم ئەم جۆرە مامەڵەکردنانەدا بێگومان وەرگرتنی ڕێژەی سوودی قەرز سەرچاوەی سەرەکی دەستکەوت و داهاتی بانکەکانە، بۆیە دانی قەرز بەهەمان بڕی پارە چەند جارێك، ئەوەندە جار بڕی سوودی قەرز زیاد دەکات بۆ بانکەکان.

لە خوارەوەدا هەوڵ دەدەین چۆنیەتی دروستکردنی پارە لە بانکەکان ڕوون بکەینەوە.

گریمان بانکی (X) (10000) دۆلاری پاشەکەوتکراوی یاوەرەکانی لەسەر حسابەکانی کەڵەکە کردووە. بەپێی یاسای بانکی ناوەندی بانکی (X) پێویستە ڕێژەی (١٠٪)ی پارەکانی بارمتە بکات لەسەر حسابەکانی بانکی ناوەندی کەواتە بانکی (X) تەنها بڕی (٩٠٠٠) دۆلار دەتوانێت بدات بە قەرز بە یاوەرەکانی ئەوکاتە باڵانسی بانکی (X) بەم شێوەیە دەبێت:

| قەرزدەر (دۆلار) | قەرزدار (دۆلار) |
|---|---|
| بڕی پاشەکەوت ١٠٠٠ | ٠ |
| بڕی قەرز ٩٠٠٠ | ١٠٠٠٠ پارەی پاشەکەوتکراو |

گریمان کۆی بارستەی پارەکان لە وڵاتدا بریتییە لە (١,٢) ملیۆن دۆلار لەو پارەیە بڕی (١) میلۆن دۆلار بەشێوەیەکی پاشەکەوتکراو لەسەر حسابی بانکەکاندایە، وە بڕی (٢٠٠) هەزار دۆلار لەشێوەی کاشە بابزانین (پێکهاتەی) بارستەی پارە چی بەسەر دێت.

| بارستەی پارە (دۆلار) | |
|---|---|
| بڕی پارەی پاشەکەوتکراو | ١٠٠٠٠٠٠ |
| بڕی پارەی کاش | ٢٠٠٠٠٠ |
| بارستەی پارە | ١٢٠٠٠٠٠ |

گریمان یەکێك لە یاوەرەکانی بانکی (X) بڕی (١٠٠٠) دۆلار پاشەکەوت دەکات وە بەرامبەر ئەو بڕە کۆمپیالە لە بانك وەردەگرێت. ئەوکاتە باڵانسی بانکی (X) بەم شێوەیە دەبێت:

| قەرزدەر (دۆلار) | قەرزدار (دۆلار) |
| --- | --- |
| بڕی پاشەکەوت ٢٠٠٠ | ٠ |
| بڕی قەرز ٩٠٠٠ | ١١٠٠٠ پارەی پاشەکەوتکراو |

ئەوکاتە بارستەی پارە بەم شێوەیەی لێ دێت:

| بارستەی پارە (دۆلار) | |
| --- | --- |
| بڕی پارەی پاشەکەوتکراو | ١٠٠١٠٠٠ |
| بڕی پارەی کاش | ١٩٩٠٠٠ |
| بارستەی پارە | ١٢٠٠٠٠٠ |

ئەگەر بە وردی سەیری نموونەکەی سەرەوە بکەین دەبینین بارستەی پارە (M-1) ناگۆڕێت تەنها پێکهاتەکەی گۆڕاوە. (١٠٠٠) دۆلاری یاوەری بانکی (X) لە شێوەی پارەی کاشەوە چۆتە شێوەی پاشەکەوتکردن. واتە پاشەکەوتی بانکی (X) زیادی کردووە بەو بڕە پارەیە. بانك بەرامبەر ئەو پاریە کۆمپیالە دەدات بە یاوەرەکەی. ئەوکاتە بارمتەی بانکی (X) لە بانکی ناوەندی دەبێت بە (١١٠٠) دۆلار، کەواتە لەو (١٠٠٠) دۆلارە (٩٠٠) دەمێنێتەوە کەواتە بانکی (X) دەتوانێت بڕی (٩٠٠) دۆلار بدات بەقەرز بە یاوەرێکی تری وە بەرامبەری ئەمەش قازانجی سوود وەرگرێت.

ئەوکاتە پێکهاتە و باڵانسی بانکی (X) بەم شێوەیەی لێ دێت:

| قەرزدەر (دۆلار) | قەرزدار (دۆلار) |
| --- | --- |
| بڕی پاشەکەوت ٢٠٠٠ | ٠ |
| بڕی قەرز ٩٩٠٠ | ١١٩٠٠ پارەی پاشەکەوتکراو |



ئەوکاتە بارستەی پارە بەم شێوەی لێ دێت:

| بارستەی پارە (دۆلار) | |
| --- | --- |
| بڕی پارەی پاشەکەوتکراو | ١٠٠١٩٠٠ |
| بڕی پارەی کاش | ١٩٩٠٠٠ |
| بارستەی پارە | ١٢٠٠٠٠٠ |

کەواتە بەهۆی جموجوڵی پارەوە لەنێوان قەرزدەر و قەرزاردا (بانکی یاوەرەکانی) بارستەی پارە بە بڕی (٩٠٠) دۆلار زیادی کردووە. کەواتە بەهۆی ئەم پرۆسەیەوە بڕی (٩٠٠) دۆلار پارە دروست کراوە.

ئێستا هەوڵ دەدەین بزانین بڕی پارەی دروستکراو چی بەسەر دێت.

بێگومان یاوەری بانکی (X) کە قەرزی وەرگرتووە بە بڕی (٩٠٠) دۆلار ئەو قەرزەی وەرگرتووە بۆ جێبەجێکردنی پێویستییەکانی. گریمان قەرزار بە بەهای (٩٠٠) دۆلار پێویستییەکانی ناوماڵ دەکرێت وە بەشێوەی چەك ئەو پارەیە دەدات بە کۆمپانیا فرۆشیارەکە. ئەوکاتە کۆمپانیاکە ئەو چەکە (کۆمپیالەیە) دەدات بە بانکەکەی خۆی بانکی (Y)، ئەوکاتە بانکی (Y)، ئەو کۆمپیالەیە پێشنیازی بانکی (X) دەکات, بانکی (X) دەبێت ئەو بڕە پارەیە ڕەوانەی بانکی (Y) بکات.

کەواتە باڵانسی بانکی (X) بەم شێوەیەی لێ دێت:

| قەرزدەر (دۆلار) | قەرزدار (دۆلار) |
| --- | --- |
| بڕی پاشەکەوت ١١٠٠ | ٠ |
| بڕی قەرز ٩٩٠٠ | ١١٠٠٠ پارەی پاشەکەوتکراو |

بەڵام باڵانسی بانکی (Y) بەم شێوەیەی لێ دێت:

| قەرزدەر (دۆلار) | قەرزدار (دۆلار) |
| --- | --- |
| بڕی پاشەکەوت + ٩٠٠ | ١١٠٠٠ پارەی پاشەکەوتکراو |

جارێکی تر دەبینین پرۆسەی جموجۆڵی پارە لەنێوان بانکەکاندا کار ناکاتەسەر باستایی پارە. کاتێك بانکی (X) بڕی (٩٠٠) دۆلار ئاڕاستەی بانکی (Y) دەکات. ئەوکاتە یاوەری بانکی (X) کە قەرزی بە بڕی (٩٠٠) دۆلار وەرگرتووە دەبێت بەپێی پەیوەستنامەی قەرزی لەماوەیەکی دیاریکراودا قەرزەکەی لەگەڵ ڕێژەی سوودی قەرزدا بیگەڕێنێتەوە بۆ بانکی (X).

وەك لە نموونەکەی سەرەوەدا دەبینین بڕی (٩٠٠) دۆلار چۆتە سەر حسابی بانکی (Y) ئێستا بابزانین چی لەو پارەیە دێت.

بانکی (Y) بەهۆی پاشەکەوتی (٩٠٠) دۆلار لەسەر حسابەکەی دەتوانێت قەرز بدات بە یاوەرێکی تر بە بڕی (٨١٠) دۆلار. لەم حاڵەتەدا بارستایی پارەش دەگۆڕێت. ئەم پرۆسەیە بەردەوام دەبێت تاکو دەگاتە حاڵەتی هاوسەنگی. خاڵی هاوسەنگی ئەوکاتە ڕوودەدات ئەگەر هاتوو بانکەکان ئیتر پارەی پاشەکەوت کراویان نەمێنێت لەسەر حسابەکانیان, چونکە ئەگەر پاشەکەوت نەبێت ناتوانن قەرز بدەن بە یاروەرەکانیان.

لە نموونەکەی پێشوودا خاڵی هاوسەنگی ئەوکاتە ڕوودەدات ئەگەر هاتوو بەرامبەر هەر دۆلارێك (١٠) دۆلار پاشەکەوت بکرێت. چونکە بڕی بارمتە بریتییە لە (١٠٪)ی هەموو پاشەکەوتەکان. وە بەهەمان شێوە لە نموونەکەی پێشوودا پاشەکەوتی سەرەتایی بریتی بوو لە بڕی (١٠٠٠) دۆلار, کەواتە بانکەکان دەبێت پاشکەوتی (١٠٠٠٠) دۆلار بکەن چونکە پێویستە بە قەوارەی (١٠) جار پاشەکەوت زیاد بکرێت.

ئەوکاتە بڕی بارستایی پارە دەتوانین بەهۆی ئەم هاوکێشەیەی خوارەوە ژمێر بکەین.

(گۆڕانی کۆی بڕی بارستایی پارە = R 1 / + بڕی گۆڕانی پاشکەوت).

R- بڕی پاشەکەوتی (بارمتەی) ئیلزامی.

ئێستا ئەم هاوکێشەیە بەهۆی ژمارەی نموونەکەی سەرەوە دەنووسینەوە.

گۆڕانی کۆی بڕی بارستایی پارە = (١٠ × ١٠٠٠) دۆلار / ١

= (١٠ × ١٠٠٠) دۆلار

= ١٠٠٠٠ دۆلار.



کەواتە بەم شێوەیە بانکەکان پارە دروست دەکەن، وە بەم شێوەیە بڕی بارستایی پارە زیاد دەکات.

کەواتە ئێستاکە دەتوانین دەرئەنجامی ئەوە بکەین، کە چۆن دیاریکردنی بڕ و ڕێژەی بارمتەی پارە لەلایەن بانکی ناوەندییەوە کار دەکەنە سەر پرۆسەی دارایی قەرزی وڵات. کەواتە چەند ڕێژەی بارمتە کەمتر بێت ئەوا پارە زیاتر کۆدەبێتەوە و پاشەکەوت دەکرێت، ئەوکاتە بانکەکان دەتوانن زیاتر قەرز بدەن بە یاوەرەکانیان. بەڵام چەند ڕێژەی بارمتە زیاتربێت ئەوا بڕی پارەی پاشەکەوتکراو کەمتر دەبێتەوە, بانکەکان ناتوانن قەرزبدەن بە یاوەرەکانیان. کەواتە بانکی ناوەندی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەتوانێت کۆنترۆڵی تەواوی هەموو چالاکییە داراییەکانی وڵات بکات. وە بەمەش دەتوانین کاریگەری بکەینە سەر بارودۆخی ئابووری بەگشتی.

# فەسڵی شانزەهەم

## سیاسەتی قەرز و دارایی

ئێستا هەریەکە لە ئێمە دەزانین پارە چییە، وە چۆن پارە دروست دەبێت، وە هەروەها زانیمان کە بارستایی پارە چۆن چۆنی کاردەکاتە سەر ئابووری وڵات. وە هەروەها دەزانین بانکی ناوەندی بە چ شێوەیەك دەتوانێت کاریگەری هەبێت لەسەر بارودۆخی دارایی وڵات وە هەروەها دەزانین بارستایی پارە چ کاریگەرییەکی هەیە لەسەر خێرایی سوڕانەوەی پارە ... لەم فەسڵەدا هەوڵ دەدەین بەشێوەیەکی فراوان و ئاسان باس لە سیاسەتی قەرز و دارایی بکەین وەك ئامرازێکی تری گرنگ بە دەست حکوومەتەوە لە ڕێگەی بانکی ناوەندییەوە بۆ ئاڕاستەکردن و گەشەکردنی ئابووری و سەقامگیری باری کۆمەڵایەتی لە دەوڵەتدا.

## سیاسەتی قەرز و دارایی لە چالاکیدایە

هەروەك دەزانین سیاسەتی ئابووری بریتییە لە کۆمەڵێك کرداری حکوومەت بۆ ئەوەی کار لە ڕووداو و دیاردە ئابوورییەکان بکات، یان بریتییە لەبەرنامەیەکی داڕێژراو بۆ گەشەکردنی ئابووری لەپێناوی چارەسەرکردنی کێشەی هەڵاوسان، داشکانەوە جێگیرکردنی نرخ، دابەشکردنەوەی داهاتی نەتەوەیی کەم کردنەوەی بێکاری، هاوسەنگی باڵانسی ئابووری و بازرگانی...هتد. بێگومان بۆ جێبەجێکردنی هەموو ئەرکە ئابوورییانە حکوومەت پێویستی بە ئامراز و میکانیزمی ئابووری هەیە. یەکێکی تر لەو ئامرازە ئابوورییانە بریتییە لە سیاسەتی قەرز و دارایی. بەهۆی ئەم ئامرازەوە حکوومەت دەتوانێت سەقامگیری بارودۆخی ئابووری بکات، وە هەروەها سوڕە ئابوورییەکان چالاك بکات. چونکە:

– کاتێك ئابووری بەرەو گەشەکردن دەڕوات ئەوا دیاردەی هەڵاوسان زیاد دەکات، لەبەرئەوە حکوومەت ناچارە ڕێژەی سوودی قەرز بەرزبکاتەوە بۆ ئەوەی چارەسەری دیاردەی هەڵاوسان بکات و زیاد بوونی بارستایی پارە لاواز و سست بکات, چونکە ئەمە تەنها ڕێگەی خێرایە بۆ چارەسەرکردنی دیاردەی هەڵاوسان.



– بەڵام کاتێك ئابووری بەرەو داشکانەوە و تەنگەژی دەچێت، ئەوا حکوومەت ناچارە ڕێژەی سوودی قەرز کەم بکاتەوە و بارستایی پارە زیاد بکات، بۆ ئەوەی ئابووری تووشی تەنگەژەی قووڵ و درێژخایەن نەبێت.

کەواتە ئەرکی سەرەکی بانکی ناوەندی (حکوومەت) لەوەدایە کە کاریگەری سوڕی ئابووری نەرم و نیان بکات. ئەرکی سەرەکی کەم کردنەوەی هەڵاوسان لەکاتی گەشەکردنی ئابووریدا، وە نەهێشتن و کەم کردنەوەی بێکارییە لەکاتی تەنگەژی ئابووریدا.

ڕاستییەك هەیە دەبێت بزانین ئەویش ئەوەیە کاریگەری سیاسەتی قەرز و دارایی و هەموو فاکتەرە ئابوورییەکانی تریش یەکسەر و کتوپڕ کارناکەنە سەر ڕووداوە ئابوورییەکان. بەڵکو کاریگەرییەکە دوای ماوەیەك بەدەر دەکەوێت. بەڵام لەسەرێکی ترەوە بازاڕی دارایی واتە (بۆرسەکان، دەزگا دارییەکان، بانکەکان) یەکسەر و کتوپڕ هەست بە گۆڕانکارییەکانی سیاسەتی بانکی ناوەندی لە بواری داراییدا دەکەن، هەر ئەمەش دەبێتە هۆی دابەزاندن و بەرزبوونەوەی بەهای کاغەزی بەنرخ و بەهای پشکەکان لە بۆرسەکاندا.

هەرچەندە بۆرسەکان و دەزگا دارییەکان بەشێوەیەکی ساتی هەست بەگۆڕانی سیاسەتی بانکی ناوەندیی دەکەن, بەڵام ناتوانن بەتەواوەتی پێشبینی ئەنجامەکانی ئەو سیاسەتە بکەن. بۆ نموونە لەساڵی (٢٠٠٠)دا بڕی ڕێژەی سوودی قەرز لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بریتی بوو لە (٦,٥٪) بەڵام لەساڵی (٢٠٠٢)دا ئەو بڕە دابەزی بۆ (١,٢٥٪) کە بەنزمترین ڕادەی سوودی قەرز دەژمێردرێت لەماوەی (٤٠) ساڵی ڕابردوودا. واتە بانکی ناوەندی ئەمەریکا لەماوەی دوو ساڵدا بەڕێژەی (٥,٢٥٪) بڕی سوودی قەرزی کەم کردۆتەوە، ئەگەر حکوومەتی ئەمەریکی بەم شێوەیە ڕێژەی سوودی قەرزی نزم نەکردایەتەوە ئەوا ئابووری ئەمەریکا تووشی هەڵاوسانێکی قووڵ دەبوو وە بێکاری بڵاودەبووەوە و ڕادەی بەرهەمهێنان کەم دەبۆوە.

بێگومان جگە لەکاریگەری بانکی ناوەندی لەسەر دیاردەی هەڵاوسان، بێکاری و ڕادەی بەرهەمهێنان، فاکتەرێکی تری گرنگیش کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر ئەو دیاردانە ئەو فاکتەرەش خەرجی گشت حکوومەت، بازاڕەکانی دەرەوە، بازاڕی دارایی، تەکنەلۆژیای نوێ. ئەمڕۆکە جیهانی ئابووری واتە جیهانگیری ئابووری ئەوەندە هەستیار و خێرا کاردەکەنە سەر ئابووری هەموو جیهان کە لە هیچ قۆناغێکی تری مرۆڤایەتیدا ئەم دیاردەیە نەبووە. بۆ نموونە لەساڵی (١٩٩٧ — ١٩٩٨)دا ئابووری وڵاتەکانی ئاسیای ڕۆژهەڵات تووشی تەنگەژی بوو. ئەم تەنگەژییە یەکسەر کاری کردە سەر ئابووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا. چونکە زۆربەی

زۆری ناردنە لەئەمەریکاوە دەچێت بۆ ئەو وڵاتانە بە کەم بوونەوەی ناردنە لە ئەمەریکاوە بۆ ئەو وڵاتانە ئابووری ئەمەریکاش بەرەو تەنگەژی چوو لەسەرەتای ساڵەکانی (١٩٩٠)دا تەکنەلۆژیای زانیاری گەشەی کرد وە کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت بڵاوبوونەوە بەهەموو جیهاندا ئەمەش بووە هۆی گەشەکردنی ئابووری وڵاتە بەرهەمهێنەرەکان بێگومان ئەم پێشکەوتنە زوو یان درەنگ دەبێتە هۆی پەیدابوونی هەڵاوسان بۆیە بانکی ناوەندی ئەمەریکا پێشبینی ئەم دیاردەیەی کردووە و بڕی ڕێژەی سوودی قەرزی دابەزاند بۆ نزمترین ئاستی (١,٢٥٪).

بێگومان دەبێت شەفافیەتێکی تەواو هەبێت لە سیایەتی دارایی بانکی ناوەندیدا.

چونکە بێ بوونی شەفافیەت و روون و ئاشکرایی لە سیاسەتو هەنگاوەکانی بانکی ناوەندی رەنگە هەموو بازاڕی دارایی‌و بانکەکان تووشی ناپووتی زەرەر و زیانێکی زۆر بن، واتە ئەمەش زەرەر و زیان‌و ناپووتی دانیشتوانە بۆیە بانکی ناوەندی هەمیشە لە رێگەی میدیاوە ئاگاداری دانیشتوان و دەزگا داراییەکان دەکات لە پلان و نەخشەی بانکی ناوەندی. وە هەروەها بانکی ناوەندی پێویستە ساڵانە لەبەردەم پەرلەماندا راپۆرتی خۆی پێشکەش بکات بەو کارانەی کە ئەنجامی داوە وە پلان و نەخشەی کارکردنی لە داهاتوودا.

## کەمێك مێژوو!

لێرەدا هەوڵ دەدەین لەسەر نموونەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا رۆڵی سیاسەتی قەرز و دارایی بانکی ناوەندی ئەمەریکا هەر لەڕۆژی دامەزراندییەوە تاکو ئەمڕۆ نیشان بدەین وە کاریگەری ئەو سیاسەتە لەسەر گەشەکردنی ئابووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا روون بکەینەوە.

لەساڵی (١٩١٣) بۆ یەکەم جار بڕیاردرا بانکی ناوەندی ئەمەریکا دابمەزرێت، لەسەرەتاوە دەسەڵاتی بانکی ناوەندی زۆر سنووردار بوو. لەو سەردەمانەدا ئەرکی سەرەکی بانکی ناوەندی ئەوە بوو کار بکاتە سەر گەڕەلاوژێی‌و ناجێگیری بازاڕی دارایی‌و دابینکردنی قەرزدان بە بانکەکان بەڕێژەیەکی سوودی قەرزی نزم بەڵام وەك دەزانین تەنگەژەی ئابووری جیهانی‌و بەتایبەتی لە ئەمەریکا لەساڵەکانی (١٩٣١ – ١٩٣٣)دا پێویستی بەسیاسەتێکی نوێ و چارەسەرێکی خێراتر بوو بۆیە حکومەت و دەسەڵاتی یاسادانان دەسەڵاتی بانکی ناوەندییان زیاتر کرد. تاکو بەهۆیەوە بتوانن، لەو تەنگەژە ئابوورییە



قورتاربن. لەساڵی (١٩٥٠)دا ڕێژەی هەڵاوسان گەیشتە (٢٪), بەڵام رادەی گەشەکردنی ئابووری، لە ئاستی ڕێژەی (٣٪) بوو وە بێکاری بەرز بۆوە بۆ ڕێژەی (٤,٥٪) بۆیە بانکی ناوەندی بەپەلە چەند بڕیارێکی دەکرد و بۆ ئارام کردنەوەی ئەو بارودۆخە. بۆیە ئەو کاتە بانکی ناوەندی ڕێژەی سوودی قەرزی بەرز کردەوە. بۆ ئەوەی چارەسەری دیاردەی هەڵاوسان بکات بەڵام لەساڵی (١٩٦٠)دا هەڵاوسان جارێکی تر زیادی کردو بوودجە تووشی کورتهێنان بوو، خەرجی گشتی حکوومەت بۆ کاروباری سەربازی زیادی کرد چونکە ئەوکاتە ئەمەریکا لە جەنگدابوو لەگەڵ ڤێتنامدا. لەساڵەکانی جەنگدا ڕێژەی هەڵاوسان گەیشتە بڕی (٣,٩٪) وە ژمارەی بێکاری بە ڕێژەی (٤,٨) زیادی کرد. ئەوکاتە خۆپیشاندان و مانگرتن و دەنگی خەڵکی بەرزبۆوە دژی سیاسەتی بانکی ناوەندی وە تاوانباریان کرد بە ناتوانایی و ناپسپۆڕی کارمەندانی بانکی ناوەندی. بەڵام بەهۆی توندوتیژی و خەرجییەکی زۆری حکوومەتەوە لەجەنگدا بەرامبەر ڤێتنام بانکی ناوەندی نەیدەتوانی بەشێوەیەکی بنچینەیی کاربکاتە سەر وەستانی پرۆسەی هەڵاوسان چونکە خەرجی گشتی رۆژ بەرۆژ لەزیادبووندا بوو وە بودجەی ساڵانە تووشی کورتهێنان بوو بەڕادەیەك بڕی ڕێژەی هەڵاوسان لەساڵی (١٩٧٦)دا گەیشتە (٥,٨٪) وە لەساڵی (١٩٧٨)دا گەیشتە (١١,٣٥٪). ڕێژەی بێکاریش گەیشتە (٦,٢٪) هەمووی لە ئەنجامی جەنگی ئەمەریکا لەگەڵ ڤێتنامدا. بەڵام بەکۆتایی هێنانی جەنگ, بانکی ناوەندی هەموو دەسەڵات و هەرچی میکانیزمە بەکاری هێنان بۆ راوەستاندن و کەمکردنەوەی ڕێژەی هەڵاوسان تەنها لەساڵی (١٩٨٣) ئەمەریکا رزگاری بوو لەو قەیرانە وە ڕێژەی هەڵاوسان بوو بە (٣,٧٪) بەڵام کورتهێنانی بودجە بەردەوام بوو ئەوکاتە بانکی ناوەندی ڕێژەی سوودی قەرزی بەرزکردەوە بۆ (٩٪). وە دیاردەی بێکاری لەساڵی (١٩٨٣) گەیشتە (٩,٥٪) بەهۆی کاری هەمیشەیی و پسپۆڕی کارمەندانی بانکی ناوەندی لە ساڵەکان (١٩٩٠) تاکو (١٩٩٩) رادەی هەڵاوسان دابەزی بۆ (٢,٥٪) وە لەساڵی (٢٠٠١)دا ڕێژەی هەڵاوسان گەیشتە (٢٪) رادەی بێکاری نزم بۆوە بۆ (٥,٥٪).

لە باسەکەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێت کە لەماوەی (٥٠) ساڵدا بانکی ناوەندی توانیویەتی تا رادەیەك بارودۆخی ئابووری ئەمەریکا سەقامگیر بکات و ڕێژەی هەڵاوسان کەم بکاتەوە و ژمارەی بێکارەکان کەمتربێتەوە. ئەگەر سەیری قۆناغەکانی ئەو سەردەمە

بکەین لەساڵی (١٩٥٠) تاکو (١٩٦٠)، بانکی ناوەندی بەتەواوەتی توانویەتی ئەرکەکانی جێبەجێ بکات.

بەڵام لەساڵی (١٩٦٠ — ١٩٧٠)دا بانکی ناوەندی بە هیچ شێوەیەك نەیتوانیوە ئەرکەکانی جێبەجێ بکات. دیاردەی هەڵاوسان تەنها لەساڵی (١٩٨٠)دا کەم بۆوە. وە لەساڵەکانی (١٩٩٠ تاکو٢٠٠١) بانکی ناوەندی توانی ئەرکەکانی خۆی جێبەجێ بکات. بەڵام دوایی روداوی (١١ی سێپتێمبەری ٢٠٠١) و جەنگەکانی ئەمەریکا لە ئەفغانستان و عێراق جارێکی تر، ئابووری ئەمەریکا توشی قەیران و تەنگەژی کردۆتەوە وەك ساڵەکانی جەنگ لەگەڵ (ڤێتنامدا). ئەمڕۆکە بودجەی ئەمەریکا توشی کورتهێنانێکی قەبەو زۆر بووە گەیشتۆتە رادەی (٤٨٠) ملیار دۆلار. بانکی ناوەندی ئەمەریکا هەموو هێز و دەسەڵاتی خۆی بەکاردەهێنێت لەپێناوی رزگارکردنی ئابووری ئەمەریکا و سەقامگیرکردنی و رزگارکردن لە هەڵاوسان و بێکاری بەڵام هەموو کارەکانی بانکی ناوەندی بێسوودە چونکە خەرجییە گشتییەکان شەڕی ئەمەریکا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بۆتە بەربەستێکی گەورە لەبەردەم هەنگاوەکانی بانکی ناوەندیدا.

ئەمڕۆکە رێژەی سوودی قەرز لە ئەمەریکادا نزمترین رێژەیە کە بریتییە لە (١,٢٥٪) ئەوەتا دۆلار وەك دراوێکی جیهانی خەریکە خۆی لەدەست دەدات. ئابووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەمڕۆکە لە خراپترین و ترسناکترین قۆناغدایە کە بەشێوەیەکی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ کاردەکاتە سەر ئابووری جیهان، ئەگەر چارەسەرێکی خێرا نەدۆزرێتەوە بۆ رزگارکردنی ئابووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەوا هەموو جیهان تووشی تەنگەژی ئابووری قەیرانێکی ئابووری قوڵ و توندوتیژ درێژخایەن دەبێت.

# بەشی پێنجەم

## ئابووری جیهانی

ئابووری جیهانی بریتییە لە کۆی ئابووری نەتەوەیی، هەر چۆن ئابووری نەتەوەیی بریتییە لە کۆمەڵێك چالاکی لە بازاڕەکاندا، ئابووری جیهانیش بریتییە لە کۆمەڵێك چالاکی لە بازاڕەکانی جیهاندا وە بەشێوەیەکی فراوانتر. ئابووری جیهانی لەشێوەی بازرگانی دەرەکی و بازاڕی دارایی جیهانیدا بەرجەستە دەبێت. بێگومان ئابووری جیهانی ئاڵۆزتر و هەمەلایەنە لەچاو ئابووری نەتەوایەتییدا ئەویش بەهۆی چەند فاکتەرێکەوە ئەو فاکتەرانەش بریتین لەجیاوازی نێوان وڵاتەکانی جیهان، جیاوازی دراو، جیاوازی رادەی پێشکەوتن و گەشەکردنی ئابووری، جیاوازی زمان، کلتور، جیاوازی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی، جیاوازی بیرکردنەوە و هەڵس و کەوت، لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین باس لەبازاڕی جیهانی و بازرگانی دەرەکی و دارایی جیهان بکەین.

وە هەروەها باس لەشوێنی وڵاتە تازە پێشکەوتووەکان دەکەین لە سیستەمی ئابووری جیهانیدا وە باس لەوە دەکەین ئایا بۆچی وڵاتانی جیهان ئاڵوگۆڕ و بازرگانی لەگەڵ یەکتردا دەکەن؟ وە هەروەها باس لە دیاردەی جیهانگیری و بە جیهان بوونی ئابووری دەکەین وە باس لەو رێسا و فاکتەرانە دەکەین کە کاردەکەنە سەر ئابووری جیهانی.

# فەسڵی هەژدەهەم

## بازرگانی جیهانی

ئێمە تاکو ئێستا کە باسمان لە بازرگانی دەرەکی نەکردووە، واتە باسمان لە هاوردە و ناردن نەکردووە، هەروەك دەزانین هاوردە و نـاردە برگەیـەکی گرنگـی هاوکێـشەی تێکـڕای بەرهـەمی نەتەوەیی پێك دەهێنێت.

{(.G.N.P = C + I +G + (Ex. - Im}

بێگومان بازرگانی جیهانی باسێکی ئاڵۆزە و ئاسان نییە بەڵام ئێمە لەم فەسڵەدا هەوڵ دەدەین هەنگاو بەهەنگاو نـاوەڕۆکی بازرگـانی دەرەکـی ڕوون بکەینـەوە وەبـاس لـەوە دەکـەین بۆچـی وڵاتەکان ئاڵوگۆڕی بازرگانی لەگەڵ یەکتردا دەکەن؟ لەم ساڵانەی دواییدا هەندێ لە ئابووریناسـان وای بۆ دەچن کە گوایە بەهۆی بازرگانی دەرەکیو جیهانییەوە دەتوانرێت کێـشەی کـەمی کـاڵا و خزمەتگوزارییەکان لە جیهاندا کـەم بکرێتـەوە، وە بـەهۆی بـێ سـنوری بازرگـانی جیهانییـەوە دەتوانرێت کێشەی هەژاری و دواکەوتوویی چارەسەر بکرێت بابزانین بۆچی وا بیردەکەنەوە؟

### هاوردە و ناردەنی بۆچی؟

بـەگوێرەی گەشـەکردنی کۆمـەڵگا تاکـەکانی خـەڵك وە هـەروەها میللـەتان و وڵاتـەکان لەبەرهەمهێنانی هەندێ شمەکی دیاری کراودا پـسپۆڕییان پەیـداکردووە. هەنـدێ جـار زیـاد لـە پێویستییەکانی خۆیان بەرهەم دەهێنن بەڵام خەڵکانو میللـەتانی تـر پێویـستیان بـەو شمەکانـە هەبووە لەبەرئەوە کەوتوونەتە ئاڵوێری شمەك لە نێوان یەکتریدا. ئەمـەش بـووە هـۆی سـەرەتای پەیدابوونی بازرگانی دەرەکی (واتە دیاردەی کڕین و فرۆشتنی شمەكو خزمەتگوزارییەکان لەنێوان وڵاتو میللەتە جیاوازەکاندا بوو بەهۆی پەیدابوونی بازرگانی دەرەکـی) واتـە پرۆسـەی هـاوردە ناردە. بازرگانی دەرەکی پرۆسەیەکی ئاڵۆز و دژوارە بۆ ئاسان کردن لە تێگەیـشتنی ئـەم دیـاردە ئابوورییە گرنگە هەوڵ دەدەین بەهۆی ئەم نموونەیەی خوارەوە ڕوونی بکەینەوە.





بازرگـانی جیهـانی (نێودەوڵـەتی) International Trade:- ئـاڵ وگـۆڕکردنی شمـەكو خزمەتگوزاری لەنێوان دەوڵەتێك و دەوڵەتێکی دیکـەدا، ئەمـەش بـەهۆی جیـاوازی تێـچوونی بەرهەمی نێوان ئەم دەوڵەتانـەدا ڕوودەدات، یـان بـەهۆی توانـایی زیـادکردنی خۆشـگوزەرانی لەهەر دەوڵەتێکدا لە ڕێی هەمەجۆرکردنی شمەكو خزمەتگوزاری بەکاربردن تیایدا.

گریمان هەردوو وڵاتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ژاپۆن تەنها بەرهـەمی (خـۆراك و کۆمپیوتەر) دەکەن.

گریمانەی یەکەم

خشتەی ژمارە (١٧-١) توانای بەرهەمهێنانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا (هەزار/ لە هەفتەیەکدا).

| گریمانەکان | یەکەی بەرهەمی خۆراك | بەرهەمی کۆمپیوتەر |
|---|---|---|
| A | 0 | 12 |
| B | 3 | 9 |
| C | 6 | 6 |
| D | 9 | 3 |
| E | 12 | 0 |

خشتەی ژمارە (١٧-٢) توانای بەرهەمهێنانی ژاپۆن (هەزار/لە هەفتەیەکدا).

| گریمانەکان | یەکەی بەرهەمی خۆراك | بەرهەمی کۆمپیوتەر |
|---|---|---|
| A | 0 | 12 |
| B | 1 | 9 |
| C | 2 | 6 |
| D | 3 | 3 |
| E | 4 | 0 |

ئێستاکە هەردوو خشتەکەی سەرەوە بەهۆی ئەم دوو وێنەیەی خوارەوە نیشان دەدەین.




ئەگەر بە وردی سەیری هەردوو نەخشەکەی سەرەوە بکەین دەبینین هەردوو وڵات ئەمەریکا و ژاپۆن کۆمپیوتەر وەك و یەك بەرهەم دەهێنن، بەڵام ئەمریکا سێ جار زیاتر لە ژاپۆن خۆراك بەرهەم دەهێنێت، واتە ئەمریکا (١٢٠٠٠) یەکە خۆراك لە هەفتەیەکدا بەرهەم دەهێنێت بەڵام ژاپۆن تەنها بڕی (٤٠٠٠) یەکە خۆراك بەرهەم دەهێنێت لە یەکەم روانگەوە دەردەکەوێت کە ئەو دوو وڵاتە پێویستییان بە ئاڵوگۆڕ نییە لە نێوان یەکتردا چونکە هەردوو وڵات وەك یەك کۆمپیوتەر بەرهەم دەهێنن، ئەمریکا سێ جار خۆراك زیاتر بەرهەم دەهێنێت بەڵام ژمارەی دانیشتوانی ئەمەریکا لە ژاپۆن زیاترە ئەو خۆراکە بەرهەمهێنراوە تەنها بەشی بەکارهێنانی ناوخۆ دەکات.

بەڵام ئەم بۆچوونە راست نییە چونکە بنچینەی ئاڵوگۆڕی شمەكو خزمەتگوزارییەکان بریتییە لە بڕی تێچوون (خەرجی) لەو بەرهەمانەدا کەپێی دەوترێت (تیۆری تێچوون).

ئابووریناسی ئینگلیزی (دێڤید ریکاردۆ) بۆ یەکەم جار باسی لەم تیۆرە کرد.

**فەرهەنگی ئابووری**

دێڤید ریکاردۆ (١٧٧٢—١٨٢٣): ئابووریناسێکی ئینگلیزییە و یەکێکە لە ڕێبەرەکانی ئابووری کلاسیکی. گرنگترین بیروڕاکانی لەم کتێبەدا روون کردەوە کە ناوی (مەبدەئەکانی ئابووری سیاسی و باج)ی لێ لێنا.



ڕیکاردۆ گرنگی زۆری داوە بە تیۆری بەهاو بەشێکی گەورەی بۆ تەرخان کردووە. بایەخێکی زۆریشی دابوو بە تیۆری کرێی کار و قازانج و موڵکانە و قۆناغەکانی گەشەکردنی ئابووری و رۆڵی دراو و میکانیزمەکانی بانك و بازرگانی نێودەوڵەتی.

بەپێی لێکۆڵینەوەی (ڕیکاردۆ) دەبێ هەر وڵاتە تایبەتمەندێتی ڕێژەیی ئاستی بەرهەمهێنانی خۆی لەبەرچاو بگرێ و پڕۆسەی بازرگانی دەرەوە لەسەر ئەو بناغەیە دابمەزرێنێ چونکە پەیڕەوکردنی کێبەرکێی رەهای بازرگانی، بە قازانجی ئەو وڵاتە دەشکێتەوە کە خاوەنی خسوسیەتی خۆیەتی.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ نموونەکەی پێشوومان کاتێك ئەمریکا بخوازێت بەرهەمی کۆمپیوتەر زیاد بکات ئەو کاتە دەبێت بەرهەمی خۆراك کەم بکاتەوە. وە هەروەها دەبێت بزانین بەهای تێچوونی بەرهەمی یەك کۆمپیوتەر لەئەمەریکا چەندە، وە هەمان بەهای تێچوون بۆ یەك کۆمپیوتەر لە ژاپۆن چەندە، ئەمەش دەبێتە هۆی پێداویستییەکانی پەیدابوونی ئاڵوگۆڕ لەنێوان دەوڵەتاندا بەپێی بۆچوونەکانی ریکاردۆ لە بازرگانی دەرەوەدا ئەو وڵاتانە سودمەند دەبن کە بەهای تێچوونی بەرهەمەکانیان کەمتر بێت لە بەهای تێچوونی بەرهەکانی وڵاتەکانی تر لە بەرهەمی لێکچوودا. کەواتە هەردوو وڵات دەبێت ئەو شمەكو خزمەتگوزارییانە بەرهەم بهێنن کە تێچوونەکەی کەمترە لە وڵاتێکی تر واتە پسپۆڕی شارەزاییان لە چ بەرهەمێکدا هەبێت ئەو شمەکە بەرهەم بهێنن کەواتە ئەمەریکا لەبەرهەمهێنانی خۆراکدا بە تواناترە وەك لە ژاپۆن. کەواتە ئەمەریکا زیاتر سوودمەند دەبێت ئەگەر بەرهەمی خۆراك بگۆڕێتەوە بە کۆمپیوتەر لە ژاپۆن، چونکە تێچوونی بەهای خۆراك لە ئەمەریکا کەمترە وەك لە ژاپۆن بەڵام تێچوونی بەهای کۆمپیوتەر کەمترە وەك لە خۆراك لە ژاپۆندا.

کەواتە بەپێی نموونەکەی سەرەوە باشتروایە ئەمریکا تەنها خۆراك بەرهەم بهێنێت وە ژاپۆن بەرهەمی کۆمپیوتەر وە ئەوکاتە ئاڵوگۆڕی بکەن لەنێوان یەکتردا هەردوولا سوودمەند دەبن.

## ئازادی بازرگانی و لایەنگرەکانی

بێگومان ئێمە زۆر بەشێوەیەکی سادە و ساکار بەهۆی نموونەکەی سەرەوە بازرگانی دەرەکیمان روون کردەوە تەنها بۆ تێگەیشتن بوو لە پرنسیپە سەرەکییەکانی بازرگانی دەرەکی, بەڵام لە پراکتیکدا ئەم پرۆسەیە گەلێك ئاڵۆز و هەمەلایەنە چونکە لە جیهاندا سەدان وڵات هەزاران شێوەی شمەكو خزمەتگوزاریی بەرهەم دەهێنن وە ئاڵوگۆڕی بازرگانی لەنێوان یەکتردا

دەکەن وە چەندان فاکتەری ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئایینی کاردەکەنە سەر ئەو ئاڵوگۆڕ و بازرگانییە دەرەکییانە. بەڵام پرنسیپی سەرەکی و تێچوون و توانای بەرهەمهێنان لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر دەگۆڕێت و جیاوازە. هەر لەسەر ئەم بنچینەیە و بۆچوونە ئەمڕۆکە ژمارەیەکی زۆر لە ئابووریناسان لایەنگری ئازادی بازرگانی دەکەن.

ئەو ئابووریناسانەی کە لایەنگری ئازادی ئابووری دەکەن دەڵێن بەهۆی پرنسیپی ئابووری ئازادەوە دەتوانرێت بڕێکی زۆر بەرهەم بهێنرێت وە ژمارەیەکی زۆر بەکاربەر دروست دەبێت.

وە هەروەها دەڵێن کە بەهۆی ئازادی بازرگانییەوە هەموو وڵاتەکان سوودمەن دەبن وە بەکاربەر لەهەموو قوژبنێکی جیهاندا سوودمەند دەبێت.

ئێستاکە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ نموونەکەی پێشووتر لەهەردوو خشتەی ژمارە (١٧-١) و (١٧-٢) بۆمان دەردەکەوێت ئەوکاتە بڕی بەرهەم و بەکارهێنان زۆرتر دەبێت و زیاد دەکات ئەگەر هەر وڵاتە ئەو شمەکە بەرهەمبهێنێت کە زیاتر پسپۆڕی تێدایە و بڕ و بەرهەمی تێچوونەکەی کەمتر دەبێت.

بیرۆکەی ئازادی بازرگانی لەوەدایە کە هەر وڵاتەی بەرژەوەندی وایە بایەخ بە بەرهەمهێنانی ئەو کاڵایە بدەن کە بۆ ئەوان خسوسیەتی خۆی هەیە، ئەوکاتە زۆرتریان لە بازاڕی یەکتردا دەستگیردەبێ، وەك لە بازاڕەکانی ناوخۆیاندا.

**فەرهەنگی ئابووری**

بازرگانی ئازاد Free Trade:- بریتییە لە لابردنی ئەو کۆت‌و کۆسپ و باجە گومرگییانەی کە دەوڵەت بۆ چەند مەبەستێکی خۆی بەسەر بازرگانیدا دەیسەپاند.

خشتەی ژمارە (١٧-٣) تایبەتمەندێتی بەرهەمی ئەمەریکا و ژاپۆن.

| گریمانەکان | بەرهەمی خۆراك | بەرهەمی کۆمپیوتەر |
|---|---|---|
| ئەمەریکا | 6000 | 6000 |
| ژاپۆن | 2000 | 6000 |
| سەرجەم | 8000 | 12000 |

کۆی گشتی هەموو بەرهەمەکان یەکسانە بە (٢٠٠٠٠) یەکە.

گریمان هەر وڵاتێك تایبەتمەندە تەنها بەیەك شێوە بەرهەم هێنان.



| گریمانەکان | بەرهەمی خۆراك | بەرهەمی کۆمپیوتەر |
|---|---|---|
| ئەمەریکا | 12000 | 0 |
| ژاپۆن | 0 | 12000 |
| سەرجەم | 12000 | 12000 |

کۆی گشتی هەموو بەرهەمەکان یەکسانە بە (٢٤٠٠٠) یەکە.

کەواتە ئەگەر هەر وڵاتێك خسوسیەتی تەنها لە شێوەیەك (یان چەند شێوەیەك) بەرهەمهێنان هەبێت ئەوا هەمیشە بڕی بەرهەمەکەی زیاتر دەبێت و تێچوونەکەی کەمتر دەبێت، ئەمەش دەبێتە هۆی بردنەوەی لە ئاڵوگۆڕی بازرگانی دەرەکیدا.

## ئازادیی بازرگانی و دژەکانی

ئەو لایەن و ئابووریناسانەی کە دژی ئازادیی بازرگانین پاڵپشتن بەچەند دەرئەنجام و فاکتەری گرنگ. دژەکانی بازرگانی ئازاد دەڵێن بازرگانی ئازاد تەنها سوودمەندە بۆ چەند وڵاتێکی دیاریکراو و چەند گروپێکی دیارکراو چونکە لە بازرگانیی ئازاددا زۆربەی زۆری وڵاتان و دانیشتوان تووشی زەرەر و زیان‌و ناپوتی دەبن وە ئەو بۆچوونانەش لەم خاڵانەی خوارەوەدا پۆلێن کراون.

- کەم کردنەوەی شوێنی کار لە وڵاتدا و زۆربوونی بێکاری.
- چوونە دەرەوەی بەشێکی زۆر لە داهاتی نەتەوەیی.
- زیاد بوونی مەترسی لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی.
- پێشێلکردنی مافی کارکەران و کرێکاران لە وڵاتەکانی دەرەوەدا.

ئێستاکە هەریەکە لەم فاکتەرانەی کە دژ بەئازادیی بازرگانین روون دەکەینەوە.

**شوێنی کار و بێکاری:**

پارێزگاری کردن و زیادکردنی شوێنی کارکردن و کەم کردنەوە و نەهێشتنی بێکاری ئەرکێکی سەرەکی و گرنگی حکومەتەکانە وە فاکتەرێکی گرنگە بۆ گەشەکردنی ئابووری و سەقامگیری

باری کۆمەڵایەتی وڵات. لەم سەردەمەدا بڕبڕەکانی بازرگانی هەموو بوارەکانی بازرگانی گرتۆتەوە. هەندێ وڵات و کۆمپانیا دەتوانن زۆربەی شمەكو خزمەتگوزارییەکان بە بەهای تێچوونێکی کەمتر بەرهەم بهێنن وەك لەهەمان شمەكو خزمەتگوزاری بەرهەمهێنراو لە ناوخۆی وڵاتدا واتە لەبەرهەمە ناوخۆییەکان، ئەمەش دەبێتە هۆی تەنگەژی و بێ بازاڕی بەرهەمە ناوخۆییەکان کە لەئەنجامدا دەبێتە هۆی ناپوتی کارگە و کۆمپانیا بەرهەمهێنەرەکان واتە کەم کردنەوەی شوێنی کار و بڵاوبوونەوەی بێکاری ئەمەش لەئەنجامی ئازادیی بازرگانیدا روودەدات. بەڵام تەنها چارەی ئەم دیاردەیە لەوەدایە کە بەرهەمهێنەرە ناوخۆییەکان پێویستە جۆرێتی بەرهەمەکانیان زۆر باشتر بکەن وەك لەبەرهەمهێنراوە هەرزانەکان، هەروەها لەسەر حکوومەت پێویستە لەڕێگەی پەروەردە و میدیاکانەوە هەستی نیشتیمانی و نەتەوایەتی بەرزبکاتەوە بەرامبەر شمەك و خزمەتگوزارییە ناوخۆییەکان هەرچەندە بەهاکەیان زیاتریش بێت.

**چونە دەرەوەی بەشێکی زۆر لە داهاتی نەتەوەیی:**

ئەگەر جارێکی تر سەیری هاوکێشەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی بکەین { $G.N.P = C + I + G + (Ex - Im)$ } دەبینین چەند بڕی هاوردە زۆرتربێت وەك لەناردە ئەوا تێکڕایی بەرهەمی نەتەوەیی کەم دەبێتەوە، بێگومان ئەم بۆچوونە لەسەرێکەوە راستە و لەسەرێکی تریشەوە هەڵەیە. بۆ یەکەم جار پاڵپشتان و لایەنگرانی مانەوەی پارە لەناو وڵاتدا و رێگەنەدان بە نەچوونە دەرەوەی بۆچوونی راڕەوی بازرگانی (قوتابخانەی مێرکێنتیلیزمەکان) بوو.

**فەرهەنگی ئابووری**

ڕاڕەوی بازرگانەکانMercantilism :- ئەو بیرو رامیارییە ئابووریانەیە کە لە نیوەی دووەمی سەدەی پازدەهەم تا نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەم باڵی کێشا بەسەر ناوچەو هەرێمەکانی ئەوروپای ئەوسادا.

ئەم راڕەوە بەناوی دەستەیەك لە دامەزرێنەرەکانییەوە ناونرا کە زۆربەیان خاوەن کارە بازرگانی و ئابوورییەکان بوون، لەوانە کۆلبیرت و ئەنتواندی مۆنتیکریتیان و فۆریۆنی و میلۆنۆلۆ لە فەرەنسا، کرمۆتیل و شیلۆد بیکۆنو دافیناو تۆماس مان و تمیل و موون لە ئینگلتەرا، ئەنتۆنیۆ سیراو بروجیا لە ئیتاڵیا، بوترسی گەورەش لە روسیا، فردریك و مکۆك و شرایوەر لە ئەڵمانیا.

لەڕاستیدا ئەم راڕەوە لەسەر پاشماوە رووخاوەکەی سیستەمی دەرەبەگایەتی دروست و لە دایك بوو.



بەشێوەیەکی گشتی ئەم بیروڕایانەی کە لەم راڕەوەدا یان لەم قوتابخانەیەدا کۆبوونەوە لەم خانەدا کورتیان دەکەینەوە:

١) دەست تێنەخستنی دەوڵەت لە نێو چالاکییە ئابوورییەکاندا، بۆ جێبەجێکردن و بەدەستهێنانی سامان و دەوڵەمەند بوون.

٢) پێویستە لەسەر دەوڵەت بەهێز و بەتوانا بێت، بۆیە ئامانجی سیستەمی ئابووری هێنانەدی ئەم هێز و توانایەیە، ئەم تیۆرییەیان (ئابووری بە هێز)ی پێ دەگوترێ.

٣) هێز و توانای دەوڵەت بەمەسەلەی سامانەوە بەندە، بۆیە پێویستە لەسەر دەوڵەت هەوڵ بدات سامانەکەی خۆی پەرە پێ بدات، سامانیش لێرەدا بڕێکە لە زێڕ و زیو و کانزا دانسقە بە نرخەکان کە لای دەوڵەتن.

٤) بڕی سامان لەجیهاندا قەوارەیەکی نەگۆڕە.

٥) هۆی بەرزبوونەوەی نرخ لە بازاڕی ناوخۆدا زیادبوونی بڕی پارەیە لەئەنجامی زیادبوونی بڕی زێڕ و زیو بەشێوەیەکی بەردەوام لەبازاڕدا.

٦) بایەخدان تەنها بەو پیشەسازییانەی کە بۆ مەبەست هەناردن بەرهەم دەهێنرێن، کە ئەمە بووە هۆی پشتگوێ خستنی ئەو چالاکییە ئابوورییانەی کە مەبەستیان هەناردن نەبوو، نەك هەر ئەمانە بەڵکو کشتوکاڵیش بە جارێك پشتگوێ خرابوو.

٧) بەدەستهێنانی زێڕ و زیو لەڕێی جێبەجێکردنی زیادەیەك لە بودجەی بازرگانیدا ئەگەر ئەم خاڵانەی سەرەوە بیروڕای گشتی ئەم راڕەوە بوو، بەڵام هەر دەوڵەتێك رامیارییەکی جیاوازی بەجێ دەهێنا لەپێناوی هێنانەدی ئەم بیروڕایانە:

- رامیاری کانزایی (Bullionise): ئەمەش یەکەم روخساری رامیاری بازرگانەکانە و بریتییە لەو ئامرازانەی کە ئیسپانیا بەجێی دەهێنا بۆ قەدەغەکردنی هەناردە و چوونە دەرەوەی پارەی کانزایی و کانزا دانسقەکان لەو وڵاتەوەو خۆ ماندوکردن بۆ هێنانە ناوەوەی.

- رامیاری پیشەسازی (Industralisme): ئەمەش هەوڵی ئاڕاستەکردنی سیستەمی ئابووری بەرەو پیشەسازی دەدات، چونکە هۆیەکە بۆ زیادکردنی بەروبووم و سامان و زۆرکردنی هەناردە.

- رامیاری بازرگانی یان چاوگەی بازرگانی (Mercantilisme): ئەم روخسارە بازرگانی بەهۆیەکی بەتین دادەنێت بۆ دەوڵەمەند بوون و بەهێزبوون، واتە بازرگانی بەکارترە لە پیشەسازی و کشتوکاڵ، چونکە بارودۆخێکی گونجاو ئامادە دەکات لەبەردەم بەرهەمهێنان و ئاڵوویر و بەکارهێناندا.

بێگومان بۆچوونی (مێرکێنتیلزمەکان) لە قۆناغەکانی پێشووی گەشەکردنی ئابووریدا تا رادەیەك راست بوو, بەڵام ئەمڕۆکە مامەڵە و چالاکییە ئابوورییەکان بەشێوەیەك گۆڕاون، کە ناتوانرێت تیۆری سنوردارێتی بازرگانی کە مێرکێنتیلیزمەکانی بانگهێشتیان بۆ ئەکرد لە پراکتیکدا جێبەجێ بکرێت. بە زیاتر ناردنە دەرەوەی شمەك و خزمەتگوزارییەکان داهاتی نەتەوەیی زیاد ناکات ئەگەر ئەو داهاتە بەکار نەهێنرێت بۆ فراوانکردنو تازەکردنەوەی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان و کڕینی تەکنەلۆژیای نوێ و مۆدێرن لەبواری بەرهەمهێناندا. نموونەمان زۆر لەبەردەستدایە، هەندێ وڵاتانی تازەپێشکەوتوو لە نادرنە دەرەوەی کەرەستەی خاوی ژێر زەوی (نەوت و گاز,..هتد) داهاتێکی زۆریان دەست دەکەوێت. بەڵام ئەو داهاتە لەبواری بەکاربردندا بەکاردەهێنێت نەك لەبواری پێشکەوتنی پیشەسازی و بەرهەمهێناندا, کەواتە زیادبوونی ناردنە دەرەوە مەرجی سەرەکی نییە بۆ زیادکردنی داهاتی نەتەوەیی و چوونە دەرەوەی پارەی نەتەوەیی.

**زیادبوونی مەترسی لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی:**

بەرژەوەندی ئاسایشی نەتەوەیی یەکێکە لە ئەرکە هەرە گرنگەکانی حکوومەت، چەندان رێگە هەیە لەبەردەم حکوومەتەکاندا بۆ پاراستنی ئاسایشی ئابووری نەتەوەیی بەتایبەتی لە کەرتی پیشەسازی سەربازی و چەك و پێویستییەکانی گرنگی و پاراستنی ئەو کەرتە لە دوولاوە گرنگە، لایەکیان بەرهەمهێنانی پێویستییەکانی نەتەوەیی لە بەرگری کردنی سەربازیدا، لایەکەی تریان فرۆشتن و ناردنەدەرەوەی چەك و تفاق و تەکنەلۆژیای سەربازی سەرچاوەیەکی گرنگی داهاتە. وە هەروەها کەرتی وزە و سووتەمەنی بە یەکێك لە کەرتە گرنگ و ستراتیژییەکانی نەتەوەیی دەژمێردرێت وە پێویستە ئەم کەرتە تەنها نەتەوەیی(خۆماڵی) بێت.

ئەوانەی دژی ئازادیی بازرگانین دەڵێن ئەگەر بازرگانی بەتەواوەتی ئازادبێت ئەوا مەترسی گەورەی دەبێت لەسەر بەرژەوەندی ئاسایشی نەتەوەیی چونکە کەرتە گرنگ و ستراتیژەکانیش دەکەونە بەردەم شاڵاو و کاریگەری کۆمپانیا بیانییەکان.

جگە لەم فاکتەرانەش چەندان فاکتەری تریش هەیە کە دژانی ئازادیی بازرگانی پشتی پێ دەبەستن. وەك دیاریکردنی (کڤۆت)، وە هەروەها کۆچکردن و بەکارهێنانی هێزی کاری بێگانە بەتایبەتی بەشێوەیەکی نایاسایی...هتد.



## سنوردارێتی بازرگانی جیهانی

مەبەست لە بازرگانی ئازاد لە بازاڕەکانی جیهاندا واتە ئاواڵەکردنی سنورەکان لەبەردەم شمەك و خزمەتگوزارییەکاندا لابردنی هەموو رێگر و سنوردارێتی لەبەردەم ئاڵوێری بازرگانیدا. بەڵام لەڕاستی و پراکتیکدا ئەو وڵاتانەی کە دەڵێن بازرگانی ئەمڕۆ ئازادە و هیچ سنوردارییەك نییە لەبەردەمیدا بەتایبەتی لە قۆناغی بەجیهان بوونی ئابووریدا، راست نییە بەڵکو زۆربەی وڵاتانی جیهان بەتایبەتی وڵاتە پیشەسازییە گەورەکان پەیڕەوی بیرۆکەی ئازادی بازرگانی تەنها بەگوتار دەکەن چونکە چەندان راگر و سنوردارێتی لەبەردەم ئازادی ئاڵوێردا دادەنێن هەرە ئامرازە گرنگەکانی سنوردارێتی بازرگانی بریتییە لە:

- گومرگ.
- سیستەمی بەشبەشکاریی.
- سنوردارێتی یاسای تایبەتی بە بازرگانی.

ئێستا سەیری هەریەکە لەو ئامرازانەی سەرەوە بەجیاجیا دەکەین.

- گومرگ:- واتە دانانی باجێکی دیاریکراو لەسەر شمەكو خزمەتگوزارییە هاوردەکان بۆ ناوخۆی وڵات، ئەمەش دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی نرخی شمەكو خزمەتگوزارییە هاوردەکان وە هەروەها حکوومەت بەهۆی بڕی گومرگەوە داهاتی خۆی زیاددەکات.

- سیستەمی بەشبەشکاریی:- دانانی سنورێکی دیاریکراو بۆ چەندایەتی هاوردەی هەندێ شکمەكو خزمەتگوزاری بۆ ناوخۆی وڵات. کەواتە حکوومەت بەهۆی ئەم ئامرازەوە دەستنیشانی بڕ و چەندایەتی هاوردە دیاری دەکات.

- سنوردارێتی یاسای تایبەتی بە بازرگانی:- بریتییە لەچەند یاسایەکی تایبەتی بۆ سنوردارێتی هاوردە و ناردنە دەرەوەی هەندێ لە شمەكو خزمەتگوزارییەکان بۆ هەندێ وڵاتانی دیاریکراو لەماوەیەکی دیاریکراودا. ئەم ئامڕازە زیاتر ئامرازێکی سیاسییە وەك لە ئابووری ئەمڕۆ کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەشێوەیەکی هەمیشەیی ئەم ئامڕازە بەکاردەهێنێت لەگەڵ ئەو وڵاتانەی کە ناکۆکیان هەیە لەگەڵ سیاسەتەکانی ئەمەریکا. بۆ نموونە ئابڵۆقەی ئابووری (عێراق).

**فەرهەنگی ئابووری**

گومرگ:- بریتییە لەبڕی باج لەسەر شمەك و خزمەتگوزاری هاوردە.

سیستەمی بەشبەشکاریی:- بریتییە لە سنووداریتی چەندایەتی شمەك و خزمەتگوزاری هاوردە کە دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی نرخ لەسەر ئەو شمەك و خزمەتگوزارییانە.

سنووردارێتی یاسای تایبەت:- بریتییە لە هەندێ یاسای تایبەت بەرامبەر هەندێ دەوڵەت بەکاردەهێنرێت بۆ ماوەیەکی دیاریکراو وەکو ئامرازێکی سیاسیو ئابووری.

## رێکخراوی بازرگانی جیهانی

رێکخراوی بازرگانی جیهانی بریتییە لە رێکخراوێکی نێودەوڵەتی زۆر گەورە، هەڵدەستێت بە رێکخستنی چالاکییە بازرگانییەکانی نێوان دەوڵەتانی ئەندامی ناو رێکخراوەکە. دانوستان و گفتوگۆ لەگەڵ فرەلایەنەکان ساز دەکات... رێکخراوی بازرگانی جیهانی بەشێوەیەکی بنەڕەتی خاڵەکانی رێکەوتننامەی بازرگانییەکەی پێش خۆی کە بەرێکەوتننامەی (ئۆرۆگوای) ناسراوە جێبەجێ دەکات.

**فەرهەنگی ئابووری**

رێکەوتننامەی ئۆرۆگوای (١٩٨٦—١٩٩٤):- یەکێك بوو لەجەولە گرنگەکان و رێکخراوی بازرگانی جیهانی تێدا دروست بوو، بۆ یەکەم جار بوو لەم جەولەیە باس لە کاڵا کشتوکاڵییەکان بکرێ جگە لەوەی چەند مەسەلەیەکی تری وەك کەرتە خزمەتگوزارییەکان و سەربەستی لە گواستنەوەی سەرمایە لەدەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی تر باسی لێوە کرا، ئەم گفتوگۆیانە بۆ ماوەی (٧) ساڵ بەردەوام بوو تا لەمانگی چواری ساڵی (١٩٩٤)دا نوێنەرانی (١١٧) دەوڵەت لە شاری مەراکیش جاڕی دەست بەکاربوونی رێکخراوی بازرگانی جیهانیان راگەیاند، دروست بوونی ئەم رێکخراوە تەکەتولاتی ناوچەیی (ئەورووپاو ئەمەریکاو ژاپۆن)ی نەهێشت گرژیو ئالۆگۆڕە بازرگانییەکانی کەمکردەوە و سیستەمێکی دامەزراوەیی خۆی نیشاندا و سەرپەرشتی ئالوگۆڕە بازرگانییەکانی دەکرد. پاڵپشتی چەندین باو و رێسای نوێی ئابووری.

کۆتایی جەولەی ئۆرۆگوای ساڵی (١٩٩٦)، سەرەتای دەرکەوتنی قۆناغێکی نوێی ئابووری جیهانی بوو. ئەم قۆناغە بەوە جیاکرایەوە کە هیچ بەربەستێکی لەبەردەم ئالوویرە بازرگانییە جیهانییەکاندا نەهێشت، ئەم قۆناغە دەوڵەتە تازە پێشکەوتووەکانی بەوە ترساند، کە ئابووری دەوڵەتە دەوڵەمەندەکان و پیشەسازییە پێشکەوتووەکانی ئەمەریکا و ژاپۆن و ئەورووپا زاڵ بێت بەسەر ئابوورییەکانیاندا لەدایك بوونی رێکخراوی بازرگانی جیهانی کاری کردە سەر ئابووری



جیهان و کاریشی کردە سەر پەیوەندییە ئابوورییەکانی نێوان باکورو باشور، بەجۆرێك وای لە باکور کرد کە (٨٧٪)ی دەرامەتی جیهانی بۆ خۆی بێت و لە (٩٤٪)ی هەناردەکانی جیهانی هەر هی خۆی بێت.

هەر لەم بارەوە (کۆمپانیا فرە رەگەزەکان) کە بەشێکن لە گۆڕانکارییە ئابوورییە نوێییەکانی جیهان، باشوریان بەوە ناچارکرد کە رێگەی وەبەرهێنانێکی نوێ بگرنەبەر لەم حاڵەتەشدا باشور پێویستە پەنابەرێتە بەر بەرنامە چاکسازییەکانی سندوقی نەختینەی دەولی ئەمەش پشتی بەستووە بەکەم کردنەوەی رەسمی گومرگی لەسەر کاڵا هاوردەکان و ئیمتیازاتی وەبەرهێنانە بیانییەکان، ئەم حاڵەتەش فەرزی دەوڵەتانی باشور دەکات کە بەناچاری بێتە ریزی رێکخراوی بازرگانی جیهانییەوە.

دەست بەکاربوونی رێکخراوی بازرگانی جیهانی کۆمەڵێك پەیوەندی بازرگانی چڕوپڕ و لێکگرێدراو تێهەڵکێشراوی لەگەڵ خۆدا هێنا، ئەم رێکخراوەی کە (١٤٤) دەوڵەت پەیوەندی پێوە کردووە نیشانەی ئەزموون و باڵادەستی سیستەمی سەرمایەدارییە بەهەموو پرنسیپ و میکانیزمەکانییەوە.

بەکورتی لەدایك بوونی رێکخراوی بازرگانی جیهانی لەپاش تێپەڕبوونی قۆناغە یەك بەدوای یەکەکانی و گەیشتنی بەم قۆناغەی ئێستا بەشێوەیەکی گشتی کۆمەڵێك دەستکەوتی لەگەڵ خۆیدا هێنا بۆ سەرجەم تێکڕای مرۆڤایەتی, بەڵام لێرەدا ئەوەی گرنگە ئایا رۆڵی ئەم رێکخراوە بەسەر دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەکانەوە تا چ رادەیەك لە پێگەیاندنی قازانجە یان زیان؟

رێکخراوی بازرگانی جیهانی گوڕێکی زیاتری دایە دەوڵەتانی تازە پێشکەوتوو بەرەو بەجیهان بوونی. ئەم بەجیهان بوونەش بووە رەهەندێکی گشتگیری لەئاستە ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکاندا.

دەتوانین بڵێین پاش دەست بەکاربوونی رێکخراوی بازرگانی لایەنی ئابووری جیهانی وەرچەرخانێکی گەورەی بەخۆوە بینی و کۆمەڵگای مرۆڤایەتی ناچارکرد بۆ جارێکی تر بە پرنسیپ و ئایدۆلۆژیا ئابوورییەکانی خۆیاندا بچنەوە.

# فەسڵی هەژدەهەم

## دارایی جیهانی

لەفەسڵی حەڤدەهەمدا باسمان لە بازرگانی و ئاڵوێری جیهانی کرد، بەڵام باسمان لەوە نەکرد کە ئایا کڕیار و فرۆشیار لە وڵاتە جیاجیاکانی جیهانی بە چ نرخ و بە چ جۆرە پارەیەك مامەڵە لەگەڵ یەکدی دەکەن، چونکە هەر وڵاتەی پارە و دارایی نەتەوەیی خۆی هەیە.

کاتێك کەشتییەك گەنم یان برنج لە ئەمەریکاوە دێت بۆ عێراق ئایا پارەی ئەو گەنم و برنجە چۆن سەرف دەکرێت، بە دیناری عێراقی یان بە دۆلاری ئەمریکی بێگومان بە دۆلار چونکە ئەمەریکا پێویستی بە دیناری عێراقی نییە، بە چ نرخ و بەها و شێوەیەك دیناری عێراق دەگۆڕدرێتەوە بە دۆلاری ئەمریکی واتە سیستەمی پارە گۆڕینەوە چۆن چۆنی جێبەجێ دەبێت لەم فەسڵەدا هەوڵ دەدەین بزانین بازاڕی گۆڕینەوەی دراو چییە؟ وە هاوسەنگی باڵانسی بازرگانی چییە؟ هەروەها دەزانین بەهێزی و لاوازی دۆلار مانای چییە؟ وە هەروەها لە سندوقی دراوی نێودەوڵەتی دەگەین.

## دەربارەی بازاڕی دراو

هەروەك دەزانین بەهۆی دراوەوە دەتوانین هەموو شمەك و خزمەتگوزارییەکان بکڕین و بفرۆشین کەواتە پارە پێوەرێکە بۆ بەهاو نرخ وە هەروەها پێوەرێکە بۆ ئاڵوگۆڕ، چونکە هەرچی مامەڵە و ئاڵوگۆڕێکی شمەكو خزمەتگوزارییەکان بەهۆی دراوەوە (پارەوە) دەکرێت. ئەمڕۆکە پارەی کاغەز بەکاردەهێنرێت بۆ هەموو مامەڵە کردنێك چ لە ناوەوەی وڵات چ لە مامەڵە دەرەکییەکاندا، بەڵام هەروەك دەزانین هەر وڵاتە دراوی نەتەوەیی خۆی هەیە کە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر دەگۆڕێت، بۆ نموونە ئەگەر دانیشتوانێکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بیەوێت لە مەکسیك کاڵایەکی دیاریکراو بکڕێت ئەوا پێویستە دراوی (پێسۆ)ی مەکسیکی پێ بێت. کەواتە پێویستە دراوی نەتەوەیی ئەمەریکی (دۆلار) بگۆڕێتەوە بە دراوی مەکسیکی (پێسۆ). ئەم



پرۆسەیە پێی دەوترێت ئاڵوێری دراو بەدراو، کەواتە بۆ مامەڵەکردن و ئاڵوگۆڕکردنی شمەكو خزمەتگوزارییەکان لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر، پێویستە دراوەکان ئاڵوگۆڕیان پێ بکرێت بەمەش بازاڕی دراو و گۆڕینەوە پەیدابوو، بێگومان گۆڕینەوەی دراو بە دراوێکی تر لەسەر بنچینەیەکی دیاریکراو دەکرێت. کەپێی دەوترێت (هاوتایی هێزەکانی کڕین).

**فەرهەنگی ئابووری**

تیۆری هاوتایی هێزەکانی کڕین:

(Purchasing powey parity theohy)

ئەم تیۆرە ئابووریناسی سویدی (گوستاف کاسل) دایناوە بە مەبەستی زانینی ئەو هێزانەی کە نرخی ئاڵوێر دەستنیشان دەکەن لە نێو پارەی ئیلزامیدا، واتە ئاڵوگۆڕکردنی دراوی وڵاتێك بە دراوی وڵاتێکی دیکە بریتییە لە ئاڵوگۆڕکردنی هێزی کڕینی دراوی وڵاتێك بەهێزی کڕینی دراوی ئەوی دیکەیان.

## شێوەکانی گۆڕینەوەی دراو

بەدرێژایی مێژوو دراو تاکو ئەمڕۆکەش سێ شێوەی گرنگ ڕەچاو دەکرێت بۆ گۆڕینەوەیان:

- ئاڵوێری نەگۆڕی دراوەکان.
- ئاڵوێری سەربەستی دراوەکان.
- ئاڵوێری هێواش (نەرمێتی) دراوەکان

ئێستا کە هەریەك لەم شێوازانەی سەرەوە بەجیا باسیان لێ دەکەین.

- ئاڵوێری نەگۆڕی دراوەکان:- بانکی ناوەندی نرخی دراوی نەتەوەیی بەرامبەر بە دراوەکانی تر دەستنیشان دەکات بەشێوەیەکی جێگیر و نەگۆڕ. وە هەروەها بانکی ناوەندی بۆ پاڵپشتکردنی نرخی گۆڕینەوەی دراو هەمیشە بەشداری دەکات لە کڕین و فرۆشتنی دراوەکاندا بۆ ئەوەی گۆڕان بەسەر نرخی گۆڕینەوەدا ڕوونەدات، یان بانکی ناوەندی دراوی نەتەوەیی دەبەستێتەوە بە زێڕەوە. بەهۆی دیارکردنی نرخی دراو بە زێڕەوە پرۆسەی گۆڕینەوە ڕوون و ئاشکراو ئاسان دەبێت. ئەم پرۆسەیە پێی دەوترێ ڕێسای پارەی زێڕ.

**فەرهەنگی ئابووری**

ڕێسای پارەی زێڕ (Gold specie standard):- ئەم ڕێسایە شێوەیەکە لە شێوەکانی ڕێسای زێڕ و شەش سیمای سەرەکی هەیە کە ئەمانەن:

١) کەسان مافی سکەلێدان و تواندنەوەی زێڕیان هەیە.

٢) سەربەستی کەسان لە پێشکەشکردنی زێڕ بە دراوخانە بەمەبەستی گۆڕینی زێڕەکە بۆ سکەی زێڕین.

٣) دەستگیربوونی زێڕ بەسەربەستی.

٤) سەربەستی لە هێنانە ناوەوە و هەناردنە دەرەوەی زێڕ بەبێ کۆت.

٥) ڕاپەموونی زێڕ وەك پێوەرێکی بەها.

٦) دەرچواندنی پارەی زێڕین لەلایەن دەوڵەتەوە بەندە لەسەر هاوسەنگییەکی نەختینە و ناوەڕۆکی پارە زێڕەکە.

- ئالوویری سەربەستی دراوەکان:- مەبەست لە گۆڕینەوەی سەربەستی دراوەکان واتە بەجێهێشتنی ئالوویر بۆ هۆیەکانی خستنەڕوو خواست، لەدواییدا بەدرێژی باسی لێ دەکەین. ئەگەر داوا لەسەر دراوێکی دیاریکراو زیاد بکات ئەوا نرخ و بەهای ئەو دراوە بەرز دەبێتەوە, بەڵام ئەگەر داوا و خواست لەسەر دراوێکی دیاریکراو کەم بێتەوە ئەوا نرخ و بەهای ئەو دراوە نزم دەبێتەوە.

- ئالوویری هیواشی (نەرمێتی) دراوەکان:- مەبەست لە گۆڕینەوەی دراو بەشێوەیەکی نەرم و نیانی، لەوەدایە کە بانکی ناوەندی بەشێوەیەکی نەرم و هێواش پشتگیری دراوی نەتەوەیی دەکات بێ ئەوەی نرخەکەی جێگیر بکات تەنها سەقفێك (واتە بەرزترین و نزمترین نرخ) دەستنیشان دەکات، ئەوکاتە بەپێی داوا و خستنەڕوو نرخی ئالوویر لە بازاڕدا دیاری دەکرێت واتە بەپێی خواست وخستنەڕوو لەسەر دراوەکان.

## خواست و خستنەڕوو لەسەر دراو

هێزی خواست و هێزی خستنەڕوو نرخی دراوەکان دیاری دەکات لە بازاڕەکاندا کەواتە دراویش وەکو هەموو بەرهەمێکی تر پابەندە بە یاسای خواست و خستنەڕووەوە، بێگومان داوا و خستنەڕوو بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەستراوە بە چالاکی و مامەڵەی بازرگانی دەرەکییەوە واتە بەستراوە بە هێزی کڕینی دراوی وڵاتێك بە دراوی وڵاتێکی ترەوە. بۆ نموونە ئەگەر داوا لەسەر بەرهەم و خزمەتگوزارییەکانی وڵاتی مەکسیك زیاد بکات ئەوکاتە داوا لەسەر پێسۆی مەکسیکی زیاد دەکات. ئێستاکە هەوڵ دەدەین بەهۆی ئەم نموونەیە و وێنەیەی خوارەوە دینامیکی ئەو گۆڕانکاری و گۆڕینەوەی دراو بە دراو لەبەر ڕۆشنایی یاسای داوا و خستنەڕوو ڕوون دەکەینەوە.



وێنەی ژمارە (١٨-١) زیادبوونی داوا لەسەر (پێسۆ)




ئەگەر سەیری وێنەکەی سەرەوە بکەین (بازرگانی دەرەکی لەنێوان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و مەکسیك) دەبینین زیاد بوونی داوا و خواست بۆ هەر بەرهەمێك دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی نرخی بەرهەمەکە. هەر چۆن دراو سیفەتی بەرهەمی هەیە کەواتە نرخی دراویش بەرزدەبێتەوە. لەوێنەکەدا دەبینین داوای ئەمەریکا بۆ بەرهەمی مەکسیکی لە (١٠) ملیار دۆلارەوە زیاد بووە بۆ (١٢) ملیار دۆلار، ئەم زیاد بوونەش دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی نرخ (پێسۆ) بەرامبەر دۆلاری ئەمەریکی. واتە پێشتر ئەگەر بەرامبەر بە یەك دۆلاری ئەمەریکی دەتوانرا (١٠) پێسۆ بکڕدرێت ئەوا دوای زیادبوونی داوا لەسەر پێسۆی مەکسیکی نرخەکەی بەرزدەبێتەوە واتە ئەگەر پێشتر یەك پێسۆ بەرامبەر (١٠) سەنتی دۆلاری ئەمەریکی بوو ئەوا دوای زیادبوونی داوا نرخی یەك پێسۆ دەبێت بە (١٢) سەنتی ئەمەریکی چونکە داوا لەسەر بەرهەمی مەکسیکی لە (١٠) ملیار دۆلارەوە بەرزبۆتەوە بۆ (١٢) ملیار دۆلار. کەواتە دەتوانین بڵێین دۆلار نرخەکەی بەرامبەر پێسۆی مەکسیکی دابەزیوە و لاواز بووە چونکە بۆ کڕینی بەرهەمی مەکسیکی پێویستیمان بە بڕێکی زۆرتر دۆلار هەیە. ئەگەر پێشتر پێویستمان بە (١) دۆلار بوو بۆ کڕینی یەکەیەکی بەرهەم بەڵام ئێستا پێویستمان بە (١,٢) دۆلار هەیە بۆ

کڕینی هەمان یەکە. کەواتە دۆلار لاواز دەبێت وە پێسۆ بەهێز دەبێت. کەواتە نرخی بەرهەمی ئەمەریکیش بۆ مەکسیکییەکان دادەبەزێت. ئەمەش دەبێتە هۆی زیادبوونی نرخ لە مەکسیکدا واتە ئابووری مەکسیك تووشی هەڵاوسانی دراو دەبێت بۆیە حکوومەتی مەکسیکی پێویستە چەند هەنگاوێکی گونجاو بنێت بۆ ڕێك کردنەوەی بەهای پێسۆ بەرامبەر دۆلار.

## بازاڕی دراو, هاوردە و ناردە, تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی

ئەگەر هاوکێشەی بەرهەمی نەتەوەیی بێنینەوە یادی خۆمان. {G.N.P = C + I + G + (Ex - Im)}

(Ex-Im): بریتییە لە ناردنە دەرەوە، کەواتە بڕ و ڕێژەی قەوارەی ناردنە دەرەوەی شمەك و خزمەتگوزارییەکان نیشان دەدات. پرۆسەی ناردنە دەرەوە یان پۆزەتیڤ دەبێت یان نێگەتیڤ, کاتێك بڕی ناردن پۆزەتیڤ بێت لەچاو هاوردەدا ئەوکاتە تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی زیاد دەکات، بەڵام ئەگەر بڕی نادرن نێگەتیڤ بێت لەچاو هاوردەدا ئەوکاتە تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی کەم دەکات. کەواتە هەموو وڵاتێك دەخوازێت کە باڵانسی بازرگانی پۆزەتیڤ بێت بەڵام لە پراکتیکدا ئەم داخوازییە مەحاڵە چونکە هەموو وڵاتەکان ناتوانن شمەك و خزمەتگوزارییەکان تەنها بنێرنە دەرەوە یان هەموو شمەك و خزمەتگوزارییەکان بهێننە ناوەوە, هەندێ وڵات پێویستی زیاتر بە ناردنە، هەندێ وڵات بە پێچەوانەوە پێویستی زیاتر بە هاوردەیە.

**فەرهەنگی ئابووری**

تەرازووی بازرگانی (Commercial Balance):- بەشێکە لە تەرازووی (باڵانس) پێدان کە هەڵدەستێ بە تۆمارکردنی ئەو ماف و قەرزانەی کە تایبەتن بە هەناردنە دەرەوە و هێنانە ناوەوەی شمەك. واتە هەناردراوی دەوڵەت بە بەهاکەی (فۆب F.O.B) واتە {بەهای کەلوپەلەکە + گشت ئەو خەرجییەی کە لەسەری خەرج دەکرێت تا دەگاتە ناوکەشتییەکە، هاوردەکەی دەوڵەت بە بەهاکەی (سیف C.I.F)} .

ئەگەر بێتو بەهای هەناردراوەکە زیاتربوو دەگوترێ زیادەیەك لە هەناردراودا هەیە، بەڵام ئەگەر بەهای هاوردراوەکە زیاتربوو ئەوا دەگوترێ زیادەیەك لە هاوردراودا هەیە.

لەباری نەبوونی زیادە لە هەناردراودا دەگوترێ دەوڵەت تەرازوویەکی بازرگانی گونجاو یان لەباری هەیە، بەڵام لەباری بوونی زیادە لە هاوردراودا دەگوترێ تەرازووی بازرگانی دەوڵەت نەگونجاوە یان لەبار نییە.



لە هەندێ لە وڵاتە ئەوروپییەکاندا بەتایبەتی ئەڵمانیا و نەمسا لەجیاتی زیادەی هەناردراو دەڵێن (Active Balance) واتە تەرازووی کارا (بەکار) و لەجیاتی زیادەی هاوردراویش دەڵێن (Passive Balance) لێرەدا دەبێ هەناردراو و هاوردراوی نەبینراو ڕەچاو بکرێت.

بۆ زیاتر تێگەیشتن لە باڵانسی ئابووری دەگەڕێینەوە بۆ سەر نموونەکەی پێشوومان کە باس لە ئاڵوگۆڕی بازرگانی نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و مەکسیك دەکات.

- زیادبوونی داوا و خواست لەسەر بەرهەمی مەکسیکی، واتە زیادبوونی هاوردە لەلایەن ئەمریکاوە.
- زیادبوونی داوا لەسەر پێسۆی مەکسیکی لەلایەن ئەمریکاوە.
- زیادبوونی داوا لەسەر دراوی مەکسیکی دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی نرخ لەسەر بەهەمی ئەمریکی بە دۆلار.
- زیادبوونی هاوردە لە مەکسیکەوە بۆ ئەمریکا دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی ناردن لە ئەمریکاوە بۆ مەکسیك (واتە سەرجەمی بەرهەمی نەتەوەیی کەم دەبێتەوە و بێکاری زیاد دەکات).
- بەڵام ئەو گۆڕانکارییەی کە دێت بەسەر نرخی گۆڕینەوەی دراو لەنێوان هەردوو وڵاتدا ئەو حاڵەتە چارەسەر دەکات. بابزانین چۆن نرخ لەسەر هاوردەی مەکسیکی بە دۆلار زیادەکات، ئەوکاتە داوا لەسەر ئەو بەرهەمانە کەم دەبێتەوە، بەوەش نرخ لە پێسۆی مەکسیکی لەسەر بەرهەمی ئەمریکی دادەبەزێت، داوا لەسەر بەرهەمی ئەمریکی لەمەکسیکدا زیاد دەکات.
- زیادبوونی داوا لەسەر بەرهەمی ئەمریکی (لەبەرئەوەی هەرزانتربوون) دەبێتە هۆی پێچەوانە کردنەوەی پرۆسەی بازرگانی لەنێوان ئەمریکا و مەکسیکدا واتە دەبێتە هۆی زیادبوونی ناردەنی ئەمریکا. واتە زیادبوونی سەرجەمی بەرهەمی نەتەوەیی ئەمریکی.

کەواتە نرخی گۆڕینەوەی دراو (دۆلار بەرامبەر پێسۆ) دەستنیشانی دارایی ئەمەریکا دەکات بۆ بەرهەمی مەکسیکی. بەڵام گۆڕانی نرخی دراو کارێکی ڕاستەوخۆ دەکاتە سەر نرخی بەرهەمەکانی هەردوو وڵات. بێگومان ئەم میکانیزمە ئەوکاتە بەکارایە ئەگەر گۆڕینەوەی دراو بەشێوەیەکی سەربەست بێت، بەڵام ئەگەر گۆڕینەوەی دراوەکان بەشێوەیەکی نەگۆڕ بێت ئەوا ئەو میکانیزمە بەکار نابێت ئەمڕۆکە بەهۆی چالاکی زۆری بازرگانی دەرەکی نێوان دەوڵەتان و گۆڕانکاری لە گۆڕینەوەی دراوە جیاجیاکان دەبێتە هۆی گۆڕینی ئاراستەی ئابووری کە لەخوارەوە باسی لێ دەکەین.

نرخی ئاڵوویر (Exchange Rate):- بریتییە لە نرخی پارەو دراوی بیانی لەچاو پارەو دراوی نەتەوەیدا (نیشتمانیدا)، یان بریتییە لەڕێژەی بەهای دراوی وڵاتێك لەچاو بەهای دراوی وڵاتانی دیکەدا.

ئەم نرخەش لەئەنجامی چەند هۆیەك دەگۆڕێت، وەك ئاڵۆزی باری رامیاری و گۆڕانی نرخی داشکاندنی راکێشراو لەسەر دەرەوە و هی دیکە.

نرخی ئاڵوویر چ لەژێر سایەی سیستەمی ئاڵوویری زێڕدا بێت، یان لەژێر سایەی سیستەمی ئاڵوویری کاغەزی سەپێنراودا بێت، بەندە بەبڕی ئەو دراوەی کە لە بازاڕدا خراوەتە روو.

## باڵانسی پێدان

باڵانسی پێدان پەراوێکە کە کورتەی هەموو ئاڵوویرێکی بازرگانی و دارایی تێدا تۆمار دەکرێت لەماوەیەکی دیاریکراودا (ساڵێك) لەنێوان دەوڵەتێك بەرامبەر دەوڵەتانی تر قەرزەکانی دەوڵەتەکانی دیکە بەسەر دەوڵەتێکدا دەردەخات.

مەبەست لە باڵانسی پێدان ئەوەیە کە حکوومەت بتوانێت لە پلەو پایەی ئابووری دەرەکی وڵاتەکە ئاگادار بێت، تاکو بتوانێت سیاسەتی دارایی و بازرگانی بەشێوەیەکی گونجاو دابڕێژێت.

باڵانسی پێدان لە دوو بەش پێك دێت، بە لایەنێکیان دەوترێ حسابی خاوەن قەرز واتە بەهای ئەو شمەك و خزمەتگوزارییانەی تێدا تۆماردەکرێت کە ناردەنییە بە دەرەوە فرۆشراوە، هەرچی لاکەی دیکەیە، ئەوە حسابی قەرزارە، لەم لایەدا هەموو بەهای شمەك و خزمەتگوزارییە هاوردەنی تێدا تۆمار دەکرێت، بەشێوەیەکی گشتی باڵانسی پێدان لە سێ بڕگەی سەرەکی پێك دێت کە حسابی بەگەڕ، حسابی سەرمایە، حسابی دارایی (حەواڵە).

- حسابی بەگەڕ: بریتییە لە تۆمارکردنی جموجوڵی هەموو شمەك و خزمەتگوزارییەکان لەنێوان دەوڵەتەکە و دەوڵەتەکانی دیکە واتە ئاڵوویری هەموو شمەك و خزمەتگوزارییەکان یان هەموو شمەك و خزمەتگوزارییە هاوردەنی و ناردەنیەك.

- حسابی سەرمایە:- بریتییە لە تۆمارکردنی دانەوەی قەرزی دەرەوەی جموجوڵی پارە لەگەڵ نیشتەجێ بوونی کۆچ کردنی دانیشتواندا، جموجوڵی پارە لەکاتی کڕین و فرۆشتنی موڵکدا وە هەروەها زەرە و زیانەکانی بیمەنەکراو.



- حسابی دارایی:- بریتییە لە تۆماکردنی هەموو ئاڵوویرێك کە پەیوەندیان هەیە بە موڵکدارێتییەوە و قەرزی دارایی‌و کاغەزی داراییەوە (پشك، سەنەد، حەواڵە، دراوی سپاردە بە بانك) وە هەروەها تۆمارکردنی هەموو سەرمایەگوزارییە کورت خایەن و درێژ خایەنەکان لە دەرەوەی وڵات.

باڵانسی بازرگانی و باڵانسی پێدان، لەو کاتەدا هاوسەنگ دەبێت ئەگەر لەهەر سێ حاڵەتەکەدا واتە (حسابی بەگەر، حسابی سەرمایە، حسابی دارایی) یەکسان بن بە یەکتری بێگومان بەشێوەیەکی تیۆری لە پەڕاوی باڵانس پێداندا ئەم یەکسانییە بەدی دەکرێت, بەڵام لە پراکتیکدا ئەو یەکسانی و هاوسەنگییە بەدی ناکرێن, بۆچی؟ چونکە ئەگەر هەر وڵاتێك لایەنی هاوردەی زیاتربێت وەك لە ناردە ئەوکاتە لاسەنگی بازرگانی روودەدات بۆ هاوسەنگی کردنی لاسەنگی بازرگانی پێویستە بڕی ناردنە زیاتر بکرێت یان پەنابردنە بەر قەرزی دەرەکی، بۆ ئەوەی باڵانسی بازرگانی ئابووری هاوتابن. وە هەمان پڕۆسەش بە دیوەکەی تریدا پێچەوانە دەبێتەوە.

**فەرهەنگی ئابووری**

تەرازووی باڵانسی پێدان (Balahce of payment) هەندێ جاریش دەوترێت باڵانسی ئابووری، یان باڵانسی لێکدانەوە، یان باڵانسی گشتی دەوڵەت یان باڵانسی بازرگانی کارا.

باڵانسی پێدان پوختەی کۆمەڵێك لێکدانەوەی هەژمارییەکە کە مافەکانی دەوڵەتێك بەرامبەر بە دەوڵەتانی دیکە و قەرزەکانی دەوڵەتەکانی دیکە بەسەر دەوڵەتێکدا دەردەخات.

ئێستا لەم خشتەیەی خوارەوەدا باڵانسی پێدانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نیشان دەدەین.

خشتەی ژمارە (١٨-٢) باڵانسی پێدانی ئەمریکا لەساڵی (٢٠٠١) (بە ملیار دۆلار):

| | هاتوو | دەرچوو | باڵانس |
|---|---|---|---|
| حسابی بەگەڕ: | | | |
| شمەك | ٧١٩ | -١١٤٦ | |
| خزمەتگوزاری | ٢٧٩ | -٢١٠ | |
| کۆی هەموو شمەك و خزمەتگوزارییەکان | ٩٩٨ | -١٣٥٦ | -٣٥٨ |
| داهات | ٢٨٤ | -٢٦٩ | ١٥ |
| حەواڵە | | | -٥٠ |
| کۆی حسابی بەگەڕ | | | -٣٩٣ |
| حسابی سەرمایە: | | | |
| حسابی دارایی (حەواڵەکان) | | | |
| سەرمایەگوزاری بیانی لەئابووری ئەمەریکا | ٧٥٣ | | |
| سەرمایەگوزاری ئەمریکا لە وڵاتانی تر | | -٣٧١ | |
| کۆی حسابی دارایی | | | ٣٨٢ |
| هەڵەی ئاماری | | | ١٠ |
| کۆی گشتی حسابی سەرمایە و دارایی | | | ٣٩٣ |

ئەگەر سەیری خشتەکە بکەین دەبینین کورتهێنانی باڵانسی پارەدان لە ئەمریکا یەکسانە بەکۆی حسابی بەگەڕ. ئەم کورتهێنانەش بەهۆی کەمتر ناردنە دەرەوەی شمەك بووە لە ئەمریکاوە بۆ وڵاتانی تر, ئەم لاسەنگییە لەساڵی (٢٠٠١)دا بریتی بوو لە (٦٠٪).

١١٤٦ — ٧١٩ = ٤٢٧ واتە ٤٢٧ ÷ ٧١٩ = ٠,٥٩

بەڵام لەهەمان ساڵدا ناردنە دەرەوەی خزمەتگوزارییەکان لە ئەمریکا بریتی بووە لە بڕی (٢٧٩) ملیار دۆلار. بەڵام هاوردەی خزمەتگوزارییەکان بریتی بوو تەنها لە (٢١٠) ملیار دۆلار.

کورتهێنان باڵانسی بازرگانی ئەمریکا بەهۆی بڕ و قەوارەی سەرمایەگوزاری بیانی لە ئەمریکا هاوسەنگ دەبێتەوە چونکە ئەمریکا تەنها بڕی (٣٧١) ملیار دۆلاری بەگەڕ خستووە لە وڵاتانی دەرەوە، بەڵام بڕی (٧٥٣) ملیار دۆلار سەرمایەگوزار کراوە لە ئابووری ئەمریکادا. ئەمەش توانای هاوردەی ئەمریکا زیاد دەکات لە هێنانی شمەکی پێویست.



کورتهێنانی باڵانسی بازرگانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لەساڵی (١٩٧٦)ەوە لە زیادبووندایە ئەگەر لەساڵی (١٩٨٢)دا کورتهێنانی باڵانسی بازرگانی بریتی بوو بێت لە (٣٦) ملیار دۆلار ئەوا لەساڵی (١٩٨٧) ئەو بڕە گەیشتە (١٦٠) ملیار دۆلار, لەساڵی (٢٠٠٠)دا گەیشتە (٤٣٤) ملیار دۆلار, لەساڵی (٢٠٠١)دا گەیشتە (٤٨٦) ملیار دۆلار، ساڵی (٢٠٠٤) گەیشتۆتە (٥٠٠) ملیار دۆلار. وە بەپێی هەندێ ئامار ساڵی (٢٠٠٧) گەیشتۆتە (٩٢٧) ملیار دۆلار.

## کورتهێنانی باڵانسی بازرگانی باشە یان خراپە؟

هەروەك دیاردە ئابوورییەکانی تر، ئابووریناسان لە بۆچوونەکانیان و لێکۆڵینەوەی کورتهێنانی باڵانسی بازرگانی شیکردنەوەی جیاجیایان هەیە. هەندێ لە ئابووریناسان دیاردەی کورتهێنان لە باڵانسی بازرگانی وڵاتدا بە دیاردەیەکی پۆزەتیڤانە دەزانن، بەڵام زۆربەی ئابووریناسان کورتهێنانی باڵانسی ئابووری بە دیاردەیەکی نێگەتیڤانە و خراپ دەزانن.

ئەو ئابووریناسانەی کە کورتهێنانی باڵانسی بازرگانی بە دیاردەیەکی کوشندە و خراپ دەزانن لەسەر بارودۆخی ئابووری دەڵێن کورتهێنانی باڵانسی بازرگانی دەبێتە هۆی پەنابردنە بەر قەرزی دەرەکی وە هەروەها بۆ داپۆشینی کورتهێنانی باڵانسی بازرگانی دەبێت لە ئەنجامدا بکەونە فرۆشتنی کارگە و کۆمپانیا نیشتەنییەکان (بەتایبەت کردن) ئەمەش دەبێتە هۆی دروستبوونی چەندان ناکامی خراپی ئابووری و تەنگەژی ئابووری و لەدەستدانی سەربەخۆیی ئابووری. وە هەروەها دیاردەی بێکاری بەرەو زیادبوون دەچێت. وە سیستەمی دارایی و قەرزی تووشی تەنگەبەستی دەبێت و داوا لەسەر بەرهەمە هاوردەکان زیاد دەکات کە دەبێتە هۆی زیادبوونی نرخ لە بازاڕەکاندا و هەڵاوسانی نەختینەیی دروست دەبێت.

بەڵام ئەو ئابووریناسانەی کە دەڵێن کورتهێنان باڵانسی بازرگانی کاریگەری پۆزەتیڤانە دەکەنە سەر بارودۆخی ئابووری وە گەشەسەندنی ئابووری بەردەوام دەبێت چونکە دیاردەی کورتهێنان دەبێتە هۆی زیادبوونی داهاتی تاکەکەس وە دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی قەوارەی سەرمایەگوزاری بیانی لە وڵاتدا بەتایبەتی لەبواری بەرهەمهێناندا بەتایبەتی ئەو شمەکانەی کەپێویستیان بە هاوردە هەیە ئەمەش دەبێتە هۆی زیادبوونی شوێنی کار و دیاردەی بێکاری لە وڵاتدا کەم دەبێتەوە.

هەندێ ئابووریناسانی تر دەڵێن هاوسەنگی باڵانسی ئابووری باشترین پێناسەیە بۆ گەشەکردنی ئابووری وڵات و رزگارکردنی لە تەنگەژی ئابووری و دارایی، بەڵام لەپراکتیکدا هاوسەنگێتی باڵانسی بازرگانی کارێکی زۆر ئاڵۆزە دەتوانم بڵێم مەحاڵە، بەتایبەتی لەدوای کۆتایی هێنان بە جەنگی سارد و رمانی سیستەمی سۆشیالیستی بەهەرحاڵ بۆچوونەکانی هەردوو لاگری ئابووریناسان بۆ روون کردنەوەی کورتهێنانی باڵانسی بازرگانی تا رادەیەك راست و دروستن. بە بۆچوونی نووسەر کورتهێنانی باڵانسی بازرگانی لەوکاتەدا کاریگەری پۆزەتیڤانەی دەبێت لەسەر بارودۆخی ئابووری ئەگەر هاتوو بە بڕی ئەو کورتهێنانە وەبەرهێنان لەبواری بەرهەمهێنانی شمەك و خزمەتگوزارییەکاندا بەکار بهێنرێت کە خزمەتێکی بنچینەیی و درێژخایەن دەکات. بەڵام ئەگەر بڕی کورتهێنانی باڵانس تەنها بەکاربهێنرێت بۆ کڕین و هاوردەی شمەك و خزمەتگوزارییەکان ئەوا ئەنجام و کاریگەرێکی نێگەتیڤانە و کوشندەی دەبێت چونکە بەم شێوەیە هاوکێشەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی هاوسەنگ دەبێت. واتە بەکورتهێنانی بڕگەی (Ex-Im)، دەتوانرێت بڕگەی سەرمایەگوزاری (I) زیاد بکرێت.

**فەرهەنگی ئابووری**

کورتهێنانی باڵانسی پێدان (Deficit Balance of payment):- ئەو دۆخەیە کە بەهای نێردراوەکانی وڵاتێك لە حسابەکاندا کەمتر بێت لە بەهای هێنراوەکانی ئەو وڵاتە لە ماوەی ساڵێکدا.

## سیستەمی دارایی جیهانی

پێداویستێتی ئاڵوگۆڕی بەرهەم لەنێوان وڵاتە جیاجیاکاندا و پەیدابوونی و گەشەکردنی بازرگانی دەرەکی بووە هۆی ئاڵوگۆڕی پارەی وڵاتێك بە پارەی وڵاتێکی تر ئەمەش بووە هۆی دروستبوونی سیستەمی دارایی جیهانی بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی رێکوپێك ئاڵوگۆڕ بە ئەنجام بگەیەنرێت. کەواتە بۆ چارەسەرکردنی گەڕەلاوژێ لە بازاڕی دراودا بەتایبەتی لە دوای کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم پێویست بوو سیستەمێکی نوێ و کاریگەر دابمەزرێنرێت لە رزگارکردنی وڵاتە ئەوروپییەکان لە کاولبوون و رمانی ئابووری دوای جەنگ. لەئەنجامی گەشەکردنی بێ سنووری بازرگانی و ناردنە دەرەوەی سەرمایەی دارایی ئاسانتر بێت وە بەهۆی هاتنە ئارای ئازادی بازرگانی و بازاڕی ئازاد دەبوو هەنگاوی بە کردەوە بنرێت بۆ رێکوپێك کردنی بازاڕی دارایی بۆیە لە مانگی تەمووزی ساڵی (١٩٤٤)دا بەئامادەبوونی (٤٥) دەوڵەت لە (بریتۆن



وذز) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کۆبوونەوە و پەیوەستنامەیەکیان مۆرکرد کە بەناوی (بریتۆن وذز)ەوە ناسراوە ئەم رێکەوتننامەیە بووە سەرەتایەك بۆ هێنانەکایەی سیستەمێکی نوێی دراو. بەپێی یەکێك لە بەندەکانی رێکەوتننامەکە سندوقی دراوی نێودەوڵەتان دامەزرا جێبەجێ کردنی پرنسیپە بنەڕەتییەکانی سیستەمەکەی پێ سپێردراوە.

هەروەها لەساڵی (١٩٤٥)دا بەپێی یەکێك لە پرنسیپەکانی رێکەوتنامەکە بانکی نێودەوڵەتان دامەزرا. بۆ ئاوەدان کردنەوە و پەرەپێدانی وڵاتانی ئەوروپای دوای جەنگەوە بۆ سەرلەنوێ بنیاتکردنەوەی ژێرخانی ئابوورییان پێویستییان بە سەرمایەیەکی زۆر هەبوو. ئەوە بوو ئەوکاتە وەزیری دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا (جۆرج مارشاڵ)* پرۆژەیەکی پێشنیازکرد کە بە (پرۆژەی مارشاڵ) ناسراوە ئەوەبوو ئەمریکا لەبەر رۆشنایی ئەم پرۆژەیەدا لەرێگای سندوقی دارایی نێودەوڵەتییەوە و بانکی جیهانی سەرمایەی خۆی خستەگەڕ و کەوتە یارمەتی دانی وڵاتە ئەوروپییەکان لە بنیاتنانەوەی ژێرخانی ئابوورییاندا.

بێگومان هەروەك لەپێشەوە ئاماژەمان پێدا لەو سەردەمەدا تەنگوچەڵەمەی سەرەکی گۆڕانی نرخی گۆڕینەوەی دراو لەنێودەوڵەتاندا لە هەموو گرفتەکان دژوارتر بوو بۆیە دامەزراندنی سندوقی دراوی نێودەوڵەتی لەوکاتەدا زۆر پێویست بوو چونکە ئەم رێکخراوە توانی رێسایەکی جیهانی دەربارەی نرخی دراو بە دراو دامەزرێنێت. ئەو رێسایەش بریتی بوو لە پرنسیپی نرخی گۆڕینەوە لەسایەی رێسای ئاڵوویر بەزێڕ. وە بەستنی دۆلار بە زێڕەوە بێگومان ئەم سیستەمە تاکو ساڵی (١٩٧٢) بەردەوام کاری پێ دەکرا. بەڵام هێدی هێدی ئەم سیستەمە بەرەو نەمان دەچێت و رۆڵی جارانی نەماوە. چونکە داوا و خستنەڕووی دراوەکان بەرامبەر دراوەکانی تر رۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە پێویستێتی گۆڕینەوەی دراودا. وە هەروەها لەکۆتایی ساڵی شەستەکاندا ئابووری وڵاتانی تر بەتایبەتی وڵاتانی ئەوروپا و ژاپۆن بەخۆیاندا هاتن و پرۆسەی پەرەسەندنی ئابووری بە رادەیەك گەشەی کرد، ئەو وڵاتانە توانای ئەوەیان هەبوو دراوی خۆیان راستەوخۆ بەزێڕ بگۆڕنەوە وە پێویستی بەوە نەدەکرد دراوی خۆیان لەرێگەی دۆلارەوە بە زێڕ بگۆڕنەوە.

*جۆرج مارشاڵ (١٨٨٠–١٩٥٩) وەزیری دەرەوەی ئەمریکا پێشنیازی کرد وڵاتانی ئەوروپا کەڵك لە سەرمایەی ئەمریکی وەرگرن و ژێرخانی ئابوورییان پێ بنیات بنێنەوە. ئەم نەخشە ئابوورییە لەمێژوودا بە (پرۆژەی مارشاڵ) ناسراوە، جگەلە مەرامە ئابوورییەکەی مەبەستێکی سیاسیشی لەپشتەوە بوو. ئەمریکا دەیویست بەماوەیەکی کورت ئەوروپاییەکی بەهێز لەبەردەم کەمپی ئەوسای یەکێتی سۆڤیەتدا قوت بکاتەوە.

ئەمەش بووە هۆی کەمکردنەوەی ئیحتیاتی (گەنجینە)ی زێڕی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەو حاڵەتەش کۆتایی بە ئەرکی سندوقی دراو هێنا. ئەمڕۆکە سندوقی دراوی نێودەوڵەتی ئەرکێکی تری لەسەرشانە ئەویش چاودێری باری دارایی وڵاتانی ئەندام ئەمڕۆکە (١٨٤) دەوڵەتن. ئەویش بەچاودێری کردنی نرخی دراوەکان لەنێوان دەوڵەتاندا بۆ ئەوەی جێگیرییەکی رێژەیی هەبێت لە بازاڕی دراودا. وە هەروەها چاودێری دانی قەرز و گەڕانەوەی قەرزەکان دەکات و ەهەروەها هەڵدەستێت بەیارمەتی وڵاتانی ئەندام لەچارەسەرکردنی لاسەنگی و کورتهێنانی بالانسی پێدان و بالانسی بازرگانی.

داهاتی سندوقی دراوی نێودەوڵەتی پێکهاتووە لە سەرجەمی پشکی ئەندامەکانی. ئەمڕۆکە پشکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نزیکەی (٢٥٪)ی هەموو پشکەکانە. کە لە پشکی هەموو وڵاتەکانی تر زیاترە بۆیە ئەمریکا کاریگەری راستەوخۆی هەیە لەسەر سیاسەتی سندوقی دراوی نێودەوڵەتی. وە ئەمڕۆکە ئەم سندوقە ئامرازێکی بەکارە بە دەست ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە بۆ سەپاندنی سیاسەتی خۆی بەسەر جیهاندا بەتایبەتی بەسەر وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان کاتێکیش کەمپی یەکێتی سۆڤیەت هەرەسی هێنا سندوقی دارایی نێودەوڵەتی کەوتە دانی قەرز بەوڵاتەکانی کەمپی رۆژهەڵات بۆیە ئەم وڵاتانەش ئەمڕۆکە بوون بە بەشێك لەسیستەمی نوێی دراوی جیهانی. بێگومان سندوقی دارایی نێودەوڵەتان لەسەرێکەوە یارمەتییەکی وڵاتانی ئەندام دەدات لە راستکردنەوەی باری ئابوورییاندا و چارەسەرکردنی تەنگژە داراییەکانیدا، بەڵام لە سەرێکی ترەوە سەپاندنی سیاسەتی دارایی خۆی بەسەر ئەو وڵاتانەدا هەندێ جار دەبێتەهۆی شێواندنی باری کۆمەڵایەتی و بڵاوبوونەوەی گەندەڵیو هەژاریو بێ دەرامەتی ئەو وڵاتانە.

**فەرهەنگی ئابووری**

ڕێسای ئالۆویر بەزێڕ (Gold Exchange standard) :- ئەم ڕێسایە شێوەیەکە لەشێوەکانی ڕێسای زێڕ، واتە دراوی نیشتمانی بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بەندە بە زێڕ، ئەم ڕێسایە لە دانیمارك و نەرویج و سوید بەپێی ڕێکەوتننامەی ساڵی (١٨٨٥) جێبەجێ کرا، هەروەها لە روسیا و ئەڵمانیاشدا لەساڵی (١٨٩٤) دەست بە جێبەجێکردنی کرا.



## یەکێتی ئەوروپا ناوچەی یۆرۆ!

دوای دامەزراندنی بازاڕی هاوبەشی ئەوروپا و دوابەدوا دامەزراندنی یەکێتی ئەوروپا، پێویستییەتی دامەزراندنی دراوێکی هاوبەشی هاتە پێشەوە بۆیە بڕیاردرا کە بانکی ناوەندی یەکێتی ئەوروپا دابمەزرێت تاکو ئەرکەکانی دراوی یەکگرتووی ئەوروپی جێبەجێ بکات ئەوە بوو لە کانونی دووەمی ساڵی (١٩٩٩)دا وا بەیەکەم جار (یۆرۆ) بوو بەدراوێکی هاوبەش بۆ مامەڵەکردن لەنێوان وڵاتەکانی یەکێتی ئەوروپادا وە ئەمڕۆ کە خەریکە دەبێتە دراوێکی جیهانی لەپاڵ دۆلاری ئەمریکیدا ئەمڕۆکە دانیشتوانی وڵاتی ئەندام یۆرۆ وەك دراوێکی هاوبەش بەکاردەهێنن ئەو وڵاتانەش بریتین لە: (نەمسا، بەلجیکا، ئەڵمانیا، یۆنان، ئێرلەندا، ئیسپانیا، ئیتاڵیا، لوکسمبرگ، هۆڵەندا، پورتوگال، فینلەندا، فەرەنسا) ئەوەتا ئەمڕۆکە بانکی ناوەندی یەکێتی ئەوروپا فشارێکی زۆری خستۆتە سەر ئەندامەکانی تری یەکێتی ئەوروپا لە بەکارهێنانی (یۆرۆ) وەك دراوێکی گشتی و هاوبەشی لەنێوانیاندا.

ژمارەی ئەم وڵاتانە ئەمڕۆکە بریتین لە (٢٧) دەوڵەت، وە لەنەخشە و پلانی یەکێتی ئەوروپادا ژمارەی ئەم وڵاتانە لە ئایندەدا بەرەو زیادبوون دەچن.

**ئاگاداری**

بیری سەرەتایی پێکهێنانی بازاڕی هاوبەشی ئەوروپا لەیەکێتی بەنەلۆکسەوە سەری هەڵدا لەساڵی (١٩٤٧)دا هۆڵەندا و بەلجیکا و لۆکسمبۆرگ ناوچەیەکی یەکگرتوویان دامەزراند، پاشان چەند وڵاتی تری ئەوروپا پێوەی پەیوەست بوون ئێستا بەیەکێتی ئەوروپا دەناسرێ، مەبەستی سەرەکی لە یەکێتی (بەنەلۆکس) لابردنی قەید و بەندبوو لەسەر کالای هاوردە و هەناردەی نێوان ئەو وڵاتانە، لەهەمان کاتیشدا تاریفەیەکی گومرگی یەکگرتوویان لەبەرامبەر کالای هەناردەی وڵاتانی تردا دانا. سەرەتایەکیشیان بۆ سیاسەتی ئابووری و دارایی و کۆمەڵایەتی هەرسێ وڵات رێکخست.

دوای (١٠) ساڵ ئەم یەکێتییە بووە کوتلەیەکی ئابووری گەورە و دەوڵەتانی (فەرەنسا، ئەڵمانی رۆژئاوا، ئیتاڵیا)ش پێوەی پەیوەست بوون. ساڵی (١٩٥٧) رێکەوتننامەی بازاڕی هاوبەشی ئەوروپا لەنێوان ئەو شەش دەوڵەتەدا مۆرکرا، مەبەستیش لەو رێکەوتننامەیە ئەوە بوو بیکەنە بەردی بناغە بۆ یەکێتی ئەوروپا. ئامانجە سەرەکییەکانی بازاڕی هاوبەشی ئەوروپا بریتی بوون لە:

- هەمووان پەیڕەوی یەك تاریفەی گومرگی بکەن بەجۆرێك وردەوردە قەید و بەندی گومرگ لەنێوانیاندا نەمێنێ.

- هیچ قەید و بەندێك نەخرێتە بەردەم راگێـوزانی کـار و سـەرمایە و کـاڵا لـە نێـوان وڵاتانی ئەندامدا.

بەڵام ئەمڕۆکە بازاڕی هاوبەشی ئەوروپا بۆتە یەکێتی ئەوروپا نـەك هـەر ئـەو ئامانجانـەی تێپەراندووە بەڵکو ژمارەیان بۆتە (٢٥) دەوڵەت.

## ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ناوچەی دۆلار

مەبەست چییە کاتێك دەڵێن دۆلار بەهێزە؟ (واتە توانای دۆلار لـە کڕینـی دراوەکـانی تـر بەهێزترە، واتە بەرامبەر یەك دۆلار دەتوانین شمەك و خزمەتگوزارییەکان زیـاتر بکڕێـت) بـەڵام کاتێك دۆلار لاوازە (واتە دانیشتوانی ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکا و ئـەو کەسـانەی تریش کە پاشەکەوتی داهاتەکانیان بە دۆلار کردووە، دەتوانن شمـەك و خزمەتگوزارییـەکان بـە بڕێکی کەمتر بکڕن).

بەهێزی و لاوازی دۆلاری ئەمریکی توانـای ئـابووری ئـەمریکا نیـشان دەدەن، کاریگـەری بەهێزی و لاوازی دۆلار لەسەر ئابووری ئەمـەریکا دوو جەمـسەرییە، ئەگـەر دۆلار بـەهێزبێت ئەوا سودمەندە بۆ بەکاربەرانی ئەمریکا چـونکە کـاڵا و خزمەتگوزارییـە هاوردەکـان بـۆ نـاو ئەمریکا هەرزانتر دەبن واتە دانیشتوانی ئەمریکا دەتوانن بڕێکی زیاتر بکـڕن بـەهۆی بـەهێزی دۆلارەوە هەروەها بەهێزی دۆلار لەلایەکی ترەوە دەبێتە هـۆی کەمکردنـەوەی نادرنـە دەرەوەی بەرهەمی ئەمریکا ئەمەش دەبێتە هۆی کەمبوونـەوەی بەرهـەمهێنان و زیـادبوونی بێکـاری‌و کەمبوونەوەی گەشتوگوزار. بەڵام ئەگەر دۆلار لاوازبێت ئـەوا توانـای ناردنـە دەرەوەی کـاڵا و خزمەتگوزارییەکان زیاتر دەبێت وە هەروەها ژمارەی گەشتەوان زیاد دەکات و بواری گەشـت و گوزار دەبوژێتەوە و ژمارەی بێکاران کەم دەبنەوە کەواتە بەهێزی دۆلار لەسەرێکەوە کاریگەری پۆزەتیڤانەی دەبێت لەسەر ئابووری ئەمریکا چونکە توانای ناردنە دەرەوەی بەرهەمی ئـەمریکا زیاد دەکات. ئەمڕۆکە پسپۆڕانی دارایی بەیەك دەنگن دەڵـێن هەرەسـهێنانی دۆلاری ئـەمریکا واتە هەرەسهێنانی ئابووری جیهانی.

بۆیە سیستەمی ئابووری ئەمڕۆکەی جیهان پێویستی بە داڕشتنەوەیەکی نـوێ هەیـە تـاکو مرۆڤایەتی تووشی قەیرانی ئابووری گەورە و درێژخایەن نەبێت.

# فەسڵی نۆزدەهەم

## بازاڕی جیهانی و وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان

گومان لەوەدا نییە کە ئابووری ئەمڕۆکە هەموو بوارەکانی ژیانی سیاسی و کۆمەلاّیەتی و کلتوری گرتۆتەوە. بۆ ئەوەی باشتر لەدیاردە ئابوورییەکان تێبگەین دەبێت ئاگادار بین ئایا ئەمڕۆکە ئابووری جیهان بەرەو کوێ دەڕوات، ئەو گۆڕانکارییانە چین کە بەسەر بازاڕی جیهاندا دێت. پێویستە بزانین داهاتوو و ئاسۆی مرۆڤایەتی بەرەو کوێ دەڕۆن. لەم فەسڵەدا هەوڵ دەدەین بزانین ئابووری جیهانی و بازاڕی جیهانی چییە؟ کێ وە چۆن رۆڵی سەرەکی دەبینێت لە ئاڕاستەکردن و رەوتی ئابووری و ژیانی رۆژانەی خەڵکیدا؟ وە هەروەها هەوڵ دەدەین شوێنی وڵاتە تازە پێشکەوتووەکان لە سیستەمی نوێی ئابووری جیهانیدا روون بکەینەوە.

### جیهان چەند بەشێکە!

پێش هەرەسی یەکێتی سۆڤیەت و کۆتایی هێنان بە جەنگی سارد، جیهان دابەش کرابوو بەسەر سێ بەشی سەرەکیدا. وڵاتە پیشەسازییە پێشکەوتووەکان (سەرمایەدارەکان)، وڵاتە سۆشیالیستەکان بەسەرۆکایەتی یەکێتی سۆڤیەت، وڵاتانی جیهانی سێهەم واتە وڵاتە هەژار و دواکەوتووەکان (زاراوەی جیهانی سێهەم بە وڵاتە دواکەوتووەکان دەوترا چونکە سێ بەشی گۆی زەوی بەر ئەو وڵاتانە دەکەون)، بەلاّم دوای هەرەسی یەکێتی سۆڤیەت لەساڵی (١٩٨٩)دا و کۆتایی هێنان بەشەڕی سارد و لەناوچوونی سیستەمی سۆشیالیستی وەك سیستەمێکی ئابووری. سیستەمی یەك جەمسەری بەسەرۆکایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هاتەکایەوە، کە لەگەڵ خۆیاندا بەها و ئایدیا و بۆچوونی تازەیان هێنایە ئاراوە، کە جیاوازن لەوانەی پێشووتر. بێگومان ئەو ئاڵوگۆڕە مەزنانەی کە لەماوەی ئەم (٢٥) ساڵەی دواییدا روویان داوە بەتایبەتی لەبواری ئابووریدا (چەرخی جیهانگیری) و پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای زانیاری...هتد. پێویستییان بەڕوانگەیو شیکردنەوەیو تێڕوانینی نوێ هەیە. بابزانین ئەم جیهانە نوێیە چییە؟



### سیستەمی ئابووری جیهانی

ئەمڕۆکە ئابووریناسان جیهان دابەش دەکەن بەسەر سێ گروپی فراواندا بەپێی رادەی گەشەکردنی ئابوورییان:

١- وڵاتە پیشەسازییە پێشکەوتووەکان.

٢- وڵاتە پیشەسازییە تازە پێشکەوتووەکان (نوێیەکان).

٣- وڵاتە تازە پێشکەوتووەکان (دواکەوتوەکان).

گروپی یەکەم: وڵاتە پیشەسازییە پێشکەوتووەکان - بریتین لەو گروپە وڵاتانەی کە رادەی بەرهەمهێنان و پیشەسازیان زۆر پێشکەوتوون، خاوەنی سەرمایەیەکی گەورەن، سیستەمی قەرز و داراییان زۆر پێشکەوتووە، وە هەروەها سیستەمی بانکی و بیمە لەئاستێکی زۆر بەرزدان، وە هەروەها بنچینەیەکی یاسایی تۆکمە و پتەویان هەیە، سیستەمی کارگێڕی بەڕێوەبردن زۆر چالاکە دەتوانن بازرگانی دەرەکی بەشێوەیەکی کارا بکەن...هتد. لەبارەی کۆمەلاّیەتییەوە پەیوەندییە کۆمەلاّیەتییەکانیان لە پلەیەکی بەرزدایە و پابەندە بەیاساوە، سیستەمی پەروەردە و خوێندن و تەندروستی زۆر پێشکەوتووە هەموو تاکێك لەکۆمەڵدا ئازاد و سەربەستە لەدەربڕیندا. وە هەروەها لەهەڵبژاردنی کاردا، هەموو تا رادەیەك یەکسانن لەبەردەم یاسادا. یاسا سەروەرە لەهەموو بوارێکدا، چەقی ناوەندی ئەم وڵاتانە حەوت وڵاتە گەورەکەی جیهانن ئەو وڵاتانەش بریتین لە (ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کەنەدا، ژاپۆن، ئەڵمانیا، فەرەنسا، بەریتانیا، ئیتاڵیا) چوار وڵات لەو حەوت وڵاتە گەورانەی جیهان، ئەمڕۆکە بەردی بناغەی ئەوروپای یەکگرتوو پێك دەهێنن، ئەوە ماوەی چەند ساڵێکە روسیای فیدراڵی بۆتە ئەندامێکی تەواوی وڵاتە گەورەکانی جیهان بۆیە دەوترێت هەشت وڵاتە گەورەکەی جیهان (بێگومان بەئەندام بوونی روسیای فیدراڵی زیاتر هۆیەکی سیاسییە نەك ئابووری). دوابەدوای ئەم وڵاتانە لەڕادەی توانا و پێشکەوتندا وڵاتەکانی سکەندەناڤیا پۆلێن دەکرێن، دوابەدوا وڵاتانی وەك: نەمسا، لۆکسمبرگ، هۆڵەندا، ئیسپانیا، بەلجیکا، سویسرا، ئوسترالیا، تایوان، نیوزلاند. بەشێوەیەکی گشتی ئەم گروپە نزیکەی لە (٢٠٪)ی دانیشتوانی گۆی زەوی پێکدەهێنن، بەلاّم لە (٧٠٪)ی بەرهەمی جیهانی لەهەموو کالاّ و خزمەتگوزارییەکان بەرهەم دەهێنن.

دەمەوێت ئاماژە بەخاڵێکی گرنگ بدەم، لەگەڵ هەموو ئەو توانا زۆرەو رادەی پێشکەوتنە ئەم وڵاتانە چەندان تەنگ و چەڵەمە و گرفت و کەموکوڕییان هەیە وەك دیاردەی

بێکاری، هەڵاوسان، کەمبوونەوەی ڕێژەی لەدایك بوون واتە (کەمبوونەوەی ژمارەی دانیشتوان)، تەمەن درێژی کەدەبێتە هۆی کەمبوونەوەی هێزی کار، زیاد بوونی خەرجی بۆ خانەنشینی و تەندروستی، وە هەروەها چەندان کێشەی کۆمەڵایەتی تر وەك نەخۆشی خامۆکی و...هتد. جگە لەمانەش ئەوەتا ئەم وڵاتانە تووشی کێشەی تیرۆر بوونەتەوە لەلایەن ڕێکخراوە موسوڵمانە توندڕەوەکانەوە کە بۆتە مەترسییەکی گەورە لەبەردەم بەرژەوەندی نەتەوایەتی ئەم وڵاتانەدا.

گرووپی دووەم: وڵاتە پیشەسازییە تازە پێشکەوتووەکان (نوێیەکان) - ئەو وڵاتانە دەگرێتەوە کە لەبواری بەرهەمهێناندا لەقۆناغی پێشکەوتنێکی هەمیشەیدان هەروەها ڕادەی ژیانی دانیشتوانیان لە بەرزبوونەوەدایە، ئەم وڵاتانە لەسەر بناغەیەکی ڕاست و دروست و پتەو و سیستەمی دارایی و قەرز و بانکیان دامەزراندووە، هەرچەندە زۆرجار ئەم وڵاتانە تووشی تەنگەژی دارایی دەبن وە قەرزی دەرەکی کەڵەکە بووە لەسەریان وە هەندێ جار ئەم کێشانە دەبنە هۆی وروژاندنی کێشەی کۆمەڵایەتی و سیاسی بەڵام هەنگاو بەهەنگاو بەرەو پێشەوە دەڕۆن و هەمیشە خەریکی چاکسازی بوارەکانی ژیانن بۆئەوەی بگەنە ئاستی وڵاتە پێشکەوتووەکان، وڵاتانی ئەم گرووپە بریتین لە (هۆنکۆنگ، سەنگاپورە، کۆریای باشور، پاکستان، مالیزیا، ئەندەنوسیا، تایلاند، مەکسیك، بەرازیل، ئەرجەنتین، چیللی، فەنزوێلا، ئیسرائیل، باشوری ئەفریقا، هەنگاریا) ئەم وڵاتانە (٥٪)ی ژمارەی دانیشتوانی گۆی زەوی پێکدەهێنن وە لە (٥٪)ی بەرهەمی جیهانی بەرهەم دەهێنن. (هەندێ وڵاتانی کەمپی سۆشیالیستی کۆنیش لەم گرووپەدا پۆلێن دەکەن وەك ئۆکرانیا، پۆڵۆنیا) ئەم وڵاتانە لەهەڵبژاردنی سیستەمی ئابووریدا زیاتر پشتیان بەستووە بەئەزموونی ژاپۆن. واتە پەیڕەوی ئایدۆلۆژی بەرهەمهێنان لەپێناوی ناردنە دەرەوەدا دەکەن، بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارە و خۆڕاگرتن لەبەردەم کێبەرکێی جیهانیدا بەرزترین و پێشکەوتووترین تەکنەلۆژیا لەبەرهەمهێناندا بەکاردەهێنن وە هەروەها ژمارەیەکی زۆر لەکارگێڕ و بەڕێوەبەری ئابووری و تەکنیکییان ئامادە کردووە، ئەوەی ئاشکرایە سندوقی دراوی نێودەوڵەتی هەمیشە یارمەتییەکی زۆری ئەم وڵاتانە دەدەن لەپێویستی داراییدا بۆ ئەنجامدانی سەرمایەگوزاری درێژخایەن، ئەم وڵاتانە لەناوخۆیاندا تاکو ڕادەیەك جیاوازن لەڕادەی پێشکەوتنی باری ئابووری و کۆمەڵایەتیدا، بەڵام بەپێی ئامارەکانی بانکی نێودەوڵەتی ڕادەی گشتی گەشەکردنی ئابووریان لەیەکچووە بۆیە پێیان دەوترێت وڵاتە پیشەسازییە نوێیەکان.



گرووپی سێیەم: وڵاتە تازە پێشکەوتووەکان (دواکەوتووەکان) - وڵاتە تازە پێشکەوتووەکان ئەمڕۆکە ئاڵۆزترین گرووپی وڵاتانی جیهان پێکدەهێنن چونکە لەناوەندی ئەم گرووپەدا وڵاتی زۆر دواکەوتوو هەژار هەن وەك ئەفغانستان، یەمەن وە وڵاتی دەوڵەمەندی وەك وڵاتەکانی کەنداوی عەرەبی، هەندێك وڵاتانی ئەم گرووپە بنچینەیەکی سەرەتاییان دامەزراندووە بۆ گەشەسەندنی پیشەسازی بەڵام ئەو بناغەیە ئەوەندە تۆکمەو پتەو نییە تاکو ببێتە هۆی سەقامگیری و جێگیرکردنی ئاراستەی پێشکەوتنی هەمەلایەنی کەرتە ئابوورییەکان، وە هەروەها تاکو ئێستاکە سیستەمی دارایی و قەرزو بانك نەگەیشتوونەتە ئەو ئاستە پێویستەی کە بتوانێت خزمەتی کەرتەکانی ئابووری و دانیشتوان بەشێوەیەکی کاریگەر بکات.

ئابووریناسان ئەم وڵاتانە دابەش دەکەنەوە بەسەر پێنج گرووپی بچووکدا:

١- وڵاتە ئەفریقییەکان، جگەلە (باشوری ئەفریقا).

٢- وڵاتە ئاسیاییەکان جگەلە (ڤێتنام، کەمبۆدیا، چین، لاوس، کۆریای باکور).

٣- وڵاتانی ئەمریکای لاتینی جگەلە (کوبا).

٤- وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

٥ ـــ ماڵتا، پورتوگاڵ، قوبروس، تورکیا.

لەنێوان ئابووریناسان ئەمڕۆکە یەك بۆچوون نییە دەربارەی (چین) هەندێکیان چین پۆلێن دەکەن لەڕیزی وڵاتە پیشەسازییە نوێیەکاندا، بەڵام هەندێکی تر دەیخەنە پاڵ وڵاتە تازە پێشکەوتووەکان چونکە کەرتی کشتوکاڵ تاکو ئێستاکە بەشێکی زۆری ئابووری چین دەگرێتەوە وە لەڕادەیەکی نزمی تەکنیکیدایە.

هەروەك لەپێشەوە ئاماژەمان پێدا گرووپی وڵاتانی تازە پێشکەوتووەکان ئاڵۆز و جیاوازن لەڕادەی پێشکەوتندا. بۆ نموونە هەندێ لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەتایبەتی وڵاتانی کەنداوی عەرەبی کە نەوت سەرچاوەی سەرەکی داهاتی نەتەوەیی پێك دەهێنێت داهاتی تاکەکەس بۆ نموونە لە عەرەبستانی سعودیە دەگاتە (٧٠٠٠) دۆلار ساڵانە، وە لەهەمان گرووپەدا وڵاتی وەك (گانا، کۆنگۆ) هەن کە داهاتی تاکەکەس تەنها بریتییە لە (٤٠٠) دۆلار ساڵانە.

هەموو ئەم وڵاتانە بەشێوەیەك لەشێوەکان بە وڵاتانی تازە پێگەشتوو لە قەڵەم دەدرێن چونکە ژێرخانی ئابوورییان بەهێز و پتەو نییە، بەتایبەتی لەبواری پیشەسازیدا، بەڵکو زیاتر پشت دەبەستن بە هاوردە، هەروەها سیستەمی دارایی و قەرز و بانك لەئاستێکی زۆر نزمدایە، زۆربەی

زۆری ئەم وڵاتانە لەسەر بەروبوومی کشتوکاڵی و ئاژەڵی دەژین کە بەشێکی گەورە لەپێکهاتەی ئابووری پێك دەهێنن. هەژاری و دواکەوتوویی بۆتە هۆی بڵاوبوونەوەی گەندەڵی و ناسەقامگیری بارودۆخی سیاسیی و کۆمەڵایەتی کە ئەمەش کارێکی نێگەتیڤانە دەکەنە سەر گەشەی ئابووری، هەروەها نەبوون یان کەمی کادر و پسپۆڕانی شارەزای تەکنیکی و ئابووری لەو وڵاتانەدا بوونەتە ئەستەنگێکی کاریگەر لەبەردەم پێشکەوتنی ئابووریدا، لەلایەکی ترەوە زۆربەی دەسەڵاتدارانی ئەم وڵاتانە خاوەنی هیچ بەرنامە و ستراتیژییەکی ئابووری روون و ئاشکرا نین، زۆربەی ئەم وڵاتانە زیاتر پشت دەبەستن بە وەرگرتنی قەرزی دەرەکی بۆ چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان و تەنگژە ئابوورییەکان، زۆربەی جار ئەو قەرزانە بەئاڕاستەی خۆی بەکارناهێنرێت بەڵکو بڕێکی زۆری دەچێتە گیرفانی لێپرسراوە گەورەکانی ئەم وڵاتانە.

**فەرهەنگی ئابووری**

خاسیەتە هاوبەشییەکانی دواکەوتەیی ئابووری:-

١- سەرمایەی بەرهەمهێنان کەمە و بەش ناکات.

٢- دواکەوتوویی رێگە و شێوازی بەرهەمهێنان.

٣- راژەی پێکهێنانی سەرمایە کز و نزمە.

٤- تەشەنەکردنی دیاردەی بێکاری.

٥- زۆری چڕی دانیشتوان (زۆری ژمارەی دانیشتوان).

٦- پەیکەربەندی کۆمەڵایەتی دواکەوتووە.

٧- پاشکۆیەتی ئابووری هەندەران.

دواکەوتوویی بارودۆخی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی گروپی وڵاتە تازە پێشکەوتووەکان بۆتە سەرئێشەی زۆربەی ئابووریناسان و سیاسەتمەدارانی جیهانی و هەروەها بۆتە باسی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی دەیان سەنتەر و رێکخراوی ئابووری جیهانی، لەپێناوی نەهێشتنی هەژاری و دواکەوتوویی لەگۆی زەویدا چەندان کۆنفرانسی نێونەتەوەیی سازدەکرێت بەڵام بەداخەوە تاکو ئێستاکە چارەسەرێکی بنەڕەتی بۆ رزگارکردنی ئەم وڵاتانە لە هەژاری نەدۆزراوەتەوە، بەشێوەیەکی گشتی چەندان پێشنیار پێشکەشکراوە بۆ گەشەکردن و پێشکەوتنی بارودۆخی ئابووری ئەم وڵاتانە بەکورتی لەخوارەوە هەندێکیان روون دەکەینەوە:



١- پێشکەوتنی (فراژووکاری) ئابووری پێویستی بەسازدانی رێکخراوێکی سیاسییە کە بەرژەوەندی راستەقینەی ئەو هێز و لایەنانە بنوێنێ کە بەتەنگ فراژووبوونەوەکەن، چونکە رێکخراوێکی سیاسیی لە مەسەلەی سەرخستنی گەشەکردندا دەوری گرنگ دەگێڕێت بۆ نموونە هاووڵاتیان کۆدەکاتەوە و ورەیان بەرزدەکا بەرەو رێگای پێشکەوتن هانیان دەدات بۆ ئەمەش دێت خەڵکەکە فێردەکات و بەئاگایان دەهێنێتەوە دەیانخاتە سەر هەرەس و ئارەزووی پێشکەوتن و گیانی گۆڕان و خۆبەخت کردنیان لەدەروونیدا دەروێنێ و بەهێز دەکات.

٢- گەشەسەندنی ئابووری پێویستی بەوەیە سیستەمی فێرکاری و خوێندن لە رەگ و ریشەوە بگۆڕێ تا بەرنامەیەکی ژیرانە و بەپێی پێویست بڕەخسێنێت چونکە گۆڕینی بەرنامەی فێرکاری و خوێندن و رێگا و شێوازەکانی خوێندن دەبێتە هۆی باوسەندنی ژیری و هۆش و زانست و شارەزابوونی نەختینەیی و زانستی و دارایی و کارامەیی و وەستایی و توانای هونەری و زانستی رێکخستن کە بۆ نەخشەکێشان و گەشەسەندنی ئابووری پێویستە.

٣- گەشەکردنی ئابووری پێویستی بەوەیە کە هەندێ لەو رێکخراو و دام و دەزگا ئابوورییانە کە هەن لە رەگ و ریشەوە بگۆڕێن یان دام و دەزگای نوێ لەجێگەیان دابمەزرێنن، بۆ نموونە بەرزکردنەوەی تێکڕای وەبەرهێنان پێویستی بەوەیە کە دام و دەزگای دارایی بەهێزی وەك بانك و کۆمپانیای بیمەکردن و بنکەی پاشەکەوت کردن دابمەزرێنن تا پاشەکەوتی ناو کۆمەڵ و کۆمەڵگای تێدا کۆبکرێتەوە و بانکی کشتوکاڵیش دابمەزرێت بۆ ئەوەی کەرتی کشتوکاڵ و دێهاتییەکان و پاشەکەوتکاری بچووکی ئەو گوندانەش پاشەکەوتە کەمەکانی خۆیانی تێدا دابنێن و بانکەکان بۆ وەبەرهێنان بیخاتە کار.

٤- پێویستە رێگا و شێوازی رەنێوهێنان لە رەگ و ریشەوە وەها بگۆڕدرێت لەگەڵ قۆناغی بەرەو چاکتر گۆڕینی هێزەکانی بەرهەمهێناندا بگونجێت تا بتوانێت ئابووری وڵاتەکە بەرەو پێشتر بەرێت و هەموو ئەو کۆسپانە تەخت بکات بۆئەوەی ئابووری نەتەوەیی لەبارودۆخی دواکەوتووییەوە بەرەو دۆخی پێشکەوتوو بگوێزرێتەوە.

٥- پێویستە پەیکەربەندی رۆشنبیریش وا بگۆڕدرێت کە لەگەڵ ئەو رێگا و شێوازی بەرهەمهێنانە تازەیە بگونجێت.

٦- پێویستە کە داڕشتنی پلان و نەخشە و رەنگ رێژی ئابووری لەسەر بناغەیەکی زانستی و راستەقینە بێت و جێبەجێ بکرێت.

بەهەرحاڵ کێشە و گرفتەکانی وڵاتانی تازە پێشکەوتوو وە ڕێگای چارەسەرکردنیان پێویستی بەلێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زیاتر هەیە. وە هیوادارم لە نووسینێکی تایبەتدا ئابووری و ڕێگەچارەی تەنگەژە ئابوورییەکانی ئەم گروپە باس بکەم.

## پۆلێن کردنی وڵاتانی جیهان لەسەر ئاستی بەرهەمهێنان و ئاستی داهات

شێوازی پۆلێن کردنی ئابووری وڵاتانی جیهان بەهۆی پێرستی (تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی)ەوە ڕوونتر و ئاشکراتر ئاستی پێشکەوتنی باری ئابووری وڵاتان نیشان دەدەن، چونکە پێکهێنانی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی ئاوێنەی هەموو چالاکییە ئابوورییەکانە وە هەروەها ڕادەی کشان و داکشانەوەی باری ئابووری وڵات نیشان دەدات، لەخشتەکەی خوارەوەدا بەهۆی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەییەوە داهاتی تاکەکەس لەهەر سێ گروپ نیشان دەدەین، لەبەر ڕۆشنایی ئامارەکانی سندوقی دراوی نێودەوڵەتی ساڵی (٢٠٠٠).

خشتەی ژمارە (١٩-١) داهاتی تاکەکەس لە تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی.

| گروپەکان | داهاتی تاکەکەس لەتێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی ساڵانە (دۆلار) |
|---|---|
| وڵاتە پیشەسازییە پێشکەوتووەکان | ١٩٠٠ |
| وڵاتە پیشەسازییە نوێیەکان | ١١٥٠٠ |
| وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان | ٣٤٠٠ |

بە تێڕوانینێکی خێرا لەخشتەکەی سەرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە داهاتی تاکەکەس لە وڵاتە پیشەسازییە پێشکەوتووەکان پێنج جار زیاترە وەك لەداهاتی تاکەکەس لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان. لێرەدا خاڵێکی گرنگ هەیە کە دەمەوێت سەرنجی خوێنەری بۆ ڕابکێشم، لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە (٢٠٪)ی دانیشتوان داهاتیان زۆر بەرزترە وەك لەئاماری ناو خشتەکە. دابەشکردنی تێکڕای داهاتی نەتەوەیی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەم شێوەیەیە لە (٥٠٪)ی داهات دابەش دەکرێت بەسەر لە (٢٠٪)ی دانیشتواندا وە لە (٥٠٪)کەی تر دابەش دەکرێت بەسەر (٨٠٪)ی دانیشتواندا. بەڵام حکومەتی ئەمریکی لەڕێگەی جارێکی تر دابەشکردنەوە هەوڵ دەدات تا ڕادەیەك یەکسانی بەرقەرار بکات لە دابەشکردنی داهاتی نەتەوایەتیدا.



بەپێی ئامارەکانی سندوقی دراوی نێودەوڵەتی ئەمرۆکە لە (٢٠٪)ی دانیشتوانی گۆی زەوی لە (٨٠٪)ی داهاتی جیهانیان بەردەکەوێت، بەڵام لە (٨٠٪)کەی تری دانیشتوانی گۆی زەوی تەنها (٢٠٪)ی داهاتی جیهانیان بەردەکەوێت. بێگومان ئەم ئامارانە خۆی لەخۆیدا نایەکسانی و جیاوازی ڕادەی ژیانی دانیشتوانی سەر زەمینمان نیشان دەدات.

لە خشتەکەی خوارەوەدا بڕی داهاتی ساڵانەی تاکەکەس لەجیهاندا نیشان دەدەین، ئەم ئامارە سندوقی دراوی نێودەوڵەتی لەساڵی (٢٠٠٠)دا پێشکەشی کردووە.

خشتەی ژمارە (١٩-٢) پۆلێن کردنی وڵاتانی جیهان بەپێی ڕادەی داهاتی ساڵانە:

| گروپەکان | ناوەندی داهاتی هەر تاکەکەسێك لەساڵێکدا (دۆلار) |
|---|---|
| وڵاتان کە داهاتی بەرزیان هەیە | ٢٢٨١٨ (ئەمریکا، ئەوروپای ڕۆژئاوا، ژاپۆن) |
| وڵاتان کە داهاتی مام ناوەندیان هەیە | ٥١٧٥ (ئەرجەنتین، مەکسیك، هەنگاریا، پۆلۆنیا) |
| وڵاتان کە داهاتیان نزمە | ١٨٠٨ (کۆستەریکا، فیلیپین، ڕۆمانیا، ئوردن) |
| وڵاتان کە داهاتیان زۆر نزمە | ٣٨٨ (وڵاتانی ئەفریقا، هندستان، یەمەن،...) |

لە خشتەکەی سەرەوەدا دەبینین کە جیاوازییەکی زۆرهەیە لە نێوان داهاتی تاکەکەسدا لەجیهاندا، بڕەکەی لە وڵاتە تازە پێشکەوتووەکاندا بریتییە لە (٣٨٨) دۆلار لەساڵێکدا، بەڵام بڕی داهات لە وڵاتە پیشەسازییە پێشکەوتووەکاندا بریتییە لە (٢٢٨١٨) دۆلار لەساڵێکدا. واتە داهاتی تاکەکەس لە وڵاتە هەژارەکاندا بریتییە لە (١) دۆلار لەڕۆژێکدا، بەڵام داهاتی تاکەکەس لە وڵاتە دەوڵەمەندەکاندا بریتییە لە (٦٥) دۆلار لەڕۆژێکدا، واتە بەئەندازەی (٦٥) جار داهاتیان زۆرترە لەچاو داهاتی تاکەکەسی وڵاتە هەژارەکان.

ئێستاکە بەهۆی خشتەکەی خوارەوە ژمـارەی دانیـشتوانی گـۆی زەوی نیـشان دەدەیـن بەپێی گروپەکان.

خشتەی ژمارە (١٩-٣) ژمارەی دانیشتوانی جیهان و ڕێژەیان بەپێی گروپەکان:

| گروپەکان | ژمارەی دانیشتوان (هەزار کەس) | ڕێـــــژەی ژمـــــارەی دانیشتوان |
|---|---|---|
| وڵاتە داهات بەرزەکان | ٩٩٥٠٠٠ | ١٥,٦ |
| وڵاتە داهات ناوەندییەکان | ٥٠٣٠٠٠ | ٨,٢ |
| وڵاتە داهات نزمەکان | ٢١٦٣٥٠٠ | ٣٥,٣ |
| وڵاتە داهاتە زۆر نزمەکان | ٢٥١١٤٠٠ | ٤٠,٩ |
| کۆی گشتی | ٦١٣٣٦٠٠ | ١٠٠,٠ |

لە خشتەکەی سەرەوەدا دەبینین ژمارەی دانیشتوانی ئـەو وڵاتانـەی کـەداهاتیان زۆر نزمـە بریتییە لە دوو ملیارد و نیو خەڵك زیاتر وە ڕێژەکەیان (٤٠٪)ی هەموو دانیشتوانی سەر گۆی زەوی پێك دەهێنن، بەڵام ڕێژەی دانیشتوانی ئەو وڵاتانەی کە بەرزترین داهاتیان هەیە بریتییـە لە (١٥٪)ی هەموو دانیشتوانی جیهان، ئەگەر جارێکی تر سـەرنجی خـشتەکە بـدەین دەبیـنین کۆی هەردوو گروپی ئەو وڵاتانەی کەداهاتیان نزم و زۆر نزمە بریتییە لـە چـوار ملیـارد و نیـو زیاتر خەڵکی واتە ڕێژەی (٧٥٪)ی هەموو دانیشتوانی گۆی زەوی پێك دەهێنن. واتە نزیکـەی پێنج ملیارد خەڵك لەجیهاندا لەحاڵەتی هەژاریدا دەژین ئەمەش مەترسـیەکی گـەورەی هەیـە لەسەر ئایندەی مرۆڤایەتی. بە بۆچوونی هەندێ لە ئابووریناسـان بـەردەوامی هـەژاری و کـەم دەرامەتی یەکێکن لە فاکتەرە هەرە گرنگەکانی نائارامی و ناسەقامگیری و بڵاوبوونەوەی تیرۆر لەجیهاندا، ئەگەر کۆمەڵگای مرۆڤایەتی چارەسەرێکی خێرا نەدۆزنەوە بۆ ئەم دیاردە کوشندەیە ئەوا ئاکام و کارەساتی ترسناکی لـێ دەکەوێتـەوە. ئێمـە هـەوڵ دەدەیـن بـەهۆی خـشتەکەی خوارەوە هەندێ لایەنی تری جیاوازییەکانی نێوان گـروپ و وڵاتـەکانی جیهـان نیـشان بـدەین، بانکی جیهانی و سندوقی دراوی نێودەوڵەتی ساڵانە ئەم ئامارانە بڵاودەکاتـەوە. وە ئێمـە لـەم نووسینەدا ناتوانین هەموو ئامارەکان نیشان بدەین، بـەڵام ئەگـەر هـەر خوێنـەرێك ئـارەزووی زانینی ئەم ئامارانەی هەبێت دەتوانێت سەیری ئەم ماڵپەرە لەئینتەرنێتدا بکات.

(http://www.worldbank.org/psd/compete.nsf)



خشتەی ژمارە (١٩-٤) ئاستی بژێوی ژیانی خەڵکی بەپێی گروپەکان:

| پێناسەکان | وڵاتانی داهات بەرزەکان | وڵاتانی داهات ناوەندییەکان | وڵاتانی داهات نزمەکان | وڵاتانی داهات زۆر نزمەکان |
|---|---|---|---|---|
| داهاتی ناوەندی دانیشتوان | ٢٢٨١٨ | ٥١٧٥ | ١٨٠٨ | ٣٨٨ |
| ڕێژەی دانیشتوان بەرامبەر دانیشتوانی جیهان | ١٥,٦ | ٨,٢ | ٣٥,٥ | ٤٠,٩ |
| درێژی تەمەن (تەمەن درێژی) | ٧٦,٨ | ٧٠,١ | ٦٨,١ | ٥٤,٦ |
| ڕێژەی بەرهەمهێنانی(ناردەنە) بەرامبەر هەموو بەرهەمی جیهانی | ٧٣,٨ | ٥٢,٦ | ٤٣,٢ | ٢٨,٠ |
| ژمارەی تەلەفۆن بۆ هەر (١٠٠٠) کەسێك | ٤٨٧ | ١٨٠ | ١١٣ | ١٧ |
| کاتی چاوەڕوان کراو بۆ ڕاکێشانی هێڵی تەلەفۆن (ساڵ) | ٠,٠٣ | ١,٨٥ | ٤,٥١ | ٥,٣١ |
| ژمارەی تەلەفزیۆن بۆ هەر (١٠٠٠) کەسێك | ٤٩٠ | ٢٩٣ | ٢٠٥ | ٦٥,١ |
| ژمارەی کۆمپیوتەری تایبەت بۆ هەر (١٠٠٠) کەسێك | ١٧٠ | ٣٥ | ١١ | ٢ |
| ڕێژەی خوێندەواران لەنێو (گەورەکاندا) | ٩٧ | ٨٦ | ٨١ | ٥٤ |
| ژمارەی زانایان بۆ هەر (١٠٠٠) کەسێك | ٣,٣ | ١,٠ | ١,٣ | ٠,٤ |
| ژمارەی داهێنان و دۆزینەوە | ٧٦٥٠٧ | ١٨٨٠١ | ١٠٠٠٨ | ٣٣٦ |

ئەگەر سەرنجێکی وردی ئامارەکانی خشتەکەی سەرەوە بدەین و کەمێك شیتەڵی بکەینـەوە و لێی بکۆڵینەوە جیاوازی ئاستی ژیـانی دانیـشتوانی گـۆی زەویمـان بـۆ دەردەکـەوێت، ئێمـە نامانەوێت هەریەك لەو ژمارانە شیتەڵ بکەینـەوە چـونکە خوێنـەر بەئاسـانی دەتوانێـت ئـەو ئامارانە شیتەڵ بکاتەوە و لێیان بکۆڵێتەوە، بـەڵام دەمـەوێت ئامـاژە بـەخاڵێکی زۆر گـرنگ

بدەم، زۆربەی ولاّتە تازە پێگەیشتووەکان ئەوەندە دواکەوتوون و لەدواوەن پێویستییان بەچەند چەرخێك هەیە بۆ گەیشتن بەئاستی ئابووری و کۆمەلاّیەتی ولاّتە پیشەسازییە پێشکەوتووەکان.

## بازاڕی نێودەوڵەتی!

بێگومان هەژاری و دواکەوتوویی ئاکامی کۆمەلاّیەتی دژوار و ترسناکی بەدواوەیە، جگەلە ئاکامە کۆمەلاّیەتییەکان با بزانین ئەم دیاردەیە چ ئەنجامێکی نێگەتیڤانەی دەبێت لەسەر ئابووری جیهانی و بازاڕی نێودەوڵەتی.

هەروەك لەپێشەوە باسمان لێکرد ولاّتە پیشەسازییە پێشکەوتووەکان بڕێکی زۆر کالاّ و خزمەتگوزارییەکان بەرهەم دەهێنن بێگومان ئەو بەرهەمانە پێویستییان بە فرۆشتن هەیە واتە پێویستییان بە بازاڕە، بەلاّم ئەم ئەرکە کەمێك ئاسان نییە چونکە داهاتی زۆربەی زۆری دانیشتوانی جیهان لەڕۆژێکدا بریتییە لە (یەك) یان (دوو) دۆلاری ئەمریکی، ئەو خەڵکانە بەدرێژایی هەموو تەمەنیان ناتوانن ببن بەخاوەنی ئۆتۆمبێل یان خانوی خۆیان یان خاوەنی کۆمپیوتەری خۆیان تەنانەت ناتوانن ببن بەخاوەنی تەلەفۆنی خۆیان,...هتد. چونکە بڕی داهاتەکەیان ڕێگەیان پێ نادات واتە داهاتەکانیان سنوورداریان دەکات لەبەکارهێناندا. بەو داهاتە دەتوانن تەنها خۆراکی ڕۆژانەی پێ دابین بکەن، ئەمەش دەبێتە هۆی نا بازاڕی لەجیهاندا، بەپێی ئامارەکان (٨٠٪)ی دانیشتوانی گۆی زەوی ناتوانن بەشدارییەکی بەکار بکەن لەپێکهێنانی بازاڕی جیهانیدا. کەواتە چی بکەین؟

هەندێ لە ئابووریناسان و سیاسەتمەداران دەڵێن بەهۆی ڕۆڵ و چالاکی کۆمپانیا فرەڕەگەزەکانەوە کە سنووری ولاّتەکانیان بڕیوە و دەتوانن بەئازادی سەرمایەی خۆیان بخەنەگەڕ لەهەموو قوژبنێکی جیهاندا. بەمەش دەتوانن چارەسەری هەژاری و دواکەوتوویی بکەن، ئەویش بەکردنەوەی کارگەی بەرهەمهێنان و سەرقاڵ کردنی دانیشتوانی ئەو ولاّتانە لەپرۆسەی بەرهەمهێناندا و بەرزکردنەوەی داهاتیان و ئاستی ژیانیان، بێگومان بەهۆی بەرزبوونەوەی داهاتیانەوە وردەوردە دەبن بە بەشێك لە بازاڕی جیهانی، بەلاّم لەڕاستیدا ئەم بۆچوونانە هەڵەن چونکە ئامانجی سەرەکی کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان دەستکەوتنی قازانجێکی زۆرترە وە گەڕانە بەدوای هێزی کاری هەرزاندا لەو ولاّتانەدا، وە هەروەها مەبەستیان بەکارهێنان و دەرهێنان و بردنی سامانی ژێر زەوی ئەو ولاّتانەیە.



بابزانین کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان چین وە چی دەکەن؟ ئەم کۆمپانیایانە بەهۆی یەکگرتنی چەندان کۆمپانیای بچوك بچوکەوە لەکەرتێکی دیاریکراوی ئابووریدا پەیدابوون بەتایبەتی دوای ساڵەکانی حەفتای سەدەی بیستەم. ئەم کۆمپانیایانە دوو جۆرن: جۆری یەکەمیان بریتین لە کۆمپانیا بەرهەمهێنەرەکان، وە جۆری دووەم بریتین لە کۆمپانیا بازرگانیەکان، کە ئەمڕۆکە بلاّوبوونەتەوە بەهەموو جیهاندا، ئەرکی سەرەکی ئەم کۆمپانییانە گەڕانە بەدوای بازاڕی نوێدا بۆ ساغ کردنەوەی بەرهەمەکانیان وە بەدەستهێنانی قازانجی زیاتر، وە دەستکەوتنی سامانی ژێر زەوی بەنرخێکی زۆر هەرزان.

ئەمڕۆکە لە میدیای جیهانی و ڕاپۆرتە ئابوورییەکاندا، زیاتر باس لەدیاردەی جیهانگیری دەکرێت وەك باسکردن لەکۆمپانیا فرەڕەگەزەکان و بێ ناسنامەکان، بەمەش دەیانەوێت خەڵکی چەواشە بکەن، کە گوایە ئامانجی جیهانگیری جیاوازە وەك لەئامانجی کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان. دەڵێن جیهانگیری هێزی سەرمایە لەئاستی جیهاندا یەك دەخات و لەسایەی جیهانگیریدا سەرمایەداران داوادەکەن هەلی زیاتر بۆ بەگەڕخستنی سەرمایە بڕەخسێ وە بەرژەوەندییان لەوەدایە لە سەرتاسەری دونیادا سەرمایەگوزاری بکەن، بەمەش گوایە یارمەتی ولاّتانی هەژار و کەم دەرامەتەکان دەدەن بۆ پێشکەوتنیان و بوژانەوەی ژێرخانی ئابوورییان و باشکردنی باری کۆمەلاّیەتییان,...هتد. بەلاّم دەبێت بە ئاگابین ئایا جیهانگیری چییە و لەکوێوە سەرچاوە دەگرێت؟

جیهانگیری: پلەیەکی بەرزی یەکگرتنی کۆمپانیا گەورەکانی جیهانە کە بە بەرگ و ڕەنگێکی تر دەیانەوێت ولاّتە هەژارەکان زیاتر هەژار بکەن وە ولاّتە دەوڵەمەندەکان زیاتر دەوڵەمەند بکەن، کەواتە جیهانگیری درێژبوونەوەی سیاسەت و ئایدۆلۆژی کۆمپانیا بێ ناسنامەکانە. ولاّتە پێشکەوتووەکان لەلایەکی ترەوە بەناوی سودەکانی جیهانگیرییەوە دەیانەوێت جارێکی تر ولاّتانی تازە پێگەیشتوو دابەش بکەنەوە لەنێوان خۆیاندا.

دیاردەی جیهانگیری جگە لەئاکامە ئابوورییەکان ئاکامی کۆمەلاّیەتیشی بەدواوەیە، بۆ نموونە کاتێ کۆمپانیای (ماکدۆناڵدس - Mcdonalds) ڕێستۆرانتەکانی لەهەموو قوژبنێکی جیهاندا دەکاتەوە، جگە لەبەرژەوەندییە ئابوورییەکانی و قازانجی بێ سنور، کلتورێکی نوێ دەهێنێتە ناو کۆمەڵگاوە کە جیاوازە لەکلتوری ناوچەکە. کەواتە جیهانگیری پەیوەندییە کۆمەلاّیەتییەکان و نەریتی نەتەوایەتی لەبنەڕەتەوە هەڵدەتەکێنێ، ئەمڕۆکە دیاردەی جیهانگیری ئەوەندە کاریگەرە کە بەبێ پرس خۆی دەکات بەگشت

شوێنێکدا، وە بەبێ لەدەرگادان دێتە ناو ژوورەکانمانەوە، ئەمڕۆکە جیهانگیری لەناو هەر کۆمەڵگایەکدا جیاوازییە کۆمەڵایەتییەکان پەرەپێدەدا و ناکۆکییەکان تیژتر دەکات. دەتوانین بڵێین جیهانگیری لەبنەڕەتدا پرۆسەی بەجیهان کردنی سەرمایەدارییە و پشت بە لیبرالیزمی نوێ دەبەستێ، وە هێدی هێدی دەیانەوێت بازاڕەکانی دراو ئازاد بکەن بۆ ئەوەی دەوڵەت دەسبەرداری سیستەمی ئاڵوگۆڕی دراو بێت، بەمەش جڵەوی دەسەڵاتی دارایی لەدەستی دەوڵەتان دەردەهێنێ و هیچ رۆڵێك بۆ بانکی ناوەندی وڵاتان ناهێڵێتەوە، ئەوکاتە بانکی ناوەندی وەك ئامرازێکی دارایی بەدەست حکوومەتەوە هیچ دەورێکی نامێنێت لەگۆڕانی سیاسەتی دارایی و قەرزی بۆ چارەسەرکردنی کێشە ئابوورییەکانی وڵات، ئەمەش ترسێکی گەورەی هەیە لەسەر ئابووری و بەرژەوەندی نەتەوەیی. چونکە بەهۆی ئازادکردنی بازاڕەکانی دراوەوە سەرمایەی وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان تێکەڵ بە سەرمایەی جیهانی دەبێت بە بەشێك لەو سەرمایە جیهانییە و مۆرکی نەتەوایەتی پێوەنامێنێ. وە لەلایەکی ترەوە بە هەڵاهەڵای دیموکراسیەت و بازاڕی ئازادەوە زیاتر بەرژەوەندی سەرمایەداران دەپارێزێت و وڵاتە تازە پێشکەوتووەکان دەکەونە خزمەتی سیاسەتە ئابوورییەکانی سەرمایەی جیهانگیری. ئەوەتا ئەمڕۆکە دەبینین بەهۆی زۆرەملێ و داسەپاندنی سیاسەتی بازاڕی ئازاد و بەناو دیموکراسییەت کۆمەڵگای وڵاتانی تازە پێگەیشتووەکان کەوتونەتە تەنگەژی ئابووری و هێمنی و ئارامی و سەقامگیری کۆمەڵایەتییان لەدەستداوە. وە زۆربەی زۆری ئەو وڵاتانە بەهۆی سیاسەتی نوێیەوە کە جیهانگیرەکان لەڕێگەی حکوومەتەکانیانەوە بە سەرۆکایەتی (ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا) دایان سەپاندووە بەسەر هەموو جیهاندا زۆربەی زۆری دانیشتوانیان لەسامانی نەتەوەیی و داهاتی وڵات بێ بەشکردووە ئەمەش واتە زیاترکردنی هەژاری و برسێتی, ئایا بەسکی برسییەوە چۆن دەتوانرێت مومارەسەی دیموکراسیەت بکرێت؟ ئەم پرسیارە دەبێت لە ئایدۆلۆژە جیهانگیر و لایەنگرانی سیاسەتی جیهانگیری بکەین.

پۆزەتیڤ و نێگەتیڤی دیاردەی جیهانگیری و چالاکی کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان پێویستی بە باس و لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی هەمەلایەن و زانستانە هەیە، بەڵام ئەمڕۆکە هەموو یەکێك لەئێمە دەتوانێت باش و خراپیەکانی ئەم دیاردەیە بخاتە تای تەرازووی مێشکی خۆیەوە و بەوپەڕی هەست لێپرسینەوە دەتوانێت هەڵیان بسەنگێنێت. بەلای منەوە ئەگەر جیهانگیرەکان



ئایدۆلۆژی و سیاسەتی خۆیان نەگۆڕن ئەوا مەترسیەکی گەورە و چاوەڕوان نەکراو روودەکاتە سەر ئایندەی مرۆڤایەتی و دەبێتە هۆی جەنگێکی بێ کۆتایی لەنێوان هەژارە زۆرەکانی جیهان و دەوڵەمەندەکانی جیهان.

**فەرهەنگی ئابووری**

جیهانگیری ئابووری (Economic Globalization):

گۆڕینی ئابوورییە ناوخۆییەکان بە ئابووریەتی جیهان، کە ئەمەش جولانەوەیەکی ئازادانە و خێرای چالاکی ئاڵوگۆڕی دارایی و بازرگانییە جیهانییەکان دەگرێتەوە، کە سنور و بەربەستەکان و گومرگ رادەماڵێ و دەرگا بۆ گواستنەوەی ئازادانەی سەرمایە و گواستنەوەی شمەك و خزمەتگوزارییەکان والا دەکات. ئینتەرنێت و بازرگانی کردنی لە میانەی تۆڕەکان، دیاردەیەکی زیندووی ئەم ئابوورییە جیهانییە نوێیەیە، بەواتایەکی تر جیهان بوونی سەرمایە و پرۆسەی بەرهەمهێنان.

# بەشی شەشەم

## ئابووری بۆ هەموو رۆژێك

ئایا زانستی ئابووری چ رۆڵێك دەبینێت لەژیانی رۆژانەدا؟ ئایا زانستی ئابووری تەنها بۆ ئابووریناسانە یان ئەو زانستەیە کەهەر یەکێك لەئێمە دەتوانێت سودی لێ وەربگرێت لە هەڵسوڕانی کاروبار و مامەڵەکردنی رۆژانەماندا؟ ئایا تێگەیشتن لە دیاردە و رووداوە ئابوورییەکان یارمەتیمان دەدات لەکاتی بڕیاردانـدا...؟ بەڵێ، بەلاّم پێویستە لەسەرەتاوە کەمێك خۆمان ماندوو بکەین لەتێگەیشتنی بنچینە سەرەتایی و تیۆرە ئابوورییەکان. دەبێت بەلایەنی کەمەوە رۆژانە ئاگاداری راپۆرت و هەواڵە ئابوورییەکان بین، دەبێت ئاگاداری گۆڕانکاریە ئابووری و داراییەکانی جیهان بین. بۆ ئەوەی بەهۆی ئەو زانیاریانەوە بتوانین رووداو و گۆڕانکارییە ئابوورییەکان هەڵبسەنگێنین و لێیان بکۆڵینەوە تاکو بڕیار و بەرنامەکانمان سەرکەوتووبن وە گونجاو بن لەگەڵ رەوتە ئابوورییەکاندا، لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین بەشێوەیەکی ئاسان و ساکار دیاردەو رووداوە ئابوورییەکان روون بکەینەوە بۆ ئەوەی هەریەکێك لە ئێوەی خوێنەر بتوانێت شیتەڵ و شرۆڤەی پڕۆسە ئابوورییەکان بکات وە توانای بەشدارییەکی چالاکانەی هەبێت لە ئاڕاستەکردنی بڕیارە ئابوورییەکاندا.

# فەسڵی بیستەم

## چۆن بتوانین چاودێری گرژی و خاوبوونەوەی ئابووری وڵات بکەین؟

هەریەکێك لە ئێمە چ کاسبکار و خاوەن دوکانەکان وە چ مووچەخۆر و خاوەن کۆمپانیا و ڕێستۆرانت و ئوتێلەکان،...هتد پێویستیمان بەوەیە بزانین ئایا ئابووری وڵات لە چ بارودۆخێکدایە؟ ئایا بەرەو گەشەکردن و بوژانەوە دەچێت یان بەرەو تەنگەژی و قەیران؟ ئایا بوژانەوە و گەشەکردن تاکو کەی بەردەوام دەبێت و درێژە دەخایەنێت؟ ئایا بارودۆخی بازاڕی دارایی و قەرز و گۆڕینەوەی دراو لە چ ئاستێکدایە؟ ئایا سیاسەتی ئابووری حکوومەت بەرەو کوێ دەڕوات و ئاکامەکانی چییە؟ لەم فەسڵەدا هەوڵ دەدەین وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانە بدەینەوە.

## گرنگێتی زانیارییە ئابوورییەکان

ئابووری ئەو زانستەیە کە لە چالاکی مرۆڤ دەکۆڵێتەوە، واتە باس لە پەیوەندییە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگا دەکات. کەواتە تێگەیشتن لە هەموو ئەو گۆڕانکارییانەی کە بەسەر باری کۆمەڵایەتی و ئابووری کۆمەڵگادا دێت. بێگومان تەنها تێگەشتن لە تیۆرە ئابوورییەکان بەس نییە بەڵکو پێویستە فێر ببین چۆن ئەو زانیارییانە شیتەڵ بکەینەوە دوابەدوا بتوانین لەبەر ڕۆشنایدا دەرئەنجامی ڕاست و دروست بکەین.

بۆ نموونە هاووڵاتییەك بڕیار دەدات لەشاری (X)ەوە بگوێزێتەوە بۆ شاری (Y) بۆ نیشتەجێ بوون، چونکە شاری (Y) بوژانەوە و گەشەکردنی ئابووری تێدا دەستپێکردووە وە هەلی کاری زۆرتر تیایە، بەڵام دەبێت ئەوە لەیاد نەکەین لەکاتی بوژانەوەدا نرخی شمەك و خزمەتگوزارییەکان بەرەو بەرزبوونەوە دەچن بەتایبەتی نرخی موڵك و بینا و خانووبەرە، بەڵام ئەگەر سوڕی گۆڕانی ئابووریمان بێتەوە یاد کە لەبەشەکانی پێشوودا باسمان لێ کردووە، ئەوا دەتوانین ئەم دیاردەیە بەئاسانی شرۆڤە بکەین چونکە بەپێی یاسای سوڕە ئابوورییەکان هەموو بوژانەوە و گەشەکردنێك قۆناغی داکشانەوە و گرژبوونەوە و خاوبوونەوەی بەدواوەیە، واتە



چاوەڕوانی نزم بوونەوەی نرخ دەکرێت چ لەسەر شمەك و خزمەتگوزارییەکان یان لەسەر موڵك و خانووبەرە بۆیە هاووڵاتی شاری (X) چاوەڕوانی ئەو هەلە دەکات وە پەلە ناکات لە گوێزانەوەی بۆ شاری (Y) چونکە نرخەکان لە بەرزترین ئاستدان. کەواتە تێگەشتن لە دیاردە ئابوورییەکان هەمیشە یارمەتیمان دەدات لە بڕیارداندا.

هەروەك لەپێشەوە ئاماژەمان پێدا ئابووری زانستێکی کۆمەڵایەتییە بۆیە جگە لەفاکتەرە ئابوورییەکان دەبێت ڕەچاوی فاکتەرە کۆمەڵایەتییەکانیش بکرێت. ئێمە لەبەشەکانی پێشوودا بەشێوەیەکی هەرەمی باسمان لە یاسا ئابوورییەکان و کاریگەرییان کرد. لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین جارێکی تر بەکورتی بنچینە و ڕێسا ئابوورییەکان بیری خوێنەر بخەینەوە.

## مەبەست لە هێما و ئامار و پێناسە ئابوورییەکان چین؟

هەموو حکوومەتەکان لەڕێگەی هەندێ دەزگای تایبەتییەوە و بەهۆی میدیاوە پێرست و هێما و ئامارە ئابوورییەکان بلاودەکاتەوە بۆ ئاگادار کردنەوەی هاووڵاتییان لە بارودۆخی ئابووری، وە هەروەها بۆ ئاگاداری سەرمایەگوزارە بیانییەکان (زیاتر هێز و پارتە سیاسییە ئۆپۆزسیۆنەکان بەم کارە هەڵدەستن چونکە ئەوان تەنها هێزێکن کە دەتوانن چاودێری و کۆنترۆڵی دەسەڵات بکەن).

بۆ نموونە کاتێك لەڕێگای میدیا و ڕاپۆرتە ئابوورییەکانەوە دەزانین ڕادەی بێکاری لە وڵاتدا گەیشتۆتە (١٠٪) واتە ڕەوشی ئابووری بەرەو تەنگەژی دەڕوات، کەواتە هەڵاوسان کەم دەبێتەوە ئەمەش دەبێتە هۆی دابەزینی نرخ لەبازاڕەکاندا کەواتە بە تێگەیشتن لە ڕێژەی بێکاری و شیکردنەوەی دەتوانین پێشبینی گۆڕانکارییە ئابوورییەکان بکەین و بڕیاری گونجاو بدەین لە جێبەجێکردنی چالاکییە ئابوورییەکانماندا. ئەمە لەلایەکەوە وە لەلایەکی تریشەوە دیاردەی بێکاری ترسناکە و ئاکامی کۆمەڵایەتی لێ دەکەوێتەوە بۆیە پێویستە لەسەر حکوومەت کەچەند هەنگاوێکی خێرا بنێت بۆ چارەسەرکردنی، یەکێك لەو هەنگاوە خێرایانە کەم کردنەوەی ڕێژەی سودی قەرزە بۆ ئەوەی کەرتی بەرهەمهێنان ببوژێتەوە چونکە کەم بوونەوەی ڕێژەی سودی قەرز زەمینەیەکی لەبار دروست دەکات بۆ سەرمایەگوزاری ئەوکاتە بەگەڕخستنی سەرمایە دەبێتە هۆی ڕەخساندنی شوێنی کار واتە کەم بوونەوەی بێکاری، کە لەئەنجامدا دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی نرخ و هەڵاوسان.

ئێستاکە لە خوارەوە جارێکی تر پێڕستە ئابوورییە گرنگ و سەرەکییەکان بیری خوێنەر دەهێنینەوە.

## تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی

ئەم پێناسەیە گرنگترین پێڕستی ئابوورییە کەپێویستە زۆر بەسەرنجەوە چاودێری بکەین. حکوومەتی ولاتە پێشکەوتووەکان مانگانە یان هەر سێ مانگ جارێك ئاستی گەشەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی بلاودەکاتەوە بۆ ئەوەی هاوولاتیان و سەرمایەگوزاران ئاگاداری بارودۆخی ئابووری ولات بن، وە هەروەها بەئاگابن لە کاروباری حکوومەت وە بەم شێوەیە ئاگاداردەبین ئایا تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی لەماوەی ساڵێکدا چۆن گۆڕانی بەسەردا دێت، ژمێرکردنی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی بەهۆی چەند مێتۆدێکەوە دەکرێت کە لەبەشەکانی پێشوودا باسمان لێکردووە، ئێستاکە جارێکی تر بەکورتی دووبارەی دەکەینەوە:

$$\text{دەستهاتی نەتەوەیی} = \frac{\text{دەستهاتی نەختینەیی نەتەوەیی}}{\text{ڕەنووسی پێوانەی نرخ}} \times ١٠٠$$

بۆ نموونە: ئەگەر دەستهاتی نەتەوەیی لەساڵی (٢٠٠٠)دا بریتی بوویێت لە (١٠٠) ملیۆن دۆلار وەنرخیش بەرامبەر ساڵی (١٩٩٥) بەڕێژەی (٢٥٪) زیادی کردبێت بەمەش ڕەنوسی پێوانەکی نرخ بەرزبۆتەوە لە (١٠٠)ەوە بۆ (١٢٥) هەر بۆیە.

$$\text{دەستهاتی نەتەوەیی} = \frac{١٠٠٠}{١٢٥} \times ١٠٠ = ٨٠٠ \text{ ملیۆن دۆلار}$$

کەواتە کاتێك حکوومەتی ولاتێك بەیانی دەکات کە تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی ئەمساڵ بەبڕی (٣٪) زیادی کردووە واتە بەو ڕێژەیە بەرزبۆتەوە وەك لەساڵی پێشووتر، بەڵام کاتێك حکوومەت بەیانی بڕی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی لەساڵی داهاتوودا بەڕێژەی (٢٪) واتە



تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی بەڕێژەی (١٪) دابەزیوە وەك لەساڵی پێشووتر، ئەمەش مانای ئەوەیە کە ڕەوشی ئابووری بەرەو داکشانەوە دەچێت بەرامبەر ساڵی پێشووتر، بێگومان بەرزبوونەوە و دابەزینی ڕێژەی گەشەی تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی بەستراوە بەچەندان فاکتەری ترەوە وەك (بێکاری، هەلاوسان، سەرمایەگوزاری، باری سیاسی و کۆمەلایەتی،...هتد). دەتوانین دەرئەنجامی ئەوە بکەین کە پێناسەی ئاستی بەرهەمی نەتەوەیی گرنگترین بارۆمەترە بۆ دیاریکردنی بارودۆخی ئابووری ولات بەشێوەیەکی گشتی.

**فەرهەنگی ئابووری**

سەرجەمی داهاتی نەتەوەیی (تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی):-
(Gross National Income)
بریتییە لە بەهای نەختینەی نرخی بازاڕی گشت شمەك و خزمەتگوزارییە تەواوکراوەکان، کە نیشتەنییەکانی ولات لەماوەی ساڵێکدا بە بەرهەمی دەهێنن.

**فەرهەنگی ئابووری**

بەرهەمی نەتەوەیی (National Product):- بریتییە لە سەرجەمی بەهای نەختینەی شمەك و خزمەتگوزاری دروستکراو یان پێشکەشکراو لەماوەی ساڵێکدا، مەبەستیش لەو شمەکە شێوەی دوایەکیی ئەم شمەکەیە کە بۆ بەکارهێنان ئامادەدەکرێ.
خزمەتگوزاریش ئەو شتەیە کەڕاستەوخۆ پێشکەش بەسودمەندی دوایەکیی (دواسودمەند) دەکرێ، بۆ نموونە خزمەتگوزاریی ئاسایش و بەرگریی،...هتد.

## بێکاری و جۆرەکانی

لە میدیا جیهانییەکانەوە ڕۆژانە گوێمان لە زاراوەی بێکاری دەبێت بەتایبەتی لەولاتە پێشکەوتووەکاندا، وە هەروەها ڕۆژانە لەشاشەکانی تەلەفزیۆنەکانەوە خۆنیشاندان و مانگرتنی کارمەندان و کرێکاران دەبینین کە دژی کەمکردنەوەی شوێنی کار و بێکاری دەیگێڕن. چونکە بێکاری دیاردەیەکی ترسناکە بۆیە ئابووریناسان و حکوومەتەکان گرنگییەکی زۆری پێ دەدەن.
کاتێك ژمارەی بێکاران لەولاتێکدا زیاددەکات ئەوە زیانی مادی و زەرەری داراییی دەکەوێتەوە جگە لەو زیانە زۆرەی کە لەداهات و دەستکەوتی تاکەکەس دەکەوێت و ئاکامی کۆمەلایەتی نێگەتیڤانەشی لێ دەکەوێتەوە لەبەرئەوە ئەرکی سەرەکی حکوومەت لەناوبردنی بێکارییە لەولاتدا.

ئەمرۆکە لەزۆربەی ولاّتە پێشکەوتووەکاندا کاتێ ڕێژەی بێکاری لەئاستی (٤٪)دایە واتە ئەو ولاّتە بێکاری تێدا نییە، چونکە ئەو ڕێژەیە ئەو کارکەرانە دەگرێتەوە کە شوێنی کاریان دەگۆڕن یان پشووی تایبەتییان بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ وەرگرتووە یان خۆیان بێکار کردووە. هەندێ لە ئابووریناسان ڕێژەی (٦٪) بە ڕێژەیەکی گونجاو دادەنێن، مەسەلەی بێکاری لەولاّتە تازە پێشکەوتووەکاندا لێکۆڵینەوەیەکی جیاتری دەوێت.

ئابووریناسان گەلێك چەشنی بێکاریان دەستنیشان کردووە کە هەریەکەیان هۆی تایبەتی خۆی هەیە، ئەمەش جۆرەکانی بێکارییە بەشێوەیەکی گشتی:

- بێکاری هەڵسوکەوتFrictional Unemployment
- بێکاری خولدراوCyclical Unemployment
- بێکاری تەکنەلۆژیTechnology Unemployment
- بێکاری تەوزیمیInvoluntary Unemployment
- بێکاری شاراوەDisguised Unemployment
- کژە بێکاریSeasonal Unemployment
- بێکاری قەوارەدارStaructural Unemployment

ئێستاکە هەریەك لە جۆرەکانی بێکاری لە خوارەوە ڕوون دەکەینەوە:

- بێکاری هەڵسوکەوت:

ئەم جۆرە بێکارییە لەئەنجامی شوێناوشوێن کردنی کرێکاراندا بەستەم لەنێوان پڕۆژە بەرهەمهێنە جیاوازەکاندا پەیدا دەبێت.

- بێکاری خولدراو:

ئەم جۆرە بێکارییە لەئەنجامی ئەو سوڕە ئابوورییانەدا ڕوودەدات کەوا تووشی ولاّتە پێشکەوتووەکان دەبێت لەشێوەیەکی ڕێکوپێکدا بەهۆی بەش نەکردنی خواستی هەمەکیی.

- بێکاری تەکنەلۆژی:

ئەم جۆرە بێکارییە لەئەنجامی پێشکەوتنی تەکنەلۆژی لە کردەی بەرهەمهێناندا (ئامێر و هۆی بەرهەمهێنانی تازە کەجێی کرێکار دەگرێتەوە) پەیدا دەبێت.

-بێکاری تەوزیمی:

ئەم جۆرە بێکارییە بریتییە لەو بارەی کەتیایدا بێکاری زۆرە ملیّ نامێنێت.



ئابووریناسە کلاسیکییەکان لەکۆتایی سەدەی هەژدەهەمەوە تا سەرەتای ئەم سەدەیە بڕوایان وابوو کە کارپێدانی تەواو لەخۆیەوە دێتەدی، بەبێ ئەوەی پێویست بەدەست تێخستنی دەوڵەت بکات، بەلاّم کاتێك لە مێژووی ئابووری دەکۆڵینەوە بەڕوونی بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم تیۆرییە لەگەڵ بارودۆخی ئێستادا ناگونجێ.

- بێکاری شاراوە (نادیار):

یەکێکە لەشێوەکانی بێکاری قەوارەدار و بریتییە لە بەفیڕۆدانی توانای بەشێك لەهێزی کار لەئیشوکاری بێکەڵك و کەم بەرهەمدا.

- کژە بێکاری:

ئەم جۆرە بێکارییە لەو پڕۆژانەدا ڕوودەدات کە گۆڕانی وەرزەکان یان ئاووهەوا کاریان تێدەکات وەك بیناکاری و شەقام و ڕێگا و پرد دروستکردن، کە سەرما و تەڕ و تووشی دەبێتە هۆی وەستاندنی کاری ئەم پڕۆژانە بۆ چەند هەفتەیەك یان چەند مانگێك، لەئەنجامدا بێکاری تاماوەیەك پەیدا دەبێت.

- بێکاری قەوارەدار:

ئەم جۆرە بێکارییە بەهۆی گۆڕانی خواستەوە لەهەندێ پیشەسازییەوە بۆ هەندێکی دیکە ڕوودەدات، یان بەهۆی گۆڕانێکی گەورەوە کە بەسەر قەوارەی پیشەسازی ولاّتدا دێت.

بێگومان بێکاری بە هەرچ شێوەیەك لەشێوەکان بێت مەترسیەکی گەورەی ئابووری و کۆمەلاّیەتی لەکۆمەڵگادا هەیە بۆیە چارەسەرکردنی ئەرکی سەرەکی حکوومەتە وە هەروەها ئەرکی سەرشانی سەرمایەدارانی ولاّتە.

**فەرهەنگی ئابووری**

بێکاری (Unemployment):

بارێکە تیایدا کەسان توانا و ئارەزووی کارکردنیان هەیە بەلاّم بە کرێی باو کاریان چنگ ناکەوێ، ئەمەش چەند جۆرێکی هەیە:

(بێکاری هەڵسوکەوت، بێکاری خولدراو، بێکاری تەکنەلۆژی، بێکاری تەوزیمی، بێکاری شاراوە، کژە بێکاری، بێکاری قەوارەدار)

## هەڵاوسان و جۆرەکانی

هەڵاوسان یەکێکە لەو دیاردە کوشندانەی کە ئەمڕۆکە زۆربەی وڵاتانی جیهانی گرتۆتەوە. مەبەست لە هەڵاوسان ئەوەیە کە نرخ بەردەوام بەرزدەبێتەوە. وە ئەم بەردەوام بەرزبوونەوەیەش لەوەوە پەیدا دەبێت کە قەوارەی خەرجی (داوا و خواست) لە قەوارەی بەرهەم (خستنەڕوو) زیاترە بەواتایەکی تر بڕی پارە زۆرە و بڕی شمەك و خزمەتگوزارییەکان لەبازاڕدا کەمترە.

ئابووریناسان بەشێوەیەکی گشتی بەهۆی دوو ڕێبەرەوە (Index) ڕادەی هەڵاوسان دیاری دەکەن، یەکەمیان ڕێبەری بەکاربردنە (خەرجی) (cpl)، دووەمیان ڕێبەری بەرهەمی پیشەسازی (pp).

ڕێبەری بەکاربردن ڕادەی بەرزبوونەوەی نرخی شمەك و خزمەتگوزارییەکان لەماوەیەکی دیاریکراودا (مانگ، سێ مانگ، ساڵ) نیشان دەدات. بەڵام ڕێبەری بەرهەمی پیشەسازی ڕادەی بەرزبوونەوەی نرخی وەبەرهەمهێنان نیشان دەدات وەك مەوادی خام و پێداویستییەکانی تری بەرهەمهێنان.

ئێستاکە بۆ زیاتر ڕوون کردنەوە بەهۆی خشتەکەی خوارەوە ڕادەی هەڵاوسانی گشتی واتە (بەرزبوونەوەی نرخ لەسەر شمەك و خزمەتگوزارییەکان) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەماوەی سێ مانگدا (تەمووز، ئاب، ئەیلول) ساڵی (٢٠٠٢) نیشان دەدەین.

خشتەی ژمارە (٢٠-١) هەڵاوسان لەماوەی مانگی (تەمووز، ئاب، ئەیلول) (٢٠٠٢)دا.

| پێناسەکان | ڕادەی هەڵاوسان لەماوەی سێ مانگدا |
|---|---|
| هەڵاوسان بە گشتی | ٣,١ |
| خۆراك و خواردنەوە | ٠,٩ |
| خانووبەرە | ٢,٩ |
| جلوبەرگ | ٤,٧ |
| هاتووچۆ و گوێزانەوە | ٥,١ |
| خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان | ٤,٧ |
| گەشت و گوزار | ١,٥ |
| پەروەردە و فێرکردن | ٢,٢ |
| شمەك و خزمەتگوزارییەکانی تر | ١,٢ |
| کارەبا | ١٣,٤ |
| شمەك و خزمەتگوزارییەکانی تر جگەلە کارەبا و خۆراك | ٢,٣ |



ئەگەر سەیری خشتەکەی پێشوو بکەین بۆمان دەردەکەوێت کە ڕێژەی هەڵاوسان بەگشتی بریتییە لە ڕێژەی (٣,١) واتە نرخ بەو ڕادەیە زیادی کردووە لەسەر هەموو شمەك و خزمەتگوزارییەکان، بەڵام ئەگەر بەسەرنجەوە سەیری خشتەکە بکەین دەبینین نرخی خۆراك و خواردنەوە و کەرتی گەشتوگوزار بەڕێژەیەکی کەمتر بەرزبۆتەوە لەچاو نرخە گشتیەکاندا، بەڵام نرخی جلوبەرگ، هاتووچۆ و گواستنەوە، تەندروستی، کارەبا ڕێژەی بەرزبوونەوەیان زیاترە وەك لە نرخ بەگشتی. کەواتە بەهۆی ئەم زانیارییانەوە دەتوانین بزانین لە چ کەرتێکی ئابووریدا وە بە چ ڕێژەیەك نرخەکان دەگۆڕێن ئەمەش یارمەتیمان دەدات لە جموجۆڵ و چالاکییە ئابوورییەکانمان و دەهەروەها لە بەگەڕخستنی سەرمایەکانمان. لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا ئەم زانیارییانە مانگانە لە ڕۆژنامە و گۆڤارە ئابوورییەکاندا بڵاودەکرێتەوە تاکو هاووڵاتیان ئاگاداری گۆڕانی نرخەکان بن، بەڵام بەداخەوە لە وڵاتە تازە پێشکەوتووەکاندا ئەم جۆرە زانیارییانە ئامار ناکرێت تەنانەت حکومەتەکان نازانن چی ڕوودەدات نەك هاووڵاتیان.

هەڵاوسان چەند جۆرێکی هەیە لە هەرە گرنگەکانیان:

- هەڵاوسانی برواپێدان Inflation Of Credit
- هەڵاوسانی ڕەسەن Banafida Inflation
- هەڵاوسانی خێرا Galloping Inflation
- هەڵاوسانی خشۆك Creeping Inflation
- هەڵاوسانی خواست Demand Inflation
- هەڵاوسانی بەرەڵڵا Laissez Faire Inflation
- هەڵاوسانی پەیوەندییە دەرەکییەکان Foreign Relation Inflation
- هەڵاوسانی مات Repressed Inflation
- هەڵاوسانی تێچوون Cost Inflation
- هەڵاوسانی شاراوە Hidden Inflation
- هەڵاوسانی هاوردە Import Inflation
- هەڵاوسانی لە ئەندازە بەدەر Hyper Inflation
- هەڵاوسانی گیرۆ (بەند) Conditional Inflation
- هەڵاوسانی نەختینە Monetary Inflation
- هەڵاوسانی قەوارەدار Structural Inflation

ئێستاکە هەریەك لە جۆرەکانی هەڵاوسان روون دەکەینەوە.

- هەڵاوسانی بڕواپێدان:- ئەو جۆرە هەڵاوسانەیە کە بەهۆی زیادبوونی هۆیەکانی پێدان، نرخیش بەرزدەبێتەوە.
- هەڵاوسانی رەسەن:- ئەم چەشنە هەڵاوسانە لەبارێکدا دێتەدی ئەگەر زیادبوونی خواستی هەمەکیی نەبێتە هۆی زیادبوونی بەرهەم، ئەمەش دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی ئاستی گشتی نرخ.
- هەڵاوسانی خێرا:- بەپێی ئەم هەڵاوسانە نرخ بەخێرایی بەرزدەبێتەوە و پارەش بەشێوەیەکی خێرا بەهاکەی دەدۆڕێنێ، بۆیە خەڵك متمانەیان بە پارەی نەخت نامێنێ و پەنا دەبەنەبەر ئاڵشت واتە شت بە شت گۆڕینەوە.
- هەڵاوسانی خشۆك:- لەم جۆرە هەڵاوسانەدا، ئاستی نرخ بەشێوەیەکی بەردەوام بەرزدەبێتەوە، بەڵام بەسستی، واتە رێژەکەی لەنێوان (٢٪) و (٣٪)دایە.
- هەڵاوسانی خواست:- ئەم زاراوەیە بۆ نیشانە هەڵدانی ئەو هەڵاوسانە بەکاردێت کە لەئەنجامی زیادبوونی خواست بەهۆی زیادبوونی داهاتەوە روودەدات.
- هەڵاوسانی بەرەڵڵا:- لەکاتی ئەم جۆرە هەڵاوسانەدا نرخ بەشێوەیەکی بەردەوام بەرزدەبێتەوە بێ ئەوەی شتێك بەربەستی بکات.
- هەڵاوسانی پەیوەندییە دەرەکییەکان:- هۆی بڵاوبوونەوەی ئەم چەشنەش بەندە بە پەیوەندییە ئابوورییەکانی نێودەوڵەتان، چونکە ئابووری وڵاتە سەرمایەدارییەکان ئابوورییەکی کراوەیە بەرەو دەرەوە.

بەم پێیە زیاد هێنان لە تەرازووی بازرگانیدا بەهۆی هەناردراو، یان هاتنە ناوەوەی پارەی جامبازی یان پارەی خستنەکار و وەبەرهێنان دەبنە هۆی زیادبوونی پەلی نەختینە و بەدیارکەوتنی رەوتێکی هەڵاوسانی بەرفراوان.

- هەڵاوسانی مات:- ئەم جۆرە هەڵاوسانە لەکاتێکدا روودەدات کەوا میری بەتایبەتی لەکاتی جەنگدا، نرخ بۆ شمەك بڕێتەوە و لەسەر دابەشکردنی شمەکێکدا (لەئەنجامی زیادبوونی خواست) زاڵ دەبێتەوە، ئەمەش مانای وایە ئەو هێزەی پاڵ بە بەرزبوونەوەی نرخەوە دەنێت خەفەکراوە، لەمەشەوە سەر رێژەی پاشەکەوتەکان پەیدادەبێت.
- هەڵاوسانی تێچوون:- ئەم جۆرە هەڵاوسانە لەئەنجامی زیادبوونی کرێ یان نرخی کەرەستەی سەرەتایی پەیدا دەبێت.



بۆ نموونە: بەرزبوونەوەی کرێ دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی تێچوون و نزمبوونەوەی خستنەڕوو و بەرزبوونەوەی نرخی فرۆتنی و نزم بوونەوەی هێزی کڕین و ئەمەش دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەیەکی دیکە لە کرێدا و...هتد.

- هەڵاوسانی شاراوە (نادیار):- واتە هەڵاوسانی شاراوە لەنرخی شمەکدا.
- هەڵاوسانی هاوردە:- ئەم چەشنە هەڵاوسانە لەگەڵ نرخی بەرزی شمەکی ئەو وڵاتانە دێت کە تووشی هەڵاوسان دەبن.
- هەڵاوسانی لە ئەندازە بەدەر:- ئەم جۆرە هەڵاوسانە نرخ بەڕادەیەکی زۆر بەرزدەبێتەوە و خێرایی ئاڵوویری پارە زیاد دەکات و پارەش بەکاری گەنجینەی بەها هەڵناسێ.
- هەڵاوسانی گیرۆ (بەند):- ئەو هەڵاوسانەیە کە نرخەکان تیایدا توانای بەرزبوونەوەیان هەیە، بەڵام حکوومەت دەست بەسەر نرخدا دەگرێت لەرێگەی یاسا دەرکردن و بەکارهێنانی سیستەمی نرخ بڕین و کارت دابەشکردن.
- هەڵاوسانی نەختینە:- ئەم چەشنە هەڵاوسانە لەئەنجامی پێهەڵبڕینی بانکی ناوەندی لەدەرکردنی ماف و جۆرجیازی نەختینە بە بڕێکی زیاتر لەو رادەیەی کە ئابووری پێویستێتی پەیدا دەبێت.
- هەڵاوسانی قەوارەدار:- ئەم جۆرە هەڵاوسانە لەئەنجامی سروشتی پێکهاتی ئابوورییەوە پەیدا دەبێت.

هەروەك لەپێشەوە باسمان لێکرد هەڵاوسان بریتییە لە هەڵکشانی بەردەوامی ئاستی نرخ وە هەرە هۆ گرنگەکانی هەڵاوسان بریتین لە:

- زیادبوونی بڕی پارە لەچاو بڕی شمەکدا.
- خێرا دەستاودەستکردنی پارە.
- شەڕوشۆڕی چەکداری.
- پارەدارکردنی بودجە.
- بارگرانی باج.

**چەندان رێگە هەیە بۆ چارەسەرکردنی هەڵاوسان لەهەرە گرنگەکانیان:**

١- کەم کردنەوەی خەرجییە گشتییەکانی حکوومەت: چونکە ئەگەر حکوومەت خەرجییەکانی خۆی کەم بکاتەوە دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی خەرجی نەتەوەیی بەمەش خواستی

هەمووەکی کەم دەکات وە بەکەمبوونەوەی خواستی هەمووەکیش توندوتیژی هەڵاوسان کەم دەکات و سنورێك بۆ بەرزبوونەوەی نرخەکان دادەنرێت.

٢- زیاد کردنی باج: باج دانان یەکێکە لەو رێگایانەی کە حکوومەت دەیگرێتە بەر لە چارەسەرکردنی هەڵاوساندا، چونکە بەهۆی سەپاندنی باجەوە بەشێك لەو دەستهاتەی بۆ خەرجکردن تەرخان کراوە کەم دەکات جا باج سەپاندنەکە راستەوخۆ بێت کە دەخرێتە سەر دەستهات و سامان یان لاوەکی بێت کە دەخرێتە سەر شمەك و کارگوزاری بەرهەمهێنراو.

٣- سیاسەتی نەختینەیی: دەوڵەت لە سیاسەتی نەختینەییدا دێت بڕی خراوە رووی پارە لەبازاڕدا کەم دەکاتەوە تا چارەسەری هەڵاوسانی نرخی پێ بکات.

٤- هەندێ جار دەوڵەت بەهۆی کەمکردنەوەی نرخی شمەك و خزمەتگوزاریەکان و دیاریکردنی کرێ وە دەتوانێت کار لە بەرزبوونەوەی نرخ بکات.

## ڕێژەی سوودی قەرز

ڕێژەی سوودی قەرز یەکێکە لە پێوەر و پێناسە گرنگەکانی ئابووری کە بەهۆیەوە دەتوانین رەوشی ئابووری وڵات دیاری بکەین.

کاتێك بڕی سوودی قەرز لە رادەیەکی نزمدا بێت ئەوا قەوارەی سەرمایەگوزاری زیاد دەبێت ئەمەش دەبێتە هۆی بوژانەوەی باری ئابووری و بەکاربەران (دانیشتوان، حکوومەت) کە دەتوانن بەهۆی قەرزی بانکەوە زیاتر شمەك و خزمەتگوزارییەکان بەکاربهێنن بەتایبەتی شمەکە درێژخایەنەکان وەك موڵك و ماڵ و خانووبەرە، پێداویستییەکانی تر کە ماوەیەکی دوورودرێژ خزمەت دەکەن وەك ئۆتۆمبیل، تەلەفزیۆن، کەلوپەلی تری ناوماڵ،...هتد. بەڵام کاتێك بڕی سوودی قەرز بەرز بێت ئەوا گرژی دەکەوێتە باری ئابووری و قەوارەی سەرمایەگوزاری کەم دەبێتەوە ئەمەش دەبێتە هۆی سستی و خاوبوونەوەی بازاڕەکان، بەرزی و نزمی رێژەی سوودی قەرز بەشێوەیەکی توندوتۆڵ بەستراوە بە سوڕە ئابوورییەکانەوە.

کاتێك باری ئابووری بەرەو بوژانەوە دەچێت واتە (قۆناغی بووژانەوە) ئەوا پلەوپایەی بژاوتی ئابووری بەرەبەرە و لەسەرخۆ بەرەو پەرەسەندن دەچێت. ئەوکاتە رێژەی سوودی قەرز بەرەو کەم بوونەوە دەچێت. کاتێك باری ئابووری بەرەو برەوسەندن دەچێت واتە (قۆناغی برەوسەندن) لەم قۆناغەدا پلەوپایەی بەرهەمهێنان و بەکارخستن بەرزدەبێتەوە، بازرگانی پەرەدەسێنێت و دەستهات زیاد دەکات، ئەوکاتە رێژەی سوودی قەرز زیاتر کەم دەبێتەوە، بەڵام



کاتێك باری ئابووری بەرەو داکشانەوە دەچێت واتە (قۆناغی داکشانەوە) لەم قۆناغەدا، دیاردەی تەنگانەی ئابووری سەرهەڵدەدات. پلەوپایەی بەرهەمهێنان و دەستهاتی نەتەوەیی نزم دەبێتەوە، نرخ کەم دەکات و بێکاری سەرهەڵدەدات، ئەوکاتە رێژەی سوودی قەرز بەرزدەبێتەوە، بەڵام کاتێك باری ئابووری بەرەو بێ بازاڕی واتە (قۆناغی بێبازاڕی) لەم قۆناغەدا بێکاری تێکڕا زیاد دەکات، پلەوپایەی بەرهەمهێنان زۆر دەداتە نزمی، بازرگانی تووشی بێ بازاڕیەکی توند دەبێت و نرخیش بە رادەیەکی زۆر کەم دەکات ئەوکاتە رێژەی سوودی قەرز زۆر کەم دەبێتەوە. کەواتە دەتوانین بڵێین کە سوودی قەرز وەك پێناسەیەکی ئابووری وە ئامرازێکی بەکار بەدەست حکوومەتەوە دەتوانێت کاربکاتە سەر (سوڕی ئابووری) چونکە کاتێك باری ئابووری بەرەو گرژی و داکشانەوە دەچێت پێویستە حکوومەت رێژەی سوودی قەرز دابەزێنێت بۆ ئەوەی باری ئابووری جارێکی تر بەرەو قۆناغی بوژانەوە و گەشەکردن ببات.

## پێناسە و پێڕستەکانی بازاڕی دارایی

هەندێ پێڕستی ئابووری و دارایی جگەلە سوودی قەرز کاریگەری راستەوخۆیان هەیە لەسەر باری ئابووری، ئەو پێڕستانەش بریتین لە رێبەری بۆرسەکان، نرخی زێڕ، نرخی وزە (نەوت).

**- رێبەری بۆرسەکان (بازاڕی کاغەزی دارایی):**

بەهۆی زانینی زانیاری لە بۆرسەکاندا واتە (بازاڕی کڕین و فرۆشتنی پشك و قەواڵە) دەتوانین بزانین بارودۆخی ئابووری جیهانی و ناوچەیی بەرەو چ ئاراستەیەك دەڕوات. چونکە بۆرسە ئەو رووبەرەیە کە کۆمپانیا بەرهەمهێنەر و بازرگانەکان بەهۆی پشك و قەواڵەوە بەرهەمەکانیان پێشنیاز دەکەن بۆ فرۆشتن. بۆرسە چەند جۆرێکی هەیە، بەڵام هەرە گرنگەکانی بۆرسەی کاغەزی داراییە، کاتێك رەوشی ئابووری بەرەو گەشەکردن دەچێت ئەوا نرخی کاغەزی دارایی لە بۆرسەکاندا بەرەو بەرزبوونەوە دەڕوات، بەڵام کاتێك ئابووری بەرەو گرژی و داکشانەوە دەچێت ئەوا نرخی پشك و قەواڵەکان لە بۆرسەکاندا بەرەو نزمبوونەوە دەڕوات. بەشدارگەکانی بۆرسە واتە خاوەن پشك و قەواڵەکان جا چ کۆمپانیا و دەزگا داراییەکان یان خەڵکی ئاسایی زۆر بەوردی چاودێری بەرزبوونەوەو نزمبوونەوەی پشکەکان دەکەن بۆ ئەوەی لەکاتی کڕین و فرۆشتندا تووشی زەرەر و زیان نەبن بەڵکو قازانج بکەن. ئەم پڕۆسەیە زیاتر لەلایەن پسپۆڕەکانی بواری بۆرسە بەئەنجام دەدرێت، چونکە پێشبینکردنی بەرزبوونەوە و

نزمبوونەوەی نرخی پشکەکان لەبازاڕی کاغەزی بەنرخدا هەروا ئاسان نییە بەڵکو پێویستی بە شارەزایی و ئەزموون هەیە.

ئابووریناسان رووبەری بۆرسەکان بە ئاوێنەی رەنگدانەوەی بارودۆخی ئابووری دادەنێن، چونکە لەبۆرسەکاندا پرۆسەی کڕین و فرۆشتنی شەیرەکانی کەرتە ئابوورییە جیاجیاکان دەستنیشان دەکرێن. بۆ نموونە ئەگەر لە بۆرسە جیهانییەکاندا جامبازەکان بەشێوەیەکی چالاك بکەونە کڕینی شەیری کۆمپانیا بەرهەمهێنەرەکانی کۆمپیوتەر واتە کەرتی بەرهەمهێنانی کۆمپیوتەر بەرەو گەشەکردن دەچێت واتە داوا و خواست لەسەر کۆمپیوتەر زیادی کردووە واتە بازرگانی کۆمپیوتەر و پێداویستییەکانی کۆمپیوتەر بازرگانییەکی بەسوود و قازانجە. بەم شێوەیە بە ئاگاداریمان لەرێبەری بۆرسەکاندا دەتوانین ئاراستەی گەشەکردنی کەرتە ئابوورییەکان دیاری بکەین. ئەمڕۆکە گەمەکردن واتە مامەڵەکردن لە بۆرسە جیهانییەکان و ناوچەییەکاندا بۆتە بەشێکی گرنگی داهاتی خەڵکی، بەتایبەتی لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا زۆربەی زۆری دانیشتوان لەرێگەی جامبازەکانەوە بەشداری دەکەن لەکڕین و فرۆشتنی پشکەکاندا، بەمەش ژمارەیەکی زۆری دانیشتوان بەشدارییەکی چالاك و راستەوخۆ لە پرۆسەی ئابووری وڵاتەکەیاندا دەکەن وە هەروەها سەرچاوەیەکی لاوەکی داهاتیشیانە.

## نەوت و نرخی نەوت

ئەمڕۆکە لە جیهاندا هەر لە بچووکەوە تاکو گەورە ئاشنان بە رۆڵی نەوت وەك سەرچاوەیەکی گرنگی وزە لەجیهاندا، نرخی نەوت کاریگەری راستەوخۆی هەیە لەسەر ژیان و گوزەرانی هەر یەکێك لە ئێمە. خەڵکی لەبری سێ ژەم نان خواردن دەتوانن دوو ژەم نان بخۆن، بەڵام ئۆتۆمبیلێك بەبێ بەنزین ناتوانێت جوڵە بکات جگەلەوە نەوت وەکو سەرچاوەی وزە لە زۆربەی بوارەکانی بەرهەمهێناندا بەکاردێت وە هەروەها وەکو کەرەستەی خاو لەپیشەسازی پەترۆکیمیایدا...هتد.

کاتێك لەرێگەی میدیاکانەوە گوێمان لێ دەبێت کە نرخی بەرمیلێك نەوت لە (٥٠) دۆلارەوە بەرزبۆتەوە بۆ (٦٠) دۆلار. یەکسەر بەبێ یەك و دوو دەتوانین پێشبینی بەرزبوونەوەی نرخ لەسەر هەموو شمەك و خزمەتگوزارییەکان بکەین، کەواتە بە ئاگاداریمان لەنرخی نەوت دەتوانین ئاراستەی باری ئابووری جیهان و ناوچەکە پێشبین بکەین.



نەوت و گاز وەك سەرچاوەیەکی وزە ئەمڕۆکە جگەلە کەڵکە ئابوورییەکانی بۆتە چەکێکی سیاسی بەدەست زۆربەی وڵاتانەوە بۆ فشارکردنە سەر یەکتری، بەرزبوونەوەی بەردەوامی نرخی نەوت (ئەوەتا ئەمڕۆکە نرخی بەرمیلێك نەوت لەبازاڕە جیهانییەکاندا گەشتۆتە (١٣٠) دۆلار بە بۆچوونی زۆربەی شارەزایانی کەرتی وزە چاوەڕێی بەرزبوونەوەی نرخ دەکەن تاکو سنوری (٢٠٠) دۆلار بۆ هەر بەرمیلێك) ئەمڕۆکە وە بگرە لەداهاتووشدا مەترسییەکی گەورەی هەیە لەسەر ئابووری جیهان ئەگەر چارەسەرێکی گونجاو نەدۆزرێتەوە بۆ رێکوپێك کردنی نرخی نەوت ئەوا مرۆڤایەتی تووشی تەنگەژییەکی ئابووری قوڵ و دوورودرێژ دەبێت.

## زێڕ و نرخی زێڕ

راپۆرتە ئابوورییەکان رۆژانە ئاگادارمان دەکەنەوە لە بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی نرخی زێڕ لەجیهاندا، بۆچی؟ چونکە زێڕ ئەو کاڵا بەنرخەیە کە سەرمایەگوزاران دەتوانن بەهۆیەوە سەرمایەکانیان لە هەڵاوسان بپارێزن، وە هەروەها بەهۆی نرخی زێڕەوە دەتوانین پێشبینی بارودۆخی ئابووری بکەین. کاتێك نرخی زێڕ بەرز دەبێتەوە واتە باری ئابووری بەرەو داکشانەوە و تەنگەژی دەچێت واتە قەیرانی ئابووری چاوەڕوان دەکرێت، ئەوەتا ئەمڕۆکە نرخی زێڕ گەشتۆتە بەرزترین پلە وە بەرزتریش دەبێتەوە ئەمەش زەنگ لێدانە بۆ قەیرانێکی ئابووری گەورەی جیهانی، بەڵام ئەگەر نرخی زێڕ نزم بێتەوە واتە بارودۆخی ئابووری بەرەو بوژانەوەو گەشەکردن دەچێت.

لەسەرەوە باسمان لەوە کرد کە چۆن بەهۆی پێناسە و پێڕستە ئابوورییەکان و لێکۆڵینەوەیان دەتوانین بارودۆخی ئابووری و ئاستی گەشەکردن و داکشانەوەی ئابووری لە جیهان و وڵاتدا دیاری بکەین.

ئابووریناسان بەشێوەیەکی گشتی پێناسە و پێڕستە سەرەکییەکان کە بەهۆیانەوە دەتوانرێت بار و رەوشی ئابووری دەستنیشان بکرێت بریتین لە (١٠) پێڕست، ئێمەش بەهۆی ئامارەکانی دەزگای ئاماری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەو پێڕستانە نیشان دەدەین. دەمەوێت ئاماژە بەوە بدەم کە هەموو مانگێك لە بیستەم رۆژدا دەزگا تایبەتەکانی ئامار لە ئەمریکا ئەم پێڕستانە لە میدیا ئابوورییەکان و سایتەکانی ئینتەرنێت بلاودەکاتەوە.

| ڕێژەکان | فاکتەرەکان (پێڕستەکان) |
|---|---|
| ٠,١٨١٢ | ١- ناوەندێتی کاتی کارکردن لەهەفتەیەکدا لەبواری بەرهەمهێناندا |
| ٠,٠٢٦٢ | ٢- ناوەندێتی بێکاران لەهەفتەیەکدا کە پێویستیان بەکۆمەکە |
| ٠,٠٤٩٦ | ٣- پێویستییەکانی کەرتی پیشەسازی بۆ بەرهەمهێنان (کەرەستەی خاو...) |
| ٠,٠٢٧٦ | ٤- بازرگانی بەکۆ، لەماوەیەکی دیاری کراودا |
| ٠,٠١٣٠ | ٥- پێویستییەکانی کەرتی پیشەسازی لە ئامراز و ئامێری بەرهەمهێناندا |
| ٠,٠١٩١ | ٦- کەرتی بیناسازی، بینای دروستکراو بەتەواوەتی |
| ٠,٠٣٠٨ | ٧- نرخی شەیری بۆرسەکان {شەیری (٥٠٠) کۆمپانیا} |
| ٠,٣٠٣٨ | ٨- بڕی پارە، M2 |
| ٠,٣٣٠٥ | ٩- ڕێژەی سوودی قەرز |
| ٠,٠١٨٣ | ١٠- ڕێبەری متمانەی بەکاربەران (کڕیار) |

بە تێڕوانین و شرۆڤەکردنی ئەو پێڕستانەی سەرەوە دەتوانین بارودۆخی ئابووری وڵات دیاری بکەین. وە بەهۆیانەوە دەتوانین بزانین چ کەرتێکی ئابووری لە گەشەکردندایە یان لە داکشاندایە. دەمەوێت بۆ خوێنەر روون بکەمەوە کە هەرچی ئاماری ئابوورییە بەراورد دەکرێ بە ئامارەکانی پێشووترەوە، بۆ نموونە ئامارەکانی خشتەکەی سەرەوە بریتین لە ئاماری ساڵی (٢٠٠٢) بەڵام ئاماری ساڵی (١٩٩٦) وەك بنچینە رەچاوکراوە.

بە سەیرکردنێکی خێرایی لە ئاماری خشتەکەی سەرەوە دەبینین کاریگەرترین کەرتی ئابووری بریتییە لە کەرتی دارایی (فاکتەری هەشتەم و نۆیەم) بڕی پارە کە بریتییە لە (٠,٣٠٣٨) وە ڕێژەی سوودی قەرز کە بریتییە لە (٠,٣٣٠٥)، بەهۆی ئەم دوو پێڕستەوە دەتوانین سیاسەتی دارایی لە وڵاتەکەدا دیاری بکەین کە کۆی هەردووکیان بریتییە لە (٠,٦٣٣٨). واتە ڕێژەی (٦٣٪) پێك دەهێنێت.

٠,٣٣٠٥ + ٠,٣٠٣٨ = ٠,٦٣٣٨ یان (٦٣٪)

جگە لەم دوو پێڕستە پێڕستی یەکەم کە بریتییە لە هێزی کارکردن ڕێژەکەی بریتییە لە (١٨٪). کەواتە ئێستاکە دەتوانین دەرئەنجامی ئەوە بکەین کە سێ فاکتەری (پێڕست کارگەرییەکی زۆریان هەیە لەسەر ئابووری ئەمریکا ئەو فاکتەرانەش بریتین لە (کاتی کارکردن، بڕی پارە، ڕێژەی سوودی قەرز) هەرسێ فاکتەرەکە پێکەوە (٨٢٪)ی ئابووری پێك دەهێنن.

٠,١٨١٢ + ٠,٣٠٣٨ + ٠,٣٣٠٥ یان (٨٢٪)



بەڵام هەموو فاکتەرەکانی تر پێکەوە ڕێژەی (٢٠٪) کاریگەرییان هەیە لەسەر گەشەکردنی ئابووری ئەمریکا.

بەم شێوەیە دەتوانین بەهۆی ئەو (١٠) پێڕستەوە بزانین چی روودەدات لەکەرتە ئابوورییە جیاجیاکاندا. گرنگی بەکام کەرت بدەین لاوازی و سستی لە چ کەرتێکدایە. تاکو چارەسەری گونجاوی بۆ بدۆزرێتەوە کەواتە چاودێرکردنی ئامارە ئابوورییەکان یارمەتی تەواومان دەدات لەکاتی بڕیاردانداا.

## پێشبینکردنی ئابووری چییە؟

لە بڕگەکانی پێشوودا باسمان لە پێناسە و پێڕستە ئابوورییەکان و کاریگەرییان لەسەر بارودۆخی ئابووری روون کردەوە. وە هەروەها دەرئەنجامی ئەوەمان کرد کە چۆن و بە چ شێوەیەك بەهۆی لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەی ئەو پێڕستانە دەتوانین ئاڕاستەی گەشەکردن و داکشانەوەی باری ئابووری دەستنیشان بکەین. لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە ئایا بۆ چ ماوەیەك یان کاتێك یان قۆناغێك دەتوانین ئاڕاستەی ئابووری دیاری بکەین؟ بۆ هەفتەیەك بۆ مانگێك بۆ ساڵێك یان زیاتر لێرەدا بەشێکی تری ئابووری یارمەتیمان دەدات کە پێی دەوترێت (پێشبینکردنی ئابووری). ئەمڕۆکە پێشبینکردنی ئابووری گرنگییەکی زۆری پێ دەدرێت وە چەندان سەنتەری تایبەتی لێکۆڵینەوە بۆ ئەم مەبەستە دامەزراوە کاردەکەن، چونکە بەبێ پێشبینکردن کۆمپانیا گەورەکانی جیهان هیچ جۆرە سەرمایەگوزاریەك جێبەجێ ناکەن، چونکە ئەمڕۆکە زۆربەی کۆمپانیا گەورەکان و (حکوومەتەکان) سەرمایە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن دەخەنە کار، چونکە زۆربەی پڕۆژەکان بەتایبەتی لەکەرتی (وزە، دەرهێنان، پاڵاوتن،...هتد) جێبەجێ کردنیان پێویستی بەماوەیەکی زۆر و تێچوونێکی زۆرهەیە.

بێگومان پێشبینکردنی ئابووری هەروا کارێکی ئاسان نییە، بۆ ئەوەی پێشبینکردنی کەرتێکی ئابووری بکرێت پێویستە زانیاری و ئامارێکی زۆر و تەواو هەمەلایەنە کۆبکرێتەوە لەسەر بنچینە و ڕێسایەکی زانستانە تاوتوێ بکرێت دوابەدوا بەهۆی مێتۆد و هاوکێشەی تایبەت و بەیارمەتی تیۆری گریمانەکان و بیرکارییەوە ژمێردەکرێن تاکو ئەنجامێکی تاڕادەیەك ڕاست و دروست بەدەست بکەوێت. ئەوەتا زۆربەی وڵاتەکان هەوڵی پێشبینکردنی گەشەسەندنی ئابووری (بەرنامەی ئابووری) بۆ ماوەی (٢٥) ساڵ و سەروتریش دەدەن. بێگومان هەموو پێشبینیەك چەند چڕوپڕو زانستانەش بێت ئەنجامی سەد لە سەد و ڕاست و دروست نادات بەدەستەوە. بەڵام لەبەر ڕۆشنایی پێشبینکردندا دەتوانرێت پلان و نەخشە ئابوورییەکانمان بەشێوەیەکی باشتر و گونجاوتر و زانستانەتر دابڕێژین.

# بەشی حەوتەم

## بازاڕی دارایی (Financial Market)

لەم بەشــەدا هــەوڵ دەدەیــن بەشــێوەیەکی چــڕوپڕتر لــە بــازاڕی دراوی جیهــانی بــدوێین (هەرچەندە لە فەسڵی هەژدەهەمــدا بەشــێوەیەکی گــشتی باســمـان لێکــردووە)، لەبەرئــەوەی ئەمڕۆکە بازاڕی ئاڵووێری دراو بۆتە کــەرتێکی گرنگــی ئــابووری و ســەردەم لەجیهانــدا کــە کاریگەری راستەوخۆ دەکاتە سەر بارودۆخی ئابووری وڵاتان. بازاڕی ئاڵوگۆڕی دراوی جیهانی بــە زمــانی ئینگلیــزی (Foreign exchange currency market-FOREX-FX)، لەوەدوا لەبری مانا کوردیەکەی کورتکراوە ئینگلیزییەکەی بــەکاردەهێنین بــۆ ئاســانکاری و راهاتن چونکە ئەم وشەیە تازە بڵاوبۆتەوە وە لە زۆربەی زمانەکانی تردا ماناکەی کت و مت دەرناهێنرێــت. هەنــدێ جــاریش بــەم بــازاڕە دەڵــێن بۆرســەی دراو یــان بــازاڕی جامبــازان (پارەبازان)، هەروەها لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین کاریگــەری ئــابووری هەمــەکیی ( Macro Economics)، لەسەر دینامیکی بازاڕی گۆڕینــەوەی دراو روون بکەینــەوە، گرنگــی ئــەم بەشە لەوەدایە کــە بەشــێوەیەکی ســادە و ســاکار یارمــەتیمان دەدات لــە تێگەشــتنی ئــەو زانیارییە زۆرانەی رۆژانە بەر گوێمان دەکەوێت لەرێگەی میدیاکانەوە دەربارەی بەرزبونەوە و نزمبونەوەی نرخی دراوەکان (دۆلار، یــۆرۆ، دینــار، لــیرە ...هتــد)، وە هــەروەها دەربــارەی بەرزبونەوە و نزمبونەوەی نرخی پشك و شەیرەکان لە بۆرسە جیهانییەکاندا، بەداخەوە یاسا و رێسایەکی نەگۆڕ و جێگر نییــە، تــاکو لــە رۆشــناییدا بتــوانین شــرۆڤەی هــەموو دیــاردە و گۆڕانکارییە ئابووری و داراییەکان بکەین، بەڵام خوێندنەوەی ئەم بەشە یارمــەتیمان دەدات لە تێگەیشتنی بنچینەیی و میکانیزم و فاکتەرە ســەرەکییەکانی گۆڕانکارییــەکانی بــازاڕی دارایی جیهانی، کە راستەوخۆ کاردانەوەی دەبێت لەسەر ئاڵووێری دراو لە هەموو بازاڕەکانی جیهاندا. کوردستانیش بەدەر نییە، بە خوێندنەوەی ئــەم بەشــە خوێنــەری کــورد دەتوانێــت زانستانە وەڵامــی ئــەو پرســیارانە بداتــەوە, ئایــا بۆچــی نرخــی دۆلار بەرامبــەر بــە دینــار دادەبەزێت؟ ئایا بۆچی نرخی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان رۆژ بە رۆژ گرانتر دەبن؟

# فەسڵی بیست و یەك

## بازاڕی دارایی

### ئەو فاکتەرانە چین کە کاردەکەنە سەر بازاڕی ئاڵووێری دراو؟

هەروەك لە بەشەکانی پێشوودا ئاماژەمان پێداوە، ژمارەی ئەو فاکتەرانەی کاردەکەنە سەر بازاڕ بەگشتی و بازاڕیی دارایی بەتایبەتی گەلێك زۆرن, بۆ زیاتر تێگەشتن فاکتەرەکان پۆلێن دەکەین بە سێ بەشەوە:

یەکەم: روداو و قەیرانە سیاسییەکان و دیاردە سروشتییەکان.

دووەم: سیاسەتی دارایی.

سێهەم: دیاردە ئابوورییەکان.

ئێستاکە هەوڵ دەدەین بەشێوەیەکی سیستێماتیکی باس لە توێژینەوەی بنچینەیی بازاڕی دراوی جیهانی بکەین.

## هەواڵی میدیاکان

هەروەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێدا ئابووری هەندەکیی کایگەری راستەوخۆیان هەیە لەسەر دینامیکی گۆڕانکارییەکانی بازاڕی دارایی، کەواتە هەواڵەکان دەربارەی بارودۆخی ئابووری هەندەکیی زەنگێکە بۆ بازاڕی دارایی جیهانی وە هەروەها سیگناڵێکە بۆ نرخی گۆڕینەوەی دراوەکان. بەشێوەیەکی گشتی دوو جۆر هەواڵ هەن:

یەکەم: هەواڵە کتوپڕ و چاوەڕوان نەکراوەکان، ئەم جۆرە هەواڵانە زیاتر سیفەتی سیاسی دەگرنە خۆ وەك لە سیفەتە ئابوورییەکان، بۆ نموونە هەواڵی هێرشە تیرۆریستییەکەی (١١)ی سێپتێمبەری (٢٠٠١) بۆ سەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە بووە هۆی دابەزینی نرخی دۆلار بەرامبەر دراوە جیهانییەکانی دیکە.

دووەم: هەواڵە چاوەڕوان کراوەکان، ئەم هەواڵانە زیاتر سیفەتی ئابووریان هەیە، بۆ نموونە هەواڵەکان دەربارەی زیادبوون یان کەم بوونی ژمارەی بێکاران، بەرزی و نزمی رێژەی



هەڵاوسان... ئەم هەواڵانە پێشتر بەهۆی پێڕستە ئابوورییەکانەوە زانراوە بۆیە کاردانەوەی کتوپڕ ناکاتە سەر بازاڕەکان. لە هەرە سیفەتە تایبەتییەکانی (FOREX) کاردانەوەی خێرا و هەستیارییە بەرامبەر هەواڵە کتوپڕ و چاوەڕوان نەکراوەکان جا چ هەواڵە سیاسییەکان یان رووداوە سروشتییەکان، لە فەسڵی (بیست و دوو)دا بەشێوەیەکی فراوانتر و بە نموونەوە باس لە کاریگەری ئەم جۆرە هەواڵانە دەکەین لەسەر بازاڕی ئاڵوێری دراو. بازاڕی دارایی جیهانی وەك مرۆڤ هەستیارە کاتێك هەریەکێك لە ئێمە هەواڵێکی کتوپڕی پێدەگات جا هەواڵەکە پۆزەتیڤ بێت یان نێگەتیڤ ئەوا کتوپڕ تووشی ورووژاندنی دەروونی دەبین. بەلاّم بەرامبەر هەواڵە چاوەڕوان کراوەکان کاردانەوەی دەروونیمان ئاسایی دەبێت.

جگە لەوەش ئەگەر لە روانگەی کاتەوە بڕوانینە سیفەتی هەواڵەکان و کایگەرییان لەسەر (FOREX). ئەوا دەتوانین دوو جۆر هەواڵ جیابکەینەوە، هەواڵە درێژخایەنەکان، هەواڵە کورت خایەنەکان. بە زمانی ئابووریناسان پێی دەوترێت (سوڕی ژیانی فاکتەرە بنچینەییەکان).

١- سوڕی درێژ خایەن: ئەم سوڕە لە چەند هەفتەیەکەوە تاکو چەندساڵێك درێژە دەکێشێت، چونکە ئەم فاکتەرانە بەشێوەیەکی راستەوخۆ بەستراون بە بارودۆخی ئابووری جیهانی و نەتەوایەتییەوە وەك (دینامیکی ژمارەی بێکاران، هەڵاوسان، رێژەی سوودی قەرز). بۆیە لەکاتی دارشتنی پلانی ستراتیژیدا دەتوانرێت رەچاو بکرێن. بۆ نموونە ناهاوسەنگی بالانسی بازرگانی نێوان ئەمریکا و ژاپۆن دەبێتە هۆی دابەزینی نرخی گۆڕینەوەی دۆلار بەرامبەر یەنی ژاپۆنی، هەر بۆیە چەرچییەکان (Broker)، بازاڕی دارایی لە مامەڵەکردندا دەتوانن پێشبینی دابەزین و بەرزبونەوەی نرخی دراوەکان بکەن.

٢- سوڕی کورت خایەن: ئەم سوڕە ماوەکەی رۆژێك یان چەند کاتژمێرێك یان چەند خولەکێك درێژە دەکێشێت. بۆ نموونە هەواڵی پۆزەتیڤانە دەربارەی کەمبوونەوەی بێکاری لە ئەمریکا دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی نرخی گۆڕینەوەی دۆلار ئەگەر بۆ چەند خولەکێکیش بێت.

جگە لەو خالانەی پێشوو فاکتەرە ئابوورییەکان کاریگەرییەکی راستەوخۆیان هەیە لەسەر بازاڕی ئاڵوویری دراوەکان، خاڵێکی گرنگ کە دەمەوێت ئاماژەی پێ بدەم زۆربەی کات پروپاگەندە بلاوکردنەوە و گوتە گوت دەبنە هۆی بەرزبونەوە و نزمبونەوەی نرخی دراوەکان بۆیە دەبێت ئەو جۆرە پروپاگەندانە بەشێوەیەکی بابەتییانە هەڵبسەنگێنین هەروەك قسەیەکی نەستەقی ئینگلیزی دەڵێت (Buy on rumors sell on fact)، واتە پروپاگەندە (گوتەگوت) بکڕە بەلاّم راستی بفرۆشە. لەکاتی بلاوکردنەوەی ئەو پروپاگەندانە دەلاڵەکانی (Broker)

بازاڕی دارایی بەخێرایی دەکەونە مامەڵەکردن تاکو هەواڵی ڕاست و دروست دەگات. بێگومان هەندێ جار ئەم پروپاگەندانە کاردەکەنە سەر بارودۆخی ئابووری جیهانی بەتایبەتی لەلایەن بازرگانانی پارە گۆڕینەوەدا (Speculator)، باشترین نموونە مامەڵەکردنی پارەبازی ئەمریکی جۆرج سۆرس لە بازاڕی (FOREX)، لەساڵی (١٩٩٢)دا کە لەماوەی شەو و ڕۆژێکدا توانی ببێت بە ملیاردێر، لەو کاتەدا بانکەکانی بەریتانیا بڕی (٢٠) ملیارد دۆلاریان زەرەر کرد کە لەئەنجامدا هەموو بۆرسە داراییەکانی جیهان تووشی قەیران بوون. بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە ڕووداوەکانی ساڵی (١٩٩٢) بەهۆی وێنەکەی خوارەوە نیشان دەدەین.

وێنەی ژمارە (٢١-١) ڕووداوەکانی ساڵی (١٩٩٢) لە (FOREX)، دۆلار بەرامبەر پاوەندی بەریتانی (GBP/USD).






ئەگەر چاوەڕوانی هەواڵی نێگەتیڤانەی ئابووری بکرێت ئەوا پێش بلاوکردنەوەی هەواڵەکە نرخی دراو و پشکەکان بەرەو نزم بوونەوە دەڕۆن، هەر بۆیە پێرستە ئابوورییە هەمەکییەکان بەرەو سێ ئاراستە دەڕۆن:

١- پێشبینکردنی چاوەڕوان کراو:(Forecast –FRC-Seen)، لە ئەنجامی بیر و بۆچوونی توێژەوەرانی بازاڕی دارایی دێتە کایەوە. ئەم بۆچوونانە بەپێی نزیك بوونەوە و سیفەتی هەواڵەکان دەستکاری دەکرێت وە بە سیگناڵێکی گرنگ دەژمێردرێت بۆ بازاڕەکان .

٢- بەڵگە ڕاست و دروستەکان: (Real- Actual- ACT)، لەئەنجامی بلاوکراوە فەرمییەکانەوە دێتە کایەوە.

٣- بژارکردن و پێداچوونەوەی ئامارەکانی پێشتر(Previous-PRV-Last)، هەندێ جار پێویست دەکات بە ئامارە بلاوکراوەکاندا بچنەوە بە بەراوردکردنیان بە ئامارەکانی پێشترەوە بۆ نموونە ئاماری (مانگێك یان وەرزێك) پێشتر بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی ڕاستتر و دروستتر پێشبینەکان بەرجەستە بکرێن. هەروەك چەرچییەکان ئاگاداری پێشبین و گۆڕانکارییە ئابوورییەکانن ئەوا دوای بلاوکردنەوەیان جارێکی تر زانیارییەکان دەپالێون تاکو بە ئامادەکردنێکی تەواوە دەست بکەن بە مامەڵەکردن. لە خشتەکەی خوارەوەدا کاردانەوەی بازاڕی دراو بەرامبەر هەواڵ و پێشبینەکان نیشان دەدەین.

خشتەی ژمارە (٢١-١) کاردانەوەی بازاڕ بەرامبەر پێشبینە ئابوورییەکان.

| ژمارەکان | بەراوردکردنی پێرستە ئابوورییەکان بە هەواڵە فەرمییەکان و پێشبینەوە | کاریگەری لەسەر نرخی گۆڕینەوەی دراوی نیشتمانی | سەرنجەکان |
|---|---|---|---|
| ١ | بەڵگە فەرمییەکان باشترن لە پێشبینکردن | ↑ | پتەوبوونی (بەهێزی) نرخی دراوی نیشتمانی |
| ٢ | بەڵگە فەرمییەکان وەك پێشبینکردنەکانن | → | بازاڕ کاردانەوەیەکی ئەوتۆی نابێت |
| ٣ | بەڵگە فەرمییەکان خراپترن لە پێشبینکردن | ↓ | دابەزینی (لاوازی) نرخی دراوی نیشتمانی |
| ٤ | پێشبینەکان خراپترن وەك لەوەی چاوەڕوان دەکرا بەلاّم بەڵگە فەرمییەکان باشتر و راستترن | ↑ | پتەوبوونی نرخی دراوی نیشتمانی زیاتر وەك لە حاڵەتی یەکەمدا لەبەر چاوەڕوان نەکراوی هەواڵەکە |
| ٥ | پێشبینەکان باشترن وەك لەوەی چاوەڕوان دەکرا بەلاّم بەڵگە فەرمییەکان خراپترن | ↓ | دابەزینی نرخی دراوی نیشتمانی بۆ شێوەیەکی زیاتر وەك لەحاڵەتی سێهەمدا |

ئەوەی جێگەی ئاماژە پێدانە، هەواڵ و بلاّوکراوە ئابوورییەکان دەربارەی پێرستە بنچینەییەکان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو کاردانەوەیەکی راستەوخۆیان هەیە لەسەر بازاڕی دارایی و نرخی ئاڵوویری دراوەکان, چونکە پارەبازانی بازاڕی (FOREX)، هەمیشە بەڵگە فەرمییەکان لەگەڵ پێشبینکردنی پسپۆرانی بازاڕی دارایی بەراورد دەکەن ئەگەر پێشبینکردنی ئاستی گەشەی ئابووری لە رێژەی (٣,٠٪) کەمتر بێت وەك لە ئامارە فەرمییەکان ئەوکاتە بەشدارانی بازاڕی (FOREX)، گرنگی بە پێرستەکانی دیکە نادەن.

# فەسڵی بیست و دوو

## مێژووی بازاڕی ئاڵوویێری دراوی جیهانی

### بازاڕی ئاڵوویێری دراوی جیهانی

(Foreign exchange currency market-Forex=FX)

بریتییە لە گشت چالاکی و سەودا و مامەڵەکردنێك لە کڕین و فرۆشتنی دراو و پرۆسەی قەرزدان و قەرز وەرگرتن. هەندێ جار بەم بازاڕانە دەوترێت بۆرسەی دراو (Bourse). کاتێك زاراوەی بۆرسە دەبیستین وا دەزانین کە برتییە لە گۆڕەپانێکی گەورە و فراوان کە پڕە لە شاشەی کۆمپیوتەر بەشێوەی ڕەمز و هێما شەیر و بۆندەکانی تیادا دەکڕێت و دەفرۆشرێت، بەلاّم مەبەست لە بازاڕی گۆڕینەوەی دراوەکان راستتر بۆرسەی دراو تەنها ئەو گۆڕەپانە گەورە و مەزنانە نییە بەڵکو لەوە زیاتریشە, (FOREX) گۆڕەپانێکی گەورە و گرانە کە هەموو جیهانی گرتۆتەوە بەهۆی پەرەسەندنی ئەلکترۆنی لە بواری پەیوەندییدا پەردەی کۆمپیوتەرەکان بۆتە بۆرسەی کڕین و فرۆشتنی دراوەکان، ئەمڕۆکە هەموو خودێك دەتوانێت ببێت بە یەکێك لە بەشدارگەکانی ئەو بازاڕە.

### سیستەمی دارایی جیهانی

بازاڕی دارایی جیهانی بەم شێوەیەی کە ئەمڕۆکە دەیبینین لەساڵی (١٩٧٠)ەوە پەیدابووە. پێشتر دراوی جیهانی بەچەند سیستەم و قۆناغێکی دیکەدا تێپەڕیوە ئەو سیستەمانەش بریتی بوون لە:

یەکەم: سیستەمی ستانداری زێڕ (١٨٦٧-١٩٣٠).

دووەم: سیستەمی بریتۆن_وودز (١٩٤٤-١٩٧١).

سێهەم: سیستەمی جامایکا (بازاڕی دارایی جیهانی ئەمێستا).

هەرچەندە لە فەسڵی هەژدەهەمدا باسمان لەم سیستەمانە کردووە، لەبەر گرنگی بابەتەکە دووبارە کردنەوەیان بەکورتی بە پێویست دەزانین.



### سیستەمی ستانداری زێڕ:

لە لەمپەڕی پێکهێنانی سیستەمی دراوی جیهانیدا بۆ ئاسانکردنی ئاڵوگۆڕ و کڕین و فرۆشتن و دانانی نرخ لەسەر کەلوپەلەکان، کانزا بەنرخەکان بەکارهێنرا بۆ ئەم مەبەستەش کانزاکانی وەك زێڕو زیو و مس و... بەکاردەهێنرا. کەواتە کانزاکان سیستەمێکی نوێیان داهێنا لە ئاڵوگۆڕدا، لەئەنجامدا زێڕ بە بناغەی دراو دانرا لەبەر رواڵەتەکانی لەناو هەموو کۆمەڵگا پەسەندکرا. ئەوەبوو لە کۆنفرانسی پاریسی ساڵی (١٨٦٧) زێڕیان دانا بەرێسای نەخت. ئەوکاتە خەڵکی ئازاد بوون لە هێنان و ناردنی زێڕ بەبێ هیچ کۆت و مەرجێك. بەپێی ئەم رێسایە راپەرمونی زێڕ وەکو پێوەرێکی بەها (بەهای دانەیەك لە زێڕ یەکسانە بە بەهای کێشی دیاریکراوی زێڕ)، ئەم سیستەمە بۆ ماوەیەکی زۆر سەقامگیری زۆربەی دراوەکانی پاراست کە بووە هۆی گەشەسەندنی ئابووری جیهانی. دراوی نیشتمانی راستەوخۆ پەند بوو بە زێڕەوە، بۆ نموونە ئەگەر بڕی دراو (پارە) لە ناوەوەی وڵات زیادبکات ئەوا نرخەکان بەرزدەبنەوە، واتە کورتهێنانی بالآنسی بازرگانی، بەلاّم چوونە دەرەوەی زێڕ بۆ دەرەوەی وڵات دەبووە هۆی دابەزینی نرخەکان واتە کەم بوونەوەی بڕی پارە لە ناوەوە، پەیدابوونی هاوسەنگی ئابووری.

لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا بەهۆی ئاڵۆزبوونی بارودۆخی نێودەوڵەتان، سیستەمی سکە لێدان واتە داڕشتگەی زێڕ بەشێوەی سکە بوو بە ستانداری جیهانی. لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا میکانیزمی سیستەمی ستانداری زێڕ بەرەو هەڵوەشاندنەوە دەچوو ئەویش بەهۆی زیادبوونی دراوی (پارە)ی کاغەزی بەهۆی خەرجییە زۆرەکانی جەنگەوە. ئەوەبوو لەساڵی (١٩٢٢)دا لە کۆنفرانسی (کینوێز)دا دراوی کاغەزی داهێنا بۆ ئاڵوگۆڕ لەسەر بنچینەی زێڕ، لەبەر رۆشنایی ئەم سیستەمەدا دانانی نرخی دراو بەرامبەر بە زێڕ و دۆلاری ئەمریکی و جونەیهی ستەرلینی و فرانکی فەرەنسی داهێنا. واتە بۆ گۆڕینەوەی هەر دراوێکی نیشتمانی بە زێڕ دەبوایە لەرێگەی گۆڕینەوەی ئەو دراوە بە سێ دراوەکەی سەرەوە بێت، چونکە نرخی هەرسێ دراوەکانی سەرەوە بەرامبەر زێڕ جێگیرکرا، بۆ نموونە جونەیهی ستەرلینی بەهاکەی بە (١١٣) خەملێنکرابوو.

### فەرهەنگی ئابووری

ئۆنسە: یەکە یەکە بۆ پێوانەی زێڕ، یەك کیلۆگرام لە زێڕ یەکسانە بە (٣٢) سی و دوو ئۆنسە زێڕ، یەك گرام لە زێڕ یەکسانە بە (٠،٣٢) ئۆنسە، یەك مسقاڵ زێڕ یەکسانە بە (٠،١٦) ئۆنسە.

**سیستەمی بریتۆن-وودز:**

تەنگەژی بازاڕی دراوی جیهانی بەهۆی جەنگی دووەمی جیهانەوە بووە هۆی پێداویستییەتی داهێنانی سیستەمێکی نوێ بۆ بازاڕی دراوی جیهانی و گۆڕینەوەی دراوەکان، ئەنجامی جەنگی دووەمی جیهانی ئاشکرایە بەسەرکەوتنی هاوپەیمانان کۆتایی پێهات. لەو کاتەدا ئابووری ئەمریکا لەچاو ولاَتانی تردا لەوپەڕی لوتکەدا بوو (چونکە ئەمریکا دووربوو لەمەیدانی جەنگەوە)، لە کۆتایی ساڵی چلەکانی سەدەی بیستەوە ئەمریکا خاوەنی لە (٧٥٪)ی گەنجینەی ئاڵتوونی تێکڕای جیهان بووە، هەروەها ئەمریکا لە (٥٠٪)ی بەرهەمی پیشەسازی جیهانی بەرهەم دەهێنا. لەو هەلومەرجەدا هەر ئەمریکا دەیتوانی دراوی خۆی بە زێڕ بگۆڕێتەوە و بیکات بە دراوێکی نێودەوڵەتی. بۆیە لە (١ تا ٢٢)ی مانگی تەمووزی ساڵی (١٩٤٤)دا، ولاَتە پیشەسازییە سەرکەوتووەکانی جەنگ ڕێکەوتننامەی (بریتۆن_وودز)یان مۆرکرد کە سەرەتایەك بوو بۆ هێنانەکایەی سیستەمێکی نوێی دراو. کە بووە هۆی دامەزراندنی سندووقی دراوی نێودەوڵەتان کە سیستەمە بنچینەییەکانی سیستەمەکەی پێ سپێردرا. لە دیسەمبەری (١٩٤٥)دا بەپێی پرینسیپێك کە ڕێکەوتننامەکە دایڕشتبوو، بانکی نێودەوڵەتانیش دامەزرا بەناوی ئاوەدانکردنەوە و پەرەپێدانی ولاَتانی ئەندامەوە. هەروەها لەچوارچێوەی سیستەمی (بریتۆن_وودز)، لەساڵی (١٩٤٧)دا ڕێکەوتننامەیەك لەمەڕ بازرگانی نێودەوڵەتان بەناوی ڕێکەوتننامەی گشتی بازرگانی و تاریفەی گومرگی پەسەندکرا کە بە ڕێکەوتنامەی گات (Gatt) ناسراوە.

لە ئەنجامدا سێ پرینسیپی سەرەکی بۆ سیستەمی نوێی دراو دیاری کران کە ئەمانەن:

١- دامەزراندنی سیستەمی گۆڕینەوەی زێڕ بە دۆلاری ئەمریکی و جونەیهی ستەرلینی، بەلاَم بەهۆی لاوازی جونەیهی ستەرلینی لەئەنجامی جەنگدا. دۆلار بەهێزتر بوو بۆیە دۆلار بوو بە دراوێکی جیهانی.*

* سەرەتاکانی سەدەی بیست و یەك، هاوتەریبە بە سەرەتاکانی سەدەی بیستەوە هەر وەك مێژووناسی زانکۆی گارڤەر (نایل ڤێرپەسۆن) ئاماژەی پێداوە، خاڵە هاوبەشەکانی هەردوو سەدە بەم شێوەیە دیاری دەکات:

١- پاڵە پەستۆو بارێکی گران لەسەر ولاَتە زلهێزەکان.



٢- بۆ بە جیهانکردنی دۆلار، دۆلاری ئەمریکی دەگۆڕدرایەوە بە زێڕ، لەڕێگەی دەزگا داراییە فەرمییەکانەوە (بانکی ناوەندی). لەساڵی (١٩٣٤) بڕی (٣٥) دۆلار بەرامبەر یەك ئۆنسە زێڕ جێگیرکرا.

٣- کەریدۆرێك بەڕێژەی (±١٪) دەستنیشانکرا بۆ ئالۆویری نرخی دراوەکان بەرامبەر یەکتری. بانکە ناوەندییەکان دەبوایە بەم مەرجە پابەندبن. ئەگەر هاتوو جیاوازی لەڕێژەی (±١٠٪) تێپەڕی ئەوا دبوایە ڕەزامەندی سندوقی دراوی نێودەوڵەتی وەربگیرایە.

لەساڵی (١٩٧٠)دا پێکهاتەی ڕێژەی گەنجینەی زێڕی جیهانی گۆڕانی بەسەردا هات، (٤٧ ملیارد دۆلار گەنجینەی زێڕی ئەورووپی بەرامبەر ١١,١ ملیارد دۆلار لە ئەمریکا). وە هەروەها دەرهێنانی زێڕ لە ساڵەکانی (١٩٤٨ تاکو ١٩٦٩) بەڕێژەی (٥٠٪) زیادی کرد. وە ناردنە دەرەوە بە بڕی (٢,٥) جار زیادی کرد. حاڵەتێك هاتە کایەوە کە بڕی زێڕ بەشی گۆڕینەوەی نەدەکرد. واتە بڕی زێڕ کەمتر بۆوە ئەمەش بووە هۆی دابەزینی نرخی دۆلار وە متمانە بەرابەر دۆلار کەم بۆوە. جگە لە مانەش سەنتەری دارایی جیهانی لە ئەورووپا و ئاسیا (ژاپۆن) پەیدابوون. هەوڵدان بۆ مانەوەی ئەم سیستەمە هیچ ئاسۆیەکی نەبوو. ئەوە بوو ئەم سیستەمە لە (١٦ی ئازاری ١٩٧٣)دا وەستێنرا. لە کۆنگرەیەکی جیهانی لە پاریس نرخی گۆڕینەوەی دراوەکان ئازاد کران بەبێ هیچ کۆسپ و مەرجێك بەجێهێشتنی بۆ هۆیەکانی خستنەڕوو و خواست لە بازاڕەکانی گۆڕینەوەدا.

٢- ململانێی نێوان ولاَتە زلهێزەکان.

٣- ناسەقامگیری پەیوەندی و نەبوونی متمانە لەنێوان ولاَتە زلهێزەکاندا.

٤- پشتگیری و یارمەتی تیرۆر لەلایەن هەندێك لە ولاَتان و ڕژێمەکانی ئەو ولاَتانە.

٥- بلاَوبوونەوەی تیرۆر.

بە سەرنجدانی ئەو خالاَنەی سەرەوە دەتوانین دەرئەنجامی ئەوە بکەین، کە ئەمڕۆکە بەهۆی سەرقاڵی ئەمریکا بە جەنگ و پلاندانان و نەخشەکێشانی بۆ کۆنترۆڵکردنی جیهان. ئەوەتا بەهای دۆلار بەرابەر دراوەکانی دیکە بەتایبەتی (یۆرۆ و جونەیهی ستەرلینی)، ڕۆژ بە ڕۆژ بێ نرختر دەبێت کەواتە ڕەنگە دۆلاری ئەمریکی وەکو دراوێکی جیهانی لەناوبچێت ئەمەش پێویستییەتی داهێنانی سیستەمێکی نوێی دراوی جیهانی دەخوازێت!!!

تیۆری نرخەکانی ئاڵوویری گۆڕاو: (Flexible Exchange Rates)، بیرۆکەی ئەم تیۆرە لەسەر بنچینەی دەستنیشان نەکردنی نرخەکانی ئاڵوویری نەگۆڕی دراوەکان و بەجێهێشتنی بۆ هۆیەکانی خستنەڕوو و خواست هەڵدەستێ، ئەمەش وەك پێشنیارێك بۆ چارەسەرکردنی تەنگەژی نەختیی دەوڵەتان.

**سیستەمی جامایکا:**

ئەم سیستەمە لە کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٧٦) لە جامایکا بڕیاری لەسەردرا، وە بەتەواوەتی ئاڵوویری دراوەکان ئازادکرا بۆ یاساکانی بازاڕ (خستنەڕوو خواست)، پرینسیپە سەرەکییەکانی ئەم سیستەمە بریتین لە:

- ئاڵوویری نەگۆڕی دراوەکان.
- ئاڵوویری سەربەستی دراوەکان.
- ئاڵوویری خشۆکی (هێواش)ی دراوەکان.

لەبازاڕی دارایی جیهانیدا (FOREX)، زیاتر سەودا و مامەڵە بەو دراوانە دەکرێت کە بەشێوەیەکی سەربەست ئاڵوویر دەکرێن (floating rates)، واتە لەبەر یاسای خستنەڕوو خواستدا. بێگومان ئەمڕۆکە بانکە ناوەندییەکان بەپێی توانایان کۆنترۆڵی نرخی گۆڕینەوە لەبازاڕەکانی دراودا دەکەن لەپێناوی دابینکردنی سەقامگیری نرخی دراوی نیشتمانی. بێگومان ئاڵوویری سەربەستی دراوەکان دەبێتە هۆی زیاتر گەشەکردن و چالاکتر بوونی بۆرسەی دراو. وە هەروەها دەبێتە هۆی پەیدابوونی پارەگۆڕ و پارەبازان (Speculate) لەبازاڕەکانی دراو گۆڕینەوەدا. پسپۆڕان پارەگۆڕەکان دەکەن بە دوو بەشەوە:

یەکەم: پارەگۆڕی ڤالایەتی:- بازرگانی پارەگۆڕینەوە کە لەیەك کاتدا، خەریکی کڕین و فرۆشتنی چەند دراوێکە، قازانجەکەی لەئەنجامی جیاوازی نرخی دراوەکانەوە دەست دەکەوێت.

بۆ نموونە: گریمان لەیەك کاتدا پارەگۆڕ لە بۆرسەی دراوی لەندەن جونەیهی ستەرلینی بەرامبەر دۆلار بە نرخی (١,٧٢٣٥) کڕیوە، لەهەمان کاتدا لە بۆرسەی بەرلین دەیفرۆشێتەوە بە نرخی (١,٧٢٣٧) بەڵام بەهۆی پێشکەوتنی سیستەمی خێرایی گەیاندنەوە ئەم جۆرە مامەڵە کردنە گرنگیەتی لەدەست داوە.

دووەم: پارەگۆڕی کاتی:- ئەم پارەگۆڕانە لەکاتی کردنەوە و داخستنی مامەڵە لە بۆرسەکاندا دراو دەکڕن و دەفرۆشنەوە، ئەم جۆرە پارەگۆڕانە هەندێ جاریش پێیان دەوترێت بازارڤان (trading).



بۆ نموونە: گریمان پارەباز لە (١٠)ی نیسان یۆرۆی گۆڕیوەتەوە بە دۆلار بەنرخی (١,٤١٠٥) بەڵام لە (١١)ی نیساندا یۆرۆی بە دۆلار فرۆشتۆتەوە بەنرخی (١,٤١٥٠).

## سیستەمی دارایی ئەورووپایی

سیستەمی دراوی ئەوروپی بە سێ قۆناغی سەرەکیدا تێپەڕیوە کە ئەمانەن:

١- قۆناغی ئامادەکردن:- سەرەتای ساڵی (١٩٤٧) تاوەکو ساڵی (١٩٨٧).

٢- قۆناغی پێکهێنان:- سەرەتای ساڵی (١٩٨٧) تاوەکو ساڵی (١٩٩٩)، ئەم قۆناغە لەسەر بنچینەی قەرزی دارایی دامەزرێنرا (European Currency Unit-EUC ). بە ڕەچاوکردنی کەریدۆری گۆڕینەوەی دراوە ئەوروپییەکان.

٣- قۆناغی ئەمێستا:- سەرەتای ساڵی (١٩٩٩) واتە قۆناغی بەکارهێنانی یۆرۆ (EURO)، وەکو دراوی یەکگرتووی ئەوروپا.

بۆ یەکەم جار بیرۆکەی دامەزراندنی یەکێتی ئەوروپا لە جڤینی (ڕیم)دا گەڵاڵە بوو، لەو جڤینەدا بڕیاری دامەزراندنی ئابووریەکی هاوبەش لە ئەوروپا بەرجەستەکرا. کە لە دواییدا بە (بازاڕی هاوبەش) ناوبرا. بەشێوەیەکی فەرمی بە (یەکێتی ئابووری ئەوروپا) ناسرا. ئەوەی شایانی ئاماژە پێدانە لەو کاتەدا هێشتا بیرۆکەی یەکبوونی دراو لە ئارادا نەبوو. ئامانجی یەکێتی ئابووری ئەوروپا بریتی بوو لە گەشەکردنی باری ئابووری و بەرزکردنەوەی ئاستی ژیانی دانیشتوانی ئەوروپا. سەرەتا ئەندامانی یەکێتی ئابووری ئەوروپا بریتی بوون لە شەش وڵات: (فەرەنسا، ئەڵمانیا، ئیتالیا، بەلجیکا، هۆڵەندا، لۆکسمبورگ). دواتر لەساڵی (١٩٧٣)دا چەند وڵاتێکی تر بوون بە ئەندام لەو یەکیەتیەدا وەك (بەریتانیا، دانیمارك، ئیرلەندا)، وە لەساڵی (١٩٨١)دا (یۆنان) دواتر لەساڵی (١٩٨٦)دا، ئیسپانیا و پورتوگاڵ.

لەسەرەتای ساڵی (١٩٩٠)دا ئەو یەکێتیە ئامانجەکانی پێکا، هەر لەوماوەیەدا یەکێتی ئەوروپا بۆ بەرهەمی خەڵوز و کانزا دامەزرێنرا دواتر یەکێتی ئەوروپا بۆ کاروباری (وزەی ئەتۆمی)، دوای ئامادەکردنی زەمینەیەکی پتەوی ئابووری لەماوەی ئەو چەند ساڵەدا بیرۆکەی دامەزراندنی یەکێتی ئەوروپا هاتە کایەوە. پەیمانی یەکێتی ئەوروپا لە شوباتی ساڵی (١٩٩٢) دا لە هۆڵەندا لەلایەن وەزیرانی دەرەوە و دارایی دوانزە وڵات پەسەندکرا. کە بریتی بوون لەم وڵاتانە (بەلجیکا، بەریتانیا، ئەڵمانیا، یۆنان، دانیمارك، ئیرلەندا، ئیسپانیا، ئیتالیا، لۆکسمبورگ، هۆڵەندا، پورتوگاڵ، فەرەنسا)، لەساڵی (١٩٩٤)دا یەکێتی ئەوروپا فراوانتر بوو

بە ئەندامبوونی (نەمسا، فینلەندا، سوید). ئەندامانی ئەو یەکێتییە دەبوایە پابەندبوونایە بە یەکبوونیان لەدارِشتنی سیاسەتی ئابووری و سیاسەتی دەرەوە و مەسەلەی ئاسایش و پارێزگاری ژینگەو...هتد. بێگومان دامەزراندنی یەکێتی ئەوروپا هەنگاوێکی گرنگ بوو بۆ پەیدابوونی دراوی هاوبەشی ئەوروپا. بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی کردەیی دراوی هاوبەشی ئەوروپا دروست بکرێت. لە ئایاری ساڵی (١٩٩٥)دا، بانکی ناوەندی ئەوروپا دامەزرا. بانکی ناوەندی کەوتە کارکردن بۆ ئامادەکردنی دراوی هاوبەشی ئەوروپا (یۆرۆ). بۆ ئەمەش ئەو ولاتانەی کە دەیانویست بچنە ناوچەی یۆرۆوە دەبوایە رەچاوی چوار مەرجی بنچینەیی بکەن:

١- سەقامگیرکردنی نرخ، بەمەرجێك ئاستی بەرزبوونەوەی نرخ لەماوەی دوانزە مانگدا دەبوایە لە رێژەی (١,٥٪)، زیاتر نەبوایە، ئەم مەرجە زیاتر بۆ ولاتە زۆر پێشکەوتووەکان دانرابوو.

٢- پێویست بوو رێژەی سوودی قەرزی درێژخایەن لە (٢٪) زیاتر نەبوایە لەماوەی دوانزە مانگدا.

٣- دەبوایە قەرزە گشتییەکانی حکومەت لە (٦٠٪) زیاتر نەبوایە، وە کورتهێنانی بالانسی بودجە لە (٣٪)ی ئاستی گەشەی ئابووری سالانە زیاتر نەبوایە.

٤- دەبوایە نرخی گۆڕینەوەی دراو، لەماوەی دوو ساڵدا لەو سنوورە دەرنەچێت کە دیاری کراوە، وە دەبوایە بەشێوەیەکی چالاك بەشداری میکانیزمی کڕین و فرۆشتنی دراوەکانیان بکردایە لە بۆرسە داراییەکاندا.

دراوی هاوبەشی ئەوروپا لە کاتژمێری (٠:٠٠) بەکاتی ئەوروپا لە یەکی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٩٩)دا بەشێوەیەکی فەرمی بوو بە دراوی ئەوروپا لە سەرەتاوە یانزە ولاتی ئەندام کەوتنە مامەڵەکردن بە یۆرۆ، ئەو ولاتانەش بریتی بوون لە (نەمسا، ئەڵمانیا، فەرەنسا، بەلجیکا، هۆڵەندا، ئیرلەندا، ئیسپانیا، ئیتالیا، لۆکسمبورگ، فینلەند، پورتوگال). دواتر لەساڵی (٢٠٠١)دا یۆنانیش چووە ناوچەی یۆرۆوە، بەم شێوەیە ناوچەی یۆرۆ بوون بە دوانزە ولاتی ئەندام. دەبوایە ولاتە ئەندامەکانی ناوچەی یۆرۆ لەماوەیەکی دیاریکراودا دراوی نیشتمانی نەهێڵن، بۆ ئەمەش نرخی دراوی نیشتمانیان بەرامبەر یۆرۆ دەستنیشان کرد. لەخشتەی ژمارە (٢٢-١)دا نرخی گۆڕینەوەی دراوەکان بەرامبەر یۆرۆ نیشان دەدەین.



خشتەی ژمارە (٢٢-١) نرخی گۆڕینەوەی دراوی نیشتمانی ولاتانی ناوچەی یۆرۆ بەرامبەر (EURO).

| پارەی نیشتمانی ولاتانی ناوچەی یۆرۆ | نرخی گۆڕینەوەی دراوی نیشتمانی بەرامبەر یۆرۆ |
|---|---|
| مارکی ئەڵمانی | ١,٩٥٥٨٣ |
| فرەنکی فەرەنسی | ١,٥٥٩٥٧ |
| لیرەی ئیتالی | ١٩٣٦,٢١ |
| پێسێتی ئیسپانی | ١٦٦,٣٨٦ |
| ئیسکودەی پورتوگالی | ٢٠٠,٤٨٢ |
| مارکی فینلەندی | ٥,٩٤٥٧٣ |
| جونەیهی ئیرلەندی | ٠,٧٨٧٥٦٤ |
| فرەنکی بەلجیکی و لۆکسمبورگ | ٤٠,٣٣٩٩ |
| گولدنی هۆڵەندی | ٢,٢٠٣٧١ |
| شیلینگی نەمساوی | ١٣,٧٦٠٣ |
| دراخمای یۆنانی | ٣٤٠,٧٥٠ |

ولاتەکانی یەکێتی ئەورپا سەربەستن لە بڕیاردانی چوونە ناوچەی یۆرۆوە، ئەوەتا تاکو ئەمێستاش زۆربەی ولاتانی ئەندام دراوی نیشتمانی بەکاردەهێنن وەك (بەریتانیا، سوید، دانیمارك). ئەوەی ئاشکرایە یەکێتی ئەوروپا بەرە بەرە فراوانتر دەبێت لەساڵی (٢٠٠٢)دا دە ولاتی تریش بوون بەئەندامی یەکێتی ئەوروپا ئەو ولاتانەش بریتین لە (هەنگاریا، قوبروس، لاتوانیا، لیتوانیا، ئیستۆنیا، مالتا، پۆلۆنیا، سلۆڤاکیا، سلۆڤێنیا، چیك). وە دواتر لەساڵی (٢٠٠٧)دا ولاتانی (رۆمانیا و بۆلگاریا) بوون بە ئەندام، ئەم پرۆسەیە بەردەوام دەبێت تاکو گشت ولاتانی ئەوروپا دەبن بە ئەندام. ئەوەی شایانی باسە بۆ یەکەم جار لە مێژووی دراوی جیهانی دا، ئەزموونی بەکارهێنانی یەك دراو بۆ کۆمەڵێك ولات دراوێکی نوێ دروستکراوە بە بێ ئەوەی دراوی یەکێك لەو ولاتانە بکەن بە بنچینە، بە پێچەوانەی ناوچەی دۆلارەوە.

بێگومان یۆرۆ هەروا بەئاسانی نە هاتۆتەوە کایەوە بەڵکو لەئەنجامی کێ بەرکێیەکی توندوتیژ، گفتۆگەیەکی درێژخایەن و هەوڵێکی زۆری نێوان ئەندامان پەیدا بووە. گۆێزانەوەی ئابووری بۆ یەك دراوی هاوبەش پرۆسەی پێکەوە بەستن (integration) و کۆنفیدرالی لەنێوان

ولاَتانی ناوچەی یۆرۆ خێراتر دەکات. بێگومان ئەم پرۆسەیە هەروا ئاسان نییە پێویستی بەکاتێکی زۆرو هەوڵ و کۆششێکی بێ ووچانی ئەندامانی یەکێتی ئەوروپا هەیە، چونکە ئاست و رادەی پێشکەوتنی باری ئابووری ولاَتانی ئەندام جیاوازن، بەلاَم وەك دەبینین پرۆسەی پێکەوە بەستن بەردەوامە.

دەتوانین ئامانجە سەرەکییەکانی پێکهێنانی دراوی هاوبەشی ئەوروپا (یۆرۆ) لەو چەند خاڵەی خوارەوەدا دیاری بکەین.

١- دامەزراندنی بەهێزترین چەق و سەنتەری ئابووری و دارایی جیهانی بەهۆی یۆرۆوە، تاکو ئەوروپا بەتەواوەتی پێکەوە دەبەسترێت و دەبێت بە بەهێزترین سەنتەری ئابووری و دارایی جیهانی.

٢- ئاسانکردنی پرۆسەی گۆڕینەوەی دراوی ئەوروپی بەرامبەر دراوەکانی تر، هەروەها نەمانی بەربەست لە بەردەم هاتوچۆ و گۆڕینەوەی دراو لەنێوان ولاَتانی ناوچەی یۆرۆ.

٣- بە یەکگرتنی سیاسەتی ئابووری.

٤- کەم کردنەوەی کاریگەری ئەمریکا و بە دۆلار بوونی جیهان.

٥- زیادکردنی چالاکیەکان لە کاریگەرکردن لە رووداوە نێودەوڵەتییەکاندا وە پارێزگاری لە بەرژەوەندییەکانی یەکێتی ئەوروپا لە هەموو جیهاندا.

ئەوەی جێگەی ئاماژە پێدانە پرۆسەی پێکەوە بەستنی ئەوروپا ئەستەنگی زۆری لە بەردەمدایە، چونکە ولاَتە گەورەکانی تریش وەك روسیا و چین و هندستان و...هتد. هەوڵی دامەزراندنی سەنتەری ئابووری دەدەن، جگە لەمەش کێشە ناوخۆییەکانی ئەوروپا کەمتر نین بە تایبەتی چەند ولاَتێکی وەك فەرەنسا و ئەڵمانیا دەیانەوێت رۆڵی سەروەری لەناو یەکێتی ئەوروپادا بگێرن.

هەرە ئۆرگانە گرنگەکانی بەڕێوەبردن لە ئەوروپا بریتین لە:

- **کۆمیسیۆنی ئەوروپا** (European commission).

کۆمیسیۆنی ئەوروپا بریتییە لەئۆرگانی جێبەجێ کردن، کە ژمارەیان ئەوەندەی ژمارەی ولاَتانی ئەندامە بۆ ماوەی پێنج ساڵ هەڵدەبژێرێن بەڕەزامەندی پەرلەمانی ئەوروپا، ئەم کۆمێسارانە لە کارەکانیاندا سەربەستن، هەر ئەندامێك بەرپرسیارە بەرامبەر کارەکانی خۆی واتە رۆڵی بەڕێوەبەری گشتی دەبینن.



- **پەرلەمانی ئەوروپا** (Ευροπεαν Παρλιαμεντ).

پەرلەمانی ئەوروپا ئۆرگانی یاسادانانە کە لە (٦٢٦) پەرلەمانکار پێکهاتووە بەشێوەیەکی راستەوخۆ لەلایەن دانیشتوانی یەکێتی ئەوروپاوە هەڵدەبژێرێن بۆ ماوەی پێنج ساڵ، ئەرکە سەرەکییەکانی پەرلەمان بریتییە لە دانانی یاسا، رەزامەندی دان لەسەر بودجە، وە هەروەها چاودێریکردنی دەزگاکانی جێبەجێکردن. پەرلەمان کاران لە ستراسبورگ (فەرەنسا)، وە برۆکسیل لە (بەلجیکا) کۆدەبنەوە.

## ناوچەکانی بازاڕی دراوی جیهانی

بازاڕی دراوی جیهانی بەشێوەیەکی راستەوخۆ بەستراوە بە بازاڕی دارایی و کاڵا و خزمەتگوزارییەکانی جیهانییەوە، چونکە پارە تەنها پێوەرە کە دەتوانرێت بەهۆیەوە هەموو پرۆسەیەکی کڕین و فرۆشتنی پێ جێبەجێ بکرێت. بەشێوەیەکی گشتی پارە هۆیەکە لەلایەن مرۆڤەوە بەکاردێت بۆ رێکخستن و ئاسانکردنی سەوداگەریی و ئاڵوگۆڕکاریی. لەبەر ئەم هۆیانە پارە ئەو کاڵایەیە کە خزمەتی بازاڕەکان دەکات. لەبەرئەوە هەرچی گۆڕانکارییەك کە لە بازاڕەکاندا رووەدەات کار دەکاتە سەر نرخی گۆڕینەوەی دراوەکان، بۆیە بازاڕی دراوی جیهانی (FOREX) بە بەشێکی گرنگی ناوچەی (کەرتی) بازاڕی گەورەی جیهانی دەژمێردرێت. ئابووریناسان ناوچەکانی بازاڕی دارایی جیهان دەکەن بە سێ بەشەوە:

١- بازاڕی دارایی نیشتمانی (نەتەوەیی).

٢- بازاڕی دارایی نێونەتەوەیی (ناوچەیی).

٣- بازاڕی قەرز و دارایی ئەوروپی.

بازاڕی دارایی نیشتمانی خزمەتی کەرتی قەرز و دارایی ناوخۆ دەکات واتە چالاکییەکانی لە چوارچێوەی ولاَتێکی دیاریکراودایە. لەم بازاڕەدا سەودا و مامەڵەکردن و بەگەڕخستنی سەرمایە تەنها بە دراوی نیشتیمانی دەکرێت بۆیە لە رێگەی ئەم بازاڕەوە هەموو دراوەکانی تر دەگۆڕدرێنەوە بە دراوی نیشتمانی. بۆ نموونە بانکی ناوەندی کوردستان قەرز دەدات بە بانکە بازرگانییەکان ئەو قەرزە بە دراوی نیشتمانی وەردەگیرێت، دواتر هەر قەرزێکی تر لەنێوان بانکە بازرگانییەکان و سەوداکاران و کۆمپانیاکاندا تەنها بە دراوی نیشتمانی جێبەجێ دەکرێت، چونکە گشت سەودا و مامەڵەیەك لەناوخۆدا بەدراوی نیشتمانی دەکرێت. کاتێك

سەوداكەر پێویستی بە دراوی بیانی دەبێت بۆ هاوردە. دەبێت دراوی نیشتمانی بگۆڕێتەوە بەو دراوە بیانییەی كە پێویستیەتی، پرۆسەی گۆڕینەوە لە بازاڕی دراوی نێونەتەوەیی (ناوچەیی) جێبەجێ دەكرێت. هەردوو بازاڕی دراوی نیشتمانی و نێونەتەوەیی تەواوكەری یەكترن وە بەشێكن لە بازاڕی دراوی جیهانی.

بازاڕی قەرز و دارایی ئەوروپا داهێنانێكی نوێیە كە لەئەنجامی بەجیهان بوونی دارایی جیهانییەوە هاتۆتە كایەوە. بەشێوەیەكی كردەیی بریتییە لەو پارەیەی كە سنووری نیشتمانی بە سەربەستی دەبڕێت. سەرەتاكانی دەگەڕێتەوە بۆ پەنجاكانی سەدەی پێشوو، كە لە ساڵەكانی شەست و هەفتاكانی سەدەی رابردوودا زیاتر گەشەی كرد. لەڕاستیدا بازاڕی قەرز و دارایی ئەوروپا لەئەنجامی بڕیارەكانی سەركردایەتی ئەو كاتەی یەكێتی سۆڤێتەوە پەیدابوو، بە بۆچوونی ئەو كاتەی سەركردایەتی سۆڤیەت لەپێناوی لاوازكردنی ئابووری ئەمریكا بڕیاریان دا بە دۆلاری ئەمریكی سپاردەكانیان لە بانكە ئەوروپییەكان زیاد بكەن كە بڕەكەی گەلێك زۆر بوو بەتایبەتی لە بانكی (EURO BANK) فەرەنسی. هەر ئەوكاتە زاراوەی (دۆلاری ئەوروپی) پەیدابوو چونكە یەكێتی سۆڤیەت دۆلارێكی زۆری لەو بانكانە گەنجینە كردبوو. ئەمڕۆكە بازاڕی قەرز و دارایی ئەوروپا بریتییە لە بازاڕێكی گەورە و چالاك و كاریگەر كە مامەڵەی دراوە زیندووەكانی جیهانی تێدا دەكرێت وەك (یۆرۆ دۆلار، یۆرۆ جونەیهی ستەرلینی، یۆرۆ فرەنك، یۆرۆ یەن، یۆرۆ یۆرۆ).

**پۆلێن كردنی دراوەكان و مێژووی دراوەكان**

لەپێشەوە باسمان لە سیستەمە داراییەكانی جیهان كرد، ئێستاكە باس لە جۆری دراوەكان دەكەین، بەشێوەیەكی گشتی دراوە جیهانییەكان بەم شێوەیەی خوارەوە پۆلێن دەكرێن:

**١- دراوە سەرەكییەكان** ( major currencies )

ئەم جۆرە دراوانە بەشێوەیەكی سەربەست و بێ هیچ قەید و بەندێك لەهەموو جیهاندا و لەسەرجەم بازاڕە داراییەكانی جیهانیدا مامەڵەی پێدەكرێت و ئاڵوویڕی پێدەكرێت. هەندێ جار ئەم دراوانە بە دراوی زیندوو یان قورس ناو دەبرێن. لە فەرهەنگی داراییدا بە پێنج دراوە گەورەكان ناو دەبرێن (five major)، كە بریتین لە (GBP. EUR. JPY. CHF. USD).

**٢- دراوە پلە دووەكان** ( minor currencies )

ئەم جۆرە دراوانە تاڕادەیەك بە سەربەستی مامەڵەی پێدەكرێت و دەگۆڕدرێنەوە، بەڵام جێگەی متمانەی خەڵكی و بازاڕەكانی ئاڵوویڕی دراوەكان نین، جگە لەمەش هەندێ جار سنوور دادەنرێت بۆ بڕی گۆڕینەوەیان بە دراوەكانی دیكە.



**٣- دراوە عەنتیكەكان** ( exotic currencies )

ئەم جۆرە دراوانە هەمیشە دەتوانرێت بگۆڕدرێنەوە بە دراوەكانی تر، بەڵام بڕی ئەم جۆرە دراوانە زۆر سنووردارە لەبەر كەمی و دەگمەنی. هەندێ جاریش بەپێی یاسا قەدەغەی ئاڵوگۆڕكردنیان دەكرێت.

پارەبازان لە بازاڕی دراوی جیهانیدا زیاتر مامەڵە لەگەڵ دراوە سەرەكییەكاندا دەكەن وەك لە دراوە پلە دووەكان چونكە رادەی سەركەشی (risk) لە كڕین و فرۆشتنی ئەو دراوانەدا كەمترە. ئەوەی شایانی ئاماژە پێدانە نزیكەی پەنجا ساڵە دۆلاری ئەمریكی وەك پارەی جیهانی مامەڵەی پێدەكرێت وە تاكو ئەمێستاش وەك دراوێكی سەرەكی لەجیهاندا مامەڵەی پێدەكرێت و زیاتر متمانەی هەیە. لەخشتەی ژمارە (٢٢-٢) خوارەوەدا رێژەی بەكارهێنانی دراوە جیهانییەكان نیشان دەدەین.

خشتەی ژمارە (٢٢-٢) رێژەی دراوە جیهانییەكان لە سەودا و مامەڵەكردندا لەساڵی (٢٠٠٢).

| دراوەكان | رێژەی بەكارهێنان |
| --- | --- |
| دۆلاری ئەمریكی | 90.4 |
| یۆرۆ | ٣٧,٦ |
| یەنی ژاپۆنی | ٢٢,٧ |
| جونەیهی ستەرلینی | ١٣,٢ |
| فرەنكی سویسری | ٦,١ |
| دراوەكانی تر | ٣٠,٠ |
| هەمووی | ٢٠٠,٠ |

لەبۆرسەكانی دراوی جیهانیدا چەند ستانداردێك لەشێوەی سێ پیتی لاتینیدا وەكو هێما بۆ ناسینەوەی دراوە جیهانییەكان دانراون بە رەزامەندی رێكخراوی جیهانی بۆ ستاندارد (ISO-421). لە خشتەی ژمارە (٢٢-٣)دا دراوی وڵاتانی جیهان و هێما لاتینییەكانیان نیشان دەدەین.

خشتەی ژمارە (٢٢-٣) دراوی ولاتانی جیهان و هێماکانیان.

| ولاتەکان | کۆدی دراو | هێمای دراو | ناوی دراو |
|---|---|---|---|
| ئوسترالیا | ٠٣٦ | AUD | دۆلاری ئوسترالی |
| نەمسا | ٠٤٠ | ATS | شیلینگ |
| ئازەربایجان | ٩٣٢ | AZM | مەنات |
| ئەلبانیا | ٠٠٨ | ALL | لێکی ئەلبانی |
| جەزائیر | ٠١٢ | DZD | دیناری جەزائیری |
| ئەرجەنتین | ٠٣٢ | ARS | پێسۆ |
| ئەرمەنستان | ٩٣١ | AMD | درام |
| ئەفغانستان | ٠٠٤ | AFA | ئەفغان |
| بیلاروس | ٩٠٦ | BYB | رۆبڵی بێلەروسی |
| بەلجیکا | ٠٥٦ | BEF | فرەنك |
| بولگاریا | ١٠٠ | BGL | لێڤە |
| بەرازیل | ٩٨٧ | BRR | ریاڵی بەرازیلی |
| بەریتانیا | ٨٢٦ | GBP | جونەیهی ستەرلینی |
| هەنگاریا | ٣٤٨ | HUF | فۆرین |
| ڤێتنام | ٧٠٤ | VND | دۆنگ |
| ئەڵمانیا | ٢٨٠ | DEM | مارك |
| یۆنان | ٣٠٠ | GRD | دراخما |
| جۆرجیا | ٢٦٨ | GEK | لار |
| دانیمارك | ٢٠٨ | DKK | کرۆن |
| یەکێتی ئەوروپا | ٩٨٧ | EUR | یۆرۆ |
| میسر | ٨١٨ | EGP | جونەیهی میسری |
| ئیسرائیل | ٣٧٦ | ILS | شیکل |
| هیندستان | ٣٥٦ | INR | روپیێ |



| | | | |
|---|---|---|---|
| ئەندەنوزیا | ٣٦٠ | IDR | روپیێ |
| ئوردون | ٤٠٠ | GOD | دینار |
| عێراق | ٣٨٦ | IQD | دینار |
| ئێران | ٣٦٤ | IRR | تومەن |
| ئێرلەندە | ٣٧٢ | IEP | پاوەن |
| ئیسلاند | ٣٥٢ | ISK | کرۆن |
| ئیسپانیا | ٧٢٤ | ESP | پێسێت |
| ئیتالیا | ٣٨٠ | ETL | لیرە |
| کازاخستان | ٣٩٨ | KZT | تینگە |
| کەنەدا | ١٢٤ | CAD | دۆلاری کەنەدی |
| کینیا | ٤٠٤ | KES | شیلینگ |
| قوبرس | ١٩٦ | CYP | پاوەن(جونەیە) |
| قرگستان | ٤١٧ | KGS | سۆم |
| چین | ١٥٦ | CNY | یوان |
| کۆلۆمبیا | ١٧٠ | COP | پێسۆ |
| کوبا | ١٩٢ | CUP | پێسۆ |
| کوێت | ٤١٤ | KWP | دینار |
| لاووس | ٤١٨ | LAK | کیپ |
| لاتوانیا | ٤٢٨ | LVL | لات |
| لوبنان | ٤٢٢ | LBP | لیرە |
| لیبیا | ٤٣٤ | LYD | دینار |
| لیتوانیا | ٤٤٠ | LTL | لیت |
| لوکسمبورگ | ٤٤٢ | LUF | فرەنك |
| مەغریب | ٥٠٤ | MAD | درهەم |
| سندوقی دراوی نێودەوڵەتی | ٩٦٠ | SDR | یەکەی (SDR) |

| | | | |
|---|---|---|---|
| مەکسیک | ٤٨٤ | MXN | پێسۆ |
| مەلداڤیا | ٤٩٨ | MDL | لێی |
| مەنگۆلیا | ٤٩٦ | MNT | تۆگریك |
| نیپاڵ | ٥٢٤ | NPR | روپێ |
| نێجیریا | ٥٦٦ | NGN | نایره |
| هۆڵەندا | ٥٢٨ | NLG | گوڵدن |
| نویز لاند | ٥٥٤ | NZD | دۆلاری نیوزلاندی |
| نەرویج | ٥٧٨ | NOK | کرۆن |
| ئیمارات | ٧٨٤ | AED | درهەم |
| پاکستان | ٣٨٦ | PKR | روپێ |
| پیرۆ | ٦٠٤ | PEN | سۆل |
| پۆلۆنیا | ٦١٦ | PLZ | زلۆتی |
| پورتوگال | ٦٢٠ | PTE | ئیسکۆده |
| روسیا | ٨١٠ | RUR | رۆبڵ |
| رۆمانیا | ٦٤٢ | ROL | لێی |
| عەرەبستانی سعودی | ٦٨٢ | SAR | ریال |
| سینگاپور | ٧٠٢ | SGD | دۆلاری سینگاپوری |
| سوریا | ٧٦٠ | SNP | لیره |
| سلۆڤاکیا | ٧٠٣ | SKK | کرۆن |
| سلۆڤێنیا | ٧٠٥ | SIT | تۆلار |
| سودان | ٧٣٦ | SDD | دینار |
| ئەمریکا | ٨٤٠ | USD | دۆلار |
| تاجکستان | ٩١٤ | TMM | سۆمۆن |
| تایوان | ٩٠١ | TWD | دۆلاری تایوانی |
| تایلاند | ٧٦٤ | THB | بات |



| | | | |
|---|---|---|---|
| تونس | ٧٨٨ | TND | دینار |
| تورکمێنستان | ٧٩٥ | TMM | مەنات |
| تورکیا | ٧٩٢ | TRL | لیره |
| وزبێکستان | ٩٢٨ | UZS | سۆم |
| ئۆکرانیا | ٩٨٠ | UAH | گریڤن |
| ئۆرۆگوای | ٨٥٨ | UYP | پێسۆ |
| فیلیپین | ٦٠٨ | PHP | پێسۆ |
| فینلەندا | ٢٤٦ | FIM | مارك |
| فەرەنسا | ٢٥٠ | FRF | فرەنك |
| چیك | ٢٠٣ | CZK | کرۆن |
| چیللی | ١٥٢ | CLP | پێسۆ |
| سویسرا | ٧٥٦ | CHF | فرەنك |
| سوید | ٧٥٢ | SEK | کرۆن |
| شیریلانکا | ١٤٤ | LKR | روپێ |
| ئیستۆنیا | ٢٣٣ | EEK | کرۆن |
| ئەسیوپیا | ٢٣٠ | ETB | بیر |
| ئەفریقای باشوور | ٧١٠ | ZAR | راند |
| یۆگۆسلاڤیا | ٨٩٠ | YUN | دینار |
| کۆریای باشوور | ٤١٠ | KRW | ڤۆن |
| ژاپۆن | ٣٩٢ | JPY | یەن |

## مێژووی پەیدابوونی دۆلاری ئەمریکی

(dolly - dollar - buck - $- USD) یان (پشت سەوز)
:(US currency unit - greenback)

نازناوی پشت سەوز لە بەکارهێنانی ئەو سەنەدانەوە هاتووە کە خاوەنەکەی لە کاتی گۆڕینەوەیدا هیچ سوودێکی (قازانج) دەست نەدەکەوت، ئەم سەنەدانە دیوی پشتەوەی

ڕەنگەکەی سەوز بووە، لەساڵی (١٨٦١)دا لە کاتی شەڕی ناوخۆدا لە ئەمریکا مامەڵەی پێدەکرا. ناوی دۆلار لە وشەی یان لە (زاراوە)ی (تالیر)ەوە هاتووە کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە ئەڵمانیا لەشێوەی دراوی کانزاییدا بەکارهاتووە. پێشتریش تالێر لە شاری یاخیمەی چیك بەکارهاتووە، لەو کاتەدا هەرچی دراوە ئەورووپییەکانی تری ئەو سەردەمە بەهۆی تالێرەوە پێوەر دەکران. هەر وڵاتەی ناوی دۆلاریان بەشێوەی جیاواز دەردەبڕی وەك (thaler- daler- dalar-daaler- talero). لە کۆلۆنییەکانی بەریتانیا و ئیسپانیا لە بری وشەی (پێسۆ)ی ئیسپانی خەڵکی زیاتر وشەی دۆلاریان بەکاردەهێنا. لەساڵی (١٧٨٥)دا ئەمریکا بەشێوەیەکی فەرمی تەبەنی دراوی نوێی کرد بە ناوی دۆلارەوە. هێمای دۆلار ($) لە یەکی نیسانی ساڵی (١٧٧٨)دا لەلایەن بیزنسمانێکی ئیرلەندییەوە (ئۆلیڤێر پەلۆك) داهێنراوە، سەرچاوەی ئەم بیرۆکەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هێمایەی کە پێشتر لەسەر دراوی ئیسپانی (پێسۆ)دا نەخشەکێشرابوو. هێمای($) بەپێی میفەلۆگیا کۆنەکان تەعبیر بووە لە (کۆتایی زەوی) کە لە دەروازەی (جەبەل تاریق) چووە، لەسەر هێمای (S) نوسرابوو ( nec plus ultra). لەساڵی (١٧٩٢)ەوە پێکهاتەی دۆلار بریتی بووە لە (١،٦٠٣٣) گرام زێڕی پاك، یان (٢٤،٠٥٧) گرام زیوی پاك. لەساڵی (١٨٧٣)ەوە دۆلاری ئاڵتون بوو بە دراوی فەرمی، لەساڵی (١٩٠٠)دا کێشی دۆلار بە زێڕ بریتی بووە لە (١،٥٠٤٦٣) گرام.

دوای جەنگی دووەمی جیهانی ئەمریکا بوو بە تاکە وڵاتی زلهێزی دونیا. چونکە لەو سەردەمەدا ئەمریکا تاقە وڵاتی سەرمایەداری بوو جەنگ تووشی داڕمانی ئابووری نەکردبێ. بەپێی (پرۆژەی مارشاڵ) ئەمریکا پێشنیاری کرد وڵاتانی ئەورووپا کەڵك لەسەرمایەی ئەمریکایی وەربگرن وە ژێرخانی ئابووریان پێ بنیات بنێنەوە. چونکە دوای جەنگ ئەورووپا و ژاپۆن بۆ سەرلەنوێ بنیاتکردنەوەی ژێرخانی ئابوورییان ناچاربوون کەڵك لە سەرمایەی ئەمریکا وەربگرن. لە هەلومەرجێکی ئاوەهادا، هەر ئەمریکا دەیتوانی دراوی خۆی بە ئاڵتون بگۆڕێتەوە و بیکاتە دراوێکی نێودەوڵەتی بە جۆرێك لەساڵی (١٩٤٥)دا ئەمریکا خاوەنی (٣/١)ی گەنجینەی ئاڵتونی تێکڕای جیهان بوو. لە ناوەڕاستی ساڵی شەستەکانی سەدەی ڕابردوو دۆلار بەرەو لاوازی دەچوو. چونکە ئەو وڵاتانە بەهۆی پەرەسەندنی ئابوورییانەوە لەو ماوەیەدا توانیان دراوی خۆیان ڕاستەوخۆ بە ئاڵتون بگۆڕنەوە. جگە لەمەش ئەمریکا تووشی هەڵاوسان و کورتهێنانی بودجە و باڵانسی بازرگانی بوو. هەموو ئەم هۆیانە وایان کرد کە دۆلار لاوازبێت لە کۆتایی ساڵی (١٩٧١)دا بەرامبەر یەك ئۆنس ئاڵتون ($٨٣) بووە. بەم



جۆرە گۆڕینەوەی ئاڵتون بە دۆلار کۆتایی پێ هات. لەساڵی (١٩٧٤)دا نرخی یەك ئۆنس ئاڵتون بوو بە ($١٥٠). لەساڵی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو گەیشتە ($٤٠٠)، ئێستاکە نرخی یەك ئۆنس ئاڵتون گەیشتۆتە سەرو ($٩٠٠). لە وێنەکەی خوارەوەدا بەرزبوونەوەی نرخی ئاڵتوون بەرامبەر دۆلار نیشان دەدەین.

وێنەی ژمارە (٢٢-١) نرخی ئاڵتون بەرامبەر دۆلار:




ئەوەی شایانی باسە دۆلار گرنگێتی خۆی وەك دراوێکی بەهێزی جیهانی لەدەست نەداوە. نزیکەی (٦٠٪) گەنجینەی بانکەکان تاکو ئێستاکەش بەدۆلاری ئەمریکین. کە بەنزیکەی یەك ترلیۆن مەزەندە دەکرێت. جگە لە ئەمریکا (٢٦) وڵاتی تر دراوەکانیان هەر ناوی دۆلارە سەیری خشتەی ژمارە (٢٢-٣) بکە.

بەپێی ئامارەکانی بانکی ئیحتیاتی ئەمریکا تاکو ئەمێستا بڕی (٦٥٠) ملیارد دۆلاری کاش هەیە. سێ بەشی ئەو بڕە لە دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەسووڕێتەوە.

خاڵێکی گرنگ کە دەمەوێت ئاماژەی پێبدەم جگە لە دۆلاری چاپکراو بە شێوەیەکی فەرمی ئەمڕۆکە بڕێکی زۆر دۆلاری تەزویر لەجیهاندا دەسووڕێتەوە بۆیە حکوومەتی ئەمریکی هەمیشە هەوڵی گۆڕینی دیزاینی دۆلار دەدات تاکو بیپارێزێت لە تەزویرکردن.

**یۆرۆ** ( EUR-   - EURO )

هێمای فەرمی (€) یۆرۆ وەکو هێمای ئیپسلۆنە لە بیرکاریدا. ئەم ڕەمزە تەعبیر لە ئەورووپای یەکگرتوو دەکات واتە یەکێتی ئەوروپا، هێمای یۆرۆ (€) لەسەدەی حەوتەمدا لەسەر دراوی بێزەنتیەیکان نەخشەکێشرابوو کە پێی دەوترا (پێنتانوم). کە ئەوکاتە تەعبیرکردن بووە لە ئیمپراتۆریەتی گەورەی بێزەنتی. ناوی یۆرۆ لە کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٩٥)دا لە مەدرید لەلایەن ئەنجوومەنی باڵای یەکێتی ئەورووپاوە بڕیاری لەسەردرا. لە یەکی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٩٩)دا بەشێوەیەکی فەرمی کەوتە کارکردن لەبازاڕەکانی دوانزە وڵاتی ئەندامانی یەکێتی ئەوروپا کە بریتی بوون لە (نەمسا، بەلجیکا، ئەڵمانیا، فەرەنسا، ئیرلەندا، ئیسپانیا، ئیتالیا، لۆکسمبورگ، هۆڵەندا، پورتوگال، فینلەندا، یۆنان). هەرچەندە تەمەنی یۆرۆ لەچاو دراوە جیهانییەکانی تردا ساوایە بەڵام ئەوەتا خەریکە دەبێتە دراوێکی جیهانی و هێدی هێدی شوێنی دۆلاری ئەمریکی دەلەقێنێ. ڕووی یەکەمی یۆرۆ لە گشت ئەو وڵاتانەی کە بەناوچەی یۆرۆ ناسراون لە یەك دەچێت، بەڵام دیوەکەی تری نەخشە و ڕەمزی گشت وڵاتەکانی ناوچەی یۆرۆیە وەك تەعبیر کردنێك لە مێژوو و کولتووری وڵاتانی ئەو ناوچانە.

**یەن** ( JPY-   - YEN )

دوای جەنگی دووەمی جیهانی بە بڕیاری بەڕێوەبەری ئەمریکی لە ژاپۆن (ئەوکاتە ژاپۆن لەلایەن ئەمریکاوە داگیرکرابوو) نرخی گۆڕینەوەی یەن بەرامبەر یەك دۆلاری ئەمریکی بریتی بوو لە (٣٦٠). واتە (1$= YEN٣٦٠)، بەڵام بەهۆی گەشەکردنی باری ئابووری ژاپۆنەوە هێدی هێدی نرخی دراوی ژاپۆنی بەرامبەر دۆلار بەرزبۆوە، لە وێنەی ژمارە (٢٢-٢)دا دینامیکی نرخی گۆڕینەوەی یەن بەرامبەر دۆلار نیشان دەدەین. سیاسەتی دارایی حکوومەتی ژاپۆنی لاوازکردنی نرخی گۆڕینەوەی یەنە بەرامبەر دراوە جیهانییەکان چونکە ژاپۆن وڵاتێکە ئابوورییەکەی زیاتر ڕاوەستاوە لەسەر ناردنە دەرەوەی بەرهەمەکانیان بۆ دەرەوەی وڵات، بۆیە بەهێزی دراوی نیشتمانی لەبەرژەوەندی ژاپۆندا نییە، هەر بۆیە بڕی ڕێژەی سوود لە ژاپۆن لە نزمترین ئاستدایە بەڕادەیەك  کە یەکسانە بە سفر. حکوومەتی ژاپۆنی و کۆمپانیا ژاپۆنییەکان زیاتر قەواڵە و سەنەدە ئەمریکی و ئەورووپییەکان دەکڕن لەبەرئەوەی ڕێژەی سوود و قازانجیان زیاتر و بەرزترە. ئەمڕۆکە (٢٣٪)ی مامەڵەی جیهانی بە یەنی ژاپۆنی دەکرێت.



وێنەی ژمارە (٢٢-٢) نرخی گۆڕینەوەی یەن بەرامبەر دۆلار.




**جونەیهی ستەرلینی** ( GBP-J-STG-POUND-CABLE- CBL )

نازناوی (cable) کێیبڵ لەو کاتەوە پەیدا بووە کە بەهۆی ڕاکێشانی کێبڵەوە بە ژێر ئاودا لەنێوان ئەمریکا و بەریتانیادا ڕاکێشرابوو بۆ مەبەستی گەیاندن لەشێوەی تێلێگرافدا لەنێوان هەردوو وڵاتدا. پاوەنی ئینگلیزی کۆنترین دراوە لەنێو دراوە جیهانییەکاندا، لە سەرەتای سەدەی یانزەهەمەوە تاکو جەنگی دووەمی جیهانی تاکە دراوی جیهانی بوو لە مامەڵەکردن و گەنجینەکردندا. بەڵام بەهۆی خەرجییە زۆرەکانی جەنگ و ئاکامە نێگەتیڤەکانی تر لەئەنجامی جەنگدا پاوەندی ستەرلینی جەبروتی خۆی لەدەستدا و دۆلار شوێنگەی گرتەوە. ئەمڕۆکە بەڕێژەی (١٣،٥٪) مامەڵەی جیهانی بە جونەیهی ستەرلینی دەکرێت. لە وێنەکەی خوارەوەدا نرخی گۆڕینەوەی پاوەند بەرامبەر دۆلار نیشان دەدەین لە ساڵی (١٩٧٥ تاوەکو ٢٠٠٧).

وێنەی ژمارە (٢٢-٣) دینامیکی نرخی گۆڕینەوەی پاوەند بەرامبەر دۆلاری ئەمریکی.




**فرەنکی سویسری** ( CHF- Confederation Helvetica Franc- SFR- Swissy- Swiss)

فرەنکی سویسری تەنها بەرێژەی (٦٪) مامەڵەی پێدەکرێت لەئاڵوگۆڕی جیهانیدا. بەتایبەتی دوای پەیدابوونی یۆرۆ وەك دراوێکی جیهانی. پسپۆڕانی دارایی فرەنکی سویسری بە ئاوێنەی یۆرۆ دەژمێرن. ئەمەش بەهۆی سیاسەتی دارایی بانکی نیشتمانی سویسرییەوە (Swiss National Bank- SBN) کە زیاتر ئاراستەکەی بەرەو یۆرۆیە. فرەنکی سویسری بەدرێژایی مێژوو وەك دراوێکی متمانەپێکراو جێگیر ناسراوە. بەهۆی سەربەخۆیی تەواوی بانکی نیشتمانی سویسرییەوە جگە لەمەش سیاسەتی بە نهێنی کردنی زانیاری دەربارەی پارە سپاردەکان بە بانکەکانی سویسرا. لە بازاڕی دراوی جیهانیدا بەشێوەیەکی هەمیشەیی و



ڕێکوپێك مامەڵەی پێدەکرێت. لە وێنەی ژمارە (٢٢-٤)دا نرخی گۆڕینەوەی فرەنك بەرامبەر دۆلاری ئەمریکی لە ساڵەکانی (١٩٣٠ تاکو ٢٠٠٧) نیشان دەدەین.

وێنەی ژمارە (٢٢-٤) نرخی فرەنکی سویسری بەرامبەر دۆلاری ئەمریکی.




## نرخی ئاڵوویری دراوەکان و توانای کڕین

بەهۆی جیاوازی و جۆراوجۆری دراوەکانەوە پێویستە نرخی ئاڵوویری دراو ئەنجام بدرێت. بۆ ئەمەش دەبێت نرخی دراوەکان بە یەکتری دیاری بکرێت واتە دیاریکردنی نرخی گۆڕینەوەی دراوی وڵاتێك بە نرخی ئاڵوگۆڕی دراوی وڵاتێکی دیکە. ئەم پرۆسەیەش واتە ئاڵوگۆڕی دراوەکان بە یەکتری لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە پێویستن.

یەکەم: ئاڵوویری دراوەکان بۆ جێبەجێ کردنی پرۆسەی بازرگانی ناوخۆ و دەرەکی. ئەو کۆمپانیایانەی کە خەریکی ناردنە دەرەوەی شمەك و خزمەتگوزاریەکانن دەسکەوتەکانیان بە

دراوی بیانییە ، ناچار دەبن دراوی بیانی بگۆڕنەوە بە دراوی نیشتمانی چونکە لە ناوخۆدا تەنها بەهۆی دراوی نیشتمانییەوە دەتوانرێت گشت سەودا و مامەڵەیەك بکرێت. بەڵام ئەو کۆمپانیانەی کە خەریکی هاوردەن بە پێچەوانەوە پێویستییان بە دراوی بیانییە بۆ کڕینی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان بۆیە ناچار دەبن دراوی نیشتمانی بگۆڕنەوە بە دراوی بیانی.

دووەم: ئاڵوگۆڕی دراوەکان دەبنە هۆی هاوسەنگی نرخەکان چ لە بازاڕە جیهانییەکاندا و چ لە بازاڕە نیشتمانییەکاندا. وە هەروەها بەشێوەیەکی سانا دەتوانرێت پێڕستی نرخەکان مەزەندە بکرێت.

سێهەم: بەهۆی ئاڵوگۆڕی دراوەکانەوە (واتە گۆڕینەوەی دراوی نیشتمانی بە دراوی بیانی و بەپێچەوانەشەوە). یارمەتی حکومەتەکان دەدات ئاگاداری گۆڕانکارییەکانی باڵانسی بازرگانی بن.

لەم سەردەمەدا دیاریکردنی نرخی دراو بەجێ هێڵراوە بۆ بازاڕ واتە بەهاکەی بەندە بەگۆڕانی خواست و خستنەڕوو، هەرکاتێك رادەی خواست لەسەر ئەو دراوە زیاتر بێت لە بڕی خستنە بازاڕی ئەوا بەهاکەی زیاد دەکات و بەپێچەوانەشەوە راستە. شارەزایانی بازاڕی دارایی بەهای ئاڵوێری دراوەکان بەم شێوەیە پۆلێن دەکەن.

١- ئاڵوێری راستەقینە:- لەم حاڵەتەدا دەتوانرێت نرخی کاڵا و خزمەتگوزارییەکانی دوو وڵات بەراورد بکرێت لەسەر بنچینەی بەهای ئاڵوێری دراوی هەردوو وڵات. جگە لە بەراوردکردنی نرخەکان بەهۆی ئاڵوێری راستەقینەوە دەتوانرێت بەراوردی بەهای هێزی کار لە هەردوو وڵات بکرێت.

٢- ئاڵوێری رووکەش (بەناو):- لەم حاڵەتەدا نرخی ئاڵوگۆڕ لەکاتی ئاڵوێری دراوەکان دیاری دەکرێت.

٣- ئاڵوێر لەسەر بنچینەی توانای کڕین:- لەم حاڵەتەدا نرخی ئاڵوێری رووکەش بە ئەندازەی نرخی ئاڵوێری راستەقینەی بە نەگۆڕی بەراورد دەکرێت.

هەروەك لەپێشەوە ئاماژەمان پێدا نرخی ئاڵوێری دراوەکان بەپێی یاسای داوا و خستنەڕوو دیاری دەکرێت. هەرچۆن نرخی شمەك و خزمەتگوزارییەکان بەپێی قەوارەی تێچوونیان دیاری دەکرێن، ئەوا نرخی ئاڵوێری دراوەکان بەپێی هێزی توانای کڕینیانەوە دیاری دەکرێن. توانای کڕینیش چەند حاڵەتێکی هەیە.

- توانای کڕین:- بریتییە لە بەراوردکردنی ئاستی ئابووری نێوان دوو وڵات لەکاتێکدا کە نرخی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان لە هەریەك لەو وڵاتانە یەکسان بن. ئەم حاڵەتە لە پراکتیکدا



جێبەجێ ناکرێت چونکە بۆ یەکسانی نرخەکانی دوو وڵات دەبێت بەلایەنی کەمەوە داهاتی دانیشتوان یەکسان بن، وە هەروەها دەبێت نرخی کەرەسەی خاو وەك یەك بن، ...هتد.

- حاڵەتی رەهایی هێزی کڕین:- ئەو حاڵەتەیە کاتێك نرخی کاڵا و خزمەتگوزارییەکانی هەردوو وڵات یەکسان دەبن بەرامبەر نرخی گۆڕینەوەی دراو. بەواتایەکی تر کاتێك نرخی ئاڵوێری دراوەکان وەك یەك و یەکسان دەبن بۆ ئەمەش پێویستە بەهای کرێی کار وەك یەك بن.

- حاڵەتی رێژەیی هێزی کڕین:- ئەو حاڵەتەیە کاتێك نرخی رەهایی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان جیاواز دەبن، بەڵام دینامیکی گۆڕانی نرخەکان لەماوەیەکی دیاری کراودا تارادەیەك نزیك دەبنەوە لەیەکتری.

لەم چەند ساڵەی دواییدا، پسپۆڕانی بواری دارایی بۆ بەراوردکردنی توانای هێزی کڕینی دراوەکان رێبەری (Index)، بیگ ماك (Big Mac)، بەکاردەهێنن.

**رێبەری بیگ ماك** ( Index Big Mac)

رێبەری (بیگ ماك) لەسەر بنچینەی نرخی یەك هەمبەرگری (Big Mac)، دارێژراوە کە لە (١١٩) وڵاتانی جیهانیدا دروست دەکرێت و دەفرۆشرێت. شێوەی بەرهەمهێنانیان لە گشت وڵاتەکاندا وەك یەکە. بەهۆی ئەم رێبەرەوە توانا و هێزی گۆڕینەوەی دراوەکان بەرامبەر دۆلار دیاری دەکەن. واتە بەهای راستەقینەی دراوە جیهانییەکان بەرامبەر دۆلاری ئەمریکی دیاری دەکرێت. بۆ نموونە نرخی یەك (بیگ ماك) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بریتییە لە (٢،٥٩$). بەڵام لە روسیا نرخەکەی بریتییە لە (٤٢) رۆبڵ. کاتێك نرخی گۆڕینەوەی رۆبڵ بەرامبەر دۆلار بەهۆی رێبەری (بیگ ماك)ەوە دیاری دەکرێت ئەوا بڕی (١٦،٢٢) رۆبڵ بەرامبەر یەك دۆلار دەبێت. بەڵام لەڕاستیدا نرخی ئاڵوێری رۆبڵ بەرامبەر یەك دۆلار بریتییە لە (٢٩) رۆبڵ. واتە نرخی رۆبڵ بەرێژەی (٤٤٪) کەمتر لە نرخی راستەقینەی خۆی ئەندازە کراوە.

**فەرهەنگی ئابووری**

هێزی کڕین (Purchasing Power)

توانای گۆڕینەوەی دانە پارەیەك بە دانەیەك یان چەند دانە شمەکێك لەو شمەکانەی کە بۆ ئاڵوگۆڕ دانراوە.

## خولی بازرگانی بازاڕی دراو

جیاوازی خولی بازرگانی بازاڕی دراو لەچاو خولی بازرگانی کاڵا و خزمەتگوزارییەکان لەوەدایە کە تەنانەت بۆ ساتێکیش لە کارناکەوێت. ئەمەش بەهۆی جیاوازی کاتەوە لە شوێنە جیاجیاکانی جیهاندا. بۆ نموونە کاتێك بازاڕی دراوی ئەمریکا دادەخرێت لە کیشوەری ئاسیا دەکرێتەوە دوابە دوا لە ئەوروپا دوابەدوا لە کیشوەری ئەمریکا،...هتد. کاتی کردنەوەی خولی ئاڵوێری دراوەکان بە کاتی سفر دەست پێدەکات، بەپێی کاتی گرینڤیچ ( Greenwich Meridian Time- GMT)، ئێستاکە بەهۆی خشتەی ژمارە (٢٢-٤)ەوە جیاوازی کاتەکان لە شوێنە جیاوازەکانی جیهان نیشان دەدەین.

خشتەی ژمارە (٢٢-٤) جیاوازی کات (کاتژمێر) بەپێی کاتی (GMT) لە سەنتەرە داراییەکانی جیهاندا.

| سەنتەری دارایی | جیاوازی کات (زستان) | جیاوازی کات (هاوین) |
|---|---|---|
| ڤیلینتۆن | +١١ | +١٢ |
| سیدنی | +٩ | +١٠ |
| تۆکیۆ | +٩ | +٩ |
| هۆن کۆنگ | +٨ | +٨ |
| سینگاپوور | +٧ | +٨ |
| مۆسکۆ | +٣ | +٤ |
| فرانکفۆرت | +١ | +٢ |
| زوریخ | +١ | +٢ |
| لەندەن | ٠ | +١ |
| نیۆرك | -٥ | -٤ |
| لۆس ئەنجلس | -٨ | -٧ |

بەپێی هەڵکەوتی جوگرافی ناوەندی (ناوەڕاست)ی روسیا بۆ بازرگانی لەبازاڕی دراوی جیهانیدا زۆر گونجاو و لەبارە. چونکە دەتوانێت بەشداری و مامەڵە لەگشت بازاڕەکانی دراودا بکات. بەهۆی خشتەکەی خوارەوە کاتەکانی مامەڵەکردنی روسیا بەراورد بە سەنتەرە داراییە جیهانییەکان نیشان دەدەین.



خشتەی ژمارە (٢٢-٥) کاتی کارکردنی بازاڕی دارایی (بەکاتی مۆسکۆ لە زستاندا).

| ناوچەکان | سەنتەری دارایی | رێژەی سورانەوە لە بازاڕی دارایدا | کاتی کردنەوەی خولی بازرگانی | کاتی داخستنی خولی بازرگانی |
|---|---|---|---|---|
| ئۆقیانوسی هادی | ئۆستراليا (سیدنی) | ٣,٢ | ٠١:٠٠ | ١٠:٠٠-٠٩:٠٠ |
| ئاسیا | ژاپۆن (تۆکیۆ)، هۆنکۆنگ، سینگاپور | ٩,١<br>٦,٢<br>٤,١ | ٠٣:٠٠<br>٠٤:٠٠<br>٠٤:٠٠ | ١٢:٠٠-١١:٠٠<br>١٣٠٠-١٢:٠٠<br>١٣:٠٠-١٢:٠٠ |
| ئەوروپا | ئەڵمانیا (فرانکفۆرت)، سویسرا (زوریخ)، بەریتانیا (لەندەن) | ٥,٤<br>٤,٤<br>٣١,١ | ٠٩:٠٠<br>٠٩:٠٠<br>١٠:٠٠ | ١٨:٠٠-١٧:٠٠<br>١٨:٠٠-١٧:٠٠<br>٢٠:٠٠-١٨:٠٠ |
| ئەمریکا | ئەمریکا (نیۆرك) | ١٥,٧ | ١٦:٠٠ | ٠١:٠٠-٢٣:٠٠ |

## خولی ئاسیایی

لەم خولەدا واتە بازاڕی دارایی ئاسیایی، زیاتر مامەڵەی (یەن بەرامبەر دۆلار)، وە (یەن بەرامبەر یۆرۆ) تیادا بەڕێوە دەچێت. ئەم بازاڕە زۆر ئەکتیڤە بەهۆی سیاسەتی بانکی ناوەندی ژاپۆنەوە. چونکە بانکی ناوەندی ژاپۆن بەشێوەیەکی راستەوخۆ بەشداری دەکات لە مامەڵەکردندا. جگە لەوەش بانکی ناوەندی ژاپۆن لە کاتژمێری (٠:٠٠) بەپێی کاتی (GMT)، نرخی ئاڵوێری یەن بەرامبەر دراوەکانی تر دیاری دەکات، تەنها بۆ ماوەی یەك کاتژمێر، تاوەکو بانکە بازرگانییەکان و سەنتەرە داراییەکان لە و ماوەیەدا بتوانن باڵانسی خۆیان بەراورد بکەن و رێکوپێکی بکەن، دوای ئەو ماوەیە واتە دوای یەك کاتژمێر، مامەڵەکردن دەکەوێتە ژێر کاریگەری بازاڕەوە، واتە دەکەوێتەوە ژێر کاریگەری یاسای داوا و خستنەڕووە.

## خولی ئەوروپی

لەم خولەدا واتە بازاڕی دارایی ئەوروپی، زیاتر مامەڵەی (جونەیهی ستەرلینی بەرامبەر دراوە ئەوروپییەکانی دیکە) دەکرێت. ئەم بازاڕە زۆر فراوان و ئەکتیڤە، نرخی ئاڵوێری دراوەکان لەم بازاڕەدا یاساکانی داوا و خستنەڕوو دیاری دەکەن.

**خولی ئەمریکی**

لەم خولەدا واتە بازاڕی دارایی ئەمریکی، مامەڵەی (دۆلاری ئەمریکی بە دراوەکانی دیکە دەکرێت)، جیاوازی ئەم بازاڕە لەچاو بازاڕەکانی دیکـەدا لەوەدایـە نرخـی دراوەکـان بەرامبـەر دۆلار یان بەرامبەر بە یەکتری رەنگە بە ئەندازەو ڕێژەیەکی بەرچاو گۆڕانیان بەسەردا بێت.

لە خشتەکەی خوارەوەدا کاتەکانی کارنـەکردنی( رۆژانـی پـشودان) ی گـرنگترین سـەنتەرە داراییەکانی جیهانی نیشان دەدەین.

خشتەی ژمارە (٢٢-٦) رۆژانی پشووی سەنتەرە داراییەکانی جیهانی.

| مانگەکان | لەندەن | فرانکفۆرت | تۆکیۆ | نیۆرک | زوریخ |
|---|---|---|---|---|---|
| کانوونی یەکەم | ١ | ١ | ١، ٢، ٣ ، ١٥ | ١ ی مانگ سێیەم دووشەممە | ١ |
| شوبات | - | - | ١١ | سێیەم دووشەممە | - |
| ئازار | جەژنی ئایینی | جەژنی ئایینی | ٢١ | جەژنی ئایینی | جەژنی ئایینی |
| نیسان | جەژنی ئایینی | جەژنی ئایینی | ٢٩ | جەژنی ئایینی | جەژنی ئایینی |
| ئایار | ٤ مانگ و دوا دووشەممە | ١ | ٣، ٤، ٥ | دوا دووشەممە | ٨ |
| حوزەیران | - | - | - | - | جەژنی ئایینی |
| تەمووز | - | - | ٢٠ | ٤ | - |
| ئاب | دوا دووشەممە | - | - | - | ١ |
| ئەیلوول | - | ٣ | ١٥، ٢٣ | یەکەم دووشەممە | - |
| تشرینی یەکەم | - | - | ١٠ | دووەم دووشەممە | - |
| تشرینی دووەم | - | - | ٣، ٢٣ | ١١ ی مانگ، چوارەم پێنج شەممە | - |
| کانوونی یەکەم | ٢٥، ٢٦ | ٢٤، ٢٥ ، ٢٦ | ٢٣، ٣١ | ٢٥ | ٢٥ |

# فەسڵی بیست و سێ

## سیاسەت، تەنگەژی، ڕووداوە سروشتییەکان

زۆربەی ڕووداوە چاوەڕوان نەکراوەکان کار دەکەنە سەر بارودۆخی ئابووری بەشێوەیەکی گشتی، بەڵام بەشێوەیەکی تایبەت و ڕاستەوخۆ کاردەکەنە سەر بازاڕی دارایی، وەك دەست لێکێشانەوە و لابردنی حکوومەتەکان، جەنگ و کۆدێتاو پێکدادان، تەنگەژی سیاسی بەتایبەتی لەکاتی هەڵبژاردنەکاندا، ڕووداوە سروشتییەکان،...هتد. ئێستاکە لەخوارەوە باس لە کاریگەری هەریەك لەو فاکتەرانە دەکەین لەسەر بازاڕی دارایی جیهانی.

## سیاسەتی دارایی حکوومەتی وڵاتە پێشکەوتووەکان

هەر کارمەندێکی میری لە سەرۆك کۆمارەوە تاوەکو بچووکترین کارمەند. هەمیشە هەوڵی لەدەست نەدانی دەسەڵات دەدەن. بۆ ئەمەش دەبێت گرووپێکی دیاریکراو یان دانیشتوان ڕازی بکەن. ئەم ڕواڵەتە زیاتر لەکاتی هەڵبژاردنەکاندا دەردەکەوێت. بێگومان ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی گرووپە جیاجیاکانی کۆمەڵگا هەروا کارێکی ئاسان نییە، چونکە بەرژەوەندییەکان هەمیشە ناکۆکن، هەر گرووپە و کۆمەڵێك لەپێناوی پاراستنی بەرژەوەندییەکانیاندا و بۆ گەشتنە ئامانج چالاکی دەنوێنن، هەر ئەم ململانێیەشە دەبێتە هۆی گەشەکردن و پێشکەوتنی ئابووری. بۆ نموونە ئەو گرووپانەی خەریکی ناردنە دەرەوەی بەرهەمەکانیانن نزمبوونەوەی بەهای دراوی نیشتمانی لەبەرژەوەندییاندایە، بەڵام ئەو گرووپانەی خەریکی هاوردەن بەپێچەوانەوە بەرزبوونەوەی نرخی دراوی نیشتمانی لەبەرژەوەندیاندایە، بانکەکان بەدیاردەی هەڵاوسان زیاتر سوودمەند دەبن، بەڵام بەکاربەر زەرەرمەند دەبێت، بەرزبوونەوەی نرخی موڵك و زەوی لەبەرژەوەندی خاوەن موڵکەکانە، بەڵام لەبەرژەوەندی زۆربەی خەڵکانی ترەوە نییە کە دەیانەوێت موڵك و زەوی بکڕن بۆ دروستکردنی خانووبەرە،...هتد. کەواتە ئەرکی سەرەکی دەسەڵات دۆزینەوەی هەمە ئاهەنگی و هاوسەنگی بەرژەوەندییە جیاجیاکانی کۆمەڵگایە بەڵام بەکردەیی چەند ماوەی مانەوەی دەسەڵات درێژتر بێت، دەبێتە پاراستنی بەرژەوەندی



گرووپەیەکی دیاریکراو. هەر ئەم هۆیەشە دەبێتە هۆی پێکدادانی بەرژەوەندییەکان، ئەنجامەکەشی شۆڕش و کۆدەتای لێدەکەوێتەوە، بەڵام لەم سەردەمەدا بەهۆی گۆڕانکارییەکانی جیهانییەوە زۆربەی کێشەکان بەشێوەی گفتوگۆ یان لە ڕێگەی هەڵبژاردنەکانەوە چارەسەردەکرێن. هەموو ئەم فاکتەرانە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ کاردەکەنە سەر ئابووری هەمەکیی (Macro Economics). لەبەرئەوە سیاسەتی ئابووری و دارایی حکوومەتەکان دەبێت بەشێوەیەك دابڕێژرێت کە بتوانێت ڕەچاوی گشت بەرژەوەندیەکان بکرێت. ئێستاکە کاتی ئەوە هاتووە بەهۆی چەند نموونەیەکی ڕاستەکییەوە باسەکەی سەرەوە ڕونتر بکەینەوە.

### تەنگەژی سیاسی

تەنگەژی سیاسی و ناسەقامگیری سیاسی و پێکدادان کاریگەری ڕاستەوخۆیان هەیە لەسەر بازاڕی دارایی.

#### - جەنگی کەنداو

لەساڵی (١٩٨٩)دا دەسەڵاتی بەغدا تاقیکردنەوەی لەبواری ئەتۆمیدا دەست پێکرد.

لە (١٩)ی تەمموزی ساڵی (١٩٩٠)دا نزیکەی (٥٠٠) هەزار سەربازی عێراقی سنوری کوێتیان بەزاند و دەوڵەتی کوێتیان داگیرکرد.

لە (١٧)ی کانوونی دووەمی ساڵی(١٩٩١)دا، پرۆسەی جەنگی بیابان ( Desert Storm)، دەستی پێکرد.

لە (٢٧)ی شوباتی ساڵی (١٩٩١)دا سوپای عێراقی بەتەواوەتی تێکشکێنراو دەوڵەتی کوێت ئازاد کرا.

بەهۆی وێنەی ژمارە (٢٣-١) کاریگەری ڕووداوەکانی جەنگی کەنداو لەسەر بازاڕی دراوی جیهانیدا نیشان دەدەین.

وێنەی ژمارە (٢٣-١) نرخی گۆڕینەوەی فرەنکی سویسری بەرامبەر دۆلاری ئەمریکی.




## داگیرکردنی عێراق

(٢١)ی ئازاری ساڵی (٢٠٠٣)

لەسەرەتای هێرشکردنی هێزی سەربازی ئەمریکی و هاوپەیمانان بۆ سەر عێراق، چالاکی بازاڕی دراوی جیهانی (FOREX) سست بوو، نرخی گۆڕینەوەی دۆلار بە دراوەکانی تر لە بەرزبوونەوەدا بوو، چونکە سەرکەوتنی ئەمریکا لەجەنگدا پێشبین دەکرا، جگە لەوەش ڕێژەی هەڵاوسان لەو کاتەدا لە ئەمریکا لە نزمترین ئاستا بوو.

(٢٤)ی ئازاری ساڵی (٢٠٠٣)

لەبازاڕەکانی گۆڕینەوەی دراودا نرخی ئاڵوویری دۆلار بەرامبەر دراوە جیهانیەکان بەرەو نزم بوونەوە دەچوو، چونکە هەواڵەکانی جەنگ لەبەرژەوەندی ئەمریکا نەبوو لەپرۆسەی جەنگدا چەند سەربازێکی ئەمریکی کوژران و چەندان ماشینی سەربازی تانك و زرێ پۆش،... تێك شکێنران، ئەمەش بووە هۆی تۆقاندنی سەرمایەگوزاران، لێکۆڵەروان پێشبینی درێژە کێشانی جەنگیان دەکرد.



(٢٧)ی ئازاری ساڵی (٢٠٠٣)

نرخی گۆڕینەوەی دۆلار بەردەوام لە نزم بوونەوەدا بوو، جگە لەوەش هەواڵەکانی جەنگ لەبەرژەوەندی ئەمریکا و هاوپەیمانان نەبوو، سوپای ئەمریکی بەرەنگاری بەرهەڵستییەکی توندوتیژ بوون لە خواروی عێراقدا. جەنگ زیاتر درێژەی کیشا وەك لەوەی چاوەڕوان دەکرا.

(٣١)ی ئازاری ساڵی (٢٠٠٣)

بەهۆی هەواڵە خراپەکانی گۆڕەپانی جەنگەوە، جگە لە دابەزینی نرخی دۆلار بەڵکو نرخی بۆند و پشك لە بازار و بۆرسەکانی تری جیهانیدا بەرەو نزم بوونەوە دەچوون، مەترسی درێژەکێشانی ماوەی جەنگ هۆی سەرەکی دابەزینی چالاکی گشت بۆرسەکانی جیهان بوون.

(٠٣)ی نیسانی ساڵی (٢٠٠٣)

وتەبێژی فەرمی سوپای ئەمریکا ڕای گەیاند، سەربازەکانی ئەمریکا چەند کیلۆمەترێك لە بەغداوە دوورن، ئەم هەواڵە بوو بە سیگناڵێکی پۆزەتیڤ بۆ بازاڕەکانی ئاڵوێری دراوەکان، بۆرسەکانی تریش چالاك تر بوون ئەمەش بووە هۆی بەرزبوونەوەی نرخی گۆڕینەوەی دۆلار.

لە وێنەکەی خوارەوەدا نرخی گۆڕینەوەی دۆلار لەماوەی جەنگدا لە عێراق نیشان دەدەین.

وێنەی ژمارە (٢٣-٢) نرخی گۆڕینەوەی دۆلار لەکاتی جەنگی عێراقدا لەماوەی مانگی (ئازار و نیسانی) ساڵی (٢٠٠٣).



### - کۆدەتای پوتچییەکان لە روسیا ساڵی (١٩٩١)

رووداوەکانی ئەو کاتەی روسیا بوو بەهۆی دابەزینی نرخی گۆڕینەوەی مارکی ئەڵمانی بەئەندازەی (١٠) پنت لە بازاڕی دراو گۆڕینەوەدا. چونکە ئەو کاتە قەرزە دەرەکییەکانی یەکێتی سۆڤیەت پابەند بوو بە مارکی ئەڵمانیەوە، بەڵام دوای ئەوەی روسیا دانەوەی قەرزە دەرەکییەکانی یەکێتی سۆڤیەتی خستە ئەستۆی خۆی، نرخی گۆڕینەوەی مارك بەرامبەر دراوە جیهانییەکانی دیکە چووەوە دۆخی جارانی خۆی و بەرەو بەرزبوونەوە دەچوو. لە وێنەکەی خوارەوەدا ئەو گۆڕانکارییانە نیشان دەدەین.

وێنەی ژمارە (٢٣-٣) نرخی ئاڵوێری مارکی ئەڵمانی بەرامبەر دۆلاری ئەمریکی.




### جەنگی کۆسەڤە

(٣٠)ی تشرینی یەکەم ساڵی (١٩٩٨)

فڕۆکەکانی بلۆکی ناتۆ چەند جارێك بە ئاسمانی کۆسۆڤەدا سورانەوە.



(١٣)ی تشرینی دووەم ساڵی (١٩٩٨)

بلۆکی ناتۆ نزیکەی (١٧٠٠) سەرباز لە مەکیدۆنیا دادەبەزێنێت، بە مەبەستی ئامادەکاری هێرش کردن.

(٢٤)ی ئازاری ساڵی (١٩٩٩)

بلۆکی ناتۆ کەوتە جێبەجێکردنی قۆناغی یەکەمی هێرشەکەی، ئەوەبوو کەوتە بۆردومان کردنی سێربیاو چیرنۆگۆریا. بەلگراد پەیوەندی دیبلۆماسی لەگەڵ (ئەمریکا، بەریتانیا، فەرەنسا، ئەڵمانیا) راگرت.

(٩)ی حوزەیران ساڵی (١٩٩٩)

پەیمانی وەستاندنی شەڕ لەنێوان بلۆکی ناتۆو سێربیا راگەیاندرا.

(١٠)ی حوزەیران ساڵی (١٩٩٩)

سێربیا دەستی بەکێشانەوەی سەربازەکانی کرد لە کۆسۆڤە، هێزی نەتەوە یەکگرتووەکان چوونە ناو کۆسۆڤەوە. هەموو ئەم رووداوانە بەشێوەیەکی راستەوخۆ کاریان کردە سەر چالاکیەکانی بازاڕی دراوی جیهانی کە بەهۆی وێنەی (٢٣-٤)ەوە نیشانی دەدەین.

وێنەی ژمارە (٢٣-٤) نرخی گۆڕینەوەی یۆرۆ.



### - کلینتۆن و مۆنیکا لیڤیسکی

هەولّەکانی پەیوەندی سێکسی سەرۆك کۆماری ئەمریکا بیل کلینتۆن و مۆنیکا لیڤیسکی بوو بەهۆی دابەزینی نرخی گۆڕینەوەی دۆلار لەبازاڕەکاندا، چونکە کۆنگرێسی ئەمریکی دەستیان کرد بە پرۆسەی لابردنی سەرۆك کۆمار لە پۆستەکەی بەهۆی پێشێلکردنی دەستوور لەلایەن سەرۆك کۆمارەوە. لە وێنەی (٢٣-٥)دا دابەزینی نرخی دۆلار بەرامبەر فرەنکی سویسری بەهۆی ئەو رووداوەوە نیشان دەدەین.

وێنەی ژمارە (٢٣-٥) نرخی گۆڕینەوەی دۆلاری ئەمریکی بەرامبەر فرەنکی سویسری.




### - هێرشی تیرۆریستی بۆ سەر ئەمریکا (١١)ی ئەیلولی (٢٠٠١)

ئەو رووداوە کتوپڕو چاوەڕوان نەکراوە بووە هۆی دابەزینی نرخی ئالوگۆڕی دۆلار بەشێوەیەکی کتوپڕ، جگە لەوەش گەڕەلاوژێ کەوتە بازاڕەکانی دراوی جیهانییەوە تەنانەت



بۆرسەکان داخران و هەموو مامەڵەیەك وەستێنرا. لە وێنەی (٢٣-٦)دا نرخی گۆڕینەوەی دۆلار بەرامبەر یۆرۆ لەو رۆژەدا نیشان دەدەین.




وێنەی ژمارە (٢٣-٦) نرخی گۆڕینەوەی دۆلاری ئەمریکی بەرامبەر یۆرۆ لە (١١)ی سێپتەمبەری ساڵی (٢٠٠١).

### - کوژانەوەی کارەبا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

بەهۆی لە کارکەوتنی ویستگەی کارەبا لە ئەمریکا و کەنەدا، زۆربەی ویلایەتەکانی ئەمریکا کارەبایان بڕا، لەسەرەتاوە گومانی هێرشی تیرۆریستی دەکرا، بەڵام دوایی هەواڵەکان رایان گەیاند کوژانەوەی کارەبا هیچ پەیوەندییەکی بە تیرۆرەوە نییە، بەڵکو تەنها رووداوێکی تەکنیکییە. ئەم رووداو و هەواڵە جیاوازانە بوونە هۆی دابەزینی نرخی دۆلار بەرامبەر یۆرۆ.

**- دەستگیرکردنی سەدام حوسێن**

لە بەرواری (١٥\١٢\٢٠٠٣)دا کاتێك میدیاکان هەواڵی دەستگیرکردنی سەرۆکی کۆنی عێراق (سەدام حوسێن)یان راگەیاند، نرخی دۆلار بەرامبەر دراوەکانی تر بەشێوەیەکی بەرچاو بەرزبۆوە. سەیری وێنەکەی خوارەوە بکە.

وێنەی ژمارە (٢٣-٧) نرخی گۆڕینەوەی دۆلار بەرامبەر یۆرۆ، دەستگیرکردنی سەدام حوسێن.




## تایبەتمەندێتی بازاڕی دراوی جیهانی

جگە لە رووداوە چاوەڕوان نەکراوەکانی کە لەپێشەوە ئاماژەمان پێدان، چەند فاکتەرێکی دیکە کە چاوەڕوان دەکرێت وە دەتوانرێت پێشبین بکرێت بەهەمان شێوە کاردەکەنە سەر نرخی گۆڕینەوەی دراوەکان لە بازاڕی دارایی جیهانیدا. ئەو فاکتەرانەش بریتین لە:



یەکەم:- کۆتایی ساڵی دارایی، ئەم فاکتەرە بەشێوەیەکی راستەوخۆ کار دەکاتە سەر نرخی گۆڕینەوەی دراوەکان، چونکە کۆمپانیاکان دەبێت بە دراوی نیشتمانی باڵانسی بازرگانی و مامەڵەکردنیان پێشکەش بە دەزگای باج و دەزگا حکوومییەکانی پەیوەندیدار بکەن. ئەمەش دەبێتە هۆی زیاد بوونی داوا لەسەر دراوی نیشتمانی، واتە نرخی گۆڕینەوەی دراوی نیشتمانی لەو ماوەیەدا بەرزدەبێتەوە. بۆ نموونە لە ژاپۆن لەساڵێکدا دوو جار کۆتایی ساڵی دارایی هەیە (کۆتایی مانگی ئازار و مانگی ئەیلول). لەو ماوەیەدا گشت کۆمپانیاکانی ژاپۆن دەبێت ئاماری ژمێرکاری (باڵانسی بازرگانی) بە یەن پێشکەش بکەن ئەمەش دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی نرخی یەن. بۆ نموونە پێش بەرواری (٣١\٠٣\٢٠٠٥)، نرخی یەن بەرامبەر دۆلار بریتی بوو لە (١٢٠,٠٢ =1$)، بەڵام لە بەرواری (٣١\٠٣\٢٠٠٥) نرخی یەن بەرامبەر دۆلار بریتی بوو لە (١١٧,٨٠ =1$). سەیری وێنەی (٢٣-٨) بکە.

وێنەی ژمارە (٢٣-٨) نرخی یەن بەرامبەر دۆلاری ئەمریکی (٣١\٠٣\٢٠٠٥).



دووەم:- هەڵبـژاردنی سـەرۆك كۆمـار یـان پەرلـەمان. پرۆسـەی هەڵبـژاردن كاریگـەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر نرخی ئاڵوویری دراوەكان لە بازاڕی دراوی جیهانیدا (FOREX)، بـۆ نموونە ئەگەر سەرۆك كۆماری وڵاتێك بۆ جاری دووەم هەڵبژێردرێتەوە ئـەوا بازاڕەكـانی دارایـی سەقامگیر دەبن و گۆڕانێكی ئەوتۆ بەسەر نرخی گۆڕینەوەی دراوەكاندا نایەت، چونكە مانەوەی هەمان سەرۆك كۆمار واتە نەگۆڕانی ئاڕاستەو بەرنامەی ئابووری، هەڵبژاردنی سەرۆك كۆماری ئـەمریكا بەشـێوەیەكی بەرچـاو كاردەكاتـە سـەر چـالاكیەكانی بـازاڕی دارایـی، هـەروەها هەڵبژاردنەكانی پەرلەمانیش بەهەمان شـێوە كاردەكەنـە سـەر نرخـی گۆڕینـەوە، چـونكە لـە زۆربەی وڵاتە ئەوروپییەكاندا زۆرینەی پەرلەمان حكوومەت دروست دەكەن، پارت و ڕێكخـراوە سیاسییەكان بەرنامەی ئابووری و دارایی خۆیان هەیە بەپێی ئـەو ئایدۆلۆژییـەی كـە پـەیڕەوی دەكەن. بۆیە ئەنجامی هەڵبژاردنەكان بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ كاردەكەنە سەر نرخی گۆڕینـەوەی دراوەكان لە (FOREX).

سێهەم:- جەژنە نەتەوایەتییەكان و ئاینییەكان لەكاتی جەژنەكاندا وەك سەری ساڵ، لەدایك بوونی عیسا،...هتد. بازاڕی دارایـی و بۆرسـەكان كارناكـەن بۆیـە گۆڕانكاریـەكی ئـەوتۆ لـە گۆڕینەوەی نرخی دراوەكان بەدی ناكرێت، سەیری خشتەی ژمارە (٢٢-٦) بكە.

چوارەم:- گەشتوگوزار و پشوودانی درێژخایەن. لە وەرزی هاویندا زۆربەی زۆری كارمەنـدان و جامبازەكانی بازاڕی دارایـی و بۆرسـەكان بـەهۆی پـشووی سـالانەوە گەشـتوگوزار دەكـەن، ئەمەش دەبێتە هۆی كەم بوونەوەی چالاكی لە بازاڕی دارایـدا، بـەلاَم پـارە بـازان ئـەم كاتانـە بەكاردەهێنن بۆ دەستكەوتی قازانجی زۆرتر.

پێنجـەم:- كۆبوونـەوەی حـەوت وڵاتـە گەورەكـەی جیهـان (G7). كۆبوونـەوەی وڵاتـە گەورەكانی جیهان كاریگەری ڕاستەوخۆیان هەیە لەسـەر بـازاڕی دارایـی جیهـان، چـونكە لـە كۆبوونەوەكاندا جگە لە بڕیارە سیاسییەكان، بڕیاری ئابووری و دارایش دەدرێت. بۆ نموونـە لـە كۆبوونەوەی وڵاتە گەورەكان لە بەرواری (٢٢\٠٩\٢٠٠٣)دا، نرخی گۆڕینەوەی دۆلار بەخێرایی دابەزی و نزم بۆوە بەرامبەر دراوەكانی تر، بەتایبـەتی بەرامبـەر یـەنی ژاپـۆنی. چـونكە لـەو كۆبونەوەیەدا بڕیاردرا كە بانكە ناوەندییەكان دەخالەت لە مامەڵەكردنی گۆڕینـەوەی دراوەكـان نەكەن، بەتایبەتی ژاپۆن و چین، بەڵكو ئەم كارە بەجێ بهێڵن بۆ بازاڕ خۆی. دوای ئـەو هەواڵـە نرخی دۆلار بەرامبەر یەن بە بڕی (٢٠٠) پنت نزم بۆوە.

# فەسڵی بیست و چوار

## سیاسەتی دارایی و دەزگا داراییەکان

لەم فەسڵەدا هەوڵ دەدەین بەشێوەیەکی چڕوپڕ باس لە ئینستیتوت و دەزگا و ئۆرگانە داراییەکانی حکوومەت بکەین، وە هەروەها باس لەپێکهاتەی ئەو دەزگایانە و شێوەی کارکردن و ئەرك و ئامانجەکانیان دەکەین. وە باس لە کاریگەرییان لەسەر بازاڕی دارایی جیهانی دەکەین، بەشێوەیەکی گشتی باس لە دام و دەزگا داراییەکانی ولاّتانی (ئەمریکا، بەریتانیا، ژاپۆن، سویسرا، یەکێتی ئەوروپا، کەنەدا، ئوستراليا) دەکەین، چونکە ئەم ولاّتانە بەشدارگەی چالاکی بازاڕی دراوی جیهانین وە دراوەکانیان بە دراوە زیندووەکانی جیهانی دەژمێردرێت. هەروەها باس لە یاسای داوا و خستنەڕوو کاریگەرییان لەسەر نرخی ئاڵوێری دراوەکان دەکەین.

### بانکی ناوەندی و وەزارەتی دارایی وەك گرنگترین دەزگای دارایی

ئەرکە سەرەکییەکانی وەزارەتی دارایی بریتییە لە داڕشتنی بودجەی گشتی، وە هەروەها کۆنترۆڵکردنی جێبەجێ کردنی بودجە. واتە چاودێرکردنی خەرجییەکانی بودجە. بەلاّم ئەرکە سەرەکییەکانی بانکی ناوەندی بریتییە لە داڕشتنی سیاسەتی نەختینەیی و دیاریکردنی ڕێژەی سوودی قەرز و چاپکردنی پارە و دانەوەی قەرزە دەرەکیەکانی حکوومەت. بانکە ناوەندییەکان بەشێوەیەکی گشتی حکوومین، بەلاّم لە هەندێ ولاّت حکوومەت خاوەنی بانکی ناوەندی نییە، بەڵکو پریڤاتن (تایبەتین) وەك لە (ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئیتاليا، سویسرا)، یان حکوومەت خاوەنی بەشێکێتی وەك لە بەلجیکا پشکی حکوومەت بریتییە لە (٥٠٪)، لە ژاپۆن پشکی حکوومەت بریتییە لە (٥٥٪). لە هەموو حاڵەتێکدا بانکی ناوەندی ئەرکەکانی حکوومەت بەڕێوە دەبات وە حکوومەت کۆنترۆڵی دەکات بەپێی یاسا. وەزارەتی دارایی و بانکی ناوەندی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەتوانن کار بکەنە سەر بازاڕی دارایی، جگە لەوەش دەتوانن بەشێوەیەکی چالاك کاربکەنە سەر ئابووری هەمەکیی. سەقامگیری دراوی نیشتیمانی ڕاستەوخۆ لە ئەستۆی بانکی ناوەندیدایە.



### دەزگای دارایی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

سیستەمی گەنجینەیی فیدراڵی(FEDERAL RESERVE SYSTEM- Fed. FRS)

دەستەی بەڕێوەبەرایەتی ئەم دەزگایە لە حەوت کارمەند پێکهاتووە. سیستەمی گەنجینەیی فیدراڵی لە ساڵی (١٩١٣)دا دامەزراوە. لەسەرەتاوە دوانزە سیستەمی گەنجینەیی دامەزرێنرا بەجۆرێك گشت ویلایەتەکانی پێکەوە دەبەستەوە ئەو ویلایەتانەی سیستەمی گەنجینەیی تیادا دامەزرێنرا بریتی بوون لە ویلایەتەکانی ( Boston- NY- Philadelphia- Cleveland- Richmond- Atlanta- Chicago- St. Louis- Minneapolis-KansasCity- Dallas- St.Francisco). ئەمڕۆکە بەشدارگەکانی هەموو کەس و کەرتی تایبەتن هیچ پشکێکی حکوومەتی تێدا نییە. ئامانجی سەرەکی ئەم دەزگایە بریتییە لە چاودێرکردن و ڕێکوپێك کردنی جموجۆڵی دارایی لە ناوخۆ و دەرەوەی ئەمریکا.

دەستەی بەڕێوەبردن لەلایەن سەرۆك کۆمارەوە دادەنرێت بەڕەزامەندی پەرلەمان ئەم کارمەندانە بۆ ماوەی (١٤) ساڵ هەڵدەبژێرێن. سیستەمی گەنجینەیی فیدراڵی لە سێ بەشی سەرەکی پێکهاتووە:

١- کۆمیتەی باڵای بەڕێوەبردن.

٢- کۆمیتەی ڕاوێژکاری فیدراڵی.

٣- کۆمیتەی فیدراڵی بۆ بەڕێوەبردنی بازاڕ ( Federal Open Market Committee- FOMS)

کۆمیتەی فیدراڵی بۆ کاروباری بازاڕی دارایی بەشێوەیەکی گشتی سیاسەتی نەختینەیی و ڕێژەی سوودی قەرز دادەڕێژێت هەشت جار لەساڵێکدا. لەخشتەکەی خوارەوەدا گۆڕانکاری لە ڕێژەی سوودی قەرز لەساڵی (١٩٩٠) نیشان دەدەین.

خشتەی ژمارە (٢٤-١) دینامیکی گۆڕانکاری ڕێژەی سوودی قەرز لەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ساڵی (١٩٩٠-٢٠٠٣).

| Change (basis points) | | | |
|---|---|---|---|
| Date<br>بەروار | Increase<br>بەرزبوونەوە | Decrease<br>نزمبوونەوە | Level (percent)<br>ئاستی ڕێژەی سەدی |
| ٢٠٠٣ | | | |
| ٠٦\٢٥ | – | ٢٥ | ١,٠٠ |
| ٢٠٠٢ | | | |
| ١١\٠٦ | – | ٥٠ | ١,٢٥ |
| ٢٠٠١ | | | |
| ١٢\١١ | – | ٢٥ | ١,٧٥ |
| ١١\٠٦ | – | ٥٠ | ٢,٠٠ |
| ١٠\٠٢ | – | ٥٠ | ٢,٥٠ |
| ٠٩\١٧ | – | ٥٠ | ٣,٠٠ |
| ٠٨\٢١ | – | ٢٥ | ٣,٥٠ |
| ٠٦\٢٧ | – | ٢٥ | ٣,٧٥ |
| ٠٥\١٥ | – | ٥٠ | ٤,٠٠ |
| ٠٤\١٨ | – | ٥٠ | ٤,٥٠ |
| ٠٣\٢٠ | – | ٥٠ | ٥,٠٠ |
| ٠١\٣١ | – | ٥٠ | ٥,٥٠ |
| ٠٣\٠٣ | – | ٥٠ | ٦,٠٠ |
| ٢٠٠٠ | | | |



| | | | |
|---|---|---|---|
| ٠٥\١٦ | ٥٠ | – | ٦,٥٠ |
| ٠٣\٢١ | ٢٥ | – | ٦,٠٠ |
| ٠٢\٠٢ | ٢٥ | – | ٥,٧٥ |
| ١٩٩٩ | | | |
| ١١\١٦ | ٢٥ | – | ٥,٥٠ |
| ٠٨\٢٤ | ٢٥ | – | ٥,٢٥ |
| ٠٦\٣٠ | ٢٥ | – | ٥,٠٠ |
| ١٩٩٨ | | | |
| ١١\١٧ | – | ٢٥ | ٤,٧٥ |
| ١٠\١٥ | – | ٢٥ | ٥,٠٠ |
| ٠٩\٢٩ | – | ٢٥ | ٥,٢٥ |
| ١٩٩٧ | | | |
| ٠٣\٢٥ | ٢٥ | – | ٥,٥٠ |
| ١٩٩٦ | | | |
| ٠١\٣١ | – | ٢٥ | ٥,٢٥ |
| ١٩٩٥ | | | |
| ١٢\١٩ | – | ٢٥ | ٥,٥٠ |
| ٠٧\٠٦ | – | ٢٥ | ٥,٧٥ |
| ٠٢\٠١ | ٥٠ | – | ٦,٠٠ |
| ١٩٩٤ | | | |
| ١١\١٥ | ٧٥ | – | ٥,٥٠ |
| ٠٨\١٦ | ٥٠ | – | ٤,٧٥ |
| ٠٥\١٧ | ٥٠ | – | ٤,٢٥ |
| ٠٤\١٨ | ٢٥ | – | ٣,٧٥ |
| ٠٣\٢٢ | ٢٥ | – | ٣,٥٠ |
| ٠٢\٠٤ | ٢٥ | – | ٣,٢٥ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١٩٩٢ | | | |
| ٠٩\٠٤ | - | ٢٥ | ٣,٠٠ |
| ٠٧\٠٢ | - | ٥٠ | ٣,٢٥ |
| ٠٤\٠٩ | - | ٢٥ | ٣,٧٥ |
| ١٩٩١ | | | |
| ١٢\٢٠ | - | ٥٠ | ٤,٠٠ |
| ١٢\٠٦ | - | ٢٥ | ٤,٥٠ |
| ١١\٠٦ | - | ٢٥ | ٤,٧٥ |
| ١٠\٣١ | - | ٢٥ | ٥,٠٠ |
| ٠٩\١٣ | - | ٢٥ | ٥,٢٥ |
| ٠٨\٠٦ | - | ٢٥ | ٥,٥٠ |
| ٠٤\٣٠ | - | ٢٥ | ٥,٧٥ |
| ٠٣\٠٨ | - | ٢٥ | ٦,٠٠ |
| ٠٢\٠١ | - | ٥٠ | ٦,٢٥ |
| ٠١\٠٩ | - | ٢٥ | ٦,٧٥ |
| ١٩٩٠ | | | |
| ١٢\١٨ | - | ٢٥ | ٧,٠٠ |
| ١٢\٠٧ | - | ٢٥ | ٧,٢٥ |
| ١١\١٣ | - | ٢٥ | ٧,٥٠ |
| ١٠\٢٩ | - | ٢٥ | ٧,٧٥ |
| ٠٧\١٣ | - | ٢٥ | ٨,٠٠ |

A basis is 1\100 percentage point

سەرچاوە: http://www.federalreserve.gov/foms/fundsrate.htm

**دەزگای کۆکردنەوەی ئامارەکان** ( Beige Book )

دەزگای کۆکردنەوەی ئامارەکان یەکێکە لە ئۆرگانە گرنگەکانی کەرتی ئابووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. ئەم دەزگایە هەرچ ئامارێك پەیوەندی بە کەرتە ئابووری و



داراییەکانەوە هەیە کۆی دەکاتەوە، دوای گەلاڵەکردن و پۆلێن کردنیان و شرۆڤەکردنیان بلاّودەکرێتەوە. هەر دوانزە سیستەمی گەنجینەیی و کۆمیتەکانیان بەشداری دەکەن لە کۆکردنەوەی ئامارەکان. ئەوەی شایانی باسە ئەو ئامارانە هەشت جار لەساڵێکدا بلاّودەکرێنەوە لەخشتەکەی خوارەوەدا.

| **ساڵی ٢٠٠٤** | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| January 27/28 | | March 16 | | May 4 | June 29/30 |
| | August 10 | September 21 | October 10 | | December 14 |

سەرچاوە: http://www.federalreserve.gov/fomc/#calendars

بۆرسەکانی ئەمریکا و بۆرسە جیهانییەکانی دیکەش زۆر بەوردی چاودێری ئامارە بلاّوکراوەکان دەکەن، چونکە ئەم ئامارانە بەشێوەیەکی راستەوخۆ کاردەکەنە سەر نرخی ئالۆویێری دراوەکان و نرخی پشك و شەیری سەند و قەوالّەکانیش. خالێکی گرنگ کە دەمەوێت ئاماژەی پێبدەم، ئەویش ئەوەیە بەپێی یاسا سەرۆکی سیستەمی گەنجینەی فیدراڵی دووجار لەساڵێکدا دەبێت لە بەردەم کۆنگرێسدا پلان و بەرنامەی سیاسەتی دارایی پێشکەش بکات. لە وەرزی هاوین و زستاندا. ئاخافتەکانی کۆنگرێس دەربارەی بارودۆخی دارایی کاریگەری راستەوخۆ دەکەنە سەر بازاڕی دراوی جیهانی.

بۆ نموونە گۆتاری سەرۆکی سیستەمی گەنجینەی فیدراڵی (Alan Greenspan). لە بەرواری (٢٠٠٣\٠٧\١٥)دا لەبەردەم کۆنگرێسی ئەمریکادا (The Senate House). بەهۆی بەرزبوونەوەی نرخی گۆڕینەوەی دۆلار بەرامبەر دراوە جیهانییەکان بەتایبەتی بەرامبەر یۆرۆ و جونەیهی ستەرلینی. لە وێنەکەی خوارەوەدا نرخی گۆڕینەوەی دۆلار بەرامبەر یۆرۆ دوای ئاخافتنەکەی سەرۆکی سیستەمی گەنجینەی فیدراڵی نیشان دەدەین.

وێنەی ژمارە (٢٤-١) نرخی گۆڕینەوەی دۆلار بەرامبەر یۆرۆ دوای ئاخافتنی سەرۆکی سیستەمی گەنجینەی فیدراڵی.




## - دەزگای دارایی بەریتانیا

بانکی ئینگلتەرا (BANK OF ENGLAND- BOG)

بانکی ئینگلتەرا یەکێکە لە دەزگا داراییە گرنگەکانی بەریتانیا. دەستەی بەڕێوەبردنی ئەم ئۆرگانە بریتییە لە (٩) کارمەند. کە بۆ ماوەی پێنج ساڵ هەڵدەبژێرێن. هەرە کۆمێتەی گرنگی ئەم دەزگایە کۆمێتەی بەڕێوەبردنی سیاسەتی داراییە ( Monetary Policy committee-MPC). کۆمێتەی بەڕێوەبردنی سیاسەتی دارایی کۆمیتەیەکی سەربەخۆیە و ئازادە لە بڕیارەکانیدا سەرۆکی ئەم کۆمیتەیە (Mervyn Ahhister King). یەکێکە لە باشترین پسپۆڕی دارایی جیهانی.



بانکی ئینگلتەرا یەکێکە لە هەرە بانکە دێرینەکانی جیهان لە کۆتایی سەدەی هەڤدەهەم دامەزراوە، لە ئەنجامی گرێ بەستێك لەنێوان حکوومەتی بەریتانی و چەند سەنتەرێکی دارایی. چونکە ئەو کاتە حکوومەت بە تەواوەتی ناپوت بوو. هەر لە ساڵی (١٦٩٠)ەوە سیستەمی بانکی بەریتانی تەنها هەڵدەستا بە دانی قەرز وە وەرگرتن و گەنجینەکردنی سپاردە بە زێڕ، تەنها لە ساڵی (١٨٤٤)دا ئەو بانکە متمانەی چاپکردنی پارەی پێ سپێردرا. بانکی ئینگلتەرا رۆڵی بانکی ناوەندی بەریتانیا دەبینێت. لە ساڵی (١٩٤٦)دا خۆماڵی کرا. بانکی ئینگلتەرا لە کاروبار و بڕیارەکانیدا سەربەخۆیە. هەرچی جموجۆڵی دارایی و نەختینەییە لەلایەن ئەم بانکەوە کۆنترۆڵ دەکرێت.

## دەزگای دارایی ژاپۆن

بانکی ژاپۆن (BANK OF JAPAN- BOJ)

بانکی ژاپۆن یەکێکە لە دەزگا گرنگەکانی کاروباری دارایی، ئەم بانکە لەلایەن کۆمێتەیەکەوە بەڕێوەدەبرێت کە پێکهاتووە لە (٩) ئەندام بۆ ماوەی پێنج ساڵ هەڵدەبژێرێن. بانکی ژاپۆن تەنها لەساڵی (١٩٩٨)دا سەربەخۆیی لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانیدا وەرگرت، پێشتر لە سیستەمی وەزارەتی دارایدا بوو. بانکی ژاپۆن رۆڵی بانکی ناوەندی دەبینێت ئەرکە سەرەکیەکانی کۆنترۆڵ کردن و دارشتنی سیاسەتی نەختینەییە کە بەشێوەیەکی زۆر چالاك بەشداری و تەداخول دەکات لەبازاڕی گۆڕینەوەی دراودا بۆ پشتگیری لە نرخی گۆڕینەوەی یەن. ئەم ئۆرگانە هەر سێ مانگ جارێك راپۆرتی خۆی بلاّو دەکاتەوە کە ناسراوە بە ( TAN KAN). لەم راپۆرتەدا بەشێوەیەکی چڕوپڕ ئاماری بارودۆخی ئابووری گشت کەرتە ئابوورییەکان بلاّودەکرێتەوە.

## دەزگای دارایی سویسرا

بانکی نیشتیمانی سویسرا (SWISS NATIONAL BANK)

بانکی نیشتیمانی سویسری (SNB) یەکێکە لە بانکە ناوەندییە بەهێز و چالاکەکانی جیهان، بە جۆرێك کە بەشێوەیەکی راستەوخۆ بەشداری لە مامەڵەکردنی گۆڕینەوەی دراوەکان لە بازاڕی دراوی جیهانیدا ناکات. ئەم بانکە لەلایەن لیژنەیەکەوە بەڕێوە دەچێت کە پێکهاتووە

له (٣) ئەندام. سەرۆکی ئەو لیژنەیە (Jean-Pierre Roth)، یەکێکە لە باشترین پسپۆڕی دارایی جیهانی بۆیە لەهەمان کاتدا سەرپەرشتی سندوقی دراوی نێودەوڵەتی لە سویسرا دەکات. بانکی نیشتمانی سویسرا بەشێوەیەکی ورد و درشت چاودێری لە نرخی ئاڵوێری فرەنکی سویسری و یۆرۆ (EUR/CHF) دەکات.

جگە لەوەش هەڵدەستێت بە داڕشتنی سیاسەتی دارایی و نەختینەیی هەروەها بانکی نیشتیمانی سویسری بەشێوەیەکی سیستێماتیکی لەشێوەی راپۆرتی ئابووریدا رێژە و بڕی هەڵاوسانی نرخی دراوە جیهانییەکان بلاّودەکاتەوە ئەو راپۆرتە بەناوی ( LIBOR-London Interbank Offered Rats) ناسراوە کە هەر سێ مانگ جارێك بلاّودەکرێتەوە.

## دەزگای دارایی یەکێتی ئەوروپا

بانکی ناوەندی ئەوروپا (EROPEAN CENTRAL BANK)

دەستەی باڵای بەڕێوەبردنی بانکی ناوەندی ئەوروپا بۆ ماوەی هەشت ساڵ لەلایەن سەرۆکی وەزیرانی یەکێتی ئەوروپاوە هەڵدەبژێرێن کە بریتین لە شەش ئەندام. لە بەرواری (١\١١\٢٠٠٣) سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبەرایەتی بانکی ناوەندی ئەوروپا ( Jean Claude Trichet) کە یەکێکە لە پسپۆڕە شارەزاکانی دارایی جیهانی. جگە لەو دەستەیە کۆمیتەی باڵای بانکی ناوەندی لە دوانزە ئەندامی تر پێکهاتوون کە بریتین لە سەرۆکی بانکە ناوەندییەکانی ناوچەی یۆرۆ، ئەو دوانزە ئەندامەش بریتین لە:

- (Guy Quaden) سەرۆکی بانکی نیشتیمانی بەلجیکا.
- (Ernst Welteke) سەرۆکی بانکی ناوەندی ئەڵمانیا.
- (Nicholas C. Garganasn) سەرۆکی بانکی ناوەندی یۆنان.
- (Jaime Caruana) سەرۆکی بانکی ناوەندی ئیسپانیا.
- (Christian Noyer) سەرۆکی بانکی ناوەندی فەرەنسا.
- (John Hurley) سەرۆکی بانکی ناوەندی ئیرلەندا.
- (Antonio fazio) سەرۆکی بانکی ناوەندی ئیتالیا.
- (Yves Mersch) سەرۆکی بانکی ناوەندی لۆکسمبورگ.
- (Nout Wellink) سەرۆکی بانکی ناوەندی هۆڵەندا.
- (Klaus Liebscher) سەرۆکی بانکی نیشتیمانی نەمسا.



- (Vitor Manuel Ribeiro ) سەرۆکی بانکی ناوەندی پورتوگال.
- (Matti Vanhala) سەرۆکی بانکی فینلەندا.

جگەلە ئەندامانی ناوچەی یۆرۆ، ئەندامەکانی تری یەکێتی ئەوروپا بەشداری لە کۆبونەوەکانی بانکی ناوەندی ئەوروپا دەکەن. ئەرکە سەرەکییەکانی ئەم بانکە بریتییە لە داڕشتنی سیاسەتی دارایی ناوچەی یۆرۆ بە هەمە ئاهەنگی لەگەڵ وەزارەتەکانی دارایی، هەروەها دیاریکردنی رێژەی سوودی قەرز و چاپکردنی پارە. بڕیارەکانی بانکی ناوەندی ئەوروپا لەلایەن بانکە ناوەندیەکانی ناوچەی یۆرۆوە دەبێت جێبەجێ بکرێت. ئەم ئۆرگانە تا رادەیەك دەزگایەکی سەربەخۆیە وە بەشێوەیەکی راستەوخۆ بەشداری ناکات لە بازاڕی دراوی جیهانیدا. بێگومان پێکهاتە و کارەکانی بانکی ناوەندی ئەوروپا یەکەم ئەزموونە لە سیستەمی دارایی جیهاندا. تاکو ئێستا لە جێبەجێ کردنی کارەکانیدا سەرکەوتووە. ئەوەتا رۆژ بەڕۆژ (یۆرۆ) نرخەکەی لەچاو دراوەکانی دیکەدا بەرز دەبێتەوە.

## دەزگای دارایی کەنەدا

بانکی کەنەدا (BANK OF CANADA)

دەستەی باڵای بەڕێوەبردنی بانکی کەنەدا بۆ ماوەی (٧) ساڵ هەڵدەبژێرێن، کە پێکهاتوون لە شەش ئەندام. ئەم دەزگایە سەربەخۆیی تەواوی هەیە لە داڕشتن و دیاریکردنی سیاسەتی دارایی و بڕی رێژەی قەرز. تایبەتێتی بانکی کەنەدا لەوەدایە کە بەشێوەیەکی تووندوتۆڵ بەستراوە بەسیستەمی گەنجینەیی ئەمریکاوە. بانکی کەنەدا هەندێ جار بۆ پشتگیری کردن لە دۆلاری کەنەدی بەشداری راستەوخۆ دەکات لە بازاڕی ئاڵوێری دراوەکاندا.

## دەزگای دارایی ئوستراليا

بانکی گەنجینەیی ئوستراليا

(RESERVE BANK OF AUSTRALIA- RBA)

دەستەی باڵای بەڕێوەبردنی بانکی گەنجینەیی ئوستراليا لە (٥) ئەندام پێکهاتووە. کە بۆ ماوەی حەوت ساڵ هەڵدەبژێرێن. ئەم دەزگایە بە هەمە ئاهەنگی لەگەڵ وەزارەتی دارایی سیاسەتی دارایی و رێژەی سوودی قەرز دادەڕێژن، جگە لەوەش چاودێری هەڵاوسانی نرخ دەکەن و بەشێوەیەکی راستەوخۆ بەشداری ناکات لە بازاڕی دراوی جیهانیدا.

## ڕێکخراوە داراییە جیهانی و ناوچەییەکان

سندوقی دراوی نێودەوڵەتی (International Monetary Fund)

ناودارترین ڕێکخراوی ئابووری نێودەوڵەتییە لەئەنجامی کۆنگرەی (بریتون_وودز)، دامەزرا بۆ کاروباری پەیوەندی نەختی نێودەوڵەتان. بارەگای سەرەکی ئەم ڕێکخراوە لە واشنتۆنە ئێستاکە (١٨٥) وڵات ئەندامن لەم ڕێکخراوەدا، پشکی گەورەی ئەم ڕێکخراوە ئەمریکا پێکی دەهێنێت. بڕی پشك لەم ڕێکخراوەدا زۆر گرنگە، چونکە دەنگدانی ئەندامەکان و بەڕێوەبردنی سندوقەکە بەپێی بڕی پشکەکانیان بەڕێوە دەچێت. بێجگە لەوەی قەرز وەرگرتن لەم سندوقە بەپێی بڕی پشکەکان دیاری دەکرێت. هەندێ لە ئابووریناسان چالاکی ئەم سندوقە بە ئامرازێکی یارمەتیدەر دادەنێن بۆ بوژانەوەی ئابووری ولاتە تازە پێشکەوتووەکان. بەلاّم هەندێکی تر بەپێچەوانەوە چالاکی سندوقی دراوی نێودەوڵەتی بە دەست تێوەردان دادەنێن لە کاروباری ئابووری ولاتە تازە گەشەکردووەکان بەجۆرێك ئەو ولاّتانە دەخەنە ژێر قەرز و قوڵەوە بەڕێژەیەکی بەرزی سوودی قەرزدانەوە (نووسەریش هەمان بۆچوونی هەیە).

ئامانجە سەرەکیەکانی سندوقی دراوی نێودەوڵەتی بریتییە لە:

١- دامەزراندنی دەزگایەکی نێودەوڵەتی بۆ چارەسەرکردنی گرفتی نەختینەیی نێودەوڵەتان.

٢- هەوڵ دەدات نرخی گۆڕینەوەی دراو بە دراو لەنێوان دەوڵەتەکاندا لەنگەر بگرێ، دەوڵەتان سیاسەتی نرخی داشکاندنی دراو نەخەنە کار.

٣- بەشداری کردن لە پەرەپێدانی بازرگانی نێودەوڵەتیدا.

٤- ئاسانکردنی ئاڵوویری دراو لەنێوان ئەندامەکانیدا.

٥- دانی قەرز بە ولاّتانی ئەندام بۆ چارەسەرکردنی کورتهێنانی بودجە.

بانکی ئاوەدانکردنەوە و پەرەپێدانی دەوڵەتان

(The International Bank for Reconstruction and Development)

بانکی ئاوەدانکردنەوە و پەرەپێدانی دەوڵەتان دووەم ڕێکخراوی ئابوورییە کە لەناو سیستەمی بانکی جیهانیدا لەساڵی (١٩٤٥) دامەزراوە. ئەندامەکانی بریتین لە (١٨٤) ولاّت. تاکو ئێستاکە ئەم بانکە بڕی (٣٧١) ملیارد دۆلاری ئەمریکی بەقەرز داوە بە ولاّتەکانی ئەندام.



بانکی ئاوەدانکردنەوەو پەرەپێدانی دەوڵەتان وەکو دەزگایەکی دارایی بەوێنەی بانکێکی ئاسایی لەنێوان دەوڵەتاندا ئیشی خۆی دەکات و قەرزو متمانە بە ولاّتە ئەندامەکانی دەبەخشێت هەریەکە بەپێی پشکی خۆی لەسەرمایەی بانکەکە قەرز و متمانەی بەردەکەوێت.

ئامانجە سەرەکییەکانی بانکی ئاوەدانکردنەوە و پەرەپێدانی دەوڵەتان بریتین لە:

١- فەراهەم کردنی سەرمایەی وەبەرهێنەکی بۆ کاروباری ڕەنیوهێنەکی و بوژاندنەوەی ئابووری لەو دەوڵەتانەدا کە جەنگ وێرانی کردوون.

٢- هاندانی سەرمایەگوزاری بیانی دەدات کە قەرزەکان دەسەبەر دەکات یان بەشداری تێ دەکات.

٣- بەشداری کردن لە پارەدان بۆ ئەو پرۆژانەی دەبنە هۆی بووژانەوەی ژێرخانی ئابووری.

٤- لە بەئەنجامدانی بووژانەوەی ئابووری لە دەوڵەتە تازە پێگەشتووەکاندا بەشداری دەکات بۆ ئەوەی ڕادەی دەستهاتی میللیان بەرز بکاتەوە بۆ ئەمەش کۆمەکی هونەری و دارایی پێشکەش دەکات.

بانکی ئاوەدانکردنەوە و پەرەپێدانی دەوڵەتان چەند مەرجێکی گرنگی داناوە بۆ قەرز وەرگرتن لەوانە:

١- دەوڵەتە قەرزکەرەکە توانای قەرزدانەوەی هەبێت.

٢- ئەو پرۆژەیەی کە قەرزەکەی بۆ دەکرێت لە ڕووی ئابوورییەوە بە سوود و گرنگ بێت.

٣- ئەو پرۆژەو کەرتەی قەرزی بۆ دەکرێت لە برگە گرنگەکانی پێشەوەی نەخشەی بووژانەوەی ئەو ولاّتەدا بێت.

**- یانەی پاریس**

یانەی پاریس بریتییە لە ڕێکخراوێکی نافەرمی ولاّتە پیشەسازییە پێشکەوتووەکانە دەربارەی قەرزەکانی ولاّتە قەرزدارەکان دەکۆڵێتەوە کە ناتوانن لەکاتی خۆیدا قەرزەکانیان بدەنەوە. ئەم یانەیە لە کۆتایی ساڵی (١٩٥٦)دا دامەزراوە. لەو ساڵەدا ولاّتی ئەرجەنتین نەیدەتوانی لەکاتی خۆیدا قەرزەکانی بداتەوە بانگیان کرد بۆ پاریس بۆ گفتوگۆکردن دەربارەی درێژ کردنەوەی ماوەی قەرزدانەوەکەی دوای ئەم ڕووداوە ناوی (یانەی پاریس) پەیدابوو. لەبەر نەگەڕانەوەی قەرز لەکاتی خۆیدا لەلایەن هەندێ ولاّتەوە لەکاتی کۆبوونەوەی ئەم یانەیەدا نوێنەرانی بانکی جیهانی و سندوقی دراوی نێودەوڵەتی بەشداری دەکەن.

- **یانەی لەندەن**

ئەرکی سەرەکی یانەی لەندەن لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی قەرزە دەرەکییەکانی وڵاتە قەرزدارەکانە. وە هەروەها چاودێری سیاسەتی قەرز و دارایی و رێژەی سوودی قەرزی وڵاتە قەرزدارەکان دەکات. هەندێ جار لەبەر رۆشنایی و پێشنیاری ئەم یانەیە، هەشت وڵاتە گەورەکەی جیهان برێ لە قەرزی دەرەکی هەندێ وڵات دەسڕنەوە بۆ نموونە دوای رمانی رژێمی سەدام لە عێراق زۆربەی وڵاتەکانی جیهان بەتایبەتی هەشت وڵاتە گەورەکە بڕی (٨٠٪)ی قەرزەکانی حکوومەتی عێراقیان سڕییەوە.

**رێکخراوی بازرگانی جیهانی** ( World Trade Organization )

رێکخراوی بازرگانی جیهانی (WTO). لە بەرواری (٠١\٠١\١٩٩٥)دا دامەزرا. ئەمڕۆکە ئەندامەکانی بریتین لە (١٤٨) وڵات. بودجەی ئەم رێکخراوە بریتییە لە (١٣٤) ملیۆن فرەنکی سویسری. بەڕێوەبەری گشتی هەڵبژێردراوی ئەم رێکخراوە بەڕێز (Supachai Panitchpakdi).

رێکخراوی بازرگانی جیهانی شوێنگەی رێکەوتنامەی گشتی بازرگانی و تاریفەی گومرگی ( گات-GATT).

رێکخراوی بازرگانی جیهانی رێکخراوێکی نێودەوڵەتییە بایەخ بە رێکخستنی بازرگانی دەدات لەنێوان وڵاتانی ئەندام و خۆی لە خۆیدا بووە بە مونتەدایەك بۆ دانوستان و گفتوگۆی هەمەلایەنانە، بەشێوەیەکی بنەڕەتیش ئەرکی پیادەکردنی رێکەوتنامەی (ئۆرۆگوای) پێ سپێدراوە. ئەم رێکخراوە لەم لیژنەو بەشانەی خوارەوە پێکهاتووە:

١- کۆنگرەی وەزاری: ئەو کۆنگرەیە وەزیرانی بازرگانی وڵاتانی ئەندام دەگرێتە خۆی وە بە لوتکەی دەسەڵات دادەنرێت لە رێکخراوەکەدا. ئەم کۆنگرەیە دوو ساڵ جارێك کۆدەبێتەوە.

٢- ئەمینداریێتی گشتی: لە بەڕێوەبەری گشتی رێکخراوی بازرگانی نێودەوڵەتی و ژمارەیەك فەرمانبەر پێکدێت کە بە تەواوەتی سەربەخۆن لە راپەڕاندنی کارەکانیاندا.

٣- ئەنجوومەنی گشتی: نوێنەرانی وڵاتانی ئەندام دەگرێتە خۆی بەلای کەمەوە لەماوەی مانگێکدا کۆبوونەوەیەك دەبەستێ.

٤- ئەنجوومەنە سەرەکییەکان:

- ئەنجوومەنی بازرگانی کردن بە کەل و پەل کە چەند لیژنەیەك دەگرێتە خۆی، لەوانە لیژنەی کشتوکاڵ، خۆپاراستن و چاودێرکردن، لیژنەی مومارەسە کردن دژی دابەزینی رێژەی گومرگ.



- ئەنجوومەنی بازرگانی خزمەتگوزارییەکان: ئەم ئەنجوومەنە سەرپەرشتی چەند گرووپێك دەکات. لەوانە، گرووپەی دانوستان دەربارەی پەیوەندییەکان و لیژنەی بازرگانی خزمەتگوزارییە بانکییەکان.

- ئەنجوومەنی مافەکانی موڵکداری فیکری: کە بایەخ بەکێشەی لایەنە پەیوەندیدارەکان بەمافەکانی موڵکداری فیکری دەدات ئەوانەی پەیوەندییان بە بازرگانییەوە هەیە.

٥- لیژنە فەرعیەکان (لابەلاکان) کە لە چوار لیژنە پێك دێت:

- لیژنەی بازرگانی ژینگە: کە بایەخ بە لێکۆڵینەوەی کاریگەری بازرگانی دەدات بۆ سەر ژینگە.

- لیژنەی بازرگانی و گەشەکردن: بایەخ بە جیهانی سێ و ئەو وڵاتانە دەدات کە کەمتر لە گەشەسەندندان.

- لیژنەی بەربەستە سەپێنراوەکان بۆ چەند مەبەستێك کە پەیوەندییان بە تەرازووی پێدانەوە هەیە.

- لیژنەی بودجەی دارایی و بەڕێوەبردن کە سەرپەرشتی مەسەلە نێوخۆییەکانی رێکخراوەکە دەکات.

ئامانجە سەرەکیەکانی رێکخراوی بازرگانی جیهانی هەوڵی دۆزینەوەی یانەیەك دەدات بۆ گفتوگۆ لەنێوان وڵاتانی ئەندام دەربارەی ئەو کێشانەی کە رووبەڕووی بازرگانی جیهانی دەبنەوە و دۆزینەوەی چەند ئالیەتێك بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی کە لەنێوانیاندا سەر هەڵدەدەن، پێشکەشکردنی هەندێك یارمەتی هونەری و دارایی بۆ وڵاتانی ئەندام. ئەمەی خوارەوەش پوختەی ئەو ئامانجانەن:

- دۆزینەوەی یانەیەك بۆ گفتوگۆی بازرگانی.
- جێبەجێ کردنی بڕگەکانی رێکەوتنامەی ئۆرۆگوای.
- بەدیهێنانی گەشەسەندنی بازرگانی.
- دۆزینەوەی شێوازێکی بەردەوامی گفتوگۆ لەنێوان ئەندامان.

بەشێوەیەکی گشتی بوون بە ئەندام لەم رێکخراوەدا گەلێك ئاکامی پۆزەتیڤانەی دەبێت لەسەر باری ئابووری بەگشتی و بازرگانی بەتایبەتی.

مەرجە سەرەکییەکانی بوون بە ئەندام لە رێکخراوی بازرگانی جیهانی بریتین لە:

- دامەزراندنی سیستەمێکی دیموکراتی.

- پاراستنی مافەکانی مرۆڤ.
- پاراستنی موڵکدارێتی فیکری.
- کارنەکردن بە منداڵ.
- ئەنجامدانی چاکسازی بەجۆرێك کە گونجاوبن لەگەڵ پەیماننامە و ڕێکەوتنە نێودەوڵەتییەکان.

لە خشتەکەی خوارەوەدا وڵاتانی ئەندام لە ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی نیشان دەدەین.

خشتەی ژمارە (٢٤-٢) وڵاتانی ئەندام لە ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی.

| وڵاتانی ئەندام | بەرواری بوون بە ئەندام |
|---|---|
| ئەلبانیا | ٢٠٠٠-٠٩-٠٨ |
| ئەنگۆلا | ١٩٩٦-١١-٢٣ |
| ئەنتیگوا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| ئەرجەنتین | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| ئەرمەنستان | ٢٠٠٣-٠٢-٠٥ |
| ئوستralیا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| بەحرەین | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| بەنگلادیش | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| بەربادۆس | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| بەلجیکا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| بێلیزیا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| بێنین | ١٩٩٦-٠٢-٢٢ |
| بۆلیڤیا | ١٩٩٥-٠٩-١٢ |
| بۆتسوانە | ١٩٩٥-٠٥-٣١ |
| بەرازیل | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| برونیا | ١٩٩٦-٠٢-٢٢ |
| بولگاریا | ١٩٩٦-١٢-٠١ |



| | |
|---|---|
| بورکینیا فاسۆ | ١٩٩٥-٠٦-٠٣ |
| بورۆندا | ١٩٩٥-٠٧-٢٣ |
| کامیرۆن | ١٩٩٥-١٢-١٣ |
| کەنەدا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| کۆمارەکانی ناوەڕاستی ئەفریقا | ١٩٩٥-٠٥-٣١ |
| چاد | ١٩٩٦-١٠-١٩ |
| چیللی | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| چین | ٢٠٠١-١٢-١١ |
| کۆلۆمبیا | ١٩٩٥-٠٤-٣٠ |
| کۆنگۆ | ١٩٩٧-٠٣-٢٧ |
| کۆستەریکە | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| کۆتەدیڤێر | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| کەرواتیا | ٢٠٠٠-١١-٣٠ |
| کوبا | ١٩٩٥-٠٤-٢٠ |
| قوبرس | ١٩٩٥-٠٧-٣٠ |
| کۆماری سیزێچ | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| کۆماری دیمۆکراتی کۆنگۆ | ١٩٩٧-٠١-٠١ |
| دانیمارك | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| جیبۆتی | ١٩٩٥-٠٥-٣١ |
| دۆمێنیکا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| کۆماری دۆمێنیکا | ١٩٩٥-٠٣-٠٩ |
| ئیکوادۆر | ١٩٩٦-٠١-٢١ |
| میسر | ١٩٩٥-٠٥-٣٠ |
| سیلڤادۆر | ١٩٩٥-٠٥-٠٧ |
| ئیستۆنیا | ١٩٩٩-١١-١٣ |
| یەکێتی ئەورووپا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| فیجی | ١٩٩٦-٠١-١٤ |

| | |
|---|---|
| فینلەند | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| فەرەنسا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| گابۆن | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| گامبیا | ١٩٩٦-١٠-٢٠ |
| جۆرجیا | ٢٠٠٠-٠٦-١٤ |
| ئەڵمانیا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| گانا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| یۆنان | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| گرینادا | ١٩٩٦-٠٢-٢٢ |
| گواتیمالا | ١٩٩٦-٠٧-٢١ |
| گینیا بیساو | ١٩٩٥-٠٥-٣١ |
| گینیا | ١٩٩٥-١٠-٢٥ |
| گوانا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| هایتی | ١٩٩٦-٠١-٣٠ |
| هۆندۆراس | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| هۆنگ کۆنگ | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| هەنگاریا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| ئیسلاند | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| هندستان | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| ئیندۆنیسیا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| ئیرلەندا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| ئیسرائیل | ١٩٩٥-٠٤-٢١ |
| ئیتالیا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| جامایکا | ١٩٩٥-٠٣-٠٩ |
| ژاپۆن | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| ئوردون | ٢٠٠٠-٠٤-١١ |
| کینیا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |



| | |
|---|---|
| کۆریایی باشوور | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| کوێت | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| کرگستان | ١٩٩٨-١٢-٢٠ |
| لاتڤیا | ١٩٩٩-٠٢-١٠ |
| لیساهۆ | ١٩٩٥-٠٥-٣١ |
| لیشتنستێن | ١٩٩٥-٠٩-٠١ |
| لیتوانیا | ٢٠٠١-٠٥-٣١ |
| لۆکسمبورگ | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| مەکاوا (چین) | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| ماسیدۆنیا | ٢٠٠٣-٠٤-٠٤ |
| مەدەغەشقەر | ١٩٩٥-١١-١٧ |
| مالاوی | ١٩٩٥-٠٥-٣١ |
| مالیزیا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| مەڵدیڤیز | ١٩٩٥-٠٥-٣١ |
| مالی | ١٩٩٥-٠٥-٣١ |
| ماڵتا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| مۆریتانیا | ١٩٩٥-٠٥-٣١ |
| ماوریتیس | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| مەکسیك | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| مەڵداڤیا | ٢٠٠١-٠٧-٢٧ |
| مەنگولیا | ١٩٩٧-٠١-٢٩ |
| مەغریب | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| مۆزەنبیق | ١٩٩٥-٠٨-٢٦ |
| موانامار | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| نامیبیا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| ئیرلەندا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| نویزلاند | ١٩٩٥-٠١-٠١ |

| | |
|---|---|
| نیکاراگوا | ١٩٩٥-٠٩-٠٣ |
| نێجر | ١٩٩٦-١٢-١٣ |
| نێجیریا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| نەرویج | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| عومان | ٢٠٠٠-١١-٠٩ |
| پاکستان | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| پەنەما | ١٩٩٧-٠٩-٠٦ |
| پاپوا نیو گێنیا | ١٩٩٦-٠٦-٠٩ |
| پاراگوای | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| پیرۆ | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| فیلیپین | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| پۆلۆنیا | ١٩٩٥-٠٧-٠١ |
| پورتوگال | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| قەتەر | ١٩٩٦-٠١-١٣ |
| رۆمانیا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| رواندا | ١٩٩٦-٠٥-٢٢ |
|ساینت کیتس | ١٩٩٦-٠٢-٢١ |
| ساینت لویس | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| ساینت ڤینسێت | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| سینیگاڵ | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| تایوان | ٢٠٠٢-٠١-٠١ |
| سیرالیۆن | ١٩٩٥-٠٧-٢٣ |
| سینگاپور | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| سلۆڤاکیا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| سلۆڤێنیا | ١٩٩٥-٠٧-٠٣ |
| سەڵەمۆن ئیسلاند | ١٩٩٦-٠٧-٢٦ |
| ئەفریقای باشوور | ١٩٩٥-٠١-٠١ |



| | |
|---|---|
| ئیسپانیا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| سریلانکا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| سورێنامیا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| سویسرا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| سوید | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| | ١٩٩٥-٠٧-٠١ |
| تەنزانیا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| تایلاند | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| تۆگۆ | ١٩٩٥-٠٥-٣١ |
| ترینداد و تۆباگۆ | ١٩٩٥-٠٣-٠١ |
| تونیس | ١٩٩٥-٠٣-٢٦ |
| تورکیا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| ئۆگەندا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| ئیمارات | ١٩٩٦-٠٤-١٠ |
| بەریتانیا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| ئەمریکا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| ئۆرۆگوای | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| ڤێنزوێلا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| زامبیا | ١٩٩٥-٠١-٠١ |
| زیمبابوا | ١٩٩٥-٠٣-٠٥ |
| ئۆکرانیا | ٢٠٠٨-٠٥-١٦ |

سەرچاوە: www.WTO.ru

- بانکی ئاوەدانکردنەوە و پەرەپێدانی ئەوروپایی

(The European Bank for Reconstruction and Development)

بانکی ئاوەدانکردنەوە و پەرەپێدانی ئەوروپایی بەشێوەیەکی فەرمی لە نیسانی ساڵی (١٩٩١) دامەزرێنرا، ژمارەی ئەندامەکانی بریتین لە (٣٩) دەوڵەت. سەرمایەی ئەم بانکە لە

ساڵی (١٩٩٣)دا بریتی بووە لە (٥،١٢) ملیارد دۆلاری ئەمریکی. پشکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە سەرمایەی ئەم بانکە بریتییە لە (١٥٪)، پشکی ولاّتە گەورەکانی ئەوروپا وەك (بەریتانیا، ئەڵمانیا، فەرەنسا) بریتییە لە (٥،٨٪). هەرچی ئەندامەکانی ترە ڕێژەی بەشداریان لە سەرمایەی ئەم بانکەدا بریتییە لە (٢،٠٪ تاکو ٤،٣٪). بانکی ئاوەدانکردنەوە و پەرەپێدانی ئەوروپایی بە پرینسیپی پریڤات کار دەکات واتە هیچ یارمەتییەکی بێ بەرامبەر پێشکەش بە ئەندامەکانی ناکات، قەرز لەسەر بنچینەی بەرژەوەندییەکانی بانك بەپێی بڕی ئەو پشکەی هەیانە دەدات بە ئەندامەکانی. ئەم بانکە سەرمایەگوزاری ڕاستەوخۆ دەکات لە پرۆژە سەرکەوتوو و بە کەڵکەکان لەبارەی قازانجەوە لەپێناوی بەدەستهێنانی زیاتر دەسکەوت بۆ ئەندامەکانی. جگە لەوەش بانکی ئاوەدانکردنەوە و پەرەپێدانی ئەوروپایی بەشێوەیەکی سیستەماتیکی مەشق دەکات بە کارمەندەکان و نوێنەرانی ئەندامەکانی بۆ زیاتر شارەزابوون لەبواری دارایی و بانکی. ئەم بانکە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەشداری ناکات لە مامەڵەکردن لە بازاڕی دراوی جیهانی (FOREX).

- بانکی وەبەرهێنانی ئەوروپایی (European Investment Bank)

بانکی وەبەرهێنانی ئەوروپایی لەساڵی (١٩٥٨) دامەزراوە. بۆ ئەوەی پەرە بە وەبەرهێنان بدات لەو ناوچانەی کە لەچاو خۆیاندا دواکەوتوون. ئەندامەکانی بریتین لە (١٢) ولاّتە سەرەکییەکانی یەکێتی ئەوروپا. ئەرکی سەرەکی ئەم بانکە وەبەرهەێنانی ڕاستەوخۆیە لە پرۆژە درێژخایەن و ستراتیژیەکاندا، یان لەشێوەی قەرزداندا بۆ ماوەی (٧-١٢) ساڵ وە هەندێ جار بۆ پرۆژە زۆر ستراتیژییەکان قەرز بۆ ماوەی (٢٠-٤٠) ساڵ دەدات. مافی قەرز وەرگرتن تەنها بۆ ئەندامەکانێتی. سەرمایەی ئەم بانکە ئەمرۆکە بریتییە لە (٣٤) ملیارد دۆلاری ئەمریکی.

جگە لەو ڕێکخراوە جیهانی و ناوچەیانەی کە لەپێشەوە باسمان لێکرد، چەند ڕێکخراوێکی تری دارایی جیهانی و ناوچەیی تر هەن لەوانە:

- ڕێکخراوی هەرەوەزی ئابووری و پەرەپێدان

(Organization for Economic Cooperative and development)

ئەم ڕێکخراوە لەساڵی (١٩٦١) دامەزراوە پاشبەندی ڕێکخراوی هەرەوەزی ئابووری ئەوروپاییە.

مەبەستی ئەم ڕێکخراوە:

١- هاندانی گەشەکردنی ئابووریی و بەرزکردنەوەی ئاستی کارپێدان و هێنانەدی جێگیرییەکی داراییە بۆ ولاّتە ئەندامەکان.



٢- بەشداری کردن لە پەرەپێدانی ولاّتە ئەندامەکان و نائەندامەکان.

٣- فراوان کردنی ئاستی بازرگانی فرەلایەن.

- دەزگای پارەدان بە دەوڵەتان (International Finace Corporation)

دامەزراوێکە سەر بە بانکی دەوڵەتانە، لەساڵی (١٩٥٦) دامەزراوە بەمەبەستی هاندانی وەبەرهێنانی تایبەت بە دروستکردنی پرۆژەی بەرهەمداریی لە ولاّتە تازە پێگەشتووەکاندا.

- دەزگای پەرەپێدانی دەوڵەتان (International Development Association)

دامەزراوێکە سەر بە بانکی نێودەوڵەتی، لەساڵی (١٩٦٠) دامەزراوە، بەمەبەستی بەخشینی قەرزی ماوە درێژ بە ولاّتە تازە گەشەکردووەکان، بە سوودێکی زۆر کەم یان بەبێ سوود.

## جۆرەکانی تێکڕای ڕێژەی سوود

بەشێوەیەکی گشتی دوو ڕێگە هەیە بۆ ژمێرکردنی ڕێژەی سوودی قەرز:

یەکەم: تێکڕای ڕێژەیی سوود (Interest Rates)

بریتییە لەو بڕە پارە زیادەیەی کە قەرز وەرگر ئەیدات، بەرامبەر وەرگرتنی ئەو بڕە پارەیەی بە قەرز وەری گرتووە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو. بڕی سوود بەشێوەی ڕێژەی سەدی ئەو قەرزە هەژمێر دەکرێت.

بۆ نموونە: گریمان کۆمپانیای (X) لە بانك بڕی (١٠٠٠٠٠$) بە ڕێژەی (٥٪) سوودی ساڵانە قەرز وەردەگرێت. ئەوا دوای ساڵێك دەبێت بڕی (١٠٥٠٠٠$) بگەڕێنێتەوە بۆ ئەو بانکەی قەرزەکەی لێکردووە. کە پێکهاتووە لە:

١٠٠٠٠٠ دۆلار بڕی قەرزی بنچینەیی.

٥٠٠٠ دۆلار ڕێژەی سوودی قەرز لەماوەی ساڵێکدا.

دووەم: تێکڕای داشکاندنی سوود (Discount Rate)

ئەم جۆرە قەرزکردنە جیاوازیەکەی وەك لەوەی پێشەوە لەوەدایە، کە قەرزکەر لەکاتی وەرگرتنی قەرزەکەدا دەبێت یەکسەر بڕی ڕێژەی سوودی قەرزەکە لە قەرزە سەرەکییەکە داشکێنێت.

بۆ نموونە: گریمان کۆمپانیای (X) لە بانك بڕی (١٠٠٠٠٠$) بە ڕێژەی داشکاندنی (١٠٪) ساڵانە قەرز دەکات. قەرز وەرگر تەنها بڕی (٩٠٠٠٠$) لە بانك وەردەگرێت، بەڵام لـەکۆتایی ساڵدا دەبێت بڕی (١٠٠٠٠٠$) بگەڕێنێتەوە بۆ بانك واتە:

٩٠٠٠٠ دۆلار بڕی قەرزی بنچینەیی.

١٠٠٠٠ دۆلار بڕی داشکاندن (ڕێژەی ١٠٪ ساڵانە).

**- تێکڕای ڕێژەی سوودی قەرز لەنێوان بانکی ناوەندی و بانکە بازرگانییەکان**

بانکە ناوەندییەکان سوودی قەرز بە ڕێژەیەکی کەمتر لەچاو ڕێژەی سوودی قەرز لە بازاڕدا دەدات بە بانکە بازرگانی و دەزگا داراییەکانی تر. ئەم پرۆسەیە لە مامەڵەی سیستەمی قەرزی دارایی جیهانیدا پێی دەوترێت تێکڕای داشکاندنی سوودی فەرمی (Official Discount Rate-ODR).

ئەمەش چەند جۆرێکی هەیە:

١- تێکڕای ڕێپ (Repo Rate)

پەیماننامەی فرۆشتن و کڕینەوە(Sale and Repurchase Agreement).

ئەم پەیماننامەیە بریتییە لە فرۆشتنی (قەواڵەی) حکومی لەلایەن بانکی ناوەندییەوە بە بانك و دەزگا داراییەکانی ناوخۆ و دەرەوە، بەمەرجی کڕینەوەی لەماوەیەکی دیاریکراودا بەڕێژەیەکی سوودی دیاریکراو. ئەمەش دەکرێت تاکو حکومەت خەرجییەکانی خۆی جێبەجێ بکات لەکاتی کورتهێنانی بودجەدا. وە هەروەها بانکی ناوەندی بەهۆی ئەم میکانیزمەوە دەتوانێت بازاڕی ڕێژەی سوودی قەرز کۆنترۆڵ بکات.

٢- تێکڕای بارمتە (ڕەهن) (Lambard Rate)

بانکی ناوەندی بەرامبەر ئەو بڕە قەرزەی کە دەیدات بە بانك و دەزگا داراییەکان بارمتەییان لێوەردەگرێت. بەشێوەیەکی گشتی ڕێژەی بڕی قەرز لە (٨٠٪)ی قەوارەی بڕی قەرزەکە دەبێت.

٣- تێکڕای سوودی سندوقی فیدراڵی (Federal Funds Rate)

جۆری تێکڕای سوودی سندوقی فیدراڵی تەنها لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا مامەڵەی پێدەکرێت. بەجۆرێك سندوقی گەنجینەی فیدراڵی بۆ ماوەی یەك ڕۆژ قەرز دەدات بە بانکە بازرگانییەکان بۆ ئەوەی باڵانسی دارایی خۆیان هاوسەنگ بکەن، هەندێ جار ئەم جۆرە قەرزە لەنێوان بانکە بازرگانییەکانیشدا کردەی پێدەکرێت.



**- تێکڕای ڕێژەی سوودی قەرز لەنێوان بانکە بازرگانییەکان**

شێوەی مامەڵەی قەرزدان و قەرز وەرگرتن لەنێوان بانکەکان خۆیاندا چەند جۆرێکی هەیە لەهەرە گرنگەکانیان:

١- تێکڕای جوڵە و گوێزانەوەی پارە (نەخت) لەنێوان بانکەکاندا (Interbank Offered Rate)

بانکە بازرگانییەکان بەپێی چەند مەرجێکی دیاریکراو پارەی بەکارنەهێنراو ڕەوانەی ئەکتیڤی یەکتر دەکەن، بەمەبەستی هاوسەنگ کردنی باڵانسی بازرگانی پارە، وە هەندێ جاریش بەمەبەستی کەمکردنەوە لە بڕی باجی گشتی.

٢- تێکڕای ڕاکێشانی پارە (نەخت) لەنێوان بانکەکاندا (Interbank Bid Rate)

هەر بانکە هەوڵی ڕاکێشانی ژمارەیەکی زۆرتر بەکاربەر واتە سەوداکار بۆ بانکەکانیان دەدەن. ئەمەش دەبێتە هۆی پەیدابوونی هاڕکێ لەنێوان بانکەکان، بەڵام ئاستی هاڕکێیەکە لەنێوان بانکەکاندا سنوری بۆ دادەنرێت تاکو بڕی ڕێژەی سوودی قەرز نزم نەبێتەوە.

بەشێوەیەکی گشتی وە لەپراکتیکدا چەند سەنتەرێکی دارایی جیهانی هەڵدەستن بە لێکۆڵینەوە و بڵاوکردنەوە دەربارەی بارودۆخی دارایی و ئاست و بڕی ڕێژەی سوودی قەرزی بانکە جیاجیاکانی جیهان، بەتایبەتی (١٦) بانکە گەورە و مەزنەکانی جیهان. گرنگترین سەنتەر بریتییە لە:

(London Interbank offered Rate- LIBOR) ئەم سەنتەرە لەساڵی (١٩٨٥) دامەزراوە و دەست بەکارە، ڕۆژانە سەنتەری (LIBOR) لەکاتژمێری (١١:٠٠) بەکاتی (GMT)، ڕاپۆرتی خۆی دەربارەی بڕی ڕێژەی سوودی قەرز بڵاودەکاتەوە. جگە لەمەش چەند سەنتەرێکی دیکەی جیهانیش هەمان کار جێبەجێ دەکەن وەك سەنتەری:

- (London Interbank Bid Rate- LIBID).
- (Moscow Interbank Actual Credit Rate- MIACR).

**- تێکڕای سوودی قەرز لەنێوان بانك و بەکاربەراندا (دانیشتوان)**

بانکە بازرگانییەکان و تایبەتەکان بە دوو شێوازی سەرەکی مامەڵە لەگەڵ بەکاربەراندا دەکەن:

١- تێکڕای ڕێژەی سوودی سپاردە (Deposit Rate)

تێکڕای ڕێژەی سوودی سپاردە بریتییە لە بڕی سوودی (قازانجی) ئەو بڕە پارەیەی کە خەڵکی دەیسپێرن بە بانکەکان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو. واتە بانکەکان بەرامبەر بڕێ قازانج پارەی سپێردراو دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەو کەسانەی پارەیان سپاردووە بە بانك.

### ٢- تێكرای ڕێژەی سوودی قەرزدان (Lending Rate)

تێكرای ڕێژەی سوودی قەرزدان بریتییە لەبڕی سوودی (قازانجی) ئەو بڕە پارەیەی کە خەڵکی بەشێوەی قەرز لە بانکەکان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو وەری دەگرن. واتە قەرز وەرگر بەرامبەر بڕێ قازانج لە پارەی قەرز وەرگیراو دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەو بانکەی کە قەرزی لێ وەرگرتووە.

دەمەوێت یادی خوێنەری بەڕێز بهێنمەوە لە فەسڵی پانزەهەمدا بەشێوەیەکی چڕوپڕ باسمان لە میکانیزمی (قەرزو سپاردە) کردووە.

**بەکارهێنانی ڕێژەی سوودی قەرز لەلایەن بانکە ناوەندییەکانەوە وەك ئامرازێك بۆ کۆنترۆڵ کردنی بازاڕی دارایی**

هەروەك لەپێشەوە ئاماژەمان پێدا، گۆڕانی ڕێژەی سوودی قەرز وەك ئامرازێکی دارایی لەلایەن بانکی ناوەندییەوە بەکاردەهێنرێت لە دارشتنی سیاسەتی قەرزو داراییدا بۆئەوەی بازاڕی دارایی کۆنترۆڵ بکات. کەم کردنەوە یان زیادکردنی ڕێژەی سوودی قەرز کاریگەری دەکاتە سەر ئاڵوێری نرخی دراو لە بازاڕی دارایی جیهانیدا، ئەم ئامرازە نەك تەنها بۆ پشتگیری لە نرخی گۆڕینەوەی دراوی نیشتمانییە، بەڵکو کاردەکاتە سەر سەوداکاری جامبازەکانی بازاڕی داراییش*

کاتێك ڕێژەی سوودی قەرز بەرز دەبێتەوە ، ئەوا نرخی گۆڕینەوەی دراوی نیشتمانی بەهێز دەبێت. ئەم پرۆسەیە بەهۆی هێڵکارییەکەی ژمارە (٢٤-١) نیشان دەدەین.

* لە ئەنجامی شەڕی بەناو دژە تیرۆر ئەمڕۆکە ئابووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تووشی تەنگەژی ئابووری بووە، کە کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر ئابووری جیهانی چونکە ئابووری جیهانی و سیستەمی دارایی بازرگانی نێودەوڵەتان بەشێوەیەکی توندوتۆڵ بەستراوە بە دۆلاری ئەمریکییەوە. دابەزینی بەردەوامی نرخی دۆلار لە بازاڕە داراییە جیهانییەکاندا پێویستی بە چارەسەرکردن هەیە. بۆیە حکوومەتی ئەمریکی خەریکی دۆزینەوەی چارەسەرکردنی دابەزینی نرخی دۆلارە. بۆ ئەم مەبەستەش سیستەمی گەنجینەی فیدراڵی، بۆ یەکەم جار لە ساڵی (١٩٣٠). بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ تەداخولی مامەڵەکردنی گۆڕینەوەی دراو لە بۆرسە داراییەکاندا دەکات. بە جۆرێك لە بەرواری (١٦-٠٣-٢٠٠٧) بڕی ڕێژەی سوودی قەرزی نزم کردەوە بۆ (٢٪) کە نزمترین ئاستە لەدوای ساڵی (١٩٣٠). جگە لەمەش گەنجینەی فیدراڵی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یارمەتی بانکی (JP-M0rgan Chase& Co)، دەدات لە کڕینی ئەکتیڤی بانکەکانی دیکە، چونکە ئەم بانکە چالاکترین و گەورەترین بانکە لە مامەڵەکردنی ئاڵوێری دراودا لە بازاڕی دراوی جیهانیدا.



هێڵکاری ژمارە (٢٤-١) بەرزبوونەوەی سوودی قەرز، بەهێزبوونی نرخی دراوی نیشتیمانی.




بەهۆی بەرزبوونەوەی نرخی سوود، دراوی نیشتیمانی پتەودەبێت، ئەمەش سیگناڵێکی باشە بۆ سەرمایەگوزار. چونکە بەهۆی بەرزبوونەوەی نرخی سوود ئەوکاتە سپێردراو (Deposit) بە بانکەکان زیاد دەکات، بۆیە:

یەکەم:- لەم حاڵەتەدا سەرمایەگوزاری بیانی زیاتر سوودمەند دەبێت. چونکە سەرمایە و پارەی سەرمایەگوزاری بیانی ڕۆڵێکی بەرچاودەبینن لە دیاریکردنی نرخی ئاڵوێری دراودا. کاتێك دراوی نیشتمانی بەرزدەبێتەوە ئەوا سەرمایەگوزارە بیانییەکان دەست دەکەن بەکڕینی دراوی نیشتمانی بۆ ئەوەی لەڕێگەی سپاردن بە بانکە بازرگانییەکانەوە قازانجێکی زۆرتریان دەستبکەوێت، ئەمەش دەبێتە هۆی بوژاندنەوەی بارودۆخی ئابووری بەگشتی.

دووەم:- لەم حاڵەتەدا دانیشتوان و کۆمپانیا ناوخۆییەکانیش متمانەیان بە دراوی نیشتمانی زیاتر دەبێت، بۆیە ئەوانیش هەوڵی پاشەکەوتکردن بە دراوی نیشتمانی دەدەن وە بەهەمان شێوە دەیسپێرن بە بانکە بازرگانییەکان. ئەمەش دەبێتە هۆی سست بوونی چالاکیە ئابوورییەکان، بەلاّم لەهەمان کاتدا دەبێتە هۆی نزمبوونەوەی هەلاّوسان. بەهۆی زیادبوونی داوا لەسەر دراوی نیشتمانی.

پارە سیفەتێکی تایبەتی هەیە ئەو سیفەتەش بریتییە لە سووڕانەوە و ئاڵوێرکردنی واتە دەستاودەستکردنی، ئابووریناسان دەڵێن پارە دەتوانێت (٥٠) جار بسووڕێتەوە. کاتێك نرخی سوودی قەرز بەرزدەبێتەوە ئەوا داوا لەسەر پارە کەم دەبێتەوە ئەمەش دەبێتە هۆی

کەمکردنەوەی بڕی پارە لەمامەڵەکردندا واتە سوڕانەوەی پارە کەمتر دەبێتەوە، واتە داوا لەسەر دراوی نەتەوەیی کەمتر دەبێتەوە.

هەروەك لەپێشەوە ئاماژەمان پێدا، بانکی ناوەندی بەهۆی بەرزکردنەوەی نرخی سوود هەوڵی کەمکردنەوەی هەڵاوسان دەدات. چونکە نرخی سوود و هەڵاوسان بەتوندی پێکەوە بەستراون. نرخی سوود کاتێك دەبێتە هۆی پتەوکردنی دراوی نیشتمانی ئەگەر هەڵاوسان لەباری ئاسایدا بێت.

دەمەوێت ئاماژە بەخاڵێکی گرنگ بدەم. ئەویش ئەوەیە یاریکردن بە ئامرازی ڕێژەی نرخی سوودی قەرز بەبێ بەرنامەیەکی زانستانە و لێکۆڵینەوەیەکی هەمەلایەنی دەبێتە هۆی ترساندنی سەرمایەگوزاران و ئاکامە داراییەکانی دیکەش. بۆنموونە بانکی گەنجینەی فیدراڵی ئەمریکا لە ساڵی (١٩٩٩) بەهۆی باشکردنی قەیرانی ئابووری (٣) جار ڕێژەی سوودی قەرزی بەرزکردەوە ئەمەش بووە هۆی تەراکردنی سەرمایەگوزاران وە کەوتنە کێشانەوەی سەرمایەکانیان بۆ وڵاتانی تر. بەڵام بەهۆی ڕووداوەکانی (١١)ی سێپتەمبەری (٢٠٠١)، گەنجینەی فیدراڵی ئەمریکی لەماوەیەکی کەمدا چەند جارێك ڕێژەی سوودی قەرزی نزم کردەوە، ئەمەش جارێکی تر بووە هۆی ناسەقامگیری و تەنگژەی دارایی لە ئەمریکا کە تاکو ئێستاکەش بەردەوامە.

کەواتە دابەزینی نرخی سوود دەبێتە هۆی لاوازی دراوی نیشتمانی. لە هێڵکارییەکەی خوارەوەدا نیشانی دەدەین.

هێڵکاری ژمارە (٢-٢٤) دابەزینی نرخی سوود، لاوازی دراوی نیشتمانی.






- کەم بوونەوەی داوا لەسەر دراوی نیشتمانی، بەهۆی دابەزینی نرخی سوودەوە، دەبێتە هۆی کەمبوونەوە پرۆسەی سەرمایەگوزاری، چونکە بڕی پارەی سپاردراو بە بانکەکان کەمتر دەبێتەوە.
- کاتێك نرخی دراو هەرزان دەبێت، ئەوا بارودۆخی ئابووری بەشێوەیەکی گشتی بەرەو گەشەکردن دەڕوات. بەهۆی کارتێکردنە سەر پێڕستەکانی (ماکرۆ ئابووری). بەڵام ئەم گۆڕانکارییە درێژخایەن نابێت، چونکە بەپێی یاساکانی بازاڕ (داوا و خستنەڕوو) جارێکی تر خستنەڕووی دراوی نیشتمانی زیاد دەکات. ئەم پرۆسەیەش هەمیشە بەردەوام دەبێت.

## کاریگەری زانیارییەکان لەسەر نرخی سوود

بڵاوبونەوەی زانیاری دەربارەی بەرزبوونەوە یان نزمبوونەوەی ڕێژەی نرخی سوود، خۆی لەخۆیدا هیچ بایەخێکی ئەوتۆی نییە. چونکە پارەبازان جگە لەوەش فاکتەرەکانی دیکەش لەبەرچاو دەگرن. ئەو هەواڵ و زانیاریانە هەرچەندە کاریگەری کاتییان هەیە لەسەر بازاڕی دارایی، بەڵام کاتێك زانیارییەکان دەربارەی بەرزبوونەوەی نرخی سوود بڵاودەبنەوە ئەوا جامبازەکان بەخێرایی دەکەونە کڕینی ئەو دراوەی کە نرخی سوودەکەی بەرزدەبێتەوە تاکو هەواڵەکە لەپراکتیکدا بەرجەستە دەبێت. ئەوا ئەو کاتە دەکەونەوە فرۆشتنەوەی ئەو دراوە لەنێوان یەکتردا، ئەمەش دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەو نزمبوونەوەی کتوپڕ و خێرای نرخی دراوەکان.

بۆ نموونە گریمان نرخی سوود بریتییە لە (٤٪)، کاتێك هەواڵ بڵاودەبێتەوە گوایە بانکی ناوەندی لە کۆبوونەوەی داهاتوویدا دەیەوێت، ڕێژەی نرخی سوود زیاد بکات بۆ (٤،٢٥٪)، هەر کە ئەم هەواڵە بڵاودەبێتەوە، ئەوا جامبازەکانی بازاڕی دارایی دەکەونە چالاکی لەکڕین و فرۆشتنەوەی دراوەکان کە ئەنجامەکەشی دەبێتە هۆی بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی نرخی ئاڵووێر بەشێوەیەکی کتوپڕی و خێرایی. ئەم پرۆسەیە بەردەوام دەبێت تاکو جڤینێکی تری بانکی ناوەندی بۆ ئەو مەبەستە دەکرێت. دەتوانین بارودۆخی بازاڕی گۆڕینەوەی دراوەکان لەماوەی نێوان بڵاوبوونەوەی هەواڵەکان و بڕیارە دروستەکانی بانکی ناوەندی لەم سێ گریمانەدا کۆبکەینەوە:

١- گریمان ڕێژەی نرخی سوود بەرز دەبێتەوە وەك چاوەڕوان دەکرا بە بڕی (٠,٢٥٪)، ئەو کاتە بازاڕ بەهۆی ئەو سیگناڵەوە ئاسایی دەبێتەوە و هیچ بەهانە و هۆیەك نامێنێت بۆ بەرزبوونەوەی نرخی دراو.

٢- گریمان ڕێژەی نرخی سوود وەك چاوەڕوان دەكرا بەرز نابێتە و، ئەو كاتە بازاڕ لەحاڵەتی نائاساییەوە دەگەڕێتەوە دۆخەكەی جارانی.

٣- گریمان ڕێژەی نرخی سوود لەبری چاوەڕوان كراو زیاتر بەرز دەكرێتەوە لەلایەن بانكی ناوەندییەوە، ئەوا بەهۆی ئەو هەواڵە چاوەڕوان نەكراوەوە نرخی ئاڵوێری دراوەكان بەرزدەبنەوە بە ئەندازەیەكی چاوەڕوان نەكراو. (ئەوەی شایانی ئاماژە پێدانە بانكە ناوەندییەكان زۆربەی كات زانیاری دەربارەی بڕی زیاد كردن یان كەمكردنەوەی ڕێژەی نرخی سوود لەوپەڕی نهێنیدا دەپارێزن تاكو كاتی بانگهێشتكردنی بەشێوەیەكی فەرمی). بەهۆی هێڵكارییەكەی خوارەوە گریمانەكانی سەرەوە نیشان دەدەین.

هێڵكاری ژمارە (٢٤-٣) گریمانەكانی گۆڕانی ڕێژەی نرخی سوود.




ئەوەی جێگەی ئاماژە پێدانە بڕیارەكانی بانكە ناوەندییەكان بۆ گۆڕینی ڕێژەی نرخی سوود جگە لەوەی كە بەمەبەستی كاریگەر كردنە بۆ سەر بازاڕی ئاڵوێری دراوەكان، بەڵكو پرۆسەیەكی ئابووری گرنگیشی لەپشتەوەیە. بۆ ڕوونكردنەوەی زیاتر چەند نموونەیەك دەهێنینەوە بە پشت بەستن بە ئامارە ڕاستەقینەكانی بۆرسەكانی دراوی جیهانی.

هەروەك ئاماژەمان پێدا گۆڕانی ڕێژەی نرخی سوود دەبێتە هۆی گۆڕانی هەموو نرخەكانی دیكەش بۆ زیاتر تێگەیشتن سەیری خشتەكەی خوارەوە بكە.



خشتەی ژمارە (٢٤-٣) گۆڕانكارییەكانی ڕێژەی نرخی سوود لە بەرواری (٢٠٠٤\٠٢\٠١)، كاریگەرییان لەسەر بازاڕی دراوی جیهانی.

| ولاتەکان | هێمای نرخاندن | ڕێژەی نرخی سوود ئۆکتۆبەری ٢٠٠٣ | دواترین بەرواری گۆڕانی ڕێژەی نرخی سوود | ڕێژەی گۆڕانی نرخی سوود |
|---|---|---|---|---|
| ئەمریکا | Federal Funds | ١,٠٠ | ٢٥,٠٦,٠٣ | -٠,٢٥ |
| | Primary Discount Rate | ٢,٠ | ٢٥,٠٦,٠٣ | -٠,٢٥ |
| بەریتانیا | Repo Rate | ٣,٧٥ | ٠٦,١١,٠٣ | +٠,٢٥ |
| یەکێتی ئەورووپا (١٢) | Main Refinancing tender | ٢,٠٠ | ٠٥,٠٦,٠٣ | -٠,٥٠ |
| | Deposit Rate | ١,٠٠ | ٠٥,٠٦,٠٣ | -٠,٥٠ |
| | Marginal lending Rate | ٣,٠٠ | ٠٥,٠٦,٠٣ | -٠,٥٠ |
| ژاپۆن | Discount Rate | ٠,١٠ | ١٨,٠٩,٠١ | -٠,١٥ |
| | Overnight Call Rate target | ٠,١٥ | ٢٨,٠٢,٠١ | -٠,١٠ |
| سویسرا | 3 month LIBOR target | ٠,٢٥ | ٠٦,٠٣,٠٣ | -٠,٥٠ |
| کەنەدا | Bank Rate | ٣,٠٠ | ١٥,٠٧,٠٣ | -٠,٢٥ |
| | Overnight Rate target | ٢,٥٠ | ٢٠,٠١,٠٤ | -٠,٢٥ |
| ئوستالیا | Cash Rate | ٤,٧٥ | ٠٤,٠٦,٠٢ | +٠,٢٥ |
| نیوزلاند | Official Cash Rate | ٥,٢٥ | ٢٩,٠١,٠٤ | +٠,٢٥ |

سەرچاوە: www.nyse.com

ئێستاکە بەهۆی چەند نموونەیەکەوە کاریگەری ڕێژەی سوودی قەرز لەسەر ئـاڵوویری نرخـی دراوەکان روون دەکەینەوە.

نموونەی یەکەم:

لەبـەرواری (٢٠٠٣\٠٢\٠٦)، هـەواڵێك بلاۆبۆیـەوە گوایـە بـانکی ناوەنـدی ئینگلتـەرا دەیەوێت ڕێژەی سوودی قەرز نزم دەکاتەوە لە (٤٪ بۆ ٣،٧٥٪). ئەو کاتە بـازاڕی گۆڕینـەوەی دراو لە چاوەڕوان کردندا بوو، ئایا ئەو نزمبوونەوەیە چ کاتێك روودەدات؟ ئـەوەبوو بڕیارەکـەی بانکی ناوەندی ڕاست دەرچوو ڕێژەی سوودی قەرزی بە بڕی (٢٥٪) نزم کردەوە چونکە خێرایـی گەشەی ئابووری بەرەو تەنگەژی دەچوو، جگە لەوەش توانای کڕین بەرەو نـزم بوونـەوە دەچـوو بۆیە بانکی ناوەندی ئەو هەنگاوەی گرتەبەر شایانی باسە لەماوەی (٤٨) ساڵدا بانکی ناوەندی بۆ یەکەم جارە بـەو بـڕە ڕێـژەی سـوودی قـەرز کـەم بکاتـەوە. ئـەم گۆڕانکارییـە کاریگـەری ڕاستەوخۆی کردە سەر نرخی گۆڕینەوەی دراوەکـان لـە بـازاڕی دراوی جیهانیـدا لـە وێنەکـەی (٢٤-٢)دا ئەو گۆڕانکارییە نیشان دەدەین.

وێنەی ژمارە (٢٤-٢) کاردانەوەی بازاڕی گۆڕینەوەی دراو بەهۆی دابەزینی ڕێژەی سـوودی قەرزەوە. (جونەیهی ستەرلینی بەرامبەر دۆلاری ئەمریکی)






نموونەی دووەم:

لەبەرواری (٢٠٠٣\٠٦\٠٥) لەکاتژمێری (١٢:٠٠) هەواڵە ئابوورییەکان جەختیان لەسـەر نەگۆڕانی ڕێژەی سوودی قەرز کردەوە لەئاستی خۆیدا واتە (٣,٧٥٪). چـونکە لـەو بـەروارەدا چاوەڕوانی دابەزینی ڕێژەی سوودی قەرز دەکرا بۆ (٥٠,٣٪). کاریگەری ئەم هەواڵانـە لەسـەر گۆڕینەوەی نرخی دراوەکان لە وێنەکەی خوارەوەدا نیشان دەدەین.

وێنەی ژمارە (٢٤-٣) جێگیربوونی ڕێژەی سوودی قـەرز لەئاسـتی (٣،٧٥٪) کاردانـەوەی لەسەر بازاڕی ئاڵوویری دراوەکان. (جونەیهی ستەرلینی بەرامبەر دۆلاری ئەمریکی).




نموونەی سێهەم:

بەهۆی لاوازبوونی نرخی گۆڕینەوەی دۆلار بەرامبەر دراوە جیهانیەکانی دیکـە. لەبـەرواری (٢٠٠٤\٠٦\٣٠) سیستەمی گەنجینەی فیدراڵی ئەمریکی بڕیاری بەرزکردنەوەی ڕێژەی سوودی قەرزی دا بە بڕی (٢٥٪) ، واتە لە (١٪ بۆ ١,٢٥٪). پێش ئەم بڕیارە بازاڕەکانی گۆڕینـەوەی

دراو لە چاوەڕوان کردندا بوون تا رادەیەك نرخی گۆڕینەوەی دۆلار بەرامبەر دراوەکانی دیکە بەرز بۆوە. بەڵام دوابەدوا نرخی گۆڕینەوەی دۆلار بەرامبەر دراوە جیهانییەکانی دیکە بەرەو دابەزین چوو، چونکە فاکتەرەکانی دیکە کاریگەرییان زیاتر بوو. وەك زیادبوونی ژمارەی بێکاران، هەڵاوسان،...هتد.

رەنگە ئەو چەند نموونەیەی سەرەوە بەس بێت بۆ تێگەیشتن و روونکردنەوەی کاردانەوەی بازاڕی گۆڕینەوەی دراو بەرامبەر کەم کردنەوە و زیادکردنی بڕی نرخی سوود. ئێستاکە هەوڵ دەدەین بەشێوەیەکی فراوانتر و چڕوپڕتر جیاوازی لەنێوان نرخی سوود بۆ دراوە جیاجیاکان روون بکەینەوە.

**جیاوازی نرخی سوود یان سۆپ (swap) چییە؟**

پارەبازانی بازاڕی دارایی نەك تەنها سەیری گۆڕانی نرخی سوود دەکەن، بەڵکو سەیری جیاوازی نێوان نرخی سوودی دراوە جیاجیاکانیش دەکەن. بۆ نموونە گریمان هەر پێنج وڵاتە گەورەکەی جیهان (ئەمریکا USD، بەریتانیاGBP ، سویسرا CHF، ژاپۆن JPY، یەکێتی ئەوروپا EUR) لەیەك کاتدا بڕیاری نزمکردنەوەی ڕێژەی نرخی سوود بە بڕی (٥،٠%) دەدەن. ئەوکاتە کاریگەرییەکی ئەوتۆی نابێت لەسەر بازاڕی دراو. چونکە ڕێژەی ناوەندی نرخی سوود بە نەگۆڕی ماونەتەوە. بەڵام لەپراکتیکدا هەر وڵاتە بەپێی بارودۆخی ئابوورییەکەی ڕێژەی نرخی سوود دیاری دەکات، ئەمەش دەبێتە هۆی پەیدابوونی جیاوازی نرخی ئاڵوێری دراوەکان. ئەو کاتە پارەبازانی بازاڕی ئاڵوێری دراو لەو جیاوازییە قازانج دەکەن. خاڵێکی گرنگ کە جێگەی ئاماژە پێدانە بازاڕی دراوی جیهانی (FOREX)، کاتی کردنەوە و کاتی داخستنی مامەڵەکردنی هەیە، بەواتایەکی دیکە کاتی دەستپێکردنی مامەڵەکردن نرخی گۆڕینەوەی دراوەکان بەرامبەر یەکتری جێگیرە، بەڵام هەر کە مامەڵەکردن دەست پێدەکات تاکو داخستنی گۆڕانکاری و جیاوازی گۆڕینەوەی نرخی دراوەکان دەست پێدەکات واتە جامبازەکان لەماوەی دەست بە مامەڵەکردن و وەستاندنی مامەڵەکردن دەتوانن چەند جارێك پرۆسەی کڕین و فرۆشتن جێبەجێ بکەن. ئەم پرۆسەیەش بە زمانی ئابووریناسان پێی دەوترێت (کاتی کڕینی پارەValue date ) ئەو پرۆسەیە بەهۆی نموونەکەی خوارەوە نیشان دەدەین.

گریمان یەکێك لە جامبازەکان بڕی (١٠٠٠٠٠$) دەگۆڕێتەوە بە یەنی ژاپۆنی بە نرخی (١٠٧،٤٢) کاتی کڕین (٢٠٠٣\٠٨\١٢).

بۆ ئاگاداری ئەم پرۆسەیە لەسەر شاشەی بۆرسەکان بەم شێوەیەی خوارەوە دەنوسرێت.

(BUY 0,1 USD/ JPY at 107,42 (long position



USD ٠٠٠ ١٠٠+

-JPY ٠٠٠ ٧٤٢ ١٠

ئەگەر مامەڵەی کڕین و فرۆشتنەکە واتە ئاڵوێری دۆلار بەرامبەر یەن بەو نرخە لەماوەی کارکردنی بۆرسەدا (کاتی کردنەوە داخستن) بەو شێوەیە بمێنێتەوە ئەوا جموجۆڵی دراوەکان بەو شێوەیەی خوارەوەی لێدێت:

لە حسابی بانکەوە بۆ حسابی جامباز (کڕیار) - ١٠٠٠٠٠ USD

لە حسابی جامبازەوە (کڕیار) بۆ حسابی بانك -١٠٧ ٤٢ ٠٠٠ JPY

هەروەك لەپێشەوە ئاماژەمان پێدا، مەبەستی سەرەکی جامبازەکان دەستکەوتی قازانجە نەك تەنها گۆڕینەوەی دراو بە دراو. لەپراکتیکدا پارەبازان هەندێ جار مامەڵەی کڕین و فرۆشتنی دراوەکان بە کراوەیی دەهێڵنەوە بۆ رۆژی دواتر، پرۆسەی گوێزانەوەی مامەڵە لە رۆژێکەوە بۆ رۆژێکی دیکە پێی دەوترێت سۆپ (SWAP TOM/ NEXT). ئەو کاتە لەکۆتایی کاتی مامەڵەکردندا واتە کاتی وەستاندنی مامەڵەکردن کاتژمێری (GMT 12:00 (ئەگەر جامباز مامەڵەکە دانەخات ئەوا بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیك دوو پرۆسەی پێچەوانە روودەدات پرۆسەی داخستن و پرۆسەی کردنەوەی هەمان مامەڵە لەڕۆژی دواتردا بەبێ ئەوەی گۆڕان بەسەر نرخی گۆڕینەوەی دراوەکاندا بێت، لەم حاڵەتەدا جامباز رەنگە تەنها (کۆمیسیۆن) وەربگرێت کە بریتیيە لەجیاوازی نرخی سوودی دراوەکان. ئەگەر جامباز دراوێك بکڕێ کە نرخی سوودەکەی بەرز بێت ئەوا (SWAP) پۆزەتیڤ دەبێت، بەپێچەوانەشەوە ئەگەر جامباز دراوێك بکڕێ کە نرخی سوودەکەی نزم بێت ئەوا (SWAP) نێگەتیڤ دەبێت. لە نموونەکەی پێشوودا (سۆپ) پۆزەتیڤ دەبێت، چونکە نرخی سوودی دۆلار بریتییە لە (١%)، بەڵام نرخی سوودی یەن بریتییە لە (١،٠%). ئەم جیاوازیانە واتە جیاوازی نرخی سوود و کاریگەرییان لەسەر گۆڕینەوەی نرخی دراوەکان لەخشتەکەی خوارەوەدا نیشان دەدەین.

خشتەی ژمارە (٢٤-٤) جیاوازی (SWAP)، نرخی سوود.

| دراوەکان | بەرزترین پنت (SWAP) | نزمترین پنت (SWAP) |
|---|---|---|
| USD/CHF | ٠,٢ | ٠,٤- |
| EUR/USD | ٠,٣ | ٠,٥- |
| GBP/USD | ١,٣ | ١,٥- |
| USD/JPY | ٠,٢ | ٠,٤- |
| EUR/CHF | ٠,٧ | ٠,٩- |
| EUR/GBP | ٠,٤- | ٠,٢ |
| EUR/JPY | ٠,٦ | ٠,٨- |
| USD/CAD | ٠,٧- | ٠,٥ |
| GBP/JPY | ١,٩ | ٢,١- |
| AUD/USD | ٠,٨ | ١,٠- |

ئێستاکە بەهۆی نموونەکەی پێشووەوە هەوڵ دەدەین مانای زاراوەی سۆپ (SWAP) زیاتر روون بکەینەوە. لەکاتی داخستنی مامەڵەکردندا واتە کاتژمێری (GMT 21:00) نرخی گۆڕینەوەی یەن بەرامبەر دۆلار بریتی بوو لە (١٠٧،٦٤). وە ژمێرکردنی ئەو پرۆسەیە لەلایەن جامبازەکانەوە لە خشتەی ژمارە (٢٤-٥)دا جێبەجێ دەکرێت.



خشتەی ژمارە (٢٤-٥) راپۆرتی (بەیانی) پشکنین لەلایەن پارەبازانەوە.

| | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| Internet Dealing System | | | | | | | | |
| حسابی ٣٥٢١٨ | | | | | | | | |
| حسابی ماوە لە (٢٠٠٣/١٢/٠٨) کاتژمێر ٠١:٠٠ - ٥٠٠٠,٠٠ | | | | | | | | |
| کات | ئامراز | لۆت | نرخ | مامەڵە | قازانج | پاداشت | ماوە | سەرنج |
| ١١:١٣ ٢٠٠٣/١٢/٠٨ | یەن | ١٠٠٠٠٠ | ١٠٧,٤٢ | کاتی کردنەوە | ٠ | ٠ | ٥٠٠٠ | |
| ٢١:٠٤ ٢٠٠٣/١٢/٠٨ | یەن | -١٠٠٠٠٠ | ١٠٧,٦٤ | کاتی داخستن | ٢٠٤,٣٩ | ٠ | ٥٢٠٤,٣٩ | Swap t/n |
| ٢١:٠٤ ٢٠٠٣/١٢/٠٨ | یەن | ١٠٠٠٠٠ | ١٠٧,٦٣ | کاتی کردنەوە | ٠ | ٠ | ٥٢٠٤,٣٩ | Swap Open at Rate 107,637 |
| کۆی گشتی | | | | | ٢٠٤,٣٩ | ٠ | ٥٢٠٤,٣٩ | |
| ٢١:٤٣ ٢٠٠٣/١٢/٠٨ کاتی کردنەوە | | | | | | | | |
| دراو | لۆت | نرخ | | | | | | |
| یەن | ١٠٠٠٠ | ١٠٧,٦٣٧ | | | | | | |

سەرنج: کاتێك مامەڵەکردن دەگۆێزرێتەوە بۆ رۆژی دواتر بەتایبەتی رۆژی چوارشەمە لەسەر پێنج شەمە، ئەوا سۆپ بە بڕی سێ جار بەرزدەبێتەوە. لەبەرئەوەی حساباتی جاری لە بازاڕی دراوی جیهانیدا بەپێی مەرجەکانی (سپۆتSpot ٍ) کاردەکات. واتە گواستنەوەی پشکنین بۆ رۆژی دووەم دوای مۆرکردنی گرێ بەستەکە.

بۆ نموونە گریمان رۆژی دووشەممە بەرواری (٢٠٠٣\٠٣\٠٢) بانکی (A

گرێ بەستێکی لەگەڵ بانکی B مۆرکردووە بۆ گۆڕینەوەی یەك ملیۆن دۆلاری ئەمریکی بە یەنی ژاپۆنی بە نرخی (١ JPY USD=108.00) ئەوکاتە بەپێی مەرجەکانی سپۆت لە بەرواری (٢٠٠٣\٠٣\٠٤) بانکی A بڕی (١٠٨) ملیۆن یەن حەواڵەی بانکیB دەکات. وە هەمان رۆژ بانکی B یەك ملیۆن دۆلار حەواڵەی بانکی A دەکات.

**فەرهەنگی ئابووری**

سۆپ SWAP – زاراوەیەکی دارایی ئابوورییە لەبۆرسەکاندا بەکاردەهێنرێت کە بریتییە لە:

١- کڕین بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بەمەبەستی فرۆشتنەوەی.

٢- کڕین و فرۆشتنەوەی کاغەزی بەنرخ لەهەمان کاتدا. بەمەبەستی درێژکردنەوەی ماوەی فرۆشتنەوەی.

٣- گۆڕینەوەی دراوی نیشتمانی بە دراوی بیانی بەمەرجێك دواتر، دراوە بیانیەکە بگۆڕدرێتەوە بە دراوی نیشتمانی، ئەم پرۆسەیە بەشێوەیەکی گشتی لەنێوان بانکە ناوەندییەکاندا روودەدات.

٤- فرۆشتنی پارەی کاش بەمەبەستی کڕینەوەی لەماوەیەکی دیاریکراودا و بەپێچەوانەشەوە.

٥- جیاوازی نرخی سوودی دوو دراوی جیاواز بۆ ماوەیەکی دیاریکراو.

**فەرهەنگی ئابووری**

سپۆت Spot - زاراوەیەکی دارایی ئابوورییە لە بازاڕی دارایی جیهانیدا بەکاردەهێنرێت. واتە جێبەجێ کردنی مەرجەکانی گرێبەستی نێوان جامبازەکانی بازاڕی دارایی لەماوەی بیست و چوار کاتژمێردا. ئەو ماوەیەش بۆ ئامادەکردنی پشکنین و ژمێرکردن و رۆتینیاتی بانك پێویستە. بەمەرجێك نرخی ئالوویر جێگیر دەکرێت لەکاتی مۆرکردنی گرێ بەستەکەدا. نەك لەکاتی حەواڵەکردندا.



**داوا و خستنەڕوو**

لەفەسڵی چوارەمدا بەشێوەیەکی چڕوپڕ باسمان لە داوا و خستنەڕوو کردووە ئەوەی لەم فەسڵەدا مەبەستمانە باسکردنە لە کاریگەری یاسای داوا و خستنەڕوو لەسەر بازاڕی دراوی جیهانی واتە کاریگەری داوا و خستنەڕوو لەسەر نرخی ئالوویری دراوەکان لە بۆرسە داراییە جیهانییەکاندا.

داوا و خستنەڕوو بریتین لە پەیوەندی نێوان کڕیار و فرۆشیار. فرۆشیار هەوڵی فرۆشتن بە نرخێکی زیاتردەدات بە مەبەستی دەستکەوتنی قازانجێکی زۆرتر، بەلاَم کڕیار هەوڵی کڕین دەدات بە نرخێکی کەمتر بە مەبەستی دەستکەوتنی زۆرتر پێویستی بە نرخێکی هەرزانتر. هۆی سەرەکی دابەزین و بەرزبوونەوەی نرخی دراوەکانیش لەکاتی ئالوویردا بەستراوە بە یاسا و رێسای (داوا و خستنەڕووە). هەروەك چۆن کڕیار و فرۆشیار دەیانەوێت پێداویستییەکانیان جێبەجێ بکەن ئەوا دەبێت بەیەکتری بگەن ئەو شوێنەش کە کڕیارو فرۆشیار تێدا بە یەکتری دەگەن پێی دەوترێت بازاڕ. ئەمڕۆکە لە زۆربەی زۆری ولاَتانی جیهاندا بۆرسەکان جێگەی بازاڕیان گرتۆتەوە، تەنانەت شاشەی کۆمپیوتەرەکانیش بوون بە بازاڕ. واتە بازاڕ ئەو رووبەرەیە کە مامەڵەی کڕین و فرۆشتنی تێدا جێبەجێ دەکرێت.

داوا یان خواست چییە؟ بریتییە لە توانای کڕین - واتە بڕی ئەو پارەیەی کە کڕیار دەتوانێت خەرجی بکات بۆ جێبەجێ کردنی پێداویستییەکانی. هەندێ جار خواست بەهەڵە لەگەڵ پێداویستییەکان تێکەڵ دەکرێت. بەلاَم لەڕاستیدا سەرجەمی پێداویستیەکان هەمیشە زۆرتر و فراوانترن لە خواستەکان. چونکە بەهۆی سنوورداریتی توانای کڕینەوە بەکاربەر ناتوانێت هەموو پێداویستییەکانی جێبەجێ بکات. بە واتایەکی دیکە داوا لەسەر کالاَ و خزمەتگوزارییەکان یەکسانە بەو بڕە پارەیەی کاربەر دەتوانێت خەرجی بکات. هەروەك ئاماژەمان پێدا کڕیار هەوڵ دەدات زیاترین پێداویستییەکانی بەدەستبهێنێت، بەلاَم توانای کڕینی سنووردارە. ئەمەش دەبێتە هۆی پەیدابوونی داوای تاك (تایبەت) کەواتە سەرجەمی خواستەکان بریتی دەبێت لە کۆی داوای تاکەکان.

قەوارەی داواکان چییە؟ بریتییە لە بڕی ئەو کالاَ و خزمەتگوزارییانەی کە کڕیار دەتوانێت بیکڕێت بە نرخێکی دیاریکراو لەماوەیەکی دیاریکراودا رۆژێك، هەفتەیەك ...هتد. قەوارەی داوا بریتییە لە دیوی پشتەوەی نرخ، واتە داوا بەستراوە بە نرخەوە. چەند نرخ بەرزبێت داوا کەمتر دەبێتەوە، بەپێچەوانەشەوە چەند نرخ نزم بێت داوا زیاتر دەبێت. ئەم پەیوەندییەش پێی دەوترێت (یاسای داواکان). ئەو کاتە هاوکێشەی داوا بەم شێوەیەی خوارەوە بنوسینەوە.

$$Q=D\ (P)$$

کاتێك:

Q – بڕ (قەوارە).

P – نرخ.

D – داوا.

دەتوانین هەر هەمان هاوکێشەکەی سەرەوە بەهۆی وێنەی (٢٤-٤)ەوە دەربڕین.

وێنەی ژمارە (٢٤-٤) چەماوەی داواکان




خستنەڕوو- بریتییە لە بڕی ئەو شمەك و خزمەتگوزارییانەی کە دەتوانرێت لە بازاڕەکاندا پێشنیار بکرێن لەلایەن بەرهەمهێنەرەکانەوە بەمەبەستی فرۆشتن. بڕی بەرهەمەکان کاریگەریان هەیە لەسەر خستنەڕوو کە پێی دەوترێت (قەوارەی خستنەڕوو) کە بریتییە لە بڕی ئەو کاڵا و خزمەتگوزارییانەی لە بازاڕەکاندا بەمەبەستی فرۆشتن پێشنیار دەکرێت بەنرخێکی دیاریکراو لەماوەیەکی دیاریکراودا.

یاسای خستنەڕوو – واتە چەند نرخ بەرزبێت ئەوا خستنەڕوو زیاد دەبێت، بەپێچەوانەشەوە چەند نرخ نزم بێت ئەوا خستنەڕوو کەم دەبێتەوە. چونکە فرۆشیار هەوڵ دەدات زیاتر قازانجی دەست بکەوێت. دەتوانین ئەم پەیوەندییە بەهۆی وێنەی (٢٤-٥)ەوە نیشان بدەین.



وێنەی ژمارە (٢٤-٥) چەماوەی خستنەڕوو.




بەم شێوەیە دەتوانین ئەم دەرئەنجامە بکەین: تەنها نرخ دەتوانێت هاوسەنگی نێوان داوا و خستنەڕوو جێبەجێ بکات. کەواتە دەستی شاراوە (داوا و خستنەڕوو) بەهۆی نرخەوە دەبێتە هۆی رێك و پێك کردنی سەودا و مامەڵە لەبازاڕەکاندا. مەبەست لە هاوسەنگیش لەنێوان داوا و خستنەڕوودا ئەو کاتە روودەدات کاتێك قەوارەی داوا یەکسانە بە قەوارەی خستنەڕوو، بێگومان هاوسەنگی لەبازاڕەکاندا پێویستی بە کاتە. چونکە قەوارەی داوا و خستنەڕوو هەمیشە لە گۆڕاندان هەر ئەم گۆڕانکارییانەیە دەبنە هۆی پەیدابوونی جیاوازی لە نرخەکان. بەهۆی وێنەی (٢٤-٦)ەوە هاوسەنگی نێوان داوا و خستنەڕوو نیشان دەدەین.

وێنەی ژمارە (٢٤-٦) هاوسەنگی نێوان داوا و خستنەڕوو.



ئەوەی جێگەی ئاماژەپێدانە کێبەرکێ لە بازاڕەکاندا دەبنە هۆی پێکهێنانی نرخی داواکان و نرخی خستنەڕوو. بە جۆرێك کە نرخی داواکان بریتی دەبێت لە بەرزترین نرخ کە کڕیار دەتوانێت خەرجی بکات، بەڵام نرخی خستنەڕوو بریتی دەبێت لە نزمترین نرخ کە بەرهەمهێنەر دەتوانێت بەرهەمەکەی بفرۆشێت.

بازاڕی دراوی جیهانیش بەهەمان شێوە دەکەوێتە ژێر کاریگەری یاسای داوا و خستنەڕووەوە، چونکە دراویش یان پارە بریتییە لە (کاڵا). کاتێك بڕی خستنەڕووی دراوێك زیاتر دەبێت لە بڕی داوا لەسەر ئەو دراوە، ئەوا نرخی گۆڕینەوەی نزم دەبێتەوە. بەپێچەوانەشەوە کاتێك بڕی خستنەڕووی دراوێك کەمتر بێت لە بڕی داوا لەسەر ئەو دراوە، ئەوا نرخی گۆڕینەوەی بەرز دەبێتەوە.

زۆربەی کات حکومەت لەڕێگەی بانکی ناوەندییەوە دەخالەت لە کڕین و فرۆشتنی دراو دەکات بەمەبەستی پارێزگاری کردن لە نرخی گۆڕینەوەی دراوی نیشتمانی، واتە حکومەت بەهۆی دەست تێوەردانەوە (intervetion). هەوڵی هاوسەنگی و بالانسی گۆڕینەوەی نرخی دراوی نیشتمانی بەرامبەر دراوە بیانییەکان دەدات.

**دەست تێوەردان** (intervetion) **چییە؟**

بریتییە لە کاریگەرترین و گرنگترین ئامرازی دارایی بەدەست حکومەتەوە کە بەهۆیەوە دەتوانێت نرخی کڕین و فرۆشتنی دراوی نیشتمانی بەرامبەر دراوە بیانییەکان ڕێکوپێك بکات. بەواتایەکی تر بەهۆی دەست تێوەردانەوە پاڵپشتی نرخی گۆڕینەوەی دراوی نیشتمانی دەکات بەرامبەر دراوە بیانیەکان ئامانجی سەرەکی لەدەست تێوەردانی حکومەت لەڕێگەی بانکی ناوەندییەوە لە مامەڵەکردنی گۆڕینەوەی دراوەکان لە بازاڕی ئاڵوێری دراوەکاندا هاوسەنگ کردنی بالانسی داراییە. بۆ ئەم مەبەستەش بانکی ناوەندی دەبێت گەنجینەیەکی تایبەتی تەرخان بکات بۆ ئەوەی لەکاتی پێویستدا بتوانێت دەخالەت بکات لە دیاریکردن و ڕاگرتنی بالانسی گۆڕینەوەی دراوی نیشتمانی بەرامبەر دراوە بیانییەکان. جگە لەوەش متمانەکردن لەلایەن بەشدارانی بازاڕی گۆڕینەوە بە سیاسەتی درێژخایەنی بانکی ناوەندی.

دەست تێوەردان لەلایەن بانکی ناوەندییەوە چەند جۆر و شێوازێکی هەیە لەهەرە گرنگەکانی:

١- دەست تێوەردانی پڕوپاگەندەیی (ناڕاستەقینە) verbal intervention

ئەم جۆرە دەست تێوەردانە هەندێ جار لەلایەن بانکی ناوەندییەوە بەکاردەهێنرێت بە مەبەستی ڕێگرتن لە بەرزکردنەوەو نزمکردنەوەی نرخی دراوەکان لەلایەن جامبازەکانەوە بەبێ



هیچ بنەمایەك. بۆ ئەم مەبەستەش بانکی ناوەندی لەڕێگەی میدیاکانەوە گوتەگوت بڵاودەکاتەوە گوایە بانکی ناوەندی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەخالەت لە کڕین و فرۆشتنی دراوەکان دەکات. ئەم جۆرە پڕوپاگاندانە تاڕادەیەك کاریگەری دەکەنە سەر بازاڕی گۆڕینەوەی دراوەکان بۆ ماوەیەکی کاتی، چونکە ئەگەر ئەم جۆرە پڕوپاگاندانە هەنگاوی کردەیی و ڕاستەقینەی بەدواوە نەبێت ئەوا بازاڕ دەچێتەوە دۆخی جارانی و دەکەوێتە ژێر کاریگەری یاسای داوا و خستنەڕوو.

٢- دەست تێوەردانی ڕاستەقینەreal intervention

بانکی ناوەندی بەشێوەیەکی فەرمی بڕیاری دەست تێوەردان دەدات لە کڕین و فرۆشتنی دراوەکان، وە زۆربەی جار بڕی ئەو پارەیەی کە ئامادەیە بیخاتە بازاڕەوە دیاری دەکات. دەست تێوەردانی ڕاستەقینەش دوو شێوازی هەیە:

یەکەم - دەست تێوەردانی ڕاستەوخۆ direct intervention

لەم حاڵەتەدا بانکی ناوەندی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەشداری دەکات لە کڕین و فرۆشتنی دراو لە بۆرسەکاندا، هەندێ جاریش بانکە ناوەندییەکانی دوو وڵات بڕیار دەدەن پێکەوە بەشداری ڕاستەوخۆ بکەن لە مامەڵەکردندا تاکو نرخی گۆڕینەوەی دراوی هەردوو وڵات توشی بەرزبوونەوە و دابەزینی کتوپڕ نەبێت.

دووەم - دەست تێوەردانی ناڕاستەوخۆ covered intervention

لەم حاڵەتەدا بانکی ناوەندی لە ڕێگەی بانکە بازرگانییەکانەوە دەخالەت دەکات لە کڕین و فرۆشتنی دراودا، هەندێ جاریش ئەم دەست تێوەردانە بەشێوەیەکی نهێنی بەڕێوەدەچێت.

ئەوەی جێگەی ئاماژە پێدانە دەست تێوەردان لەلایەن بانکی ناوەندییەوە تەنها چارەسەرێکی کاتییە. چونکە زوو یان درەنگ یاسای داوا و خستنەڕوو جارێکی دیکە کاردەکەنە سەر نرخی کڕین و فرۆشتنی دراوەکان. ئابووریناسان دەست تێوەردان بەپێی ئاڕاستەکانی بەم شێوەیەی خوارەوە پۆلێن دەکەن.

- دەست تێوەردان لەبەرژەوەندی بازاڕی گۆڕینەوە:

لەم حاڵەتەدا دەست تێوەردان ئاڕاستە دەکرێت بۆ خێرایی کردنی گۆڕینی نرخی دراو کە پێشتر نەخشەی بۆکێشراوە، بەم جۆرە بەشێوەیەکی هێدی ئاڕاستەی داوا و خستنەڕوو هاوسەنگ دەکرێت بۆ پاڵپشتکردنی نرخی گۆڕینەوەی دراوی نیشتمانی.

- دەست تێوەردان بەپێچەوانەی بازاڕی گۆڕینەوە:

لەم حاڵەتەدا دەست تێوەردان ئاڕاستە دەکرێت بۆ گەڕاندنەوەی نرخی گۆڕینەوە بۆ دۆخی پێشوتری، هەندێ جاریش ئاکامەکەی نێگەتیڤ دەبێت.

لەبەرئەوەی بانکی ناوەندی ژاپۆن بەشێوەیەکی چالاك دەخالەت لە مامەڵەکردنی گۆڕینەوەی دراوەکان لە بازاڕی دراوی جیهانی دەکات. بۆیە بەپێویستمان زانی لەسەر نموونەی ژاپۆن کاریگەری دەست تێوەردان زیاتر روون بکەینەوە.

### دەست تێوەردان لەلایەن بانکی ژاپۆنەوە

ڕۆژی ٢٢-٠٩-٢٠٠٣ دووشەمە نرخی دۆلار بەرامبەر یەن بەرێژەیەکی زۆر دابەزی بە بڕی (٢٠٠ پنت)، هۆکەش دەگەڕێتەوە بۆ بلاوکردنەوەی بەیانی کۆتایی کۆبوونەوەی حەوت وڵاتە گەورەکەی جیهان کە هەوڵی ئەوە دەدەن نرخی گۆڕینەوەی دراو بەتەواوەتی ئازاد بکەن، واتە بەشێوەیەکی راستەوخۆ دەخالەت لە بازاڕی گۆڕینەوەی دراو نەکەن. ئەم هەواڵە لەبەرژەوەندی ژاپۆن و چین نەبوو چونکە ئەو دوو وڵاتە لەپێناوی بەرگری کردن لە نرخی گۆڕینەوەی دراوی نیشتمانی بە بەردەوامی دەخالەتی راستەوخۆ دەکەن لە بازارەکانی گۆڕینەوەی دراودا. ئەم بڕیارە زیاتر ئەمریکا پشتگیری دەکرد بۆ ئەوەی بالانسی بازرگانی هاوسەنگ بکات. بەهۆی وێنەی ژمارە (٢٤-٧) ئاکامی ئەو هەواڵە نیشان دەدەین.



وێنەی ژمارە (٢٤-٧) نرخی گۆڕینەوەی دۆلار بەرامبەر یەن ٢٢-٠٩-٢٠٠٣




ئابووریناسان ئاگاداری حکومەتەکان دەکەنەوە کە هەموو دەست تێوەردانێك رەنگە ئاکامی پۆزەتیڤانەی نەبێت بەڵکو بەپێچەوانەوە هەندێ جار رەنگە ئاکامەکەی نێگەتیڤانە بێت. زۆربەی خەڵکانی ناپسپۆر لەبواری داراییدا وادەزانن بەهێزی دراوی نیشتمانی شتێکی باشە. بەڵام ئەمە وانییە ئەگەر ئابووری وڵات زیاتر ئاڕاستەی هەناردنە دەرەوەی هەبێت ئەوا بەهێزی دراوی نیشتمانی زیان دەگەیەنێت بەو کۆمپانیانەی کە خەریکی ناردنەدەرەوەی بەرهەمەکانیانن بۆ زیاتر تێگەیشتن سەیری ئەم نموونەیە بکەن.

گریمان کۆمپانیای TOYOTA بۆ دروستکردنی ئۆتۆمبیلێك پێویستی بە بڕی (١٢٠٠٠٠٠,٠٠) یەن هەیە. ئەگەر نرخی گۆڕینەوەی یەن بەرامبەر دۆلار بریتی بێت لە (١٢٠ یەن بەرامبەر ١ دۆلار)، ئەوا بڕی پێویست بۆ دروستکردنی یەك ئۆتۆمۆبیل بریتی دەبێت لە (١٠٠٠٠ دۆلار). ئەگەر رێژەی سوودی قەرز بریتی بێت لە (١٠%) ساڵانە ئەوا خەرجی بۆ بەرهەمهێنانی یەك ئۆتۆمۆبیل بریتی دەبێت لە (١١٠٠٠ دۆلار)، گریمان لەکاتی

فرۆشتندا واتە ناردنە دەرەوەی ئۆتۆمۆبیل بەمەبەستی فرۆشتن نرخی گۆڕینەوەی یەن بەرامبەر دۆلار بەرزدەبێتەوە واتە یەن بەرامبەر دۆلار بەهێزدەبێت بەبڕی (١٠٠ یەن بەرامبەر ١ دۆلار). ئەو کاتە داهاتی کۆمپانیاکە بەم شێوەیەی خوارەوەی لێ دێت﴿١١٠٠٠٠٠,٠٠ یەن = ١١٠٠٠ دۆلار×١٠٠ دۆلار/یەن﴾

ئەوا لەم حاڵەتەدا کۆمپانیای TOYOTA نەك قازانج ناکات بەڵکو زەرەرمەندیش دەبێت.

- ١٠٠٠٠٠،٠٠ یەن = ١١٠٠٠٠٠،٠٠ یەن - ١٢٠٠٠٠٠،٠٠ یەن

هەروەك لەپێشەوە ئاماژەمان پێدا هەموو دەست تێوەردانێك ئەنجامی پۆزەتیڤانە نادات بەدەستەوە بەڵکو بەپێچەوانەوە ڕەنگە ئەنجامی نێگەتیڤی هەبێت، لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە، ئایا چ فاکتەرێکی دیکەی ئابووری کاردەکاتە سەر نرخی گۆڕینەوەی دراو؟ ئەو فاکتەرە بریتییە لە بڕ و بارستایی پارە. چەند بڕی پارە زیاتر بێت ئەوا نرخەکەی کەم دەبێتەوە وە بەپێچەوانەشەوە چەند بڕ و بارستایی پارە کەمتربێت ئەوا نرخەکەی زیاد دەکات. لە فەسڵی چواردەهەمدا بەشێوەیەکی چڕوپڕ باسمان لە بارستایی پارەو خواست لەسەر پارە و یاسای سوڕانەوەی پارە کردووە، وە هەروەها بەدوور و درێژی باسمان لە چەندێتی هاوکێشەی ئاڵوگۆڕکردنەوە کردووە. بۆیە بەپێویستی نازانین جارێکی دیکە دووبارەی بکەینەوە.

**فەرهەنگی ئابووری**

تیۆری پارەگێڕی Management of Money

ئەم تیۆرە ئابووریناسی ئینگلیزی (کینز) دایناوە بەمەبەستی چارەسەرکردنی سیستەمی نەختیی دەوڵەتان لەسەر بنچینەیەکی نوێ، واتە پەیڕەوی کردنی سیاسەتێکی نەختینەیی بەهێز بۆ جێگیریی نرخەکان لەرێگەی دەست تێوەردانی بانکە ناوەندییەکان لە بازاڕی دراو.

ئەمەش بە دوو ڕێباز جێبەجێ دەکرێت:

١- بەکارهێنانی نرخی داشکاندن بەمەبەستی کارکردنە سەر بڕی پارەی ئاڵوویرکراو، واتە بەرزکردنەوزەی نرخی داشکاندن لەلایەن بانکەکان کاتی بوونی ئارەزووی بەرزکردنەوەی ئاستی نرخەکان.

٢- دەست تێوەردان لە کردەکانی بازاڕی کراوە بە مەبەستی کارکردنە سەر هۆیەکانی پێدان، واتە کڕین و فرۆشتنی کاغەزی دارایی لەلایەن بانکە ناوەندییەکانەوە.

# فەسڵی بیست و پێنج

## بازاڕی کاغەزی دارایی

بازاڕی کاغەزی دارایی:- بریتییە لە میکانیزمی پەیوەندی نێوان کڕیار و فرۆشیار. بەواتایەکی دیکە بریتییە لە میکانیزمی پەیوەندی (داوا و خستنەڕوو). کاڵای بازاڕی دارایی بریتییە لە کاغەزی بەنرخ و پشك و قەواڵەی کۆمپانیەکان. توانای دارایی و ئابووری کۆمپانیاکان بە بڕ و نرخی قەواڵەکانیان دیاری دەکرێت. بازاڕی دارایی هەروەك بازاڕەکانی سەرمایە و، دراو هاوبەشن چونکە لەگشت حاڵەتەکاندا بریتییە لە جوڵانەوەی (دراو). دەتوانین بەشێوەیەکی گشتی بەهۆی ئەم هاوکێشەیەی خوارەوە پێناسەی بازاڕی دارایی بکەین:

بازاڕی دارایی = بازاڕی دراو + بازاڕی سەرمایە.

لە وێنەکەی خوارەوەدا پێکهاتەی بازاڕی دارایی نیشان دەدەین.

وێنەی ژمارە (٢٥-١) پێکهاتەی بازاڕی دارایی.






لە بازاڕی دراودا - پاشەکەوتکردن بۆ ماوەیەکی کورت (تا یەك ساڵ) دەکرێت، بەلاّم لە بازاڕی سەرمایەدا - پاشەکەوتکردن بۆ ماوەیەکی مام ناوەندی یان درێژ خایەن (ساڵێك زیاتر) دەکرێت .

بازاڕی دارایی — پێکهاتووە لە هەردوو بازاڕی دراو بازاڕی سەرمایە. یان بەواتایەکی تر هەردوو بازاڕی دراو سەرمایە دەگرێتە خۆی.

لە سیستەمی ئابووری ئازادا بازاڕی کاغەزی دارایی باشترین ئامرازە بۆ دابەش کردن و دابەشکردنەوەی پارەی پاشەکەوتکراو لە رێگەی پێدانی قەرزەوە، جگە لەوەش بازاڕی کاغەزی دارایی میکانیزمی بازاڕ زیاتر سەربەست دەکات لە بەگەڕخستنی سەرمایەی دارایی لە کەرتە جیاجیاکانی ئابووریدا.

**بازاڕی کاغەزی دارایی حکوومەت و چالاکی بانکی ناوەندی لەبازاڕدا**

حکوومەت لەرێگەی بانکی ناوەندییەوە، بەتایبەتی لەرێگەی خەزێنەی دەوڵەتەوە بۆ جێبەجێ کردنی پرۆژەکانی و ئاراستەکردن و دابەشکردنەوەی بودجە و چارەسەرکردنی کورتهێنانی بودجە، کاغەزی دارایی لەشێوەی (سەنەد) دەردەکات و دەیفرۆشێتەوە بە بانکە بازرگانەکان و کۆمپانیاکان بەرامبەر قازانجێکی دیاری کراو. جگە لەو ئەرکانەی سەرەوە حکوومەت بەهۆی سەنەد فرۆشتنەوە دەتوانێت کۆنترۆڵی بارستایی پارە و چەندایەتی بڕی پارە بکات، لە بازاڕی ناوخۆدا. دەرکردنی کاغەزی دارایی (بۆند- سەنەد) ئەرکی راستەوخۆی بانکی ناوەندی یە، چونکە تەنها بانکی ناوەندی ئاگاداری جوڵانەوە و جموجۆڵی پارەیە. سەنەدی حکوومەت سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ کۆکردنەوەی سەرمایەی پێویست تاکو بتوانێت پرۆژە ستراتیژییەکانی جێبەجێ بکات. بەپێی یاسا لەزۆربەی ولاّتەکاندا بانکی ناوەندی رێگە دەدات بەدەسەلاّتی ناوچەیی (پارێزگا، شارەوانی) بەدەرکردنی سەنەد و فرۆشتنەوەی بۆ پڕکردنەوەی کورتهێنانی بودجەکانیان.

سیفەتی بۆندی حکوومی لەوەدایە کە کڕیاری ئەو بۆندانە سەربەستن لە فرۆشتنەوەی. چونکە کاتێك هەڵگری بۆند پێویستی بە پارە بێت ئەوا تەنها رێگە بۆ دەستکەوتنەوەی بڕی پارەی پێویست فرۆشتنەوەی ئەو سەنەدانەیە بێگومان بە قازانجێکی زۆرتر، ئەو زیادە قازانجەش لەئەنجامی سنورداریێتی کڕیارانی بۆندە لە بانکی ناوەندی، ئەمەش دەبێتە هۆی پەیدابوونی بازاڕی کڕین و فرۆشتنەوەی بۆند بەجۆرێك نرخەکانیان بەپێی میکانیزمی بازار (داوا و خستنەڕوو) دیاری دەکرێت.

کاغەزی دارایی حکوومەت دوو جۆر بەهای هەیە:

یەکەم – بەهای سەرەتایی (ڕاستەقینە) لەم حاڵەتەدا حکومەت ڕێژەی سوودی سەنەدەکە جێگر دەکات کە پێی دەوترێت (yield).

دووەم – بەهای بازاڕی لەم حاڵەتەدا بەشدارانی بازاڕ بەپێی یاسای (داوا و خستنەڕوو) ڕێژەی سوودی فرۆشتنەوە دیاری دەکەن.

بۆ ئەوەی ئەم پرۆسەیە زیاتر روون بێت سەیری ئەم نموونەیەی خوارەوە دەکەین.

گریمان بانکی (A) بەنرخی سەرەتایی (١٠٠) یەکە سەنەد لە حکوومەت دەکرێت بەرامبەر ڕێژەی قازانجی (٣٪) ساڵانە. ئەو کاتە حکوومەت لەماوەی ساڵێکدا (١٠٠) یەکە لەگەڵ قازانجی (٣٪) دەگەڕێنێتەوە بۆ بانکی (A). گریمان بانکی (A) ئەو سەنەدانە بە نرخی (٩٥) یەکە دەفرۆشێتەوە بەبانکی (B)، ئەو کاتە بانکی (B) لەماوەی ساڵێکدا نرخی سەرەتایی سەنەدەکە لەگەڵ ڕێژەی قازانجدا دەگەڕێنێتەوە بۆ بانکی (A). ئەو کاتە قازانجی بانکی (A) بریتی دەبێت لە (٨) یەکە.

(١٠٠- ٩٥) + ٣ = ٨

بەشێوەیەکی گشتی مامەڵەکردن بەسەنەدی حکوومی تەنها بەدراوی نیشتمانی دەکرێت، ئەمەش دەبێتە هۆی زیادبوونی داوا لەسەر دراوی نیشتمانی، جگە لەوەش چەند ڕێژەی قازانجی ئەو سەنەدانە بەرزتر بێت ئەوا دەبێتە هۆی زیاتر ڕاکێشانی سەرمایەگوزاری، چونکە سەرمایەدار لەو شوێنەدا سەرمایەکەی بەگەڕ دەخات کە قازانجەکەی زیاتر بێت. وەك لەوێنەکەی خوارەوەدا نیشانی دەدەین.

وێنەی ژمارە (٢٥-٢) کاریگەری داهاتی کاغەزی دارایی لەسەر نرخی ئاڵوویری دراو.






## ئەرکی بانکی ناوەندی لە بازاڕی دارایی دا

یەکێك لەئامرازە گرنگەکان کە دەتوانێت بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ کاریکاتە سەر سوڕانەوەی (گوێزانەوەی) پارە لە بازاڕەکاندا بریتییە لە ئەرکی بانکی ناوەندی لە ڕێکوپێك کردنی کڕین و فرۆشتنی کاغەزی داراییدا بە بانکە بازرگانییەکان. کاتێك بانکی ناوەندی هەڵدەستێت بە کڕینەوەی کاغەزی دارایی ئەوا بەرامبەر ئەو بڕە پارە دەخاتە سەر حسابی بانکە بازرگانییەکە، بەمەش پارەی پاشەکەوت لەسەر حسابی یەدەکی بازرگانی زیاد دەکات. بەڵام کاتێك بانکی ناوەندی هەڵدەستێت بە فرۆشتنی کاغەزی دارایی ئەوا ئەو بڕە پارەیەی کە لەسەر حسابی پاشەکەوتکردنی بانکی بازارگانییە ڕادەکێشرێتەوە (چونکە حسابی پاشەکەوتکراوی یەدەکی لەژێر چاودێری بانکی ناوەندیدایە) بەمەش بانکی ناوەندی دەتوانێت کۆنترۆڵی سوڕانەوەی پارە و بارستەی چەندایەتی پارە بکات.

ئەمڕۆکە لەسەردەمی جیهانگیریدا ئەمە تاکە ئامرازە بۆ ڕێکوپێك کردنی بڕی پارە و سوڕانەوەی پارە، هەر بەهۆی ئەم ئامرازەشەوە دەتوانێت جولانەوە و ئاراستەی (داوا و خستنەڕوو) تارادەیەك کۆنترۆڵ یان ڕێکوپێك بکات.

بانکی ناوەندی بە دوو شێوە دەتوانێت بازاڕی قەرزی دارایی سەقامگیر بکات:

یەکەم- سیاسەتی زەمینە خۆش کردن بۆ زیادبوون و فراوانکردنی خستنەڕووی پارە.

سیاسەتی فراوانکردنی خستنەڕووی دراو

(Expansionary Policy,Easy Mony Pohicy)

ئەم سیاسەتە لەکاتێکدا بەکاردەهێنرێت ئەگەر هاتوو باری ئابووری بەرەو تەنگەژی بچێت. میکانیزمی ئەم سیاسەتە لەوەدایە کە بانکی ناوەندی بانکە بازرگانییەکان پارەدار دەکات بۆ ئەوەی ئەو بانکانە بتوانن قەرزی هەرزان پێشکەش بە دانیشتوان و کۆمپانیا سەرمایەگوزارییەکان بکەن. کە دەبێتە هۆی فراوانکردن و زیادبوونی توانای کڕین و سەرمایەگوزاری، بۆ جێبەجێ کردنی ئەم ئەرکەش بانکی ناوەندی دەکەوێتە کڕینەوەی بۆندەکانی لەو بانکانە، لەئەنجامدا بڕی پارە زیاددەکات کە دەبێتە هۆی دابەزینی ڕێژەی قەرز و بوژانەوەی باری ئابووری.

دووەم- چوونەوەیەکی (گرژبوونی) سیاسەتی دارایی

(Contractionary Policy, Tigt Mony Policy)

ئەم سیاسەتە لەکاتێکدا بەکاردەهێنرێت ئەگەر هاتوو بووژانەوەی ئابووری بگاتە ئاستێکی زۆر بەرز. چونکە لەو حاڵەتەدا بەرهەم زیاد دەبێت بەمەش بڕ و بارستایی پارە زۆرتر دەبێت کە

دەبێتە هۆی پەیدابوونی هەڵاوسان، لەئەنجامدا دەبێتە هۆی گرژی باری ئابووری و قەیرانی ئابووری. بۆ دەربازبوون لەم حاڵەتە بانکی ناوەندی بەشێوەیەکی لەسەرخۆ هەنگاو بەهەنگاو دەبێت هەوڵی دابەزینی سوڕی ئابووری بدات، واتە دەبێت بەشێوەیەکی خشۆکی گەشەی ئابووری رابوەستێنێت (بۆ نموونە ئابووری وڵاتی چین ئەمڕۆکە لەو حاڵەتەدایە)، بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارەش بانکی ناوەندی دەکەوێتە فرۆشتنی بۆندەکانی بە قازانجێکی گونجاو بەمەش ئەکتیڤی دراوی بانگە بازرگانییەکان کەم دەبێتەوە، لەئەنجامدا دەبێتە هۆی زیادبوونی بێکاری و سستی چالاکی ئابووری و کەم بوونەوەی سەرمایەگوزاری و دابەزینی توانای کڕین تاکو باری ئابووری ئاسایی دەبێتەوە و هەڵاوسان کەم دەبێتەوە.

**- جۆرەکانی کاغەزی دارایی (سەنەد – بۆند) حکومی**

بەشێوەیەکی گشتی و لەپراکتیدا و بەپێی سیفەتەکانی جۆرەکانی کاغەزی دارایی (سەنەد) لەجیهاندا بریتین لە:

– سەنەدی گەنجینەیی:- بریتییە لە پابەندی حکوومەت بە فرۆشتن و کڕینەوەی سەنەدەکانی لەماوەی ساڵێکدا وە جێگیرکردنی بڕی رێژەی سوودی ساڵانە، لە نرخی سەرەتاییەوە، ئەم جۆرە سەنەدانە لە ئەمریکا زیاتر مامەڵەی پێ دەکرێت کە ناسراوە بە (Treasury Bill, T-Bill).

– سەنەدی گەنجینەیی بۆ ماوەیەکی درێژ خایەن:- بریتییە لە پابەندی حکوومەت بە فرۆشتن و کڕینەوەی سەنەدەکانی لەماوەی ساڵێکدا تاکو پێنج ساڵ، لەم حاڵەتەشدا رێژەی بڕی سوود جێگر دەکرێت.

– سەنەدی گەنجینەیی (١٠) ساڵی:- ئەم جۆرە سەنەدانە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا مامەڵەی پێ دەکرێت کە ناسراوە بە

١٠–year Treasury Note

– Gilts:- ئەم جۆرە سەنەدانە لە بەریتانیا بەکاردەهێنرێت، کە بریتییە لە پابەندبوونی حکوومەت بە کڕینەوەی ئەو سەنەدانەی کە فرۆشتویەتی بەنرخێکی زیاتر وەك لەوەی کە فرۆشتویەتی، ئەم کاغەزانە هێڵێکی ئاڵتوونی تێدا وێنە کراوە.

– سەنەدی حکوومەتی ژاپۆنی Japanse Government Bonds- JGB ئەم جۆرە سەنەدانە لە ژاپۆن مامەڵەی پێ دەکرێت، بانکی ناوەندی ژاپۆن هەموو مانگێك ئەو سەنەدانە دەکرێتەوە بۆ ماوەی ١٠ تاکو ٢٠ ساڵ بۆ ئەوەی سیستەمی قەرزی دارایی سەقامگیر بکات.



- سەنەدی ئەوروپایی:- ئەم جۆرە سەنەدە زیاتر لە ئەڵمانیا مامەڵەی پێ دەکرێت کە ماوەکەی (١٠) ساڵە.

- یۆرۆ بۆند Euro Bond:- ئەم جۆرە سەنەدانە وڵاتانی ناوچەی یۆرۆ بۆ دەرەوەی ئەوروپا دەری دەکەن، ئەم جۆرە سەنەدانە مەرج نییە لە ئەوروپا مامەڵەی پێ بکرێت، هەرچەندە بازاڕی سەرەکی دەکەوێتە لەندەنەوە، بەڵام زیاتر وڵاتانی تر ئەم جۆرە سەنەدانە دەکڕن و دەفرۆشنەوە. ئەم جۆرە سەنەدانە زیاتر بەستراون بە دراوی وڵاتانی ترەوە (جگە لە یۆرۆ)، بەتایبەتی دراوی ئەو وڵاتانەی کە مۆڵەتی کارکردنیان هەیە لە بازاڕی دراوی جیهانیدا.

ئەوەی جێگەی ئاماژە پێدانە، بازاڕی دراوی جیهانی (FOREX) بەشێوەیەکی گشتی مامەڵە بەو جۆرە بۆندانە دەکەن کە ماوەکەی لە ١٠ ساڵ کەمتر نەبێت.

## دیاریکردنی پلەو پایەی توانای دارایی

چەند کۆمپانیایەك لەجیهاندا پسپۆڕ و شارەزان بە دیاریکردنی پلەو پایەی توانای دارایی کۆمپانیاو حکوومەتەکان. ئەم کۆمپانیانە بەهۆی چاودێری و شیکردنەوە و مێتۆدی تایبەتی ئاستی ئەو توانایانە دیاری دەکەن. ئەو کۆمپانیا جیهانیانەش بریتین لە:

– Moodys (http://www.moodys.com)

– Standard & Poors (http://www.sand.ru)

– Fitch Ibca. ( http://www.fitchibca.com)

ئەم کۆمپانیانە بەهۆی چەند هێماو پیتێکی ئینگیزییەوە دەستنیشانی ئاست و پلەو پایەی دارایی کۆمپانیاو حکوومەتەکان دەکەن. بۆ نموونە بەرزترین پلە کە متمانەی تەواوی هەیە بۆ وەرگرتن و دانەوەی قەرز بە سێ پیتی (AAA) دەستنیشانکراوە، بەڵام نزمترین پلە بۆ وەرگرتن و دانەوەی قەرز بە پیتی (D) دەستنیشانکراوە.

هەوڵ دەدەین بەهۆی خشتەی ژمارە (٢٥-١)ەوە گشت هێماو پیتەکانی دیاریکردنی پلەو پایەی توانای دارایی و متمانە نیشان بدەین.

خشتەی ژمارە (٢٥-١) هێما و پیتەکانی دیاریکردنی پلە و ئاستی دارایی کۆمپانیا و دەزگا دارایی و بانکەکان و حکومەتەکان.

| زنجیرە | Moody's | S&P | Fitch Ibca | ڕوونکردنەوە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | Aaa | AAA | AAA | بەرزترین پلەی توانای دارایی کە دەتوانێت پابەند بێت بەجێبەجێ کردنی گشت داوا داراییەکان. |
| ٢ | Aa | AA | AA | پلەی توانای دارایی بەرزە بە جۆرێك کە دەتوانێت قەرزەکانی لەکاتی خۆیدا بداتەوە. |
| ٣ | A | A | A | پلەی توانای دارایی تا ڕادەیەك بەرزە بەڵام لەکاتی قەیرانی داراییدا ناتوانێت بەتەواوەتی پابەند بێت بە دانەوەی قەرزەکانی. |
| ٤ | Baa | BBB | BBB | توانای دارایی زۆر بەرز نییە، پابەندبوونی بەدانەوەی قەرزەکانی بەشێوەیەکی پتەو بەستراوە بە بارودۆخی دارایی و ئابوورییەوە. |
| ٥ | Ba | BB | BB | لەکاتی قەیرانی ئابووریدا تا ڕادەیەك دەتوانێت پابەند بێت بە گەڕانەوەی قەرزەکانی بەڵام چەند قەیرانەکان توندو تیژتر بێت ئەوا توانای دارایی کەم دەبێتەوە. |
| ٦ | B | B | B | لەکاتی ئاساییدا دەتوانێت پابەند بێت بەگەڕانەوەی قەرزەکانی بەڵام بەپەیدابوونی قەیرانی ئابووری ناتوانێت ئەو ئەرکە جێبەجێ بکات. |
| ٧ | Caa | CCC | CCC | توانای دارایی بەشێوەیەکی توندو تۆڵ بەستراوە بەبارودۆخی ئابوورییەوە، بەپەیدابوونی قەیرانی دارایی ناتوانێت لەکاتی خۆیدا ئەرکە داراییەکانی جێبەجێ بکات. |
| ٨ | Ca | CC | CC | توانای دارایی نزمە ئەگەری جێبەجێ نەکردنی ئەرکە داراییەکانی لەهەموو کاتێکدا لێ دەکرێت. |
| ٩ | C | C | C | زۆربەی جار قەرزدەر بۆ وەرگرتنەوەی قەرزەکانی پەنا دەباتە بەر دادگا. |
| ١٠ | | SD | | نزمی دانەوەی قەرزەکان زۆربەی جار تەنانەت دوای بڕیاری دادگاش ناتوانێت قەرزەکانی بداتەوە. |
| ١١ | D | D | D | نزمترین ئاستی توانای دارایی. |



سەرنج:- پسپۆڕانی ئابووری بەهۆی ئاستی پلەو پایەی ئێستەکیەوە دەتوانن پێشبینی بەرزبوونەوە یان نزم بوونەوەی توانای دارایی بۆ ماوەی دوو تا سێ ساڵ بکەن.

- ئەگەر پلەکەی پۆزەتیڤ بێت ئەوا ئەگەری زیاتر بەرزبوونەوەی لێ دەکرێت.
- ئەگەر پلەکەی نێگەتیڤ بێت ئەوا گریمانی زیاتر نزمبوونەوەی لێ دەکرێت.
- ئەگەر پلەکەی نەگۆڕ (جێگیر) بێت ئەوا گریمانی جێگیری و نەگۆڕی لێ دەکرێت.
- ئەگەر پلەکەی خشۆکی بێت ئەوا ئەگەری بەرزبوونەوە و، نزمبوونەوەی لێ دەکرێت.

بەشێوەیەکی گشتی بەرزترین پلەو پایە کە متمانەی تەواوی هەیە لەوەرگرتن و دانەوەی قەرزە بە سێ پیتی (AAA)، دیاری دەکرێت، بەڵام نزمترین پلەوپایە کە متمانەی تەواوی نییە بۆ وەرگرتن و دانەوەی قەرز بە پیتی (D) دیاری دەکرێت.

## ئامراز و ڕێبەرەکانی (پێوەرەکان)ی بازاڕی دارایی

- فیوچەر FUTURES:

وشەی (فیوچەر) واتە داهاتوو (ئایندە)، ئەم زاراوەیە لەساڵەکانی شەستی سەدەی نۆزدەهەمدا لەبواری بازرگانیدا بۆ یەکەم جار بەکارهاتووە. لە نێوان بازرگانە ئەمریکییەکان و بەرهەمهێنەرانی بەروبومی کشتوکاڵی. بەتایبەتی بەروبوومی (گەنم)، گرێ بەست لەشێوەی فیوچەردا واتە پابەندبوونی بازرگان لە کڕینی بەروبوومی ساڵانە. ئەم گرێ بەستە لەڕێگەی بۆرسەی خۆراکی (چیکاگۆ)وە دەبەسترا لەنێوان کڕیار و فرۆشیاری بەروبوومە کشتوکاڵیەکانەوە، بۆرسەی چیکاگۆ لەساڵی ١٨٤٨ دامەزراوە، بە بەشداری (٨٢) کۆمپانیا.

گرێ بەستی فیوچەر:- بریتییە لە گرێ بەستن لەنێوان کڕیار لەلایەکەوە وە فرۆشیار لەلایەکی ترەوە بۆ کڕینی بەرهەمێکی دیاریکراو کە لەپێشەوە نرخەکەی دیاری کراوبێت.

مەرجە سەرەکیەکانی گرێ بەستنی فیوچەر بریتین لە:

- دیاریکردنی بەرهەمەکە وەك (دراو، زێڕ، نەوت، کەرەسەی خاو، گەنم،...هتد).
- دیاریکردنی بڕی بەرهەمەکە (کۆی دراوەکان، کێشی زێڕ، ژمارەی بەرمیلە نەوتەکان، بڕی تەنی گەنم،...هتد).
- دیاریکردنی کاتی جێبەجێ کردن.

نرخی بەرهەمەکان لەبۆرسەدا بەپێی ڕێسای (داوا و خستنەڕوو) لە گرێ بەستندا دەست نیشان دەکرێت. کڕیار دەبێت سپاردەی بانکی پێشکەش بکات، دوای سپاردەی بانکی دەتوانێت بەشداری لە مامەڵەکردنی ناو بۆرسەکەدا بکات.

هەوڵ دەدەین بەیارمەتی خشتەکانی (٢٥-٢) زیاتر گرێ بەستی فیوچەر روون بکەینەوە.

خشتەکانی ژمارە (٢٥-٢) تایبەتمەندێتی گرێ بەستنی (فیوچەر).

| ناوی مانگەکان | Jan | Feb | Mar | Apr | May | Jun | Jul | Aug | Sep | Oct | Nov | Dec |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کۆدەکان | F | G | H | J | K | M | N | Q | U | V | X | Z |

جۆری دراو

| جۆری دراو | قەوارەی گرێ بەستەکە | مانگەکانی جێبەجێ کردن | هێماکان | (tick) تیك | نرخی هەر یەکەیەك |
|---|---|---|---|---|---|
| دۆلاری ئوسترالی | 100 000 | H,M,U,Z | AD | 0.0001(10$) | 1 pt=$10 |
| جونەیهی ستەرلینی | 62 500 | H,M,U,Z | BP | 0.0002($21,50) | 1 pt=$ 6,25 |
| دۆلاری کەنەدی | 100 000 | H,M,U,Z | CD | 0.0001($10) | 1 pt=$10 |
| یۆرۆ | 125 000 | H,M,U,Z | EC | 0.0001($12,50) | 1 pt=$12,50 |
| یەنی ژاپۆنی | 1 250 000 | H,M,U,Z | JY | 0.000001($12,50) | 1pt=$12,50 |
| فرانکی سویسری | 125000 | H,M,U,Z | SF | 0.0001($12,50) | 1pt=$12,50 |



**ڕێبەرەکان ( index )**

| جۆری بەرهەم | قەوارەی گرێ بەستەکە | ماوەی (مانگەکانی) جێبەجێ کردن | هێماکان | تیك (خاڵی) (نیشانەکردن) | نرخی هەر یەکەیەك |
|---|---|---|---|---|---|
| E-Mini S&p | $50xIndex val | H,M,U,Z | ES | 0,25pt($12,50) | 1pt=$50 |
| E-Mini NASDAQ 100 | $20xIndex val | H,M,U,Z | EN | 0.50pt($10,00) | 1pt=$20 |
| NASDAQ 100 | $100x Index val | H,M,U,Z | ND | 0.50 pt($50) | 1pt=$100 |
| NIKKEI 225 | $5x Index val | H,M,U,Z | NK | 5 pt ($25) | 1pt=$5 |
| S & P 500 | $250xIndex val | H,M,U,Z | SP | 0.10 pt($25) | 1pt=$250 |

لایەنی کڕیار لە گرێ بەستی (فیوچەر)دا دەبێت گشت پارەکە لەپێشەوە بدات بە فرۆشیار لەشێوەی سپاردەی بانکیدا کە پێی دەوترێت مارژی سەرەتایی (initial margin)، کە بڕەکەی بەپێی مامەڵەکردنی ناو بۆرسەکە گریانی گۆڕانی نرخی سەرەتایی لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا لێ دەکرێت لەپراکتیکدا و بەشێوەیەکی گشتی ئەو گۆڕانکارییە لەنێوان (٢٪ تاکو ١٠٪) دەبێت لەکۆی بڕی گرێ بەستەکە. مارژ (margin) زیاتر ئەرکی متمانەی دارایی بۆ حاڵەتی کتوپڕ جێبەجێ دەکات بەواتایەکی دیکە بریتییە لە بەدەك (پارە و کات) لەحاڵەتی کتوپڕدا. واتە لەکاتی شێواندنی دینامیکی بازاڕدا.

بۆرسەکان بەشێوەیەکی گشتی ماوەی چوار مانگ دیاری دەکەن بۆ کڕین و فرۆشتنی بەرهەمەکان (چ عەینی و چ دارایی). بۆ نموونە بۆ کڕین و فرۆشتنی یەنی ژاپۆنی مانگەکانی (مارت، حوزەیران، ئەیلول، کانوونی یەکەم -(H,M,U,Z) دیاری کراوە. "سەیری خشتەکانی ژمارە ٢٥-٢ بکە".

وە بەهۆی چەند نموونەیەکەوە میکانیزمی چۆنیەتی گرێ بەست بۆ ئایندە (فیوچەر) نیشان دەدەین.

ئەو کۆمپانیانەی کە خەریکی بەرهەمهێنانی شیرەمەنی و شیرینین بەتایبەتی شکۆلاتە و نەستەلە و...هتد، پێش سێ مانگ گرێ دەبەستن بۆ کڕینی کاکاو،...هتد. چونکە بەبێ کاکاو ناتوانن شیرەمەنی بەرهەم بێنن ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە بەرهەمی کاکاو بەستراوە بەڕەوشی سروشتییەوە وەك گۆڕانکاری لە کەش و هەوادا، بێ بارانی،...هتد. ئەمەش ڕەنگە ببێتە هۆی بەرزبوونەوەی نرخەکەی. بۆیە کڕیار پێش سێ مانگ ناچار دەبێت بەنرخێکی دیاریکراو گرێ بەستەکە ئیمزا بکات. دوابەدوا بەشێوازی زیادکردنی ئاشکرا (auction) لەڕووبەڕێکی دیاریکراودا کە پێی دەوترێت (pit) مامەڵەکردن دەست پێ دەکات، زۆربەی چەرچیەکان لەکاتی مامەڵەکردن بە گرێ بەستی فیوچەری زیاتر ئەو کڕیارانە هەڵدەبژێرن کە توانای زیادکردنی ئاشکرایان هەیە وەك (نەوت، گەنم، قاوە، زێڕ، مس، شەکر، گاز،...هتد).

گرێ بەستنی فیوچەری (ئاییندەیی) چەند شێوازێکی هەیە، لەهەرە گرنگەکانیان:

– گرێ بەستی فیوچەر بۆ ڕێژەی سوودی سەنەد (بۆند) ئەو ڕێژەیە لەکاتی گرێ بەستەکەدا دەردەکەوێت و پێی دەوترێت (Fed Funds rate) بەهای سەنەدەکە بەپێی گۆڕانکاری لەڕێژەی سوودی داهاتوودا دیاری دەکرێت. وەکو ڕێبەرێك بانکە ناوەندییەکان بەکاری دەهێنن بۆ دیاریکردنی بەهای سەنەدەکانیان.

– گرێ بەستی فیوچەر بۆ ماوەی سێ مانگ (یۆرۆ- دۆلار) - هەروەك گرێ بەستەکەی پێشوو نرخی گۆڕینەوەی دۆلار بەرامبەر یۆرۆ لەداهاتوودا بۆ ماوەی سێ مانگ دیاری دەکرێت لە کەریدۆرێکی (چوارچێوەیەکی) دیاریکراودا، جگە لەوەش ئەم ڕێبەرە بۆ نرخی گۆڕینەوەی دۆلار بەرامبەر یەنی ژاپۆنیش بەکاردێت.

– گرێ بەستی فیوچەری سێ مانگی (Euribor) بەهۆی ئەم گرێ بەستەوە چاوەڕوانی سپاردەی بانکی بۆ ماوەی سێ مانگ دیاری دەکرێت بۆ یۆرۆ – یۆرۆ (Euro-Euro)، تاکو بڕی پێویستی یۆرۆ لە بانکدا هەڵبپسێرێت بەرامبەر ئەو بڕە دۆلارەی مامەڵەی پێ دەکرێت.

– گرێ بەستی فیوچەری سێ مانگی دۆلار بەرامبەر فرەنکی سویسری، لەم گرێ بەستەدا ڕەچاوی گۆڕانی نرخی گۆڕینەوەی دۆلار بەرامبەر فرەنکی سویسری دەکرێت بۆ ماوەی سێ مانگ. (USD/CHF).



– گرێ بەستی فیوچەری سێ مانگی دۆلار بەرامبەر جونەیهی ستەرلینی، لەم گرێ بەستەدا ڕەچاوی گۆڕانی نرخی گۆڕینەوەی دۆلار بەرامبەر جونەیهی ستەرلینی دەکرێت بۆ ماوەی سێ مانگ (GBP/USD).

## سەربەستی هەڵبژاردن (Option)

سەربەستی هەڵبژاردن (ئۆپشن):- بریتییە لە گرێ بەست کە لەنێوان کڕیارو فرۆشیاردا دەبەسترێت. بەجۆرێك کڕیار مافی هەڵبژاردنی جێبەجێ کردن یان جێبەجێ نەکردنی ئەو گرێ بەستەی دەدرێتێ. کڕیار لەکاتی جێبەجێ نەکردنی ناوەڕۆکی گرێ بەستەکە دەتوانێت ئارەزوومەندانە پاداشت (premium) بدات بە فرۆشیار وە هەروەها بەپێی ئارەزووی خۆی دەتوانێت بڕی ئەو پاداشتە دیاری بکات. ئەم جۆرە گرێ بەستانە ئەولەویەت دەدات بە هەردوو لایەن کە گرێ بەستەکەیان مۆر کردووە (کڕیار و فرۆشیار) لە کڕین و فرۆشتنی بەرهەمەکانیان بەیەکتری.

گرێ بەستی سەربەستی هەڵبژاردن دوو جۆری هەیە:-

یەکەم:- هەڵبژاردنی کۆڵ (call option):- بریتییە لە گرێ بەست کە مافی تەواوەتی دەدات بە کڕیار بەنرخێکی دیاریکراو لەماوەیەکی دیاریکراودا بەرهەم لە فرۆشیارەکە بکڕێتەوە بەرامبەر خەڵاتێکی دیاریکراو بەفرۆشیار. جگە لەوەش فرۆشیار هیچ مافێکی نییە بەوەی کە کڕیار دەتوانێت جارێکی تر ئەو بەرهەمە بفرۆشێتەوە، بەواتایەکی دیکە کڕیار مافی کڕینەوەی گرێ بەستەکەی هەیە بەرامبەر خەڵاتێکی دیاریکراو.

دووەم:- هەڵبژاردنی پوت (put option):- بەهەمان شێوەی پێشوو کڕیار مافی کڕینی تەواوی هەیە، بەڵام لەم حاڵەتەدا کڕیار دەتوانێت چاوەڕێی بەرزبوونەوەی نرخ بکات، ئەوساکە بەرهەمەکە بفرۆشێتەوە.

جیاوازی لەنێوان گرێ بەستی هەڵبژاردنی سەربەست و گرێ بەستەکانی تر لەوەدایە، مافی کڕینەوە دەدات بە کڕیار بەبێ ئەوەی پابەند بێت بە جێبەجێ کردنی بەندەکانی گرێ بەستەکەوە.

مامەڵەکردن بە گرێ بەستی سەربەستی هەڵبژاردن زیاتر لە ساڵی (١٩٧٣)دا بڵاوبۆتەوە، لەو کاتەوە زۆربەی بۆرسەکان بەم جۆرە گرێ بەستە دەستیان بەکار کرد، بەڵام تاکو ساڵی (١٩٨٤) تەنها لەبواری مامەڵە کردن بە بەرهەمی (عەینی) بەکار دەهات، دوابەدوا ئەم جۆرە گرێ بەستە لەبواری دارایدا بەکارهێنرا بەتایبەتی لە کڕین و فرۆشتنی کاغەزی بەنرخ

و شەیری کۆمپانیا و دەزگا داراییەکان. جگە لەوەش زۆربەی کۆمپانیاکان لە دەرەوەی بۆرسەکان سەودا لەگەڵ یەکتری بەهۆی ئەم جۆرە گرێ بەستانەوە دەکەن چونکە ئاستی ریسك (مەترسی) کەمتر دەکاتەوە .

– **پێشەنگ (ئارەزوومەندی) فۆروەرد** (For ward)

گرێ بەستی ئارەزوومەندانە (For ward contract- deal):- بریتییە لە گرێ بەستن لەنێوان دوو لایەندا کە باس لەکڕین و فرۆشتنی بەرهەمێکی دیاریکراو دەکرێت، جیاوازی ئەم جۆرە گرێ بەستە لەگەڵ ئەوانەی پێشووتردا لەوەدایە کە کڕیار و فرۆشیار بەشێوەیەکی راستەخۆ واتە بەبێ هیچ ناوەندێك بەشداری (جامبازەکان) دەیبەستن، ئەوەی جێگەی ئاماژە پێدانە ئەم جۆرە گرێ بەستانە لەناو بۆرسەکاندا نابەسترێت.

ئێستاکە کاتی ئەوە هاتووە باس لە بۆرسە و شێوەی کارکردنیان و جۆرەکانیان بکەین. بەهۆی چەند فاکتەرێکی ئابووری و مێژووییەوە زۆربەی بۆرسەکان کەوتوونەتە ئەمریکاوە هەر لەرێگەی ئەو بۆرسانەوە بەرهەمە ستراتیژیەکان دەکڕدرێن و دەفرۆشرێنەوە کە پێی دەوترێت بۆرسەی فیوچەری بەرهەمەکان، کە لەهەرە بەناوبانگ و گرنگەکانی بریتین لە:-

-(CBOT)- Chicago Board of Trade)

(http://www.cbot.com)

لەم بۆرسەیەدا مامەڵە بەم بەرهەمانە دەکرێت (گەنم، گەنمەشامی، برنج، فاسۆلیا، ئارد، زەیت، پاقلە، زیو، سەنەدی گەنجینەی فیدراڵی، سەنەدە حکومیەکانی تر، رێبەری (index) داوجۆنس).

-(CME- Chicago Mercantile Exchange)

(http://www.cme.com)

لەم بۆرسەیەدا جگە لەچەند بەرهەمێکی ستراتیژی، گۆڕینەوەی دراوە سەرەکییە جیهانیەکانیش مامەڵە دەکرێت وەك دۆلاری ئەمریکی، جونەیهی ستەرلینی، یۆرۆ، یەنی ژاپۆنی، فرەنکی سویسری، دۆلاری کەنەدی، پێسۆی مەکسیکی. جگە لەوەش لەم بۆرسەیەدا بەشێوەیەکی فراوان مامەڵە بە رێبەر و شەیری زۆربەی بۆرسە تایبەتەکانی تر دەکرێت، لەسەر شاشەی سەرەکی ئەم بۆرسەیەدا ( OSB-Oriented Strand Board) ئیندێکسی ئەم بۆرسانە بەدی دەکەین وەك ((S&P 500)، (S&P Mini)، (FT-SE 100)، (NASDAQ 100)، (NiKKei 225)، (Russell 2000)، (S&P Mid Cap 400)، (Euro Yen)، (Fed Funds Rate)، (LIBOR -1 month)).



-(NYMEX-Division of New York Mercantile Exchange)

(http://www.nymex.com)

لەم بۆرسەیەدا زیاتر مامەڵە بەسەرچاوەکانی وزە دەکرێت وەك (نەوت، بەنزین، گازی سروشتی،...هتد)

-(COMEX- Division of New York Mercantile Exchange)

(http:// www.comex.com)

لەم بۆرسەیەدا زیاتر مامەڵە بە میتاڵە گرانەکان دەکرێت وەك (زێڕ، زیو، مس، پلاتین،...هتد)

-(CSCE-Coffee,Sugar, Cocoa Exchange,lnc)

(http://www.csce.com)

لەم بۆرسەیەدا زیاتر مامەڵە دەکرێت بەم بەرهەمانەوە وەك (قاوە، کاکاو، زەیت، پەنیر، شیری وشك، شەکر بە هەموو جۆرەکانییەوە).

-(KCBT- Knasas City Board of Trade)

(http://www.kcbt. com)

ئەم بۆرسەیە تایبەتە بە مامەڵەکردن بە (گەنم).

-(CTN- New York Cotton Exchange)

(http://www.nyce.com)

ئەم بۆرسەیە تایبەتە بە مامەڵەکردنی لۆکە و سەنەدی گەنجینەی فیدراڵی ئەمریکی.

جگە لەو بۆرسە تایبەتانەی سەرەوە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا چەند بۆرسەیەکی تری جیهانیش بەهەمان ئاراستە کاردەکەن و مامەڵە بەو بەرهەمانەوە دەکەن کە پێشتر باسمان لێ کردووە. هەرە گرنگەکانی بریتین لە:

-(LIFFE- London International Financial Futures Exchange))

-(EOE- European Options Exchange)

-(DTB- Deutsche Terminboerse)

-(SIMEX- Singapore International Monetary Exchange).

## ئیندێکس (index) چییە؟

سەرنج:- لەزمانی کوردی دا بەرامبەر وشەی (ئیندێکس) ئەم زاراوانە بەکاردەهێنرێت (توان، ڕێبەر، هاوکۆلکە، دەلیل). ئێمە وشەی ڕێبەر یان ئیندێکس بەکاردەهێنین.

ئیندێکس دینامیکی بازاڕ بەتایبەتی بازاڕی دارایی لەبۆرسەکاندا نیشان دەدات. پلەو ئاستی ئیندێکس بەستراوە بە نرخی سەنەد و قەواڵە و پشکی کۆمپانیاکان لەبۆرسەکاندا. بەشێوەیەکی گشتی بەهۆی دینامیکی ئیندێکسەوە دەتوانین ئاستی دارایی و توانای دارایی و بارودۆخی ئابووری کۆمپانیاکان یان وڵاتان دیاری بکەین. جگە لەوەش بەهۆی زانین و تێگەشتن لە دینامیکی ئیندێکس دەتوانین دەرئەنجامی ئەوە بکەین ئایا چ کەرتێکی ئابووری لە گەشەکردندایە، یان چ کەرتێك لە گرژیدایە، وە هەروەها دەتوانین ئاراستەی گەشەکردن یان گرژبوونی کەرتە ئابوورییەکان دیاری بکەین. بەواتایەکی دیکە ئیندێکس وەك ئاوێنەیەك وایە کە هەموو چالاکییە ئابوورییەکانی تیا بەدی دەکرێت. چونکە بەهۆی نرخی کاڵا و پشك و شەیرەکانەوە لە بازاڕی جیهانیدا (بۆرسەکان) دەتوانین ئاستی بەرهەمهێنان و بازرگانی و دارایی دیاری بکەین.

بەشێوەیەکی گشتی بە دوو شێوە یان بە دوو ئاڕاستە بەهۆی ئیندێکسەوە دەتوانین تۆژینەوە یان شرۆڤەی بازاڕی دارایی بکەین:

یەکەم:- بە بەراوردکردنی ئاستی دوو ئیندێکسی جیاواز لە دوو وڵاتی جیاوازدا یان لە دوو بۆرسەی جیاوازدا، بەهۆی جیاوازی لە نرخی گۆڕینەوەی دراوەکانیان بۆ نموونە دۆلار بەرامبەر جونەیهی ستەرلینی (GBP/USD) یان بۆرسەکانی (FISE 100/DJIA). هەندێ جاریش بەراوردەکە لەنێوان سێ ئیندێکسدا یان سێ بۆرسە لە سێ وڵاتی جیاجیادا دەکرێت.

دووەم:- بۆئەوەی باشتر پێشبینی ئاڕاستەی بەرزبوونەوەو نزم بوونەوەی ئیندێکسی بازاڕی دارایی بکرێت مێتۆدی شیکردنەوەی تەکنیکی بەکاردەهێنرێت. لە وێنەکەی خوارەوەدا پەیوەندی جوڵانەوەی ئاستی ئیندێکس لەگەڵ نرخی ئاڵۆیری دراوەکان نیشان دەدەین.



وێنەی ژمارە (٢٥-٣) پەیوەندی جوڵانەوەی ئاستی ئیندێکس بە نرخی ئاڵوێری دراو.




لە جیهاندا چەند بۆرسەیەکی بەناوبانگ و گەورە هەن کە ڕۆژانە لە هەواڵە ئابوورییەکاندا نیشان دەدرێن و ئاماژەی پێ دەدرێن.

ئێستاش باس لە هەریەك لەو بۆرسانە دەکەین.

### ئیندێکسی بۆرسەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

یەکەم: ئیندێکسی داوجۆنس (The Dow Jones Index). کە پێکهاتووە لە چوار ئیندێکس:

١- ئیندێکسی داوجۆنسی پیشەسازی (The Dow Jones Industrial Average,-DJIA).

٢- ئیندێکسی داوجۆنسی گواستنەوە و هاتووچۆ (The Dow Jones Transportation Average-DJTA).

٣- ئیندێکسی داوجۆنسی کۆمۆنیکەیشن (خزمەتگوزاری) (The Dow Jones Utility Average-DJUA).

٤- ئیندێکسی داوجۆنسی پێکهاتە (ئاوێتە) (The Dow Jones Composite Average-DJCA) ئەم ئیندێکسە لەسەر بنچینەی هەرسێك ئیندێکسەکانی پێشوو ئاوێتە کراوە.

ئیندێکسەکانی داوجۆنس بەشێوەیەکی گشتی لەلایەن گۆڤـاری وۆڵ سـتریتەوە سەرپەرشـتی دەکرێت (The Wall Street Journal). ئەوەی جێگەی ئاماژە پێدانە لەم بۆرسەیەدا تەنها پشکی ئەو کۆمپانیانە مامەڵەی پێ دەکرێت کە پلەو پایەیان بەرزە و ناوی جیهانیان هەیە.

ئێستاکە هەوڵ دەدەین بەشێوەیەکی سادە و ئاسان ژمێرکردنـی ئیندێکـسی داوجـۆنس روون بکەینەوە.

- **چۆن و بە چ شێوەیەك ئیندێکسی داوجۆنس ژمێردەکرێت؟**

هەر لەسەرەتا و کاتی دامەزراندنییەوە ئیندێکسی داوجۆنس بەشێوەی کۆکردنەوەی ژمارەی بەشداران و دابەشکردنیان بەسەر ئـەو ژمارەیـەدا ژمێـر دەکـرد. بـەڵام دواتـر تـەنها بـەهۆی دابەشکردنەوە (divisor) ژمێر دەکرا بۆئەوەی بەشێوەیەکی روونتر و دروست تر پێکەوەلکان و یەکگرتنی کۆمپانیاکان دەربکەوێت. ئیندێکس بەهۆی پنتەوە دیاری دەکرێت.

لە بەرواری (٣١\١٢\٢٠٠٢) بڕی دیاریکراو (پنت)ی دابەشکردن بریتین لە:

- (DJIA - 0,142 799 2)
- (DJTA - 0,232 835 26)
- (DJUA - 1,714 926 23)

ئێستاکە بەهۆی ئەم نموونەیەوە ژمێرکردنی ئیندێکسی داوجۆنس روون دەکەینەوە.

گریمان ئیندیکس پێکهاتووە لە پشکی چوار کۆمپانیا.

A = 26

B = 20

C = 45

D = 17

ئەوکاتە نرخی ناوەند لەکۆتایی مامەڵەکردندا بریتی دەبێت لە (٢٧) یەکە.

گریمان کۆمپانیای (C) لەگەڵ کۆمپانیایەکی تردا یـەك دەگرێـت وە پـشکی (E) بـەنرخی (٣٧) یەکە دەردەکەن. ئەگـەر بەشـێوەیەکی سـاکار بـڕی پـشکەکان کۆبکەینـەوە و دابەشـی ژمارەی کۆمپانیاکانی بکەین ئەوا نرخی ناوەندی (٢٥) یەکەمان دەسـت دەکـەوێت. ئەمـەش جیاوازیەکی بەرچاوی هەیە لەگەڵ نرخی ناوەندی سەرەتایی کە بریتی بوو لـە (٢٧) یەکـە. بـۆ ئەوەی ئەم هەڵەیە روونەدات، کۆی نرخی پشکەکان دابەش ناکەین بەسەر ژمارەکانیاندا بـەڵکو پێویستە دابەشی ژێرگری (X) بکەین ئەوساکە دەبینین:



(X /(A+B+D+E= ٢٧

ئەوکاتە

$$X=(26+20+37+17)/27=3,704$$

- ئیندێکسی داوجۆنسی پیشەسازی

.(The Dow Jones Industrial Average, DJIA)

ئیندێکـسی داوجۆنـسی پیـشەسازی: بریتییـە لـە (٣٠) پـشکی مـەزنترین کۆمپانیـای پیشەسازی، لە خشتەکەی خوارەوەدا گشت ئەو کۆمپانیانە نیشان دەدەین.

خشتەی ژمارە (٢٥-٣) پێڕستی کۆمپانیا پیشەسازییەکانی داوجۆنس.

| Company | Ticker/Sedol | Primany Group |
|---|---|---|
| 3M Co. | MMM | Industrial Diversified |
| Alcoa Inc. | AA | Aluminum |
| Altria Group Inc. | MO | Tobacco |
| American Express Co. | AXP | Diversified Financial |
| AT & T Corp. | T | Fixed-Line Communications |
| Boeing Co. | BA | Aerospace |
| Caterpillar Co. | CAT | Heavy Machinery |
| Citigroup Inc. | C | Diversified Financial |
| Coca-Cola Co. | KO | Soft Drinks |
| E. I. DuPont de Nemours & Co. | DD | Chemicals Commodity |
| Eastman Kodak Co. | EK | Recreational Products &Services |
| Exxon Mobil Corp. | XOM | Oil Companies Major |
| General Electric Co. | GE | Industrial Diversified |

| | | |
|---|---|---|
| General Motors Corp. | GM | Automobile Manufactuters |
| Hewlett- Packard Co. | HPQ | Computers |
| Home Depot Inc. | HD | Retailers Specialty |
| Honeywell International Inc. | HON | Industrial Diversified |
| Intel Corp. | INTC | Semiconductors |
| International Bussiness Machines Corp. | IBM | Computers |
| International Paper Co. | IP | Paper Products |
| J. P. Morgan Chase & Co. | JPM | Banks Ex- S & L |
| Johnson & Johnson | JNJ | Pharmaceuticals |
| McDonalds Grop. | MCD | Restaurants |
| Merck & Co. Inc. | MRK | Pharmaceuticahs |
| Microsoft Corp. | MSFT | Software |
| Procter & Gamble Co. | PG | Household Products Nondurabe |
| SBC Communication Inc. | SBC | Fixed-Line Communications |
| United Technologies Corp. | UTX | Aerospace |
| Wal-Mart Stores Inc. | WMT | Retailers Broadine |
| Walt Disney Co. | DIS | Broadcasting |

له (٢٦)ی ئایاری ساڵی (١٨٩٦)دا بۆ یەکەم جار (چارلز داو) تێبینی و ئاماژەی بە ئیندێکسی پیشەسازی داوجۆنس کرد. ئەوکاتە پیشەسازکاران و سەرمایەگوزاران بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ پشکی کۆمپانیا پیشەسازییەکانیان دەکڕی بەرامبەر سوودێکی دیاریکراو و جێگیر.

ئەوەی جێگەی ئاماژە پێدانە ئەوکاتە پشکی ئەو کۆمپانیانە دەکڕدرا کە بەشێوەیەکی ڕاستەقینە بەرهەمی پیشەسازییان بەرهەم دەهێنا. بەڵام ئەمڕۆکە لە گۆڕەپانی بۆرسەکاندا کڕین و فرۆشتنی پشکەکان بوونەتە شتێکی ڕەمزی، فرۆشیار مەرج نییە خاوەنی کارگەیەکی بەرهەمهێنەر بێت، یان خۆی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەرهەمهێنەر بێت، هەرچ خاوەن



سەرمایەیەك یان پارەدارێك دەتوانێت پشکی هەرچ کارگەیەکی بەرهەمهێنەر بکڕێت و ببێت بەخاوەنی بەشێك لەو کارگەیە...

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە ئەویش ئەوەیە ئایا ئیندێکس بۆچی پێویستە؟

ئیندێکسی داوجۆنسی پیشەسازی زیاتر لە سەد ساڵە دامەزراوە، ئەوکاتە تەنانەت پسپۆڕەکانی باری دارایش لە توانایاندا نەبوو بەشێوەیەکی ڕوون و ڕێکو پێك بتوانن مامەڵە و شرۆڤەی ئەو هەموو زانیارییە بکەن لەگۆڕەپانی بۆرسەکاندا.

بۆیە (چارلز داو) بە داهێنەری ئیندێکسی بازاڕ (بۆرسە) دادەنرێت چونکە ئەو بۆ یەکەم جار بۆئەوەی گووژمی ئەو زانیاریانە ڕێکوپێك بکات. پێشنیاری کرد کە پشکەکان لە (١١) پشکدا کۆبکاتەوە بەجۆرێك (٩)ی ئەو پشکانە بریتی بوون لە پشکی کۆمپانیاکانی هێڵی ئاسنین کە ئەو کاتە مەزنترین کۆمپانیای نیشتمانی بوو. بۆیە نرخی پشکی کۆمپانیای هێڵی ئاسنین بوو بە خاڵی سەرەتایی کە دەتوانرا نرخی کڕین و فرۆشتنی پشکی کۆمپانیاکانی تری پێ بەراورد بکرێت.

ئەوەی جێگەی ئاماژە پێدانە هەر لە بەرواری (٧)ی ئۆکتۆبەری ساڵی (١٨٩٦) گۆڤاری وۆڵ ستریت ڕۆژانە ئەنجامی مامەڵەکردنی پشکەکانی بۆرسەی داو جۆنس بڵاودەکاتەوە. لە ساڵی (١٩١٦)دا ژمارەی پشکەکانی پیشەسازی لە داو جۆنس گەیشتە (٢٠) پشك، لە ساڵی (١٩٢٨)دا ژمارەی پشکەکان گەیشتە (٣٠) پشك، واتە ژمارەی کۆمپانیا پیشەسازییەکان کە مافی بەشداربوونیان لە بۆرسەی داو جۆنسدا هەبوو گەیشتە سی کۆمپانیای مەزن. بەپێی ئامارەکانی دەزگای(DJ U.S. Total Market Index). ئەمڕۆکە ئیندێکسی داوجۆنسی پیشەسازی لە (٢٨٪) بازاڕی سەرمایە و دارایی ئەمریکا پێك دەهێنێت کە بریتییە لە (٨,٩) ترلیۆن دۆلاری ئەمریکی. ڕۆژانە گۆڤار و ڕۆژنامە و ئاژانسەکانی هەواڵ و ئینتەرنێت، هەواڵی ئیندێکسی داو جۆنسی پیشەسازی بڵاودەکەنەوە، چونکە ئەو هەواڵانە گرنگترین ئاماژەن دەربارەی بارودۆخی ئابووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و جیهانی.

ئەوەی شایانی باسە ئیندێکسی داو جۆنسی پیشەسازی لە ساڵی (١٩٩٩)دا لە بەرزترین پلەدا بوو بەجۆرێك ژمارەی مامەڵەکردن لەو ساڵەدا گەیشتە (١١٩٩٣) پنت کە پێی دەوترێت (Life High). بەڵام نزمترین پلەی مامەڵەکردن لەساڵی (١٩٣٢)دا بوو کە گەیشتە (٤١,٢) پنت پێی دەوترێت (Life Low).

- ئیندێکسی داو جۆنسی گواستنەوە و هاتوچۆ (The Dow Jones Transportation Average, DJTA)

ئیندێکسی داوجۆنسی گواستنەوە و هاتوچۆ پێکهاتووە لە (٢٠) پشکی بیست کۆمپانیایی مەزنی گواستنەوە و هاتوچۆ لەوانە (کۆمپانیای هێڵی ئاسمانی، کۆمپانیای گواستنەوەی هێڵی ئاسنین، کۆمپانیای گواستنەوەی هاتووچۆی سەرزەمینی). لە خشتەکەی (٢٥-٤)دا پێڕستی گشت ئەو کۆمپانیانە نیشان دەدەین.

خشتەی ژمارە (٢٥-٤) پێڕستی کۆمپانیاکانی گواستنەوە و هاتوچۆی داو جۆنس.

| Company | Ticker/ Sedol | Primary Group |
|---|---|---|
| Alexander & Baldwin Inc. | ALEX | Maine Transport |
| AMR Corp. | AMR | Airlines |
| Burlington Northern Santa Fe Corp. | BNI | Railroads |
| C.H. Robinson Worldwide Inc. | CHRW | Trucking |
| CNF Inc. | CNF | Trucking |
| Continental Airlines Inc. CI B | CAL | Airlines |
| CSX Corp. | CSX | Railroads |
| Delta Air Lines Inc. | DAL | Airlines |
| Expeditors International of Washington Inc. | EXPD | Air Freight |
| FedEx Corp. | FDX | Air Freight |
| GATX Corp. | GMT | Industrial Services |
| J.B. Hunt Transport Services Inc. | GBHT | Trucking |
| Norfolk Southern corp. | NSC | Railroads |
| Northwest Airlines Corp. | NWAC | Airlines |



| | | |
|---|---|---|
| Ryder System Inc. | R | Transportaion Services |
| Southwest Airlines Co. | LUV | Airlines |
| Union Pacific Corp. | UNP | Railroads |
| United Parcel Service Inc. CI B | UPS | Air Freight |
| USF Corp. | USFC | Trucking |
| Yellow Roadway Corp. | YELL | Trucking |

هەرچەندە ئیندێکسی پیشەسازی گرنگترین ئیندێکسی داو جۆنس پێك دەهێنێت، بەلاّم ئیندێکسی گواستنەوە و هاتووچۆ کۆنترین ئیندێکسە، هەروەك لەپێشەوە ئاماژەمان پێدا، دامەزرێنەری ئیندێکسی داو جۆنس وە لەهەمان کاتدا دامەزرێنەری گۆڤاری ۆڵ ستریت (Wall Street Journal) ، (چارلز داو) بۆ یەکەم جار لەساڵی (١٨٨٤)دا پشکی (٩) کۆمپانیای گواستنەوەو هاتووچۆی لەکۆی هەموو پشکەکان کە بریتی بوون لە (١١) پشك خستە مامەڵەکردنەوە لە بۆرسەی داو جۆنس. چونکە ئەوکاتە کۆمپانیاکانی هێڵی ئاسنین گەورەترین و مەزنترین کۆمپانیای ئەمریکا بوون وەك کۆمپانیاکانی:

(New York Central, Union Pacific, Pacific Mail Steamship, Western Union).

ئەوەی جێگەی ئاماژە پێدانە هەردوو ئیندێکسی پیشەسازی و گواستنەوە و هاتووچۆ بەشێوەیەکی راستەوخۆ و دینامیکێکی پێکەوە بەستراون، چەند پلەی پنتەکانی مامەڵەکردنی ئیندێکسی پیشەسازی بەرز بێت ئەوا بەهەمان شێوەش ئیندێکسی گواستنەوە و هاتووچۆ بەرز دەبێتەوە.

- ئیندێکسی داو جۆنس بۆ خزمەتگوزاری (The Dow Jones Utility Average, DJUA)

ئیندێکسی داو جۆنس بۆ خزمەتگوزاری (کۆمۆنیکەیشن) بریتییە لە پشکی (١٥) کۆمپانیای مەزن، لەبواری گەیاندنی وزەی کارەبا و گازدا. لەخشتەکەی (٢٥-٥)دا پێڕستی ئەو کۆمپانیانە دەخەینەڕوو.

خشتەی ژمارە (٢٥-٥) پێرستی کۆمپانیاکانی داو جۆنس بۆ خزمەتگوزاری.

| Company | Ticker / sedol | Primary Group |
|---|---|---|
| Alexander& Baldwin Inc. | ALEX | Marine Transport |
| AMR Corp. | AMR | Airlines |
| Burlington Northern Santa Fe corp. | BNI | Railroads |
| C.H. Robinson Worldwide Inc. | CHRW | Trucking |
| CNF Inc. | CNF | Trucking |
| Continental Airlines Inc.CI B | CAL | Airlines |
| CSX corp | CSX | Railroads |
| Delta Air Lines Inc. | DAL | Airlines |
| Expeditors International of Washington Inc. | EXPD | Air Freight |
| FedEx Corp. | FDX | Air Freight |
| GATX Corp. | GMT | Industrial Services |
| J.B. Hunt Transport Services Inc. | JBHT | Trucking |
| Norfolk Southern Corp. | NSC | Railroads |
| Northwest Airlines Co. | NWAC | Airlines |
| Ryder System Inc. | R | Transportation Services |
| Aouthwest Airlines Co. | LUV | Airlines |
| Union Pacific Corp. | UNP | Railorads |
| United Parcel Service Inc.CI B | UPS | Air Freight |
| USF Corp. | USFC | Trucking |
| Yellow Roadway Corp. | YELL | Trucking |



ئیندێکسی داو جۆنس بۆ خزمەتگوزاری نوێترین ئیندێکسە لەچاو ئەوانەی پێشوودا. لە ساڵی (١٩٢٩)دا دامەزراوە. بەپێی لێکۆڵینەوەی پسپۆڕانی بۆرسە، کاتێك نرخی پشکی ئەو کۆمپانیانە بەرز دەبێتەوە ئەوا چاوەڕوانی نزم بوونەوەی ڕێژەی سوودی قەرز دەکرێت. چونکە زۆربەی ئەو کۆمپانیانە ڕۆڵی ناوەند دەبینن و سەرچاوەی داراییان قەرزی بانك و دەزگا داراییەکانە چەند ڕێژەی سوودی قەرز نزم بێت ئەوا قازانجیان زیاد دەکات پێچەوانەش بەپێچەوانەوە. زۆربەی شارەزایانی بازاڕی دارایی گۆڕانکاری (بەرزبوونەوە و نزم بوونەوە)ی نرخی پشکەکانی بازاڕی دارایی دەبستنەوە بەنرخی پشکەکانی کۆمپانیا خزمەتگوزارییەکانی داو جۆنسەوە. ئەگەر ئیندێکسی پیشەسازی لەماوەی سەد ساڵی ڕابردوودا سەدان جار گۆڕانکاری بەسەردا هاتبێت، ئەوا ئیندێکسی خزمەتگوزاری گۆڕانێکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتووە هەر وەك خۆی ماوەتەوە، تەنانەت ژمارەی کۆمپانیا بەشدارەکان کەمتر بوونەتەوە. ڕەنگە بەهۆی ئاوێتە بوونی چەند کۆمپانیایەکی خزمەتگوزاری لەگەڵ یەکتردا ڕووی دابێت.

ناسداك - (NASDAQ- National Association of Securities Dealers Automated Quotations)

ناسداك (NASDAQ):- بریتییە لە ڕێکخراوێکی نابازرگانی پسپۆڕان و کارمەندانی بانك و جامبازەکان بۆ ڕێکوپێك کردن و پاراستنی بەرژەوەندیان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. ناسداك مامەڵەی بازرگانی لە دەرەوەی بۆرسەکان ڕێك دەخات وە چوارچێوەی کارکردن بۆ ئەندامەکانی دیاری دەکات جگە لەوەش خولی ڕاهێنان بۆ ئەندامەکانی دەکاتەوە.

لەساڵی (١٩٣٩)دا لە کۆنفرانسی بانکە سەرمایەگوزارییەکان و لیژنەی چاودێری کاغەزی بەنرخ، بۆ ڕێکوپێك کردنی بازاڕەکانی دەرەوەی بۆرسە ڕێکخراوی (ناسداك)یان دامەزراند. دەستەی بەڕێوەبردنی ناسداك پێکهاتووە لە (٢٧) ئەندام، وە زیاتر لە (١٣) لقی لێ بلاوبۆتەوە لە ویلایەتەکانی ئەمریکا. دەستەی بەڕێوەبردن چاودێری و کۆنترۆڵی باری دارایی لقەکانی دەکات و پێشنیار و ڕێنمایی ئەندامەکانی دەکات.

سیستەمی بازرگانی ناسداك بریتییە لە تۆڕەکانی ئینتەرنێت، ئەمڕۆکە بەشداران بریتین لە (٥٠٠٠) کۆمپانیا. سیفەتی تایبەتی ئەم بازاڕە ئەلەکترۆنییە لەوەدایە کە بەشدارەکان تەنها کۆمپانیا هەرە مەزنەکان نین بەڵکو چەندان کۆمپانیای ناوەندی و بچوکیشن لە سەرانسەری جیهاندا.

ناسداك نوێترین تەكنۆلۆژیای گەیاندن بەكاردەهێنێت لە مامەڵەكردن و بازرگانیدا بۆ ئەوەی بەشدارانی بازاڕی كڕین و فرۆشتنی پشك و كاغەزی بەنرخ بەئاسانی و خێرایی بتوانن پەیوەندی بە یەكدیەوە بكەن. ئەمڕۆكە زیاد لە (٥٠٠) جامباز كاردەكەن بۆ بەرژەوەندی هەزاران كۆمپانیا و سەرمایەدار و خەڵكی ئاسایی بۆ نموونە لەساڵی (٢٠٠٠)دا ئەو جامبازانە نزیكەی (٦١٠٩٢) گرێ بەستی بازرگانییان جێبەجێ كردووە. هەندێ جاریش ئەو جامبازانە سەرمایەی تایبەتی خۆیان بەكاردەهێنن لە كڕین و فرۆشتنی شەیرەكاندا.

بەشێوەیەكی گشتی دەتوانین بەشدارانی ناسداك پۆلێن بكەین لە دوو گرووپەدا:

یەكەم:- جامبازانی بازارگەڕی - بریتین لە ژمارەیەكی زۆری جامباز (چەرچی) كە بەشێوەی تاك سەوداكاری دەكەن و كێبڕكێی یەكدی دەكەن لەجێبەجێ كردنی خواستەكانی سەرمایەگوزار لە كڕین و فرۆشتنی پشك و كاغەزی بەنرخی كۆمپانیا جیاجیاكان.

دووەم:- سیستەمی گەیاندنی ئەلكترۆنی ( ECN- Electronic Communications Network ) - ئەم سیستەمە كارئاسانی دەكات بۆ ئەو سەرمایەدار و پارەدارانەی كە دەیانەوێت پشك و كاغەزی بەنرخی كۆمپانیا جیهانییەكان بكڕن یان بفرۆشنەوە. ئەویش بەتۆماركردنی داواكەیان لە سیستەمی گەیاندنی ئەلەكترۆنی ناسداكدا.

- (NASDAQ Composite Index)

ئیندێكسی ناسداك (٨)ی شوباتی (١٩٧١) دامەزراوە. هەر لەو كاتەوە بڕی (١٠٠) پنتی بۆ مامەڵەكردن دیاری كردووە بەو بڕە ئاستی بەشداری كۆمپانیا ئەمریكی و بیانییەكان دەست نیشان دەكرێت. بەرزبوونەوە یان نزمبوونەوەی نرخی كاغەزی بەنرخ بەشێوەیەكی راستەوخۆ كاردەكاتە سەر ئاستی ئیندێكسی كۆمپانیاكان. بەهای ئیندێكسی ناسداك بەلێكدانی نرخی كۆتایی پشكەكە بە ژمارەی گشت پشكەكان ژمێردەكرێت.

خاڵێكی گرنگ كە دەمەوێت ئاماژەی پێبدەم، ئەویش ئەوەیە ئیندێكسی ناسداك وەك ئاوێنەی بازاڕ وایە. چونكە گشت گۆڕانكارییەكانی باری ئابووری لە كەرتە جیاجیاكانی بەرهەمهێنان و خزمەتگوزاریدا نیشان دەدات، ئیندێكسی ناسداك پێرستی (٤٨٦٢) كۆمپانیا دەگرێتە خۆ. بۆ نموونە ئەگەر ئیندێكسی ناسداك بەراورد بكەین بە ئیندێكسی داو جۆنسی پیشەسازییەوە تەنها (٣٠) كۆمپانیا بەشداری دەكەن.

ئەوەی شایانی باسە ئیندێكسی ناسداك (NASDAQ) لەساڵی (٢٠٠٠)دا لە بەرزترین پلەدا بوو، بەجۆرێك ژمارەی مامەڵەكردن لەو ساڵەدا گەیشتە (٤٨١٦,٣٥) پنت كە پێی



دەوترێت (Life High). بەڵام لەساڵی (١٩٩٨)دا لەنزمترین پلەدا بوو، بەجۆرێك ژمارەی مامەڵەكردن لەو ساڵەدا گەیشتە (٩٩٣,١) پنت كە پێی دەوترێت (Life Low).

جگە لەوەش ناسداك چەند ئیندێكسێكی تری هەیە وەك:

- (NASDAQ-100 Index):- ئەم ئیندێكسە (١٠٠) كۆمپانیای نادارایی مەزن دەگرێتە خۆ، بەمەرجێك ئەزموونی كاركردنیان لە دوو ساڵ كەمتر نەبێت وە ژمارەی پشكەكانیان رۆژانە لە مامەڵەكردندا لە (١٠٠٠٠٠) پشك كەمتر نەبێت .

- (NASDAQ Financial-100 Index):- ئەم ئیندێكسە لە (٣١)ی كانونی دووەمی ساڵی (١٩٨٥)دا دامەزراوە. كە (١٠٠) كۆمپانیای مەزنی دارایی دەگرێتە خۆ.

- (NASDAQ National Market Composite Index):- ئەم ئیندێكسە لە (١٠)ی تەمووزی ساڵی (١٩٨٤)دا دامەزراوە. بەشێوەیەكی گشتی ئەم ئیندێكسە گشت ئەوانەی پێشوو دەگرێتە خۆی بەواتایەكی دیكە گشت ئیندێكسەكانی ناسداك جارێكی تر لەم ئیندێكسەدا دووبارە دەبێتەوە.

ئیندێكسی ستاندارت پۆرس (STANDART & POORS Index)

ئیندێكسی ستاندارت پۆرس پێكهاتووە لە:

- (Standard& Poors Composite 500 Index):

ئەم ئیندێكسە پێكهاتووە لە (٤٠٠) كۆمپانیای پیشەسازی، (٢٠) كۆمپانیای گواستنەوە و هاتووچۆ، (٤٠) كۆمپانیای خزمەتگوزاری و (٤٠) كۆمپانیای دارایی. مەرجی بەشداربوون لەم بۆرسەیەدا دەبێت سەرمایەی پشكەكانی كۆمپانیاكان لە (٧٣) ملیۆن دۆلاری ئەمریكی كەمتر نەبێت. ئەم ئیندێكسە لەساڵی (٢٠٠٠)دا لە بەرزترین پلەدا بووە بەجۆرێك ژمارەی مامەڵەكردن لەو ساڵەدا گەیشتە (١٥٥٣,١١) پنت. بەڵام نزمترین پلەی مامەڵەكردن لەساڵی (١٩٥٧)دا بووە كە تەنها بریتی بووە لە (٣٨,٩٨) پنت.

- (Standard& poors 400 Index[S&P Midcap):

ئەم ئیندێكسە (٤٠٠) كۆمپانیای پیشەسازی دەگرێتە خۆی بەمەرجێك دەبێت بڕی ئاڵوویری پشكەكانی لە (٨٥) ملیۆن دۆلاری ئەمریكی كەمتر نەبێت.

ئیندێکسی فۆندی بۆرسەی نیۆرك ( NYSE INDEX-New York Stok Exchange-Index)

ئیندێکسی فۆندی بۆرسەی نیۆرك نرخی گۆڕینەوە (کڕین و فرۆشتنی) گشت ئەو پشکانە نیشان دەدات کە تۆمار کراون لە بۆرسەکەدا. جگە لەوەش بەهای ناوەندی پشکەکان نیشان دەدات. ئەم بۆرسەیە یەکێکە لەبۆرسە گەورە و گرنگەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. جگەلە کۆمپانیا ئەمریکییەکان کۆمپانیا جیهانییەکانی دیکەش دەتوانن بەشداری تێدا بکەن. جیاوازی ئەم بۆرسەیە لەگەڵ ئیندێکسی داوجۆنسدا لەوەدایە. پلەی پێنتەکان بە ژمارە و بڕی پشکەکان ژمێر ناکرێت بەڵکو ژمێرکردن بە بڕی دۆلار دەکرێت، هەر ئەم فاکتەرەشە بۆتە زیاتر بە جیهان کردنی دۆلاری ئەمریکی، چونکە کۆمپانیاکان لەم بۆرسەیەدا تەنها بە دۆلاری ئەمریکی دەتوانن مامەڵە بکەن، ژمارەی ئەو کۆمپانیانە هەندێ جار لە (٧٠٠٠) کۆمپانیا تێ دەپەڕێت.

ئیندێکسی فۆندی بۆرسەی ئەمریکی (AMEX)

ئیندێکسی فۆندی بۆرسەی ئەمریکی پێکهاتووە لە دوو بەش:

١- ئیندێکسی بنچینەیی (سەرەکی) (AMEX Major Market Index):

ئەم ئیندێکسە نرخی بنچینەیی پێرستی (٢٠) کۆمپانیای پیشەسازی گەورە نیشان دەدات. بەشێوەیەکی گشتی کۆمپانیا بەشدارەکانی ئەم بۆرسەیە هەمان بەشدارگەی ئیندێکسی داوجۆنس و ئیندێکسی فۆندی بۆرسەی نیویۆرکن.

٢- ئیندێکسی نرخی بازاڕی (AMEX Market Value Index):

ئەم ئیندێکسە لە ئەیلولی ساڵی (١٩٧٣)دا دامەزراوە. جیاوازی سەرەکی لەگەڵ بۆرسەکانی تردا لەوەدایە ئیندێکسی (٨٠٠) کۆمپانیای مەزنی جیهانی بەنرخی بازاڕ واتە بەپێی یاسای (داوا و خستنەڕوو) مامەڵەی پێ دەکرێت. ئەمەش دەبێتە هۆی بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی بەهای پشکەکان لەماوەی مامەڵەکردندا واتە لەکاتی کردنەوە و داخستنی بۆرسە. ئەوەش دەبێتە هۆی بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی نرخی ئاڵوویری دراوەکان بەتایبەتی نرخی ئاڵوویری دۆلار.

بۆ نموونە: لە بەرواری (٢٠٠٣\١٠\٢٢)دا بەهۆی دابەزینی بەهای پشکەکانی کۆمپانیا بەشدارەکانی بۆرسەی ئەمریکی نرخی گۆڕینەوەی دۆلاریش بەرامبەر دراوەکانی دیکە دابەزی،



ئەمەش کاردانەوەیەکی نێگەتیڤانەی کردە سەر بەهای پشکەکان، بەجۆرێك ئیندێکسی داو جۆنس بە پلەی (١,٥٪) پنت نزم بۆوە، وە ئیندێکسی ناسداك بە بڕی (٢,٢٪) نزم بووەوە. نرخی گۆڕینەوەی دۆلاری ئەمریکیش بەرامبەر یۆرۆ دابەزی وەك لەوێنەکەی خوارەوەدا دیارە.

وێنەی ژمارە (٢٥-٤) کاردانەوەی دابەزینی ئیندێکسی بۆرسەکان لەسەر نرخی گۆڕینەوەی دۆلار بەرامبەر یۆرۆ.



